- ناوی کتێب: درۆ...دراو
- بابەت: دیداری رۆژنامەوانی
- بڵاوکردنەوەی کتێبخانەی شەهید جەمالی عەلی باپیر
- ساڵی چاپ: ٢٠١١
- تیراژ: (١٠٠٠)
- نرخی(١٠٠٠٠) بەدیڤیدییەکەوە.



# پێڕست

# ئەزمونی حیزبی لەهەرێمی کوردستاندا کەوتوەتە بەر مەترسی

سازدانی: هوشیار عەبدوڵا

لـە بەرنامــەی روبــەڕودا نەوشـیروان مـستەفا بـاس لـە روداوە سیاسـییەکانی ئێـستای هــەرێمی کوردسـتان دەکـات، هاوکـات پێیوایـە ئـەزمونی حیزبـی لـە هــەرێمی کوردسـتان لـە مەترسـیدایە و دەڵێـت: "لەراسـتیدا ئـەزمونی حیزبـی کەوتوەتە مەترسییەوە، ئەزمونی حیزبە دەسەڵاتدارەکان کەوتوەتە مەترسییەوە ئەگینا ئەزمونی حکومەتی هەرێمی کوردستان خۆی بەردەوامە و دەڕوات".

KNN: زۆر جـار لـە بەرامبـەر ئـەو رەخنـە و ناڕەزاییانـەی ک ە ئێـوە لـە حیزبـە باڵادەسـتەکانی دەگـرن، بـاس لـەوە دەکـرێ کـە ئێـستا کـاتی ئـەوە نیـە دۆخـی نـاوخۆیی کـەرت بکرێـت، زۆرجـاریش ئێـوە تاوانبـار دەکـرێز بـەوەی کـە ئێـوە ئـەزمونی هـەرێم دەخەنەبـەر مەترسـییەوە، ئایـا بەڕاسـتی هـەرێمی کوردسـتان لەژێر مەترسیدایە؟

نەوشیروان مستەفا: قسەیەکی بەناوبانگ هەیە دەڵێت: ئەی ئازادی چەند تـاوان بە ناوی تۆوە کراوە؟، ئەی دیموکراسـی چـەند تـاوان بەناوی تـۆوە کـراوە؟، من شـتێکی تـری بـۆ زیـاد دەکـەم و دەڵـێم ئـەی ئـەزمونی سـاوای کوردسـتان چـەند قەباحەت بەناوی تۆوە کراوە؟، لەڕاستیدا من پێشنیار دەکەم ئـەم دەستەواژەیە (ئـەزمونی سـاوا) لـە فەرهـەنگی کـوردی شـاربەدەر بکرێـت، چـونکە مـەعقول نیـە لەپاش ٢٠ سـاڵ لـە دامەزرانـدنی دامودەزگاکـانی حکومـەتی هـەرێم باسـی ئـەوە بکرێت کە ئەزمونەکەمان ساوایە و هەرچی قسەیەك بکرێـت راستەوخۆ بوترێـت ئەزمونەکـە دەکەوێتـە بـەر مەترسـییەوە، لـەپاش ٢٠ سـاڵ کەسـێك ئەگـەر سـاوا

بێت مانای وایە عەقڵی دواکەوتوە و مەنگۆلییە و پێویستی بەوە هەیە بینێریت بۆ فەرمانگەی چاودێریی کۆمەڵایەتی یان بیخەیتە نەخۆشخانەوە، ئەزمونیش ئەوەندی من بزانم بڕۆ لە مامۆستای فیزیا و کیمیا و بیرکاری و زانستە کۆمەڵایەتییەکان بپرسە، جارێك، دوجار، سێجار شتێك ئیختیبار دەکەن یان تەجروبەی دەکەن ئەگەر سەرکەوتو بو ئیتر دەیکەین بە قاعیدە یان بە قانون و کاری لەسەر دەکەن، ئەگەر شکستیشی هێنا، ئەوا ئیتر وازی لێ دەهێنن، ئەزمونی ٢٠ساڵی رابردوی کوردستانی عێراق ئەگەر ئێمە لەسەر چەندین ئاستی جیاجیا تەماشای بکەین، دەبینین بەڵی ئەزمونی سیاسی، ئەزمونی قانونی، ئەزمونی دەستوی سەرکەوتنی بەدەستەێناوە لەبەرئەوەی ئەم ئەزمونە ئێستا خاوەنی شتێکە پێی دەوترێت حکومەتی هەرێمی کوردستان و لە ئەزمون دەرچوە، حکومەتی هەرێمی کوردستان لەڕوی دەستورییەوە حکومەتی عێراق ئیعتیراڤ پێکردوە و دەوڵەتانی دراوسێ و زلهێزەکانی دنیا مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن و لەچەندین جێگەی دنیا حکومەتی هەرێم نوێنەرایەتی هەیە و خۆشی دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکردن و دادوەریی هەیە و لە هەمان کاتدا چەندین وەزارەتی هەیە بەجۆرێك کە وەزارەتی وای هەیە بەرەوژوری سەد هەزار کارمەندی تیایە، ئیتر باسکردن لەوەی کە ئەم ئەزمونە ئەزمونی ساوایە و دەکەوێتە مەترسییەوە، لەراستیدا ئەزمونی حیزبی کەوتوەتە مەترسییەوە، ئەزمونی حیزبە دەسەڵاتدارەکان کەوتوەتە مەترسییەوە ئەگینا ئەزمونی حکومەتی هەرێمی کوردستان خۆی بەردەوامە و دەڕوات، ئەو مەترسییانە لەسەریەتی، هەندێك مەترسیی وەهمین و هەندێکی راستەقینەن و دەکرێت چارەسەر بکرێن، ئەوەی شکستی خواردوە، ئەزمونی حیزبە سیاسیەکانە لەڕوی شاردنەوەی داهاتی هەرێمی کوردستان و شاردنەوەی بودجە و ئەزمونی بەحیزبیکردنی کۆمەڵ و ئەزمونی حیزبی شمولی و تاکحیزبی و رێککەوتن و گرێبەستی ژێربەژێر، ئەمانە هەموی شکستی خواردوە و هەمویان لە مەترسیدان، وەختێك ئەوان باس لەوە دەکەن کە ئەزمونەکەمان لەمەترسیدایە،

بەڵی ئەزمونی بەکارهێنانی چەك بۆ بەلاداخستنی ململانێی سیاسی بۆ ئەوەی حیزبێك بەکاری بهێنێت لەدژی حیزبێکی تر یان حیزبێك یان دەسەلأت بۆ سەرکوتکردنی خەڵك بەکاری بهێنێت، ئەم ئەزمونە لە مەترسیدایە چونکە ئیتر نابێت دوبارە ببێتەوە، نابێت کەس هێزی پێشمەرگە و ئاسایش و هێزی چەکدار لە ململانێی سیاسی و کێبڕکێی سیاسی نێوان حیزبەکاندا بەکارهێنێت، ئەم ئەزمونە کاتی خۆی بو بەهۆی بەرپاکردنی شەڕی براکوژی، لەبەرئەوە شکستی هێناوە، ئەزمونی شاردنەوەی داهاتی هەرێمی کوردستان، ئەوەی کە لە بەغداوە دێت و ئەوەی کە لە کوردستاندا کۆدەکرێتەوە چ لەرێگەی نەوتەوە چ لە رێگەی گومرگەوە چ لە رێگەی داهاتی ناوخۆوە، ئیتر ئەزمونی شاردنەوەی بودجە و داهاتی هەرێمی کوردستان لە مەترسیدایە، چونکە خەریکە ئاشکرا دەبێت کە بوە بەهۆی دروستبونی گەندەڵی لە کوردستانی عێراقدا، ئەزمونی دەستێوەردانی حیزب لە جومگەکانی ژیاندا، لەزانکۆکاندا، لە مزگەوتەکاندا، لە بازاڕەکاندا، لە دامودەزگاکانی حکومەتدا، لە ئاسایشدا، لە پێشمەرگەدا، بەڵێ ئەمە لە مەترسیدایە، چونکە خەریکە شکست دەخوات، ئەزمونی دروستکردنی ئاسایشی حیزبی و دەوڵەتی حیزبی لە مەترسیدایە، ئەزمونەکەی ئەوان لە مەترسیدایە، ئەزمونەکەی ئێمە لە مەترسیدا نیە.

KNN: بەلأم لەڕوی راگەیاندنەوە بەردەوام ئەوان لە راگەیاندنەکانیانەوە باس لەوە دەکەن کە ئەم ئەزمونە ئەزمونێکی سەرکەوتوە؟

نەوشیروان مستەفا: بێگومان دەبێت وابڵێن چونکە ئەزمونی میدیای حیزبیش شکستی خواردوە، رەنگە گلەیی لە ئێمەش بکەن بڵێن ئێوەش میدیای حیزبیتان هەیە بەڵی ئێمەش هەمانە، لە ولأتێکدا کە میدیای سەربەخۆ نەبێت و هەر حیزبێك بەئارەزوی خۆی بە پارەی حکومەت، بەپارەی میللەت، بەپارەی دەوڵەت بڕوات میدیا بۆ خۆی دابمەزرێنێت، بەڵی ئەزمونی میدیای حیزبیش کە بناغەکەی لەسەر پارە و لەسەر درۆ بنیاتنراوە، ئەویش شکستی خواردوە و بێگومان ئەویش لە مەترسیدایە کە ئەمساڵ بێت یان هەر ساڵێکی تر بێت لە

داهاتودا كۆتایی پێ دێت، لەبەرئەوە فیعلەن ئەوانە هەقیانە بڵێن ئەزمونەكەمان لە مەترسیدایە، ئەزمونی حیزبیی ئەوان لە مەترسیدایە.
KNN: جیاوازی لەنێوان راگەیاندنی ئێوە و راگەیاندنی ئەوان چییە؟، بەتایبەت لە مەسەلەی پشتگیریكردنی داخوازییەكانی خەڵك لەگەڵ شاردنەوەی ئەوەی كە پێشتر خۆت ناوت لێناوە و سێ چەمكت بەكارهێناوە (گێلاندن و تاریكاندن و دێواندن)، لە چ شتێكدا جیاوازی هەیە؟
نەوشیروان مستەفا: عادەتەن حیزبە شمولییەكان و حیزبە تۆتالیتارەكانی دنیا یەكێك لە كۆڵەكە سەرەكییەكانیان مەسەلەی بایەخدانە بەكاروباری رۆشنبیری، لەناو رۆشنبیریشدا بایەخدانە بەكاری راگەیاندن و كاروباری میدیا، هەمو حیزبە شمولییەكان لە دنیادا چ حیزبە كۆمۆنیستەكان، چ حیزبە نازی و فاشییەكان، حیزبە ئیسلامییەكانی تریش كە ئێستا وردە وردە لە هەندێ جێگادا حوكمیان گرتوەتە دەست، یەكێك لە كۆڵەكە سەرەكییەكانی كاركردنیان بریتییە لە دروستكردنی میدیایەكی تایبەت بەخۆیان، ئەم میدیایە چۆن كاردەكات؟ من كاتی خۆی لە وتارێكدا نوسیوە، یەكەم كاری ئەم میدیایە لەباتی ئەوەی كە راستی بگەیەنن بەخەڵك، چەواشەكردنی خەڵكە كە من ناوم ناوە گەوجاندن، واتا خەڵك گەوج دەكەن و وای لێدەكەن كە راستییان لێ بشاردرێتەوە و ئاگای لە هیچ نەمێنێت، تاریكاندن، واتا كاتێك كۆبونەوە دەكرێت كەس نازانێت باسی چی دەكەن، شەڕ دەبێت دەیشارنەوە، كە ئەمە تاریكاندنە، هاوكات دێواندنی سەركردەكان، ئەمەش لەوەدا خۆی دەبینێەوە كە باسی ئەوە دەكەن ئەگەر راپەڕین فلان كەس نەبوایە هەرگیز نەدەبو، ئەگەر فلان و فیسار كەس نەبوایە هەرگیز ئەزمونی دیموكراتی لە كوردستاندا نەدەبو، ئەگەر فلان نەبوایە هەڵبژاردن نەدەكرا و پەرلەمان دروست نەدەكرا، ئەگەر فلان كەس نەبوایە ئەمەریكا نەدەهات بۆ كوردستان و ئێران كوردستانی داگیر دەكرد و تورك دەهات كوردستانی عێراقی خاكی بە تورەكە دەبێژا، واتە

دێوان و تاریکاندن و گەوجاندن ئەمانە لە چوارچێوەی کارە سەرەکییەکانی میدیای حیزبییە کە پێموایە ئەویش وەکو ئەزمونێك لەمەترسیدایە.

KNN: حیزبە باڵادەستەکان باس لەوە دەکەن کە ئەوان بە زۆرینە حکوم دەکەن و ئێوەش کەمینەن، ئێوە دەتانەوێت بەزۆر شتیان بەسەردا بسەپێنن؟

نەوشیروان مستەفا: ئەو مەسەلەیە دو لایەنی هەیە، یەکێکیان ئەوەیە کە هەندێك ئامارەی خراپ لە چەند مانگی رابردودا ئێمە بەدیمان کرد، کە لە ساڵانی رابردوشدا بەدیمان کردبو، حیزبەکەی حوسنی موبارەك کاتی خۆی بە ئینقیلابی سەربازی نەچوەتە سەر حوکم و حوسنی موبارەك خۆی یەکێك بوە لەوانەی بەشدار بوە لە شەڕەکانی دژ بە ئیسرائیلی و فڕۆکەوان بوە، بن عەلیش بە هەمان شێوە یەکێك بوە لە رزگارکەرەکانی تونس، ئەمانە هەردوکیان لە هەڵبژاردنی ئازاددا هاتنە سەر دەسەڵات، هەردوکیان زۆرینەی پەرلەمانیان هەبو، بەو زۆرینەیەی کە لە پەرلەماندا هەیانبو، سیستەمی سیاسی وڵاتەکەیان گۆڕی و توانییان دەستورێك دابنێن کە تەئمینی مانەوەی خۆیان لە دەسەڵاتدا بکات بۆ خۆیان کوڕەکانیان، بۆ خۆیان و حیزبەکانیان، بەو زۆرینەیەی کە لە پەرلەماندا هەیانبو توانییان سەیتەرە بکەن بەسەر دەزگای ئاسایش و دامەزراوەی سەربازی و دامودەزگاکانی حکومەت و میدیا و زانکۆ و هەمو جومگەکانی ژیان لەو وڵاتەدا، هەر لەو رێگەیەوە کارێکی وایان کرد سیستەمێکیان دروستکرد کە ئەو سیستەمە بەچاوی خۆمان بینیمان پێش ماوەیەك لەمەوبەر هەرەسی هێنا، کاتی خۆی ئێمە کە بەیاننامە ٧ خاڵییەکەمان بڵاو کردەوە، لە راستیدا ئەمە جۆرێك لە ئیستیباق بو بۆ هۆشیارکردنەوەی ئەوان کە ئەم تەجروبەیە لە جیهاندا شکستی هێناوە، تەجروبەی تاکحیزبی و تەجروبەی ئەو جۆرە زۆرینەیەی کە خۆی دەسەپێنێت و سیستەمی سیاسی وڵاتێك، عادەتەن دەستور بریتییە لە پەیمانێکی کۆمەڵایەتی لەنێوان هاوڵاتیاندا، ناکرێت تۆ بە زۆرینە بیسەپێنیت بەسەر خەڵکدا، هەندێك یاسا هەیە بۆ نمونە یاسای هەڵبژاردن یان ئەو یاسایانەی پەیوەندییان بە ئاسایشی

نیشتمانییەوە هەیە، ئە یاسایانەی کە پەیوەندی بە پاشەڕۆژی داهاتو و نەوەی داهاتووەوە هەیە، ئەم یاسانە عادەتەن بەجۆرێك دادەڕێژرێت کە زۆرینەی خەڵك پێی ڕەزامەند بێت و کەمترین ڕێژەی خەڵك پێی ناڕازی بێت، بەجۆرێك کە ئەو یاسایە نەك لەپاش ٤ ساڵ پێویستی بە گۆڕین بێت جاری وایە لەپاش ٣٠ ساڵیش پێویستی بە دەستکاریکردن نیە، ئەمانە بە زۆرینەیەك کە مەعلوم نیە ئایا ئەو زۆرینەیە بە نەزاهەت هێنابێتیان، هەمومان دەزانین کە بە چ ڕێگایەك ئەو زۆرینەیەیان بەدەستەێناوە، هەمومان دەزانین ئەوان چۆن توانیویانە هەڵبژاردن بکەن، حاڵی حازر ئێمە ناتوانین لە دهۆك ئیش بکەین، ناتوانین لە هەولێر ئیش بکەین، لە هەولێر مۆڵەت نادەن بە ئەنجامدانی خۆپیشاندانێکی هێمنانە، لە کوێ باسی هەڵبژاردنی بێخەوش دەکرێت تاوەکو باسی زۆرینە بکرێت، ئەم زۆرینەیەی کە ئەوان ناویان ناوە، مەعلومە چۆنە، ئێمە ڕێزی ئەو زۆرینەیەمان گرتوە لە پەرلەماندا تا ئەو کاتەی ئەو یاسایانەی ئەوان هێناویانە، پەیوەندی هەبوە بە ژیانی ڕۆژانە و شتی کورتخایەنەوە، ئێمە هەمویمان قبوڵ کردوە و لە هیچیان ڕەخنەمان نەگرتوە و ئەسڵەن بەیەك پەرلەمانتاری خۆمانمان نەوتوە کە ڕەخنە بگرێت یان ڕەزامەند بێت لە یاساکان و ویژدانی خۆیمان کردوە بە سەرپشك و وتومانە چی بە چاك دەزانن بۆ بەرژەوەندیی میللەتەکەمان بیکەن، بەڵام وەختێك ئەو قانونێك دەهێنێت کە پەیوەندیی بە خۆپیشاندانەوە هەیە مەنعی خۆپیشاندان دەکات و دەریش کەوت کە یاساکە بۆ قەدەغەکردنی خۆپیشاندن بو بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی خۆپیشاندان نەبو بە دەلیلی ئەوەی کە لە هەولێر چەندینجار خەڵك داوای کردوە بۆ ئەوەی مۆڵەتی خۆپیشاندان ئەنجام وەربگرن بەڵام ڕێگایان بە کەس نەداوە، وەختێك قانونێك دەهێنێت بۆ خۆپیشاندان، قانونێك دەهێنێت بۆ ئەوەی کە کۆمسیۆنی هەڵبژاردن لە کوردستاندا مۆنۆپۆل و قۆرخ بکات بۆ خۆی، وەختێك قانونێك دەهێنێت لەسەر دەزگای ئاسایش و ئەو دەزگایە وا لێدەکات کە تاهەتایە ببێت بە دەزگایەکی سەرکوتکەر بەدەست ئەوەوە،

وەختێك قانونێك دەهێنێت بۆ ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی كە بە عەقڵی خۆی دایڕشتوە یان وەختێك دەستورێكی لەو بابەتە دەهێنێت، بێگومان ئەم زۆرینەیە دەكەوێتە ژێر پرسیارەوە، حاڵی حازریش جارێكی كە ئەگەر هەڵبژاردنی لەو بابەتە بكرێت كە ساڵی رابردو كراوە، بێگومان دەكەوێتە ژێر پرسیارەوە، زۆرینەیەكی وا ناتوانێت سیستەمی سیاسی لە وڵاتێكدا دابنێت كە گرەنتی ئاسودەیی و ئاشتی كۆمەڵایەتی بكات لە ئایندەیەكی دور و لە ئایندەیەكی نزیكدا.

KNN: كەواتە مەترسیی ئێوە لە یاسای خۆپیشاندان یان كە ناوتان نابو یاسایەك بۆ قەدەغەكردنی خۆپیشاندان بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی كە لە هەولێر قەدەغە دەكرێت، لەجێی خۆیدا بو؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵی بێگومان، ئەوە سەلماندی كە ئەو مەترسیەی كاتی خۆی ئێمە و هاوڕێكانی ئێمە لە پەرلەمانی كوردستاندا هەیانبو، خەڵكیش لە شەقام بۆی هاتە سەر شەقام و دژی یاساكە راوەستان، مۆڵەت وەرگرتن بەمانای قەدەغەكردنی خۆپیشاندان بو، تەنیا رەنگە مۆڵەتیان بدەنێ لەو كاتانەی كە وەكو زەمانی پێشو خەڵك كۆبكەیتەوە بۆ پشتیوانیكردن لە حكومەت، بۆ پشتیوانیكردن لە حیزبی دەسەڵات، بۆ پشتیوانیكردن لە سەركردەكانی وڵات.

KNN: گلەیی ئەوەتان لێ دەكرێت كە ئێوە كێشەكان دەبەنە بەغدا و بێگانەمان پێ خۆش دەكەن یاخود بێگانە بە كورد خۆش دەكەن؟

نەوشیروان مستەفا: یەكەم لایەن كە كێشەكانی بردە بەغدا ئەوان بون، ئەوان بون كە نەیانهێشت ئێمە بەپێی ئیستحقاقی ئینتیخابی لە حكومەتی عێراقدا وەزارەت وەربگرین لە كاتێكدا كە ئێمە ماف ئەوەمان هەبو دو وەزارەتمان پێ بدرێت، ئەوان كێشەكانیان بردە بەغدا و وتیان نابێ وەزارەتیان بدرێتێ، سەرەڕای ئەوەش ئێمە هەمیشە باسی ئەوەمان كردوە كە ئەو كێشانەی لە كوردستاندا هەیە با لە كوردستان چارەسەری بكەین، كاتی خۆشی ئەوەمان پێ

وتون، بەلأم کێشەیەك کە ئەوان ئامادە نەبن لە کوردستان چارەسەری بکەین ئێمەش دەیبەینە بەغدا کە سەرۆکەکەی کوردە و چەندین وەزیری کوردی تێدایە و لە دادگای ئیتیحادیدا چەندین نوێنەری حیزبەکانی دەسەلأتی تێدایە، پەرلەمان کە ژمارەیەکی زۆر نوێنەری ئەوانی تیایە و سەرۆکەکەی بە دەنگی ئەوان بو بە سەرۆکی پەرلەمان، هەر ئەوانیش بون کە یەکەمجار کێشەی کوردستانیان بردە بەغدا و یەکپریزی کوردستانیان تێکدا، ئێستا ئەوان گلەیی چی لە ئێمە دەکەن، ئێمە تەنها بەرگریمان لە مافەکانی خەڵکی ولأتەکەمان کردوە، هەرکاتێك مەسەلەیەکی نەتەوەیی هاتە پێشەوە کە پەیوەندی بە چارەنوسی میللەتەکەمانەوە هەبێت بێگومان ئێمە رەنگە پێشنیاری بکەین ئیتر نازانین ئەوان پشتیوانیمان دەکەن یان نا لە هەمان کاتدا هەر کاتێك ئەوان پێشنیاریان کرد ئێمە پشتیوانی لێدەکەین.

KNN: یەکێك لەو باسانەی تر مەسەلەی هەڵبژاردنی پێشوەختە کە ئێوە لە بەیاننامە ٧ خاڵییەکەدا هێناتانە کایەوە، ئێستا باس لەوە دەکرێت ئێوە ترستان لە هەڵبژاردنی پێشوەخت هەیە، بۆچی؟

نەوشیروان مستەفا: لەراستیدا من لەگەڵ وشەی ترسدا نیم بەڵکو نیگەرانیمان هەیە، لەراستیدا ئێمە ئێستاش پێمان باشە هەڵبژاردنی پێشوەخت بکرێت بەلأم هەڵبژاردنی پێوەخت موستەلزەماتی هەیە، لە حاڵەتێکی وەکو ئێستادا کە بەم شێوازە دەستیان بەسەر هەولێر و دهۆکدا گرتوە هەڵبژاردنی پێشوەخت چ مانایەکی هەیە؟ هەڵبژاردنی پێشوەخت بەشێکە لە پاکێجێك، لەپێش هەمو شتێکدا گرنگترین شت ئەوەیە کە هێزە ئەمنییەکانی وەکو ئاسایش و پێشمەرگە و دژەتیرۆر بێلایەن بکرێن لەو کێبڕکێ سیاسیەی کە دەکەوێتە نێوان حیزبە سیاسییەکانەوە، ئەمانە دەسەلأتی ئەوەیان نەبێت دەست وەربدەنە کاروباری هەڵبژاردن و ببن بە لایەن و لایەنگری لایەنێك بکەن لەدژی لایەنێکی تر، لەلایەن ئێمەشەوە من دەمەوێت ئەو کەسانەی گاڵتە بە وەزیری بێلایەن دەکەن، دەمەوێ ئەوەیانە بیر بخەمەوە پێش چەند رۆژێك لە تورکیا کە بڕیاریان

داوه هەڵبـژاردنی گـشتی بکرێتـەوە، سێ وەزیـر لەوانـەی کـە لـە پـارتی داد و گەشـەپێدانی دەسـەڵاتدارن، هەرسـێکیان بـە ئـارەزوی خۆیـان وازیـان لـە پۆسـتەکانیان هێنـا و سـێ وەزیـری بێلایـەنیان دانـا کـە یـەکێکیان وەزیـری ناوخۆیە و یەکێکیان وەزیری دادە و ئەوی تریشیان وەزیری گەیاندنە، ئەم سێ وەزیرە بۆ ئەوەی کاریگەری لەسەر هەڵبژاردن دروست نەکەن هاتن سێ وەزیری بێلایەنیان دانا، کەواتە ئێمە ماڧ سروشتی خۆمانە بۆ ئەوەی هەڵبژاردنێکی بێخەوش بکرێت لایەنی کەمی نەزاهەت لە هەڵبژاردندا دەستەبەر بکرێت، ماڧ خۆمانـە داوا بکـەین چاوبخـشێنرێتەوە بـە کۆمـسیۆنی هەڵبژاردنـدا، چـاو بخـشێنرێتەوە بەوانـەی کـە لـە مەکتەبەکانـدا دادەنـرێن بـە بەڕێوەبـەری هەڵبژاردنـەکان، هێـزی پێـشمەرگە و هێـزی ئاسـایش بێلایـەن بکـرێن لـە هەڵبژاردنـدا، ئـەو کاتـە ئێمـە پێشوازی دەکـەین لـە هەڵبـژاردنی پێشوەخت و زۆریشمان پێ خۆش دەبێت.

KNN: زۆر باس لەوە دەکرێت لەم هەڵبژاردنانەدا ئەوەی کە خۆت ناوت ناوە دراو، زۆر کاریگەیی هەیە بۆ زۆر حاڵەت، مەسەلەی بودجەی حیزبەکان تاچەند یـەکێکی تـرە لـەو پێـشمەرجانەی کـە ئێـوە بـۆ هەڵبـژاردنی پێشوەخت دەچنە ناوی؟

نەوشیروان مستەفا: من حەزم نەدەکرد بچینە سەر مەسەلەی پارە چونکە رەنگە هەنـدێك جـار وا بـاس بکـەن کـە ئێمـە شـەڕەکەمان هـەموی لەسـەر پارەیـە، لـە بودجـەی رابـردودا ٩٠ ملیـار دینـاریـان دانـاوە بـۆ بودجـەی حیزبـەکان، بەشـی زۆری حیزبەکان کە باسی دەکەن یەکێتی و پارتییە ئەو ٩٢ ملیار دینارەیان بە کاملی خـواردوە و هـی تریـشیان خستوەتە سـەری، ئێمـە لـە مـانگی ٦ی سـاڵی رابردوەوە مانگی ٥٠٠ هەزار دۆلارمان دەدەنێ، بەمەرجێك یـەکێتی ٢٩ کورسـی هەیە واتە ٤ کورسی لە ئێمە زیاترە، پارتـی ٣٠ کورسـی هەیـە واتـە ٥ کورسـیی لـە ئێمـە زیـاترە، ئێمـە ٢٥ کورسـیمان هەیـە، ئـەو بـە ئاشـکرا ٩٠ ملیارەکـەیان بردوە، شتی تریشیان لەگەڵدا بردوە، خـوا دەیزانـێ ئەگـەر هەڵبژاردنی داهـاتو

بکرێت چەندێك لە بودجەی گشتی و لە دارایی گشتی دەبەن و خەرجی دەکەن بۆ بانگەشەی حیزبەکەی خۆیان و بۆ کڕینی ویژدانی خەڵك، لەم نابەرامبەرییەدا واتە لەم نەبونی هاوسەنگییەدا، ئەو لەلایەکەوە هەمو بودجەی حکومەتی بەدەستەوەیە، لەلایەکەوە ئاسایشی بەدەستەوەیە لەلایەکەوە هێزی پێشمەرگەی بەدەستەوەیە، لەلایەکەوە هەمو ئیدارەی حکومەتی بەدەستەوەیە، لەلایەکەوە راگەیاندنێکی زەبەلاحی بەدەستەوەیە، تۆ چۆن کە داوات لێ دەکات بۆ هەڵبژاردن باوەڕی پێدەکەیت کە ئەمە هەڵبژاردنێکی پاك و بێگەرد و ئازاد و دیموکراتە.

KNN: دوای ئەوەی داواتان کرد کە ئەم حکومەتە هەڵبوەشێتەوە، حکومەت جارێکی تر لە پەرلەمان متمانەی وەرگرتوە، را و بۆچونی ئێوە چیە؟

نەوشیروان مستەفا: لەبەر هەمان هۆ کاتی خۆی ئێمە داوامان کرد وتمان ئەو پەرلەمانە هەڵبوەشێتەوە، چونکە ئەو پەرلەمانە بە ئیرادەی حیزبی ئیش دەکات، پەرلەمانتارەکانی یەکێتی و پارتی، پێش ئەوەی ویژد نی خۆیان بکەن بە سەرپشك، فەرمانی حیزبەکەیان جێبەجێ دەکەن هەر لەبەر ئەوە بو کە ئێمە پێمان وابو ئەو پەرلەمانە ئیفلیجە و ئیشی لەبەر ناڕوات، هەر ئەوەیە کە دەست هەڵبڕێت بۆ کاروبارەکانی حکومەت، بۆیە داوامان هەڵبژاردنی پێشوەخت بکرێت و ئەو پەرلەمانە هەڵبوەشێتەوە:

KNN: ئێوە لەگەڵ کەسایەتییەکانی ئەم حکومەتە، زۆر جار باس لەوە دەکرێت کە کێشەکان بەشەخسی یاخود شەخسەنە دەکرێن، لەگەڵ کەسایەتییەکاندا هیچ جۆرە کێشەیەکتان هەیە؟

نەوشیروان مستەفا: ئەو کەسانەی کە ئێستا لە دامودەزگاکانی یەکێتی و پارتیدا کاردەکەن ئەو کەسانەی کە لە ئەنجومەنی وەزیراندا کار دەکەن، ئەوانەی کاربەدەستن لەم وڵاتەدا، وەکو شەخس ئێمە بەرامبەر بە هیچ کامێکیان هیچ جۆرە کێشەیەکمان نیە، ئەوان دەیانەوێت زۆربەی کێشەکان بکەن بە کێشەی کەس، ئێمە کێشەمان لەگەڵ سیستەمی بەڕێوەبردندا هەیە،

کێشەمان لەگەڵ جۆری بەڕێوەبردنی وڵاتدا هەیە کێشەمان لەگەڵ کەسدا نیە، لەجێگەی دکتۆر بەرهەم ئەگەر جەنابیشت بیت هەر هەمان هەڵوێستمان دەبێت، هەر کەسێکی کە بێت هەر هەمان هەڵوێستمان دەبێت، کێشەکە ئەوە نیە ئێمە رقمان لە کاك بەرهەمە یان رقمان لە کاك ئازاد بەرواریە یان رقمان لە کەمال کەرکوکییە، یان رقمان لە دکتۆر ئەرسەلان بایزە، ئێمە رقمان لە هیچ کەسێك نیە و بەشتی شەخسی ئیش ناکەین بەڵکو ئێمە لەگەڵ کۆی سیستەمەکە ناکۆکین، کە دەڵێین لەگەڵ کۆی سیستەمەکە ناکۆکین مەبەستمان ئەوە نیە کە دەمانەوێت کوردستان پڕبێت لە پشێوی و ئاژاوە و حکومەت و پەرلەمان و دەسەڵاتی جێبەجێکردن و دادوەریی تیا نەمێنێت، نەخێر ئێمە پێمان وایە ئەم دەسەڵاتە خەلەلی تیایە دەبێت بیگۆڕین و خەلەلەکانی چارەسەر بکەین و دەسەڵاتێك بێتە سەر حوکم کە بتوانێت کاروبارەکانی خەڵك جێبەجێ بکات، بەلایەنی کەمەوە بتوانێت عەدالەتی کۆمەڵایەتی بۆ خەڵك دابین بکات، دەسەڵاتێك بێت کە بتوانێت لە ئاستی خواستەکانی خەڵکدا بێت، ئێمە لەگەڵ هیچ کەسێکدا هیچ جۆرە کێشەیەکمان نیە، بەپێچەوانەوە پێش ئەوەی ئەم بزوتنەوەیە بێتە کایەوە ئێمە لەگەڵ زۆر لەوانە هاوڕێیەتی و دۆستایەتیمان هەبوە و پێکەوە چوین بۆ سەیران و سەفەری وڵاتان و دانیشتوین، لەمەودوایش ئامادەین بۆ هەمان شت، لەگەڵ شەخسی ئەوانە هیچمان نیە بەڵکو لەگەڵ حکومەتەکەیاندا ناکۆکیمان هەیە.

KNN: دەوترێت لە کوردستان نائارامی هەیە و دەستی ئێران و سوپای قودس لەپێشت خۆپیشاندانەکانەوەیە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڕاستی جێگەی شەرمە ئەگەر کەسێك لە سەرکردایەتی سیاسی یەکێك لە حیزبەکان بێت و قسەی وا بکات، ئەوانەی لەسەر شەقامەکانن نەوەی دوای راپەڕینن، بەشی هەرەزۆریان لە تەمەنێکی گەنجیدان، هەرگیز نە لە ئێران ژیاون نە لە ئۆردوگاکانی ئێران، نە موچەخۆری ئێران نە پارەیان لە ئێران وەرگرتوە، بە دەگمەن رەنگە کەسێکیشیان تیا بێت کە هەندێك

وشەی فارسی تێبگات، هەر بەراستی شەرمە تۆمەتبارکردنی خۆپیشاندران بەوەی کە دەستی ئێران یاخود سوپای قودسی ئێرانیان لەپشتەوەیە.

KNN:یەکێکی تر لەو رەخنانەی کە لە خۆپیشاندانەکان دەگیرێت، ئەوەیە کە وەبەرهێنان و بازاڕی وەستاندوە؟

نەوشیروان مستەفا: ئەوە درۆیەکی ئابورییە دەیکەن، ئەویش ئەوەیە کە باسی ئەوە دەکەن گوایە ئەوەندە ملیار دۆلار لە کوردستاندا ئیستسمار کراوە یاخود بە دەستەواژەی خۆیان وەبەرهاتوە، لە راستیدا وەبەرهێنان لە کوردستاندا بێجگە لە گرێبەستی نەوتی کە کەس نازانێت چۆنە و چۆن نیە و لەگەڵ کێیە، چونکە باس نەکراوە نە لە پەرلەمان و نە لە میدیا نە لە هیچ جێگیایەکدا، من لەو دامودەزگایانەی کە بۆ وەبەرهێنان ئیش دەکەن دەپرسم بزانم چەند ملیۆن دۆلاری ئەمەریکی بە پارەی تورکی یان بە پارەی ئێرانی یان بە پارەی سوری هاتوەتە ناو هەرێمی کوردستانەوە و وەبەرهێنان دەکات و پاش پێنج ساڵی تر پارەکەی دەربێنێتەوە و قازانج بکات، راستە لە کوردستاندا جوڵانێك هەیە لە بواری کەرتی خانوبەرە و باڵەخانە کە ئەمانە زۆربەی لەلایەن کەرتی تایبەتەوە ئەنجام دەدرێت و بەشی زۆریان هی خاوەن سەرمایە کوردەکانن چونکە جگە لە خانوبەرە هیچ بوارێکی تری وەبەرهێنان نیە، لەکوردستاندا سەیری کەرتی کشتوکاڵ بکە، سەیری کەرتی پیشەسازی بکە، سەیری کەرتی گەشتیاری بکە، سەیری کەرتی تەندروستی بکە، ئەم کەرتانە شتێکی وای تیا نیە وەبەرهێنانی تیا بێت و ئەوەی کە ئەوان باسی دەکەن کە دەڵێن وەبەرهێنان راوەستاوە هیچ بنەمایەکی راستی نیە چونکە لە بنەڕەتدا وەبەرهێنانی بێگانە لە کوردستاندا نیە، ئەوەی کە هەیە کۆمەڵێك کۆمپانیای بیانی هەیە هاتون لێرە قۆنتەرات وەردەگرن، کاتێکیش قۆنتەرات وەردەگرن پارە وەردەگرن و پارەکە دەبەنەوە وڵاتی خۆیان واتا پارەیان لە وڵاتی خۆیانەوە نەهێناوە لە کوردستاندا کاری وەبەرهێنانی پێوە بکەن و خەڵك ئیشی پێوە بکات، بەڵکو بەپێچەوانەوە لەو پارانەی کە لێرە دانراوە بۆ ئاوەدانکردنەوە و بۆ ئیش و کارەکان، ئەوان دێن بە

قۆنتەرات وەری دەگرن و پارەکە دەگوێزنەوە بۆ وڵاتەکانی خۆیان، ئەگینا کە دەڵێن وەبەرهێنان راوەستاوە، وەبەرهێنانی کوێ راوەستاوە؟ وەبەرهێنانی گرێبەستە نەوتییەکان راوەستاوە؟ باپێمان بڵێن. هەر دەڵێن بازاڕ وەستاوە، باپێمان بڵێن بازاڕی کوێ وەستاوە؟

KNN: لەماوەی خۆپیشاندانەکاندا یەکێکی تر لەو حاڵەتانەی باس دەکرێت ئەوەیە کە گوایە چەند هەڵسوڕاوێکی ئێوە حەرەمی زانکۆیان شکاندوە؟

نەوشیروان مستەفا: من جارێکی تریش باسی ئەوەم کردوە کە بەداخەوە بیری سیاسی هەندێ لەمانە زۆر زۆر دواکەوتوە، نازانن حەرەمی زانکۆ مانای چی، رێزگرتنی حەرەمی زانکۆ و شکاندنی حەرەمی زانکۆ، لە هەمان کاتیشدا خۆیان گێل دەکەن لە مەسەلەی دەستێوەردانی حیزبی لە کاروباری زانکۆ، عادەتەن لە هەمو وڵاتێکدا چەند شوێنێك هەیە کە جۆرێك لە حورمەت و رێزی هەیە ئەوانیش بریتین لە پەرستگاکان و دادگا و پەرلەمان و زانکۆ و پەیانگاکان کە ئەمانە جۆرێك لە حورمەتیان هەیە، ئەو حورمەتە بریتییە لەوەی کە هێزی چەکدار بۆی نیە بچێتە ناو ئەم شوێنانەوە، تەنانەت لە ئێران نەریتێکی زۆر کۆنی بەستنشینی هەیە، هەندێ شوێن هەیە لەوێ بەستی پێ دەڵێن هەندێ جار ئەو تاوانبارانەی مەحکومن بە سزای لەسێدارەدان رایانکردوە چونەتە ناو ئەو بەستانەوە لەبەر حورمەتی شوێنەکە هێزی چەکدار نەچوە پەلاماری بدات و بەزۆر دەری بهێنێتە دەرەوە، حورمەت لەمەدایە، ئێمە پێمان وایە کە لە کوردستانیش دەبێت حەرەمی پەرلەمان، حەرەمی مزگەوتەکان، حەرەمی دادگا، ئەمانە هەمویان رێز و حورمەتێکی تایبەتیان هەبێت کە هەرگیز هێزی چەکدار یاخود بەرپرس بە پاسەوان و چەکەوە بۆی نەبێت بچێتە ناوەوە و بۆیان نەبێت کەس لەوێ بە چەك دەربێننە دەرەوە، ئەمەیە راگرتنی حورمەتی زانکۆ و پەیمانگاکان، دەستێوەردانیش بریتییە لەوەی کە تۆ سەرۆکی زانکۆی بە ئارەزوی خۆت لەسەر بنەمای ئینتیمای حیزبی دایبنێیت و بیگۆڕیت، راگری زانکۆ لەسەر بنەمای ئینتیمای حیزبی دابنێیت و بیگۆڕیت، سەرۆکی بەشەکان

به هەمان شێوە، بەگوێرەی ئینتیمای حیزبی قبوڵ خاس بۆ کەسانێك هەبێت بۆ خوێندنی ماستەر و دکتۆرا، بە جوملە شەهادەی دکتۆرا بدەیت بە لایەنگرەکانی خۆت بەبێ ئەوەی کە موستەحەق بن یاخود پلەی زانستییان شایستەی ئەوە بێت، ئەمە دەستێوەرۆدانە، کردنەوەی بارەگای حیزب لەناو زانکۆکاندا دەستێوەردانە، دەستێوەردان ئەوەیە یەکێتی قوتابیان و کۆمەڵەی خوێندکاران کاتێك دەچن شت دەسەپێنن بەسەر مامۆستا و خوێندکارەکاندا یان کاتێك لیژنەی ناوچەی پارتی و کۆمیتەی یەکێتی دەچن لە زانکۆکاندا شت دەسەپێنن ئەوە دەستێوەردانە، ئەگینا ٣ کەس کە هەرسێکیان پێشتر خۆیان مامۆستای زانکۆ بون، دوانیان مامۆستای یاسا بوە، ئێستا هەرسێکیان پەرلەمانتارن لەسەر داوای خوێندکارانی زانکۆی سلێمانی، چونەتە ناو حەوشەی زانکۆی سلێمانییەوە، لەسەر داوای خوێندکارەکان قسەیان بۆ کردون، ئەمە بۆچی شکاندنی حەرەمی زانکۆ بێت؟، یان ئەمە بۆچی دەستێوردانی حیزبی بێت لە کاروباری زانکۆکاندا؟

KNN: دەوترێت کە پرۆژەی هەرێمێکی سەربەخۆتان هەیە بۆ سلێمانی، بەمانایەکی ئێوەی پرۆژەی فیدرالیەتی پارێزگاکانتان هەیە؟

نەوشیروان مستەفا: بێگومان جاری تریش ئێمە رامانگەیاندوە کە ئەوە راست نیە، ئەوە درۆیەکی شاخدارە، ئەگەر ئێمە شتی وامان بکردایە بەراستی نە لە یەکێتی دەترسین نە لە پارتی، بیروبۆچونەکانی خۆمان بەئاشکرا وتوە، بەڵام ئێمە پێمان وایە ئیدارەی هاوچەرخ پێویستی بە لامەرکەزیەتە، لەماوەی ١٠ ساڵی رابردودا ئێمە زۆرجار باسی ئەوەمان کردوە کە لە هەرێمی کوردستاندا دوئیدارەیی هەیە، دوپێشمەرگەیی هەیە، دوئاسایشی هەیە، دوپەروەردەیی هەیە، دوڕویی هەیە، دوزمانی و چەندین شتی تر هەیە، بێگومان یەکخستنی هەرێمی کوردستان زۆر زۆر گرنکە و ئێمە هەرێمی کوردستانمان دابەش نەکردوە، ئەوەی کە دابەشی کردوە لایەنی ترە کە نەیهێشتوە تێکەڵاوی لەنێوان زانکۆی سەلاحەدین و زانکۆی دهۆك و زانکۆی سلێمانیدا هەبێت، کە

نەیهێشتوە تێکەڵاوی لەنێوان بازڕی هەولێر و سلێمانی و دهۆکدا هەبێت، کە نەیهێشتوە تێکەڵاوی لەنێوان ئیدارەکانی ئەم ناوچانەدا هەبێت، کە نەیهێشتوە ئاسایش و پێشمەرگە تێکەڵاو بکرێت، ئەوان هەرێمی کوردستانیان بەعەمەلی دابەشکردوە کە خراپترە لە فیدرالی، ئێمە بۆچونمان چیە؟ من بۆچونی خۆمم نەشاردوەتەوە و برادەرەکانیشم بەهەمان شێوە بۆچونی خۆیان نەشاردوەتەوە، بۆ پێکهێنانی ئیدارەیەکی هاوچەرخانە ئێمە پێمان وایە لە هەرێمی کوردستاندا سێ دەسەلات هەیە، دەسەلاتی یاسادانان و دەسەلاتی و دادوەری و دەسەلاتی جێبەجێکردن، دەسەلاتی یاسادانان کە بریتییە لە پەرلەمان، ئێمە هەمومان لایەنگری ئەوەیەن کە لە کوردستانی عێراقدا یەك پەرلەمان هەبێت، یەك یاسای هەڵبژاردن هەبێت، بە یەك جۆر پەرلەمان دروست بکرێت و پەرلەمانێکی کارا بێت واتە پەرلەمانێك بێت کە بتوانێت چاودێری حکومەت بکات و بتوانێت یاسا دابنێت، یاسا دابنێت نەك بە گوێرەی ئیرادە و بەپێی پێویستییەکانی حیزب، بەڵکو بەگوێرەی پێداویستییەکانی میللەتەکەمان، ئێمە لایەنگری ئەوەین پەرلەمانێکی وا هەبێت بۆ هەمو هەرێمی کوردستان، دەسەلاتێکی دادوەری هەبێت ئەویش کە بریتییە لە دادگاکان بۆ هەمو هەرێمی کوردستان یەك جۆرە یاسا و حاکمەکان بەیەك جۆر تەعین بکرێن و لەسەر بنەمای پیشەیی و سەربەخۆیی، بۆیە ئێمە لایەنگری ئەوەین کە لە کوردستانی عێراقدا یەك دەسەلاتی دادوەری هەبێت، بەلام کە دێیتە سەر دەسەلاتی جێبەجێکردن، وەکو چۆن لە دنیادا باسی دابەشکردنی سەروەت و دەسەلات دەکرێت، پێویستە لەنێوان حکومەتەکەی هەولێر و لەنێوان ئەنجومەنی پارێزگاکاندا جۆرێك لە دابەشکردنی دەسەلات هەبێت، حکومەتی هەرێم واتە ئەنجومەنی وەزیران کە دەسەلاتی جێبەجێکردنە، ئەوان بەرپرسن لەوەی پەیوەندی نێوان هەرێم و بەغدا رێکبخەن، ئەوان بەرپرسن لەوەی بودجەی گشتی رێکبخەن، بەرپرسن لەوەی کە هێزی ئاسایش و پێشمەرگە یەکبخەن، بەلام لە هەمان کاتدا پێویستە ئەنجومەنی پارێزگاکان جۆرێك لە دەسەلاتیان

هەبێت کە بریتییە لە دەسەڵاتی کارگێڕی، لە دەسەڵاتی جێبەجێکردن، تەنانەت لە هەندێك وڵاتی دنیا شارەوانییەکان خۆیان پەروەردە بەڕێوە دەبەن و پۆلیسی ناوخۆییان هەیە و پۆلیسی هاتوچۆیان هەیە و گومرگ دادەنێن، واتە خۆ کفر نابێت ئەگەر ئەنجومەنی وەزیران بەشێك لە دەسەڵاتەکانی خۆی واز لێ بێنێت و بیدات بە ئەنجومەنی پارێزگاکان، با پلانی مەرکەزی حکومەتی هەرێم دای بنێت، بەڵام جێبەجێکردنی پرۆژەی شەقامێك یان مەکتەبێك یان نەخۆشخانەیەك، دامەرزاندنی فەراشێك یان مجەورێك یان مامۆستا یان ئەندازیارێك بۆچی بەدەست هەولێر بێت؟، ئەی بۆ بەدەست ئەنجومەنی پارێزگا خۆی نەبێت؟، ئێمە باسی ئەمە دەکەین، ئەمەش مەترسی ئەوە دروست دەکات کە ئەو مەرکەزییەتەی ئەوان دەیانەوێت هەیانبێت بۆ ئەوەی دەست بنێنە بینی خەڵك، واتا فەراشێك لە خانەقین، فەراشێك لە کفری، فەراشێك لە زاخۆ ویستی دابمەزرێت هەر دەبێت بڕواتەوە بۆ هەولێر و بچێتەوە بەردەستی ئەو بۆ ئەوەی تەزکییەی حیزبی پێ بنوسێت و بیکات بە حیزبی ئینجا دایبمەزرێنێت، بێگومان ئێمە ئەمەمان ناوێت.

KNN: دەوترێت ئەگەر هەرێمی کوردستان بەدەست ئێوەوە بێت، رژێمێکی عەلمانی وا دادەمەزرێنن کە جێگەی ئیسلامییەکانی تیادا نابێتەوە؟

نەوشیروان مستەفا: جارێ لە هەلومەرجی وەك ئێستادا بەهیچ جۆرێك هەرێمی کوردستان بەدەست ئێمەوە نابێت بە تەنها، ئەوپەڕەکەی ئێمە بەشدار دەبین لە دەسەڵاتدا، بێجگە لەوە جوڵانەوە سیاسییەکانی کە ئێستا لە کوردستانی عێراقدا هەن، هەمویان جوڵانەوەی رەسەنن لەناوجەرگەی میللەتەکەمانەوە هەڵقوڵاون، بە تەجروبە دەرکەوت ئەو زەمانەی کە شەڕیان لەگەڵ کردن و لە دەرەوەی پرۆسەی سیاسی بون چۆن بون، ئێستاش کە هاتونەتە ناو پرۆسەی سیاسییەوە چ رۆڵێکی ئیجابی دەبینن لە باشکردنی کۆمەڵگای کوردیدا، لەبەرئەوە ئەو قسەیەی کە کردویانە پێم وایە قسەیەکی راست نیە، ئێمە لایەنگری پلورالیزمین، لایەنگری رەنگاورەنگی پێکهاتەکانین، وەکو چۆن ئێمە

**لە کۆنەوە میللەتەکەمان قبوڵی کردوە کە نەتەوەی جیاواز و دینی جیاواز و مەزەەبی جیاواز لەناوماندا بونی هەبێت، بەهەمان شێوە دەبێ بیروباوەڕی جیاواز و حیزبی جیاواز و جوڵانەوەی سیاسیی جیاوازیش قبوڵ بکەین، فرەیی بەم مانایە دێت، ئێمەش فرەییمان قبوڵە.**

**KNN: لە ڕاگەیاندنی حیزبە نەیارەکانتانەوە ئەوە باس کرا کە گوایە ئێوە دەزگایەکی نهێنی لەشێوەی پاراستن و زانیاریدا دادامەزرێنن، شتی وا هەیە؟**

**نەوشیروان مستەفا: نەخێر ئەمە بە تەواوەتی درۆیە، بزوتنەوەی گۆڕان لە ماوەی ڕابردودا کۆمەڵێك دامەزراوە و دەزگای دروست کردوە، کە پێم وایە زۆر جیاوازە لە دامەزراوەی حیزبەکان، بۆنمونە ئێمە دەزگایەکی تایبەتمان هەیە بەناوی دامەزراوەی هەڵبژاردن، ڕەنگە حیزبەکانی تریش لەم دەزگایەیان هەبێت، ئێمە چەند ژورێکمان دروست کردوە، یەکێك لەوانە بەناوی ژوری ڕەوەندی کوردییەوەیە کە سەرپەرشتی کاروبارەکانی دەرەوە دەکات، ژورێکمان هەیە بەناوی ژوری ڕۆژنامەوانییەوە، ژورێکمان هەیە بەناوی ژوری داراییەوە، ژورێکمان هەیە پڕۆژەیاسامان بۆ ئامادە دەکات،هەمو ئەو قانونانەی ئێمە دەمانەوێت هەمواریان بکەن ئێمە کۆمەڵێك حاکمی بەتوانا و شارەزای قانونیمان هەیە کە ئەوان بەناوی ژوری قانونییەوە ئەو کارانەمان بۆ جێبەجێ دەکەن، ناوەندێکمان هەیە بەناوی توێژینەوەی سیاسییەوە کە کۆمەڵێك مامۆستا و پسپۆڕی زانکۆکان بەڕێوەی دەبەن، ژوری پەیوەندی سیاسی و پەیوەندی دبلۆماسیمان هەیە، ئەم ژورانە بەکۆمەڵ دەتوانین باسی ئەوە بکەین بڵێین سەرکردایەتی بزوتنەوەی گۆڕان پێکدەهێن، ئەو ژورەی یاخود ئەو ناوەندەی کە ئەوان باسی دەکەن دەڵێن ئیستخباراتی عەسکەرییە یان ئیستخباراتە و بۆ کاری هەواڵگری دروستمان کردوە، لە ڕاستیدا ئێمە هیچ دەزگایەکمان نیە بۆ جاسوسی بەڵکو ئەوان دەزگای جاسوسییان هەیە، ئەوانەی کە ئەو هەواڵەیان بڵاو کردوەتەوە لێرەوە من دەعوەتیان دەکەم با تەشریف بهێنن ئەو شوێنە ببینن و لەگەڵ ئەو مامۆستا بەڕێزانەی کە ئێستا لەو ناوەندە خەریکی لێکۆڵینەوەی سیاسین، بێن گفتوگۆ و قسە بکەن بزانن ئەمە سینکتانکە بە مانا زانستییەکەی ئەمە شوێنی بیرکردنەوە و داڕشتنەوەی**

فیکره یاخود ئەمە دەزگای جاسوسییە؟ جارێکی تر من لێرەوە دەعوەتیان دەکەم با تەشریف بێنن بۆ ئەوەی بەچاوی خۆیان ببینن بزانن چیە و چی نیە، ئێمە شانازییان پێوە دەکەین چونکە لە زۆربەی ئەو کێشانەی کە لە کوردستانی عێراقدا دێتە پێشەوە پرسیان پێ دەکەین و ئەوان وەرەقەی زۆر باش و رێکوپێکمان بۆ ئامادە دەکەن کە یارمەتییان داوین بۆ ئەوەی لەبیرکردنەوەی سیاسیماندا کاروبارەکان بەرێوە بەرین.

KNN: یەکێك لەو حاڵەتانەی لە ئێستادا باس دەکرێت بۆ تێپەڕاندنی یاخود بۆ چالاککردنی گفتوگۆی سیاسی لە کوردستاندا، هێنانەپێشەوەی گفتوگۆی سێقۆڵییە، مەبەست لە ئێوە و یەکێتی و پارتی، ئێوە ئامادەن بۆ دانیشتنی سێقۆڵی؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵی ئامادەین.

KNN: ئەگەر لەئاستی سێ سەرکردەکەشدا بێت ئامادەن؟

نەوشیروان مستەفا: خەڵك چاوەڕوانییەکی گەورەی لەو کۆبونەوانە هەیە، ئێمە نامانەوێت خەڵك توشی بێئومێدی بکەین، ناشمانەوێت روزەرد بین لەبەردەمی لایەنگر و دۆستەکانی خۆماندا لەبەرئەوە پێمان باشە پێش ئەوەی کۆبونەوەی پرۆتۆکۆلیی لەو بابەتە ببێت، دابنیشین بۆ ئەوەی زەمینە خۆش بکەین چۆن دەتوانین تەفاهوم بکەین.

KNN: واتا چەند مەرجێکتان هەیە؟

نەوشیروان مستەفا: هیچ مەرجێمان نیە، زەمینەسازیمان دەوێت بۆ ئەوەی کۆبونەوەیەکی سەرکەوتو بێت بەجۆرێکی وا کە لە کۆبونەوەکە هاتینە دەرەوە لەبەردەمی میللەتەکەی خۆماندا بە سەربەرزیەوە بڵێین بەڵێ لەسەر ئەم شتانە رێککەوتوین و خەڵکەکە پێی خۆش بێت و پێی رازی بێت نەك خەڵکەکە بڵێت وەڵا ئەم کۆبونەوەیەش وەکو کۆبونەوەکانی تر وابو کە ئەنجامی وای نەبو، نەخێر ئێمە پێشمەرجمان نیە بەڵکو دەمانەوێت ئامادەکاری و زەمینەسازی بۆ بکرێت و ئەو ناکۆکییانەی کە لە نێوانماندایە پێشتر هەوڵ بدەین جۆرێك لە تەفاهوم و رێگای هاوبەشی بۆ بدۆزینەوە.

# پشتیوانی نەوەی نوێ دەکەین

سازدانی : هۆشیار عەبدوڵا

لە دیمانەیەکیدا لەگەڵ بەرنامەی روبەڕو نەوشیروان مستەفا باس لە دواین روداوەکانی هەرێمی کودستان و خۆپیشاندانەکان دەکات، هاوکات باس لە بەرنامە و پرۆژەی بزوتنەوەی گۆڕان دەکات بۆ ئەم قۆناغەی ئێستا و رایدەگەیەنێت: " لەراستیدا ئەم خۆپیشاندانانە نە دەستی ئێرانیان لەپشتە نە دەستی شۆڤێنییەکانی عەرەبیان لەپشتە، نەدەستی ئێمەیان لەپشتە، بەڵکو ئەمە کۆمەڵێك خەڵکن داواکارییەکی رەوایان هەیە کە پێویستە ئەم حکومەتە و حیزبە دەسەڵاتدارەکان بەدەنگیانەوە بچن، لەباتی ئەوەی تۆمەتی ناڕەوایان بخەنەپاڵ هەقی وایە داواکارییەکانیان جێبەجێ بکەن".

KNN: با لە بەیاننامەکەی ١٧ی مانگەوە دەست پێبکەین کە تیایدا باستان لەوە کردوە رێگا نەدرێت کاری گێرەشێوێنی ئەنجام بدرێت، ئەوەش وا لێکدرایەوە کە ئێوە بە خۆپیشاندەران دەڵێن گێرشێوێن؟

نەوشیروان مستەفا: بێگومان ئێمە بە خۆپیشاندەران ناڵێین گێرەشێوێن، هەرگیز وایان پێ ناڵێین، رەنگە لەناو چەند هەزار خۆپیشاندەرێکدا چەند کەسێکی تیا بێت کە بیانەوێت گێرەشێوێنی بکەن، بەڵام ئێمە هەر لەسەرەتاوە کاتێك کە یاسای خۆپیشاندان هاتە ناو پەرلەمانەوە، هەمو کەس دەزانێت ئێمە چۆن داکۆکیمان کردوە لەوەی کە یاسایەکی سەردەمییانەی هاوچەرخ بۆ خۆپیشاندان دابنرێت، ئێمە پێمان وابە خۆپیشاندان مافێکی ئاسایی هەمو هاوڵاتیانە، یەکێکە لە شێوازەکانی دەربڕینی ناڕەزایی، ئەو خۆپیشاندانەی لەو رۆژەدا ئەنجامدرا، ئێمە لەسەر کاتەکەی رازی نەبوین، پێمان باش نەبو لەوکاتەدا و لەو رۆژەدا خۆپیشاندان بکرێت، هەروەها ئێمە لە پێکهاتەی

بەڕێوەبردنی خۆپیشاندانەکەدا بەشدار نەبوین، بەڵام ئەو ڕونکردنەوەیەی ئێمە دەرمانکردوە هی کاتێکە کە هێشتا تەقە نەبوە و هێشتا خوێنی تیا نەڕژاوە، بەڵام کاتێك کە زانیاریمان پێگەیشت لەسەر ئەوەی کە جارێکی تر تەقە لە خۆپیشاندەران کراوە و خوێنی تیا ڕژاوە و گەنجی کوردی تیا کوژراوە، ئێمە یەکەم شت کە کردمان بەیاننامەکەمان کێشایەوە، دوەم شت کە کردمان ڕومالّی هەمو ڕوداوەکانمان کرد، ئێمە کەوتینە نێوان دو شتەوە، لەنێوان ئەوەی کە ئێمە بەرگری لە بارەگای حیزبێك بکەین، بەرگی لە کورسی و قەنەفە و مێز بکەین، یاخود بەرگری لە خوێنی گەنجی کورد بکەین، بەرگری لە ژیانی هاولاّیی کورد بکەین، بێگومان ئێمە خوێنی گەنجی کورد و ژیانی هاولاّتی کوردمان هەڵبژارد، لەبەرئەوە لە نێوان بەرد و گوللەدا ئێمە بەردمان هەڵبژارد و کەوتینە ئەوەی یەکەم بەیاننامەکەمان کێشایەوە و دوەم ڕومالّی هەمو ڕوداوەکانمان بەفراوانی کرد لە ڕادیۆ و لە تەلەفزیۆن و لە سەرجەم دەزگاکانی ڕاگەیاندندا، سەرەڕای ئەوەش ئێمە کەوتینە دیفاعێکی سیاسی، دیفاعێکی قانونی، دیفاعێکی ئیعلامی لە خۆپیشاندەرەکان و ماف خۆپیشاندەرەکان، بۆ ئەوەی هەقیان نەفەوێت لە ئەنجامی ئەمانەش ئێوە خۆتان دەزانن هێزێکی زۆر گەورە هاتنە سەرمان.

KNN: بابێینە سەر خۆپیشاندانەکان، کێن ئەوانەی لەسەر جادەن؟ یاخود خۆپیشاندەران کێن؟

نەوشیروان مستەفا: ئەوانەی کە لەسەر جادەن لە ڕاستیدا ئەوانە نەوەی دوای ڕاپەڕینن، ئەوانەی کە لەسەر جادەن ئێستا خۆپیشاندان دەکەن ئەوانە نەوەیەکن کە پێیان وایە نەوەی ئێمە واتە نەوەی پێش ڕاپەڕین، ئەو نەوەیەی کە لە خەباتی ژێرزەمینیدا کاری کردوە، کە لە شاخدا کاری کردوە، ئێستا ئیحتیکاری هەمو جومگەکانی دەسەلاّتی حکومڕانی و حیزبایەتییان لە کوردستاندا کردوە، ئەو نەوەیەن کە خۆیان وا تەسەور دەکەن کە مەحرومن لە بەشداریکردن لە ژیانی سیاسی و کۆمەلاّیەتی و ئابوریدا، نەوەی نوێن،

جیاوازی ئەو نەوەیە لەگەڵ نەوەی ئێمەدا ئەوەیە کە لە زەمانی ئێمەدا نە سەتەلایت هەبوە نە تەلەفزیۆن هەبوە، نە مۆبایل هەبوە نە ئیمەیڵ هەبوە نە ئینتەرنێت هەبوە، ئەمانە هیچیان نەبون، ئەمانە نەوەیەکن کەوتونەتە ژێر کاریگەریی تەکنەلۆجیای دنیا و شۆڕشی تەکنەلۆجیای نوێوە، نمونەیەك: لەدوای راپەڕینەوە بەگوێرەی هەندێك لەو سەرژمێرییانەی کە ئێمە لەلامانە، زیاتر لە ٥٠ هەزار گەنجی کورد خوێندنی بالآیان تەواو کردوە لە زانکۆکان و پەیمانگاکانی کوردستانی عێراقدا، لەو ٥٠ هەزار کەسە ئەگەر بێیت حساب بکەیت بڕواناکەم ٥٠ کەسیان توانیبێتی بگاتە ناوەندەکانی بڕیاردان چ لە سەرکردایەتی حیزبەکان و چ لە حکومەتدا، سەیری مەکتەبی سیاسی حیزبەکان، سەرکردایەتی حیزبەکان، بەرپرسی لقەکان، بەرپرسی مەڵبەندەکان، وەزیرەکان، بریکاری وەزیرەکان، بەڕێوەبەرە گشتییەکان، بالێۆز و کونسوڵەکان، لە کێ هەڵبژێردراون؟ لە نەوەیەك هەڵبژێردراون کە نەوەی پێش راپەڕینن، نەوەی دوای راپەڕین خۆی بە خاوەن دەزانێت، راستە فریای ئەوە نەکەوتوە پێشمەرگایەتی بکات، فریای ئەوە نەکەوتوە لە شەکەوتدا بژی، فریای ئەوە نەکەوتوە خەباتی ژێرزەمینی بکات، بەلاّم بە مافی سروشتی خۆی دەزانێت کە لە دامودەزگاکانی ئێستای هەرێمی کوردستان چ دامودەزگا حیزبییەکان بێت چ دامودەزگا حکومەتییەکان بێت بەشی خۆی هەبێت، ئەمە ئەو نەوەیەی دوای راپەڕینە کە هەست بەوە دەکات بەشێکە لە بەشداریکردن لە دەسەڵاتی سایسیدا لە ژیانی ئابوریدا لە ژیانی رۆشنبیریدا دەیەوێ بەشی خۆی وەربگرێت و مافی خۆشیەتی، بۆیە ئێمە پشتیوانی لێ دەکەین.

KNN: دەوترێت ئەو خۆپیشاندانانە دەستی دەرەکی لە پشتەوەیە؟

نەوشیروان مستەفا: ئەمە زۆر لەملا و لەولا ئەوترێ، ئەمە نەك هەر دەسەڵاتداری کوردی گەلێك دەسەلاّتداری تر لە دنیادا ئەم قسە بێمانایەیان کردوە، ئەگەر باسی دەستی دەرەکی دەکەن هەندێکجار باسی ئەوە دەکەن کە دەستی ئێرانی تیایە، هەمو کەسێك دەزانێت کە ئێرانییەکان چی دەستێکیان

هەبو لە دروستکردنی ئەم حکومەتەی کە ئێستا لە بەغدا حکومڕانی دەکات، چەند دەستیان هەبو لەوەی کە هەندێ کەس و هەندێ حیزب پلەوپایەی بەرز لە حکومەتی عێراقیدا وەربگرن، ئێستا هەمومان دەزانین کە باشترین پەیوەندی ئەمنی و پەیوەندی بازرگانی و پەیوەندی سیاسی و پەیوەندی ئابوری لەنێوان هەرێمی کوردستان و حیزبەکانی هەرێمی کوردستان و حیزبەکانی ئێراندا هەیە، حیزبەکانی کوردستانی عێراق، دەسەلاتدارەکانیان هەمو لە تاران و شارەکانی ئێراندا نوسینگە و ئۆفیسیان هەیە لە بەرامبەر ئەوەشدا حکومەتی ئێران کونسوڵخانەی هەیە لە هەولێر و لە سلێمانی، رۆژانە سەدان کەس لە کوردستانی عێراقەوە دەچن بۆ ئێران و لە ئێرانەوە دێن بۆ عێراق، ئەگەر دەڵێن دەستی دەرەکی مەبەستیان ئێرانە، مەبەستیان لەو قسەیە ئەوەیە کە ئەمەریکاییەکان و ئینگلیز و خۆرئاوا بکەن بەگژ ئێمەدا و بڵێن ئێران لەپشت ئەمانەوەیە، لە راستیدا مەعلومە کە ئێران پشتیوانی کێی کرد بەوەی کە پلە و پۆست لە بەغدا وەربگرێت، لەلایەکی ترەوە دەڵێن ئەمانە عەرەبە شۆڤێنییەکانیان لەپشتە، من هەر لە خۆتان دەپرسم و لە رای گشتی کورد دەپرسم خەڵکینە کێ شۆڤێنییەکانی عەرەبی بردەوە بۆ ناو پەرلەمانی عێراقی و بردیەوە بۆ ناو حکومەت و کارێکی وای کرد کە لە بەرزترین پلەوپایەی حکومەتی عێراقیدا جێگیر بن، واتا ئەگەر دەستی شۆڤێنییەکانی عەرەبی لەپشتە یان دەستی ئێرانی لەپشتە، با ئەو دەستە بڕن، بەلام لەراستیدا ئەمانە نە دەستی ئێرانیان لەپشتە نە دەستی شۆڤێنییەکانی عەرەبیان لەپشتە، نەدەستی ئێمەیان لەپشتە، بەڵکو ئەمە کۆمەڵێك خەڵکن داواکارییەکی رەوایان هەیە کە پێویستە ئەم حکومەتە و حیزبە دەسەلاتدارەکان بەدەنگیانەوە بچن، لەباتی ئەوەی تۆمەتی ناڕەوایان بخەنەپاڵ هەقی وایە داواکارییەکانیان جێبەجێ بکەن.

KNN: باست لەوە کرد کە نە دەستی ئێوەی لەپشە، بەلام بۆچونێك هەیە کە ئێوە وەك بزوتنەوەی گۆڕان ئەم خۆپیشاندانانە هەڵدەسوڕێنن؟

نەوشـیروان مـستەفا: ئـەم خۆپیـشاندانانە لـە راسـتیدا خەریکـە دەبێتـە دیاردەیـەکی تـازە لـەناو کۆمـەڵگای کوردیـدا، لـەماوەی ٢٠ سـاڵی رابـردودا مونافەسـە لـەنێوان حیزبەکانـدا کـە بـوە، زۆرتـر مونافەسـەکە لەسـەر بنـچینەی سڕینەوەی یەکتری بوە، زۆرجار ئەگەر سڕینەوەش نەبوبێت لەسەر بنچینەی ئەوە بوە کە لایەك لاکەی تر بکات بە پاشکۆی خۆی، ئەوەی ئێمە دەیبینین لەم خۆپیشاندانانەدا دەبینین کە جۆرێك لە پلوڕالیزم واتا جۆرێك لە فرەیی و تەعەددودیەت هاتوەتە پێشەوە، ئەوانەی لەم خۆپیشاندانانەدا بەشداری دەکەن هەمو ئەو کەسانەن کە خۆیان هەست بە مەزڵومی و هەست بە بێبەشی دەکەن، لەناو ئەوانـەدا خەڵکی تیایە لە قاعیدەی پارتییە خەڵکی تیایە لە قاعیدەی یەکێتییە، خەڵکی تیایە لە یەککگرتوی ئیسلامییە خەڵکی تیایە لە کۆمەڵی ئیسلامیە، خەڵکی تیایە لە بزوتنەوەیە خەڵکی تیایە لە سۆشیالیسە خەڵکی تیایە لە زەحمەتکێشانە خەڵکی تیایە لە بێلایەنە، بەڵێ لایەنگرەکانی ئێمەشی تیایە.

KNN: بـەڵام ئـەوەی کـە دەوترێـت گۆمەکـەی بـە تـەواوەتی لـە کوردسـتان شڵەقاند، مەسـەلەی بەیاننامـە ٧ خاڵییەکـەی ئێوەیـە، ئـەو داواکارییانـەی کـە ئێستا جەماوەر لەسەر شەقام هەیەتی، زیاترە لە سەقفی ئەو داواکارییانەی کە ئێوە لە بەیاننامە ٧ خاڵییەکەدا داواتان کرد؟

نەوشیروان مستەفا: دەتـوانین بڵـێین لـە هەنـدێ روەوە لـە یـەك دەچن، رەنگـە داواکـاری شـەقام زیـاتر بێـت لـە داواکارییـەکانی ئێمـە، داواکارییـەکانی ئێمـە بەزۆری لە دەوری هەندێ خاڵی سیاسی دەسوڕێتەوە کە پەیوەندی بە ئاینـدە و ستراتیژی سیستەمی سیاسی وڵاتەکەوە هەیە، ئەو خاڵانـەی ئێمە پێشنیازمان کردوە لە راستیدا پێمان وایە چارەسەری بنـەڕەتی ئەو قەیرانە سیاسییەیە کە ئێستا لە کوردستانی عێراقدا هەیـە، پێمانوایە ئەمە چارەسەری ئەو خەلەلەیە کـە لـە سیـستەمی سیاسـی هـەرێمی کوردسـتاندا هەیـە، پێمانوایـە چارەسـەری بنەڕەتییە بۆ ئەو خەلەلەی کە لە سیستەمی بەڕێوەبردنی وڵاتەکەدا هەیە، ئێمە

لەسەر ئاستی ستراتیژی کۆمەڵێك شتمان پێشنیاز کردوە، داواکارییەکانی خەڵك خەمی رۆژانەی خۆیانە و پەیوەندی بە پێویستییەکانی ژیانی رۆژانەی کۆمەلانی خەڵکەوە هەیە، لەوەی ئێمە پەیوەندی بە جەوهەری سیستەمی سیاسییەوە هەیە ئەوانەی لەوان پەیوەندی بە خەمی رۆژانە و بەپێویستییەکانی رۆژانەی شەقامی کوردی و دانیشتوانی کوردستانی عێراقەوە هەیە، لەوەدا داواکارییەکانی هەردولامان یەك دەگرێتەوە رەنگە لە هەندێ شتی تردا یەك نەگرێتەوە.

KNN: ئەم دۆخەی ئێستا لە کوردستان هاتوەتە ئاراوە بێگومان پێویستی بە گفتوگۆی سیاسی دانیشتنە لەسەر مێز، تا چەند مەبدەئی گفتوگۆتان قبوڵە یاخود رەتی دەکەنەوە؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە مەبدەئی گفتوگۆ نەك هەر قبوڵی دەکەین، بەڵکو بەپێویستی دەزانین و پێشمان وایە ئەم سەردەمە سەردەمی گفتوگۆیە، بەڵام ئێمە دەمانەوێت تائێستا تەقلیدێك لە بزوتنەوەی کوردیدا هەبوە، دەمانەوێت ئەمجارە تەقلیدێکی تازە بێنینە پێشەوە، لە حەرەکەی کوردیدا مەسەلەی موجامەلە و ئەو کۆبونەوانەی ماچ و موچی تیا دەکەن و خواردنی تیا دەخۆن و دادەنیشن و بۆ رەسمگرتنی تەلەفزیۆن تیایدا پێ دەکەنن، پێمان وایە ئەم قۆناغە تێپەڕیوە، پێمان وایە ئێستا سەردەمێك هاتوتە پێشەوە کە سەردەمی گفتوگۆی جددیە، سەردەمێکە کە دادەنیشیت لەباتی ئەوەی موجامەلەی یەکتری بکەن، دەبێ خاڵە سەرکییەکان بێننە پێشەوە بۆئەوەی موناقەشەی جددی بکەن، موکاشەفە بکەن موسارەحە بکەن لەگەڵ یەکتر، هەمو بیروبۆچونەکانی یەکتری باس بکەن بۆئەوەی تەفاهوم و نوقتەی هاوبەش بدۆزنەوە، ئێمە چیتر بەلامانەوە گرنگ نیە بۆ نمونە من بڕۆم بچم لەگەڵ یەکێك لە کەسە دەسەلاتدارەکانی هەرێمی کوردستان دابنیشین و ئەملا و ئەولای یەکتری ماچ بکەین و لە تەلەفزیۆندا دەربکەوین و پێکەوە لەسەر مێزێك نان بخۆین و لە دواییدا بێینە دەرەوە و هیچمان بە هیچ نەکردبێت، لەبەرئەوەی

پێمان باشە ئێمە لەهەمو جێگایەکدا گفتوگۆ بکەین، ئێمە لە پەرلەمانی کوردستاندا گفتوگۆ دەکەین لە پەرلەمانی عێراقدا گفتوگۆ دەکەین لە ئەنجومەنی پارێزگاکاندا گفتوگۆ دەکەین لە ژورە تاریکەکاندا گفتوگۆ دەکەین، گفتوگۆی دوقۆڵی دەکەین گفتوگۆی چەندقۆڵی دەکەین، حەز دەکەم لایەنگرەکانی ئێمە دڵنیا بن لەوەی کە ئێمە چ لە ژوری داخراوا چ لە ژوری کراوەدا چ لە ژوری روناکدا چ لە ژوری تاریکدا، لە پەرلەماندا ئێمە هیچ داواکارییەکی تایبەتیمان نیە بۆ خۆمان و رێکخراوە سیاسییەکەمان، داواکارییەکانی ئێمە داواکاریی گشتییە و ئەوانەیە کە ئێمە پێمانوایە چارەسەری قەیرانی کوردستان دەکات، ئێمە بچین بۆ هەر جێگایەك هەمان ئەو قسانە دەکەین کە باوەڕمان پێیەتی و داواکاری گشتین بۆیە پێویست ناکات هیچ کەسێك نیگەران بێت لەوەی کە ئێمە لە ژوری تاریکدا قسە دەکەین یاخود لە ژوری روناکدا قسە دەکەین، چونکە هەمان قسە دەکەین.

KNN: بەڵام زۆرجار وەکو خۆت باست کرد ئەم جۆرە گفتوگۆیانە لەم دۆخەدا بە تایبەتی، نیگەرانی بەدوای خۆیدا دەهێنێت؟ لانی کەم هەندێ خەڵك پێی وابێت رەنگە زۆر جار ئەم گفتوگۆ سیاسییانە لەسەر حسابی ئەوان دەکەوێتەوە؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە بە ناوی کەسەوە گفتوگۆ ناکەین تەنها بەناوی بزوتنەوەی گۆڕانەوە نەبێت، خۆپیشاندەران لە هەمو جێگایەك خۆیان ئەنجومەنیان دروستکردوە و نوێنەریان داناوە بۆ گفتوگۆکردن، لەبەرئەوە ئێمە هەرگیز خۆمان بە دەمڕاستی ئەوان نازانین و بەناوی ئەوانەوە ناچین قسە بکەین، ئێمە کە دەچین بۆ قسەکردن و گفتوگۆکردن بەناوی خۆمانەوە قسە دەکەین، هەربۆیە ئێمە پێمان باش بو ئەوان خۆیان قسەکەری خۆیان هەبێت و ئەنجومەنی خۆیان هەبێت، داواکاری خۆیان هەبێت، فیعلەن خۆیان کەوتونەتە گفتوگۆکردن لەگەڵ پەرلەمان و لەگەڵ حکومەتی هەرێم بەبێ ئەوەی هیچ پێمان

ناخۆش بێت، بەپێچەوانەوە ئێمە پێمان خۆشە و پشتیوانی لە داواکارییەکانیان دەکەین.

KNN: ئێوە وەك بزوتنەوەی گۆڕان ڤیتۆتان لەسەر هیچ لایەنێکی سیاسی هەیە بۆ گفتوگۆکردن یاخود گفتوگۆ لەگەڵ هیچ لایەنێکی سیاسی ڕەت دەکەنەوە؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە لە کوردستانی عێراقدا ڤیتۆمان لەسەر هیچ لایەنێك نیە، بە پێچەوانەوە ئێمە پێمان وایە گفتوگۆکردن لەنێوان دو لایەندا چەند ناکۆك بن لەگەڵ یەکتریدا، ئەوا تۆ دەتوانیت لەبیروبۆچونەکانی ئەو تێبگەیت ئەویش دەتوانێت لە بیروبۆچونەکانی تۆ تێبگات، دەتوانن پێکەوە ڕێکبکەون و بە ڕێککەوتن بێنە دەرەوە، دەتوانن ڕێکیش نەکەون، بەڵام ڕێزی یەکتری بگرن، زەمانی سڕینەوەی یەکتری تێپەڕیوە، ئێستا زەمانی قبوڵکردنی یەکترییە.

KNN: بابێینە سەر ئەو پرۆژە هاوبەشەی کە لەگەڵ ئۆپۆزسیۆندا واتە لەگەڵ کۆمەڵ و یەکگرتودا واژۆتان کرد، بۆچونێك هەیە کە ئێوە لەم پرۆژە هاوبەشەی ئۆپۆزسیۆن پەشیمان بونەتەوە؟

نەوشیروان مستەفا: ئەوە ڕاست نیە، ئێمە لەگەڵ ئەو دو لایەنەدا گەیشتوینەتە سەر کۆمەڵێك خاڵ، پێمانوایە دەستمان خستوەتە سەر خەلەلە جەوهەرییەکانی ئەم قەیرانەی کە ئێستا لە کوردستانی عێراقدا هەیە، دەستمان خستوەتەسەر خەلەلە جەوهەرییەکانی کە کێشە لە دەستوردا هەیە، لەو یاسایانەدا هەیە کە پەیوەندی بە سیستەمی سیاسییەوە هەیە، دەستمان خستوەتەسەر ئەو خەلەلانەی کە لە سیستەمی بەڕێوەبردندا هەیە.

KNN: واتا لانی کەم لەسەر ٢١ خاڵی ناو بەیاننامەکە ڕەزامەندن؟

نەوشیروان مستەفا: لەسەر هەمو خاڵەکان ڕەزامەندین ڕەنگە تەنها لە یەك شتدا کێشەیەك لەنێوان ئێمە و ئەواندا هەبێت ئەویش ئەوەیە کە پێمانوایە ئەم حکومەتەی ئێستا حکومەتێکی لاوازە، حکومەتێکی دوفاقە، حکومەتێکی

بێدەسەلاتە، ئەم حکومەتە لەباریا نیە لە توانیدا نیە کە بتوانێت ئەو خالانە جێبەجێ بکات.

KNN: تا چەند بایەختان بۆ یەکڕیزیی ئۆپۆزسیۆن هەیە لە کوردستان وەك بزوتنەوەی گۆڕان؟

نەوشیروان مستەفا: ئەمە پرسیارێکی زۆر بەجێیە، ئێمە نەك هەر یەکڕیزیی ئۆپۆزسیۆن، ئێمە یەکڕیزیی کوردیشمان بەلاوە گرنگە، ئێمە بە لامانەوە گرنگە کە کورد لە کەرکوك یەکڕیز بێت، پێمان گرنگە کورد لە بەغدا یەکڕیز بێت، پێمان گرنگە کورد لە بەردەرکی سەرای سلێمانی یەکڕیز بێت، پێمات گرنگە کورد لەبەردەمی ئەمەریکاییەکاندا یەکڕیز بێت، ئێمە یەکڕیزیمان زۆر بەلاوە گرنگە چ لەنێوان ئۆپۆزسیۆندا بێت چ لەگەڵ لایەنەکانی تردا بێت، هەربۆیە ئێمە سەرەتای گفتوگۆ بە سەرەتایەکی قبوڵ دەزانین بۆئەوەی هەمومان بتوانین جۆرێك لە یەکڕیزی سیاسی بهێنینە کایەوە.

KNN: لە خاڵی سێیەمی بەیاننامەکەتاندا باس لە هەڵبژاردنی پێشوەخت دەکەن، دواجاریش یەکێتی و پارتی هاتنە ژێرباری ئەوەی کە دان بنێن بەوەی کە بەڵێ با هەڵبژاردنی پێشوەخت بکرێت، سەبارەت بە هەڵبژاردنی پێوەخت راتان چیە؟

نەوشیروان مستەفا: هەڵبژاردنی پێشوەخت بەشێکە لە پاکێجێك، ئەمە جۆرێکە لە ئینتیقائیەت، جارێکی تر گەڕاوینەتەوە بۆ ئەو ئسلوبە کۆنەکەی کە بەکاریان دەهێنا، ئێمە ٧ خاڵمان پێشنیاز کردوە ئەو یەك خاڵی بەدڵە کە لە بەرژەوەندی خۆیەتی دەچێت ئەو خاڵە هەڵدەبژێرێت، ئەمە جارێکی کە دەمانباتەوە بۆ ئەو ئینتیقائیەتەی کە لە رێکەوتنی سیاسیدا هەمیشە بوە بەهۆکاری ئەوەی کە شکستی بە رێکەوتنەکە هێناوە، ئەمە بەشێکە لە پاکێجێك، ئێمە وەختێك باسی ئەوە دەکەین کە هەڵبژاردنی پێشوەخت بکرێت، ئەگەر بەم دامودەزگایەی ئێستا هەڵبژاردن بکرێت ئەوا هەڵبژاردن هیچ مانایەکی نییە، چونکە بەم دامودەزگایە رەنگە ئەنجامێکی هەبێت کە لە ئەنجامەکەی ئێستا باشتر نەبێت و

حیزبەکانی دەسەڵات زیاتر قۆرخکاری بکەن، بۆیە ئێمە کە باسی هەڵبژاردنی پێشوەخت دەکەین مەرجەکانی هەڵبژاردنی پێشوەخت واتا پێداویستییەکانی ئەوانە چییە؟ لەپێشدا هەڵوەشاندنەوەی ئەم حکومەتەیە و پێکهێنامی حکومەتێکی ئینتیقالییە بۆئەوەی سەرپەرشتی ماوەی گواستنەوە بکات لەم قۆناغەوە بۆ قۆناغێکی تازە، بەلامانەوە گرنگە ئەو حکومەتە کە دروست دەبێت بەلایەنی کەمەوە شەش وەزارەتی بێلایەن بێت لە خەڵکی سەربەخۆ و لە خەڵکی پرۆفیشناڵ کە غەیرە حیزبی بن، ئەو وەزارەتانەش بریتین لە وەزارەتی ناوخۆ و وەزارەتی پێشمەرگە و وەزارەتی دارایی و وەزارەتی سامانە سروشتییەکان و وەزارەتی دا و وەزارەتی پەروەردە، ئەمانە ئەو وەزارەتانەن کە دەتوانن هەڵبژاردن بە لایەك ببەنەوە و بە لایەکی بدۆڕێنن، بۆیە پێمان باشە هەروەکو چۆن لە بەغدا داوا دەکەن دەڵێن دەبێت وەزیری ناوخۆ و وەزیری داد و وەزیرەکانی تر خەڵکی سەربەخۆ بێت، بۆچی بۆ ئەوان ڕەوایە و بۆ ئێمە ناڕەوایە، ئێمەش لە کوردستان داوا دەکەن کە دەبێ ئەم وەزارەتانە بە کەسانی بێلایەن بسپێردرێت، ئەم کەسە بێلایەنانە دەتوانین ڕێککەوتنی لەسەر بکەن کە خەڵکی غەیرە حیزبی بن، چونکە ئەگەر ئەم دەزگایانە لە خزمەتی حیزبێکدا بێت ئەوا لە هەڵبژاردندا هەمویان بەکاردەهێنن بۆ بەرژەوەندی خۆیان، ئەگەر ئەمە نەکرێت ئەوا بەڕای ئێمە هەڵبژاردنی پێشوەخت هیچ مانایەکی نیە و ئێمە پشتیوانی لێ ناکەین.

KNN: بۆچونێك هەیە کە ئێوە وەك بزوتنەوەی گۆڕان بە هیچ شتێك رازی نین و کەس نازانێت ئێوە چیتان دەوێت؟

نەوشیروان مستەفا: من پێموایە حیزبەکانی دەسەڵات و دەسەڵات نازانێت چی دەوێت، تەنها یەك شتی دەوێت، ئەویش ئەوەیە کە دەیەوێت لە دەسەڵاتدا بمێنێتەوە، هەربۆیە کۆڵەوارە لە چارەسەرکردنی ئەو کێشە و گیروگرفتانەی کە دێتە ڕێگەی، بە پێچەوانەوە ئێمە زۆرباش دەزانین چیمان دەوێت و کورتمان کردوەتەوە لە ٧ خاڵدا، دو خاڵیان دەربێنەرە دەرەوە کە بریتییە لە

هەڵوەشانەوەی حکومەت و هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان، پێنجەکەی تری پێموایە هیچ کەس ناتوانێت بڵێت جێبەجێ ناکرێت، ئەو پێنج خاڵە چارەسەری ستراتیژییە بۆ ئەو قەیرانەی کە لە کوردستاندا هەیە لەئێستا و لە ئایندەیەکی نزیکیشدا بۆئەوەی جارێکی تر توشی ئەم کێشەیە نەبینەوە کە لە کوردستانی عێراقدا هەیە، بۆئەوەی حکومەتێك بێتە کایەوە، پەرلەمانێك بێتە کایەوە کە جێگەی رەزامەندی خەڵك بێت و خەڵك پێی باش بێت، دەبێت ئەو خاڵانە جێبەجێ بکرێت، وەختێك ئێمە باسی ئەوە دەکەین کە تەزکیەی حیزبی نەمێنێت، وەختێك باسی ئەوە دەکەین کە ئاسایش بێلایەن بکرێت، وەختێك باسی ئەوە دەکەین کە هێزی پێشمەرگە بێلایەن بکرێت، وەختێك باسی ئەوە دەکەین دەزگای ئاسایش و دەزگای زانیاری لە دەزگایەکی حیزبییەوە بکرێت بە دەزگایەکی نەتەوەیی و نیشتمانی، وەختێك باسی ئەوە دەکرێت کە پێشمەرگە لەباتی ئەوەی لە مونافەسەی سیاسیدا بەکاربهێنرێت و لایەك بیهێنێتە سەر لایەك، ببێت بە دەزگایەکی نیشتمانی لایەنگر بۆ گەل و نیشتمان نەك بە قسەی سەرکردایەتی حیزب بکات، ئێمە زۆر بە رونی دەزانین چیمان دەوێت، ئێمە دەمانەوێت دەوڵەتی نەتەوە دەوڵەتی گەل دەوڵەت لەسەر بنچینەی هاوڵاتیبون بنیات بنرێت نەك لەسەر بنچینەی حیزب و ئینتیمای حیزبی پێکبهێنرێت، ئێمە دەوڵەتی حیزبمان ناوێت، ئێمە دەوڵەتی هاوڵاتیمان دەوێت، دەوڵەتی نەتەوەکان دەوێت، دەوڵەتی گەلمان دەوێت، ئەمە خواستی ئێمەیە کە دەمانەوێت، ئەوان نازانن چیان دەوێت.

KNN: کەواتە لێرەدا یەکێك لە پرسیارە زۆر گرنگەکان دێتە پێش بریتییە لەوەی، ئێوە وەك بزوتنەوەی گۆڕان لەژێر سایەی ئەم حکومەتە دەچنە هەڵبژاردنەوە؟

نەوشیروان مستەفا: تەجروبەی رابردو دەریخست کە ٢٠٠٠ کەسیان نانبڕاو کرد، ئێمە دەمانەوێت بەهۆی هەڵبژاردنی داهاتووەوە کۆمەڵگایەکی ئاسودە، هاوڵاتییەکی ئاسودە، هەست بەوە بکات کە لە وڵاتێکدایە کە ئازادی هەیە و

ئاسودەیە، ئێمە نامانەوێت خەڵك بە نانبڕین بدەین واتا لەنێوان هەڵبژاردنی پێشوەخت و لەنێوان هەڵبژاردن نەکردندا، ئێمە هەڵبژاردنی پێشوەختمان ناوێت بۆ ئەوەی ٢٠٠٠ کەسی تر نانبڕاو نەبێت، ئێمە پێمان باشە پێش هەڵبژاردنی پێشوەخت کۆمەڵێك لەو شتانە جێبەجێ بکرێت، بۆئەوەی جارێکی کە خەڵك ترسی ئەوەی نەبێت چاوی لێ سور دەکەنەوە یان لە وەزیفە دەری دەکەن، ترسی ئەوەی نەبێ موچەکەی دەبڕن، ترسی ئەوەی نەبێ خانەنشینییەکەی دەبڕن، ترسی ئەوەی نەبێ نەقڵی دەکەن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، ترسی ئەوەی نەبێ بەشەو دەیفڕێنن، ترسی ئەوەی نەبێ تەقە لە ماڵەکەی دەکەن، ئەگەر ئەمانە جێبەجێ نەبن، نەوەلا ئێمە هەڵبژاردنی پێشوەختمان ناوێت.

KNN: سورن لەسەر بەیاننامە ٧ خاڵییەکەی ١/٢٩؟

نەوشسیروان مستەفا: بەڵێ ئێمە سورین لەسەر ئەو بەیاننامەیە، پێشمان وایە ئەو ٧ خاڵە ئەگەر وردی بکەیتەوە هەمو خواستەکانی کە لە ٢٠ ساڵی رابردودا هەمو کۆمەلانی خەڵك چ بە رۆژنامە چ بە قسەکردن، چ بە گفتوگۆ داوایانکردوە، ئێستا ئێمە خۆمان خەریکین هەریەکێك لەو ماددانەی لەو بەیاننامەیەدا نوسراوە وردە وردە بیکەین بە قانون و پرۆژەبڕیار و بیکەین بە پرۆژەی وا کە قابیلی جێبەجێکردن بێت، ئیتر قۆناغی ئەوە بەسەرچوە کە ئێمە شیعارات باس بکەین بڵێین جیاکردنەوەی حیزب لە حکومەت، بنبڕکردنی گەندەڵی ئەمانە شیعاراتن، ئێمە هەوڵدەدەین ئەمانە هەموی ورد بکرێتەوە کە وەختێك تۆ باسی ئەوە دەکەیت حیزب لە حکومەت جیابکرێتەوە چۆنی جیا دەکەیتەوە؟، بۆ نمونە تۆ ئەگەر بتەوێت حیزب لە حکومەت جیا بکەیتەوە لە دەزگای ئاسایشدا پێویستیت بەوە هەیە لەپێش هەمو شتێکدا ئەو رێکخستنە حیزبییەی کە پارتی و یەکێتی هەیانە لەناو ئاسایشی سلێمانی و هەولێر و دهۆکدا

بارەگاکانیان نەمێنێت و کۆمیتەکانیان هەڵبوەشێتەوە، لەپێش هەمو شتێکدا گرنگ ئەوەیە کە لە بەڕێوەبەر و بەرەوژور کەسانی بێلایەن دابنرێت، لەپێش هەمو شتێکدا پێویستە کە ئیتر ئەوان دەسەلاتی دادگایان نەمێنێت، نەتوانن خەڵك بگرن راوی بنێن و هەڵبکوتنە سەر ماڵان، ئەم ئەرکە بسپێردرێت بە دادگاکان و دەسەلاتی دادوەری و ئەوان تەنها دەسەلاتی کۆکردنەوەی زانیاری و دانی زانیارییان هەبێت بە حکومەت، واتا ئێمە مەبەستمان ئەوەیە لە شیعارات و لە قۆناغی شیعاراتەوە ئیتر دەبێت بگوێزینەوە بۆ قۆناغی جێبەجێکردنی وردکردنەوەی شیعارەکان بە هەنگاوی عەمەلی و بیکەین بە بڕیار و پرۆژە.

KNN: بە لەبەرچاوگرتنی ئەو جموجۆڵە بەرفراوانەی لە ناوچەکە هەیە، بەو خرۆشانەشەوە کە لە شەقام هەیە و بەو جموجۆڵە سیاسییەش کە لە ئاستی ئۆپۆزسیۆندا هەیە، تا چەند ئومێدت بەوە هەیە واتا گەشبینن بەوەی کە ئەمجارە دەسەلات لە کوردستاندا چاکسازی تیا دەکرێت و ماکیاج ناکرێت؟

نەشیروان مستەفا: تەجروبەی وڵاتانی پێش ئێمە دەریخستوە کە ئەو دەسەلات و ئەو حکومەت و ئەو حیزبە حاکمانەی کە ئەگەنە قۆناغێك لەبەردەمی دوڕیانێکدا دەبن، ئێستا ئێمە لە کوردستان دەسەلات گەیشتوەتە ئەو دوڕیانە، رێگایەکیان بەرەو توندوتیژی دەڕوات، بەرێگای سەرکوتکردن خەڵك سەرکوت بکەیت، بەرێگای گرتن و کوشتن و راونان و نانبڕین و. . . هتد، رێگای دوەمیش رێگای پیاچونەوەیە بە خۆدا و رێگای قوڵکردنی داواکارییەکانی خەڵکە، رێگای چاکسازیی سیاسییە، ئێمە لەبەردەمی دو رێگادا راوەستاوین، یەکێتی و پارتی دەتوانن رێگای توندوتیژی بگرن، دەتوانن رێگای چاکسازی بگرن، رێگای توندوتیژی سەرەتاکەی دەستی پێکردوە ئەوەتا خەڵك دەگرن

خەڵك دەكوژن خەڵك بریندار دەكەن، هەڕەشە دەكەن، من ئومێدم وایە لەو ڕێگایە پەشیمان بنەوە، چونكە هیچ دەسەڵاتێك نەیتوانیوە تا سەر بە ڕێگای توندوتیژی حكومڕانی بكات، ئومێدم وایە ڕێگای دوەم بگرنەبەر، كە ڕێگا قبوڵكردنی خواستەكانی خەڵكە، ڕێگای چاكسازی سیاسی و كۆمەڵایەتی و ئابوریە، من ئومێدم وایە ڕێگای دوەم بگرنەبەر.

KNN: لە كۆتایدا دەپرسین، تا چەند چاوەڕوانی ئەوە بكەین كە بەڕێز نەوشیروان مستەفا ئەمین لەناو ریزی خۆپیشاندەراندا ببینین؟

نەوشیروان مستەفا: ئەگەر پێویستی كرد بەڵێ بەشداری

# دەبێت ئەوان داوای لێبوردن بکەن

سازدانی: هۆشیار عەبدوڵلا

لە بەرنامەی روبەڕوی کەناڵی (KNN) دا، نەوشیروان مستەفا، ئاماژە بەو پەندو دەرسانە دەکات کە پێویستە دەسەڵاتدارانی کوردستان، لە شۆڕشەکانی تونسو میسرەوە وەریانگرتبێت.
هەروەکو بەیاننامە (٧) خاڵییەکەی گۆڕان، وەك نەخشە رێگای کارکردنی بزوتنەوەکەی دەبینێت و دەڵێت: "بەیانەکەی ئێمە، بەیانێکی ئیستیباقییە، بەیانێکە پێشتر هۆشیاریی داوە بە کۆمەڵێك لەو حیزبانە و پێشئەوەی گەردەلولەکە بێتە کوردستان، با دانیشینو چارەسەری وەزعەکە بکەین".
KNN: ئەگەر لە تونس و میسرەوە دەستپێبکەین، ئەو گۆڕانکارییەی لە تونس بە (٢٧) رۆژو لە میسر بە (١٨) رۆژ یەکلایی بوەوە. چییان لێ فێر دەبین؟
نەوشیروان مستەفا: لەڕاستیدا ئەو روداوانەی لە تونس و دواتر لەمیسر رویاندا، ئەوەمان بەبیر دەهێننەوە کە کاتی خۆی چۆن گۆڕان لە ئەوروپای رۆژهەلات لە پۆلۆنیاوە دەستپێکرد، بەرەو رۆمانیا و دوایی هەمو ولاتانی ئەوروپای رۆژهەلاتی گرتەوە و یەکێتی سۆڤیەتیشی گرتەوە و ئەو دەولەتە گەورەیە پارچە پارچە بو، ئەمەش رەنگە شتێکی لەوبابەتە لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست بهێنێتە پێشەوە، بەتایبەتی دوای ئەوەی کە ئەو گۆڕانە بنەرەتییەی کە لە میسرا رویدا و سیستمی ئەوێی گۆڕی، ئەمە وەکو ئەوە وایە سەرەتای گۆڕانێك بێت لەهەمو رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، لەپێش هەمو شتێکدا، دەبێت لەئەزمونی ئەو دو ولاتەوە چەند دەرسێك دەربهێنین.

یەکەم" وەکو چۆن سیستمی تاکحیزبی لە ئەوروپای شەرقی رماو هەرەسی هێناو وەك ئەزمون فەشەلی کرد لە ژیانی سیاسیی میللەتان، بەهەمان شێوە لەتونس سیستمی تاکحیزبی و لە میسریش سیستمی تاکحیزبی فەشەلی هێنا، لەم ولاّتانە کە دەڵێن سیستمی تاکحیزبی، کۆمەڵێك حیزبی تر هەبون، بەلاّم لەپانتایەکی زۆر تەسکدا رێگەیان داون بۆئەوەی بەهیچ جۆرێك رۆژێك لەرۆژان دەسەلاّت نەگرنە دەستیان، سەیری تونس بکە، هەمو بارەگای حیزبەکانی دەسەلاّت، ئاگریان تێبەردراو سەرکردایەتی حیزبەکەی هەڵوەشایەوە و سکرتاریەتی هەڵوەشایەوە و مەکتەبی سیاسییەکەی هەڵوەشایەوە و بارەگای لقەکان لەلایەن کۆمەلاّنی خەڵکەوە بەتالاّن بران، لەمیسریش بەهەمان دەرد چون، ئەمە دەرسێکە بۆئەوەی کە فیعلەن پێشوەخت تێبگەین، سیستمی تاکحیزبی لە سلێمانیش فەشەلی کردوە و لە هەولێر و دهۆکیش فەشەلی کردوە، ئەو تەعەدودییە کە ئێستا سەرکردایەتی کورد خۆی پێوە هەڵدەکێشێت، لەڕاستدا تەعەدودی نییە، لە سلێمانی یەك حیزب حوکم دەکات و چەند حیزبێکی بچکۆلە لەدەورین، لە هەولێریش یەك حیزب حوکم دەکات و چەند حیزبێکی بچوك لە دەورین، تەنانەت لە هەولێر یەکێتی وەك پارتی دەسەلاّتی نییە و لە سلێمانی پارتی وەك یەکێتی دەسەلاّتی نییە، ئەمە دەرسی یەکەمە کە دەبێت بەڕاستی هەمو حیزبەکان، لەپێش هەمویان حیزبەکانی کوردستانی عێراق، ئەو دەرسە وەربگرن کە سەردەمی سیستمی تاکحیزبی و ئەو حیزبانەی کە خۆیان بە پێشرەو و حیزبی قائید دەزاننو ئەو حیزبانەی پێیانوایە، ئەگەر ئەوان نەبن، ئەوا میللەت گورگ دەیخواو لافاو دەیبا و هەمو لەبرسا دەمرن و ماڵیان وێران دەبێت، ئەمە تێپەڕیوە و ئەمە دەرسی یەکەم کە دەبێت لێوەی فێربین.

دەرسی دوەم" چاکسازی درەنگوەخت سودی نییە، من خۆم دوساڵ لەمەوپێش، لەگەڵ هەندێ لە سەرکردەکانی کە خاوەن دەسەلاّتن، قسەم لەگەڵدا کردن و بۆم باسکردن کە پرۆسەی نارەزایی پرۆسەیەکە گەشە دەکات و

دەگۆڕێت، سەرەتاکەی بە داواکاری زۆر ئاسان دەستپێدەکات، خەڵك داوا دەکات و دەڵێت ڕێگاوبانم نییە، دەڵێت زێرابم نییە، دەڵێت جێگای نیشتەجێبونم نییە، دەڵێت بێکارم، دەڵێت کارەبام نییە، دەڵێت ئاوم نییە، یانی خواستەکانیان لەئاستی خزمەتگوزارییدایە، لەپاش ماوەیەك کە تۆ چارەسەری ئەمە ناکەیت، وەعدی دەدەیتێ و درۆ دەکەیت و بەڵێنەکانت جێبەجێناکەیت، چاوبەستەکی لێ دەکەیت، لەپاش فەترەیەك ئەمە دەگۆڕێت، لەخواستی خزمەتگوزارییەوە دەبێت بە خواستی ئیسلاحی، داوا دەکەن ئیسلاح لە نیزامی ئیداریی و لەنیزامی سیاسی وماڵیدا بکرێت، ئەمەش قۆناغێکە کە ئەگەر ئەو قوناغەش سایەی نەبێت، دەبێت بەم گەردەلولەی کە ئێستا لەمیسر و تونس و ئەو وڵاتانە هەیە.

KNN: بڵاوکردنەوەی بەیاننامەکە، لەبنەمادا کە ئێوە وەك خۆتان باسی دەکەن، بۆ تێپەڕاندنی دۆخی هەرێمی کوردستان بو لە قەیران، بەلاّم قەیرانەکەی بەردەوامکرد، ئەگەر نەڵێین تۆختری کردەوە، لەو قەیرانەی هەرێمی کوردستانەوە، چ وانەیەك فێردەبین؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە چونکە خۆمان لەم ژینگە سیاسییە دەژین، لەم چەند ڕۆژەی ڕابردودا، ئێمە چەند دەرسێکمان لەم تەنگژەو قەیرانە وەرگرت، من خۆم بە چاوی لێکۆڵینەوەوە سەیری ئەوەم کردوە، لەگەڵ کۆمەڵێ خەڵکی تر گفتوگۆم لەسەر کردوە و چەند دەرسێکی لێدەردەهێنین، دەرسێکیان عەسکەرییە، دەرسێکیان سیاسییە، دەرسێکیان ڕۆشنبیرییە و دەرسێکیان ڕاگەیاندنە، واتە دەرسی جیاجیای لێدەردەهێنین.

KNN: با لە سەربازییەکەوە دەست پێبکەین، ئەو وانەیەی کە لێوەی فێردەبین، چییە؟

نەوشیروان مستەفا: لەدەرسی عەسکەرییدا، فێریکردین لەم وڵاتە دامەزراوەیەك نییە بەناوی دامەزراوەی عەسکەرییەوە، لەم وڵاتە هێزی پێشمەرگە هەیە، ئاسایش هەیە، زانیاری هەیە، پاراستن هەیەو ئەمانە هەمو دەزگای حیزبین و

نەبون بە دەزگای حکومەتی و نەبون بەموڵکی دەزگای دەوڵەت، واتا حیزب لەکاتی لێقەومانی خۆیدا و لەکاتی ململانێی سیاسی لەگەڵ لایەنەکانی تر، دەتوانێت ئەم دەزگایە وەك دەزگایەکی حیزبی بەکاربهێنێت، کە هیچ جۆرە سەربەخۆییەکی تێدا نییە، بەداخەوە، ئەمە کارێکی زۆر زۆر خراپ بو کە سەرکردایەتی ئەم حیزبانە پەنایان بردەبەر ئەوەی جارێکی تر پێشمەرگە وەکو ئامرازێك بەکاربهێنن بۆ هەرەشەلێکردن لە خەڵك و کە ئیحتمال هەبو ئەمە بێتە هۆی شەڕی ناوخۆ. دەرسێکی تر پێیوتین، لەم وڵاتە کێ خاوەن دەسەڵاتە لەوەی لەحالەتی پێویستدا پێشمەرگە و هێزە چەکدارەکان بخاتە ئینزارەوە؟ کێ خاوەن دەسەڵاتە کە ئیعلانی حەرب بکات بەرامبەر جەماعەتێك؟ کێ خاوەن دەسەڵاتە، ئەمە بکێشێتەوە و کێ خاوەن دەسەڵاتە لەوانە بپرسێتەوە کە غەلەت دەکەن؟ بە غەلەت هێزی پێشمەرگە و ئاسایش و پۆلیس و هێزەکانی حکومەت بەرکادەهێنێت؟ کێ ئەو دەسەڵاتەی داوەتی؟ کێ خاوەن دەسەڵاتە لەو بوارەدا، پێشمەرگە بەئارەزوی خۆی بخاتە ئینزارەوە و دەبابە بێنێتە سەر جادە و قوتە بگرێت و ئوتێلی پێنج ئەستێرە داگیر بکات! کێن ئەوانەی لەم وڵاتە ئەم دەسەڵاتەیان هەیە؟ کێ خاوەن دەسەڵاتە کە لەمانە بپرسێتەوە و بڵێت بۆچی وات کردوە و بەبێ موبەریر، بەبێ ئەوەی سەبەبێکی مەعقول هەبێت هێزی پێشمەرگە دەخەیتە ئینزارەوە بەرامبەر بەهێزێکی سیاسیی تر کە خۆت بە مونافسی سیاسیی خۆتی دەزانی.

KNN: لەسەر ئاستی سیاسیدا، ئەوەی پەیوەندیی بەحیزبە سیاسییەکانەوە هەیە، چ وانەیەك فێر دەبین؟

نەوشیروان مستەفا: لەم وڵاتەدا، سیستمی تاکحیزبی هەیە، لەم وڵاتە تەعەددوییەت بەناو هەیە، لەم وڵاتە حیزبە بچوکەکانیان والێکردوە کە هەمویان وەکو دەسنگەخۆری حیزبە گەورەکانیان لێهاتوە، بودجەیان لەلایەنە ئەوانەوە ئیدارە دەکرێت، لەلایەن ئەوانەوە هەندێك وەزیفە و پۆستیان پێ دەسپێردرێت، لەلایەن ئەوانە رێیان پێدەدەرێت لەهەڵبژاردندا چەند کورسی بێن و لە چەند

وەزارەتـدا بەشـداریی بکـەن، لەبەرئـەوە بەداخـەوە، لـەم وڵاتانـە نەیانهێـشتوە حیـزب بـەمانای سـەردەمییەکەی خـۆی، گەشـە بکـات، بۆئـەوەی ببێـت بـە فاکتـەرێکی کاریگـەر لـەژیانی سیاسیدا، ئەوەی بۆ من زۆر کارێکی سەیر بو، لەپڕێکدا (١٩) حیزبیـان کـۆکردەوە کـە لەڕاسـتیدا هەنـدێکیان دەتـوانین بڵـێین کـارتۆنین کـە لەڕاسـتیدا زەمـانی حیزبـی کـارتۆتی نـەماوە، وەخـتی خـۆی لـە ئـەڵمانیای شـەرقی هـەبوە، لەهەنـدێك وڵاتـی تـر هـەبوە، ئـەم تەقلیـدە خراپـە لەتونس هەبوە، لەمیسر هەبوە و پێویستە ئەم دو حیزبە واز لەو تەقلیدە خراپـە بهێنن، حیزب داتاشن، حیزبی کارتۆنی دروستبکەن، دوکانی سیاسیی بەخـەڵك دابنێن و لەحالەتی پێویستدا بیانهێنن یەك زنجیزە ناو دروستبکەنو بڵێن، وەڵا (١٩) حیـزب یـان (٢٠) حیـزب یـان (٣٠) حیـزب کـە هەنـدێکیان لـە هەقیقەتـدا و جـودێکی ئـەوتۆیان نییـە، هـەر تـەنیا بـۆ کاروبـاری دیعایـەو ئـیعلان بەکاردەهێنرێن، ئەمانە هەندێکیان ناهەقیان نییە، چونکە لـەڕوی سیاسییەوە و لـەڕوی ئیعلامییـەوە و لـەڕوی مالییـەوە لـەژێر دەسـەڵات و هەیمەنـەی ئـەم دو حیزبـەدان کـە ئەگـەر وانەکـەن، سـزایان دەدەن، لەبەرئـەوە بـۆ هەنـدێك حالـەت مەجبورن لەگەڵیان بڕۆن، کە لەڕاستیدا هەقە وانەبێت، هەقە ئەوانە رەئی خۆیان هەبێت، بۆچونی خۆیـان هـەبێت و دو حیزبە دەسـەڵاتدارەکە زۆریـان لێنەکـەن و وازیان لێبهێنن کە بە ئازادی بیروڕای خۆیان دەربڕن.

KNN: لەخالەکاندا باست لە دەرسی رۆشنبیری کرد، مەبەست چی بو؟

نەوشیروان مستەفا: هەمو جوڵانەوەیـەکی سیاسـی لـە دنیـادا، هـەمو حیزبێکـی سیاسـی لـە دنیـادا، پێویـستی بەکۆمـەڵێك خـەڵك هەیـە، پێویـستی بەکۆمـەڵی رۆشـنبیر هەیـە، پێویـستی بەکۆمـەڵێك مامۆسـتای زانکـۆ هەیـە، پێویـستی بەکۆمەڵێك رۆژنامەنوس هەیە، پێویستی بە کۆمـەڵێك موفەکیر هەیە، بەداخـەوە ئـەم تەجروبەیـەی کوردسـتانی عێـراق، فێـری کـردین کـە لـەم وڵاتـەدا دەسـەڵات چینێکی مشەخۆر، یـان توێـژێکی مـشەخۆر لـەناو رۆشـبیران و مامۆسـتایانی

زانکۆ و رۆژنامەنوسان و نوسەرەکاندا دروستکردوە، ئەم چینە مشەخۆرە بەرامبەر بە ئۆتۆمبێل، بەرامبەر بە ئەرزە، بەرامبەر موچەی بەرز، بەرامبەر هەندێك دیاریی و دەستکەوتی مادیی، ویژدانی پیشەیی خۆیان فەرامۆش دەکەن، لەکاتێکدا کە حیزبەکە پێی دەڵێت، هجوم بکە و هێرشبەرە، هێرش دەکات، کە پێی دەڵێت راوەستە، رادەوەستێ، ناچێت بەئەقڵی خۆی بیربکاتەوە، حیزبەکان مەفروزە کۆمەڵێك خەڵکیان هەبێت کە بیریان بۆ بکەنەوە، کۆمەڵێك خەڵکیان هەبێت راوێژیان پێبکەن، کۆمەڵی خەڵکیان هەبێت کە رێگای باشیان پیشانبدەن، نەك لەشکرێك دروستبکات لە رۆشنبیری مشەخۆر و کەی پێیوت هێرشبکات و کەی پێوت راوەستێت، ئەوە دەرسێکە کە بەڕاستی پێویستە سەرکردایەتی کورد ئەوە بە نەزەری ئیعتبار وەربگرێت، لەباتی ئەوەی رۆشنبیرەکانی کوردستان، مامۆستایانی زانکۆ و رۆژنامەنوسەکان و شاعیر و ئەدیب و نوسەرەکان بەو ئیتجاهە بەڕێ بکات و دابەشیان بکات و فێری جنێودان و قسەی ناقۆلاّ و شتی لەو بابەتەیان بکات، تەوجیهیان کات بەئیتجاهی بیرکردنەوە و دۆزینەوەی رێگای راست و بە ئیتجاهی ئەوەی ئەوانە ببن بە دامودەزگای بیرکردنەوە ز دەمودەزگای وا کە خزمەت بەجوڵانەوەی کورد بکەن، نەك بەشداریی بکەن لە موهاتەرات و شەرە جنێو و هجومکردن و ئا لەم بابەتانە.

KNN: ئەو پەندانە، یان ئەو دەرسانەی لە لێدوانەکانی حکومەت و حیزبە بالأدەستەکان کەوتونەتەوە، یان لای ئێوە کەوتونەتەوە، چین؟

نەوشیروان مستەفا: کەلعادە، دەزگاکانی راگەیاندنیان هەمو سەرلەنوێ خستەوەگەڕ بۆ چەواشەکاری و سەرلێشێواندنی خەڵك، بۆ درۆکردن، ئەوانە باسی ئەوە دەکەن، ئێمە دژی دەستورین و دەیانەوێت خەڵك واتێگەیەنن کە ئێمە دەمانەوێت بۆشایی دەستوریی دروستبێت، لەڕاستیدا ئەوەی ئێمە بناسێت، دەزانێت کە لەیەکەم خولی پەرلەماندا ئێمە داوکاری ئەوەبوین، من و رەفیقەکانم داوکاری ئەوەبوین کە هەرێمی کوردستان دەستوری تایبەتی خۆی

هـەبێت و ئـەوە لاكـانى تـر بـون كـە قبوڵيـان نـەكرد، ئێمـە ئێسـتاش لايـەنگرى ئەوەين كە دەستورێكى باش بۆ هەرێمى كوردستان هەبێت، دەستورێك بێت وەكـو دەسـتورەكەى ميسر كـە ئێسـتا رەفـز كـراوە و خـەريكن و دەيانـەوێت بيگۆڕن، يان وەك دەستورەكەى تونس كە ئێستا لەژێر زەبرى كۆمەلانى خەڵكدا مـەجبورن بيگـۆڕن، دەسـتورێكى وا نـەبێت، بـەڵكو دەسـتورێكى بـاش بێـت و دەسـتورێك زۆرايـەتى ميللەتەكـەمان پێـى رازى بێـت و رەنگدانـەوەى بـيرى سياسـى هاوچـەرخ بێـت، نـەك ديكتاتۆرێـك دروسـتكات لـە كوردسـتان، ئێمـە لايـەنگرى هـەبونى دەسـتورێكى باشـين، ئەوانـە باسـى ئـەوە دەكـەن، ئەمانـە حكومەتيان ناوێت، وەكو ئەوەى ئاسايشيان ناوێت، فلأنيان ناوێت، ئەمەش درۆيـە و دەيانـەوێت وا لـە خـەڵك بگەيـەنن كـە دەمانـەوێت بۆشـايى ئـەمنى دروستبێت، ياخود بۆشايى ئيداريى دروستبێت، بەهيچ جۆرێك ئێمە نامەوێت ئـەو بۆشـاييانە دروسـتبێت، ئێمـە وتومانـە، ئـەم حكومەتـە هەڵوەشـێتەوە و حكومەتێكى تەكنۆكراتى ئينتيقالى دروستبێت كە لەمانە باشتر ئيشوكارەكانى بەڕێوەبـەرێت، ئێمـە دەمانـەوێت حكومـەتێك هـەبێت، ئيشى لەبـەر بـڕوات، حكومـەتێك هـەبێت، حيزبايـەتى نەكاتـە ئيـشى ئەساسـى و حكومەتەكـەى ئيستغلال نەكات بۆ بەقوەتكردنى حيزبەكەى خۆى، ئەوانە باسى ئەوە دەكەن كـە دەڵـێن، ئەمانـە خۆيـان بەشـدارييان نـەكردوە لەحكومەتـدا، ئێمـە ئەسـلەن نامانەوێت بەشدارى بكەين لە حكومەت و مەبەستمان ئەوە نييە بەشداربين لە حكومەتـدا، تـۆ وەختـێ كـە ئينتيخابـات دەبەيتـەوە، فـەرزنا ئـەم دو حيزبـە ئينتيخاباتيـان بـردەوە بـە ئەكسەرييەت، يـەكێك (٣٠)و ئـەويتر (٢٩) كورسـى هێناو حكومەتەكەيان دروستكرد و موبارەك بێت، بەلأم لـەخوار وەزارەتەكانـەوە مەفروز نييە لەفەڕاشەوە تا دەگاتە وەكيلى وەزير لە حيزبەكانى خۆيان دابنێن و لەمابەينى خۆيـان دابەشى بكەن، بەڵكو دەبێت واز لـە ميللتەكەمان بهێنن و لـەناو ميللەتەكەمانـدا(١٣٠) هـەزار مامۆسـتامان هەيـە و (٥) هـەزار دكتـۆرمـان هەيە، چەند هـەزارێك محاميان هەيە و چەند هـەزار ئيداريمان هەيەو پياوانى

کاری شارەزامان هەیە و ئەندازیارمان هەیە، واز لەخەڵکە بێنن با لەسەر ئەساسی کەفائەت و لێوەشاوەیی لەخوار وەزیرەوە، گوێ نەدرێتە ئینتمای حیزبی و گوێ نەدرێتە تەسکییەی حیزبی، ئێمە ئەمەمان دەوێت، ئەگەر نا ئێمە نەمانوتوە لەهەمو جێگەیەك ئەگەر یەکێتی و پارتییەکەی لێبێت، ئێمە دەبێت سێیەم بین، قەت باسی شتی وامان نەکردوە، بەڵام ئێمە دەمانەوێت شانبەشانی ئەوانەی یەکێتی و پارتین، خەڵکی تریش لەسەر ئەسایی کەفائەت و لێوەشاوەیی و شارەزایی بتوانێت ببێتە مدیری عام، مدیری مەکتەب، رەئیسی دائیرە و وەکیلی وەزیر، ئەسلەن لەهەمو وڵاتانی دونیا، بێجگە لە وەزیر کە پۆستێکی سیاسییەوەو بڕیاری بەدەستە، پۆستەکانی خوارەوە خەڵکی مەسلەکی دەیگرنەوە، یانی لەگەڵ گۆڕینی وەزیردا ناگۆڕێت، چونکە ئەوان کۆڵەکەی ئەساسی ئەو وەزارەت و دائیرەیەن.

ئینجا دەڵێن، دەیانەوێت پەرلەمان نەمێنێت، یان دەڵێن ئێمە دژی پەرلەمانین و دەمانەوێت بۆشایی قانونی دروستبێت، بەهیچ جۆرێك لەگەڵ ئەوەیان نین، بەڵام ئەم پەرلەمانە ئیفلیج بوە و ناهێڵن هیچ ئیشێکی لەبەر بڕوات، بەناوی زۆرینەوە حکومەت کردویەتی بە دەزگایەکی کارتۆنی و دەزگایەکی ئیفلیج، ئێمە پێمانخۆش نییە پەرلەمان دەزگایەکی ئیفلیج بێت، پێمانخۆشە دەزگایەکی فەعال بێت، پێمانخۆشە موراقەبەی حکومەت بکات و وەزیرەکان بانگ بکات بۆ لێپرسینەوە، پێمانخۆشە کاربەدەستەکانی حکومەت بانگ بکات بۆ لێپرسینەوە، پێمانباشە پەرلەمان مەرجەع بێت، پێمانخۆش نییە پەرلەمانێك دروست بێت، حکومەت بە ئارەزوی خۆی چ قانونێکی بۆ نارد مۆری بکات و بینێرێتەوە، بە قانونیکردنی هەمو کارە ناقانونییەکانی حکومەت بکات، ئێمە نامانەوێت وابێت، ئێمە دەمانەوێت پەرلەمانێکی زیندو و کارا بێت و ئیشوکارەکانی بکات، ئەگینا ئێمە لەگەڵ بۆشایی تەشریعیدا نین، دەمانەوێت پەرلەمان هەبێت، هەتا لە بەیاننامەکەی خۆماندا کە داوامانکردوە، پاش (٣)ی مانگی تر هەڵبژاردن بکرێتەوە، خۆ مەعلوم نییە لە پەرلەمانی داهاتو ئێمە

چەند دەهێنین و پارتی چەند دەهێنێت و یەکێتی چەند؟! خۆ بەم زەبروزەنگە بڕوات، لەوانەیە ئێمە ئەسلەن کورسی کەمتر بهێنێین.

KNN: لە قسەکانی پێشوتدا، باسی چەواشەکاریت کرد، ئەو چەوەشەکارییە، بە رای بەڕێزتان بۆ ترساندنی خەڵکە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، بەشێکی بۆ هەڵخەڵەتاندنی خەڵکە، ئەو چەواشەکارییەی دەیکەن، زۆرجار بۆ تەفرەدانی خەڵکە، بۆئەوەیە خەڵك بەهەڵەدا بەرن و راستییەکان لەخەڵك بشارنەوە، بۆ گەوجاندنی خەڵك و بۆ تاریکاندنی پەرلەمان و بۆ تاریکاندنی راستییەکانە، واتە بۆ تەعتیمی راستییە.

KNN: پەیوەندی بەترسەوە نییە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، بۆ ترساندنیشە، بۆچی نا.

KNN: خەڵك دەترسێت بەو چەواشاکارییانە؟

نەوشیروان مستەفا: بەشێك لەخەڵك دەترسێت.

KNN: لەسەر مەسەلەی گەندەڵیی، ئێوە دەڵێن گەندەڵییەکی زۆر هەیە لە دامودەزگاکانی حکومەتدا، حکومەتیش دەڵێت، بەڵێ هەیە، جیاوازییەکە لەکوێدایە؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە گەندەڵیی کورتناکەینەوە تەنیا لەمەسەلەی دارایی و مالیدا، کۆی ناکەینەوە لەچەند کەسێك کە بەشێوەیەکی نامەشروع پارەیان پێکەوە نابێت، گەندەڵیی لایەنی هەیە، بۆ نمونە، تەسکییەی حیزبی و دامەزراندنی خەڵك لەسەر ئەساسی حیزبی، ئەمە جۆرێکە لەگەندەڵی، قبوڵکردنی خوێندکار لەدیراساتی عولیا لەسەر ئەساسی ئینتیمای حیزبی، جۆرێکە لە گەندەڵیی، دابەشکردنی دامودەزگاکانی حکومەت لەسەر بنچینەی ئینتمای حیزبی، جۆرێکە لە گەندەڵی، ئەمانە دەتوانن بە ئاسانی تەسکییەی حیزبی مەنع بکەن، ئەمانە دەتوانن بەئاسای جارێکی تر وابکەن کە هاوڵاتی کوردستانی خۆی بە هاوڵاتی بزانێ تو خۆی بەخاوەنی ئەم حکومەتە بزانێت و ئیحتیکاری ئاسایش و زانیاری و هێزی پێشمەرگە بۆ دو حیزب، خۆی

لەخۆیدا گەندەڵییە، دەبێت ئەم هێزانە بکرێنە هێزی میللی و نیشتمانی و نەتەوەیی، هێزێك كە هەمو كەسێك بەهی خۆی بزانێت، نەك وەك ئەمجارە یەكێتی و پارتی بەهی خۆی بزانێت و غەیری ئەوە هەمو خەڵك لێی بترسێت و بڵێت، ئەمە هێزی من نییە و هاتوە بۆ شەڕی من، بۆیە گەندەڵی لایەنی هەیە، گەندەڵی سیاسی هەیە، گەندەڵی ئیداریی هەیە، گەندەڵی ئەخلاقی هەیە، گەندەڵی داراییش هەیە، بەڵام بەداخەوە، زۆری ئەو گەندەڵییانە كۆكراونەتەوە لەمەسەلەی داراییدا، كە بێگومان داراییش شتێكی گرنگە، بەڵام واسیتەو واسیتەكاری و مەحسوبییەت، ئەمانە هەمو بەشێكن لە گەندەڵی.

KNN: ئەو باسكردنەوەیەی گەندەڵی، یاخود قەناعەتپێهێنانی لای ئەوان بۆ مەسەلەی گەندەڵی، قەناعەتە یان بۆ ماكیاژكردنە؟

نەوشیروان مستەفا: من بیستومەتەوە لەهەندێك كۆڕوكۆبونەوەی تایبەتی خۆیان، هەندێك كەس باسی ئەوەیان كردوە، با دەستبكەین بە چاكسازی، چونكە چاكسازی درەنگوەخت سودی نابێت، ئێستا بۆ نمونە، لەمیسر لە رۆژانی ئەو شۆڕشەی كە دەستیان پێكرد، كۆمەڵێك چاكسازییان كرد، بەڵام فایدەی نەبو، چونكە سیستمەكە گەیشتبوە حالەتی مردن، هەتا ئێوارە موغەزی بەرێو شریقەی لێبدە، بەناوی ئیسلاحاتەوە، چاك نابێتەوە، چونكە لە تونسیش عەینی بابەت، وەختێك كەوتنە چاكسازی كە ئیتر تازە تێپەڕی بو. لە وڵاتی ئێمە، هێشتا تێنەپەڕیوە، بەڵام ئەوەی من بیستومەتەوە، دەمێكە باسی ئەوە دەكرێت كە لەناو سەركردایەتی حیزبەكان كە چاكسازی بكرێت، بەڵام بەشێك لە دەسەڵاتدارانی ئەم حیزبانە، پێیانوایە كە ئەگەر چاكسازی بكەن لەناو كاروباری حكومەت و لەناو حیزبەكاندا، وەكو ئیتیحادی سۆڤیەتییان لێ بەسەردێت، وەكو گۆرباشۆفیان لێ بەسەربێت كە لەڕاستیدا ئەگەر واشیان لێ بەسەربێت، مەفروزە چاكسازیی بكەن، واتە لەترسی ئەوەیە، ئەوەك بڕوخێن، پێیانوایە كە هەمو چاكسازییەك سەرەتای لەدەستدانی دەسەڵاتە، لەبەرئەوە چاكسازی بۆ چەواشەكاركردنی خەڵك دەڵێن. . . دەڵێن بێعەدالەتی هەیە و

گەندەڵی هەیە و مەحسوبییەت هەیە و تەداخولی حیزب لەکاروباری حکومەت هەیە، ئیّ باشە کە هەیە بڕو چارەسەری بکە، ڕێگەی گونجاو بدۆزەوە بۆ چارەسەرکردنی، تەنیا ئیعترافکردن بەوە کافی نییە، ئیعترافکردن بۆ هەڵخەڵەتاندنی خەڵکە.

KNN: بێجگە لە ئیعترافکردن، وەعدیش دەدەن کە چاکسازی دەکەن، رای ئێوە؟

نەوشیروان مستەفا: هەر بۆ خەلەتاندنی خەڵکە.

KNN: لەماوەی رابردودا، بەهۆی ئەو بەیاننامەیەوە، هێزێکی زۆرتان لەسەر کۆکرایەوە، گەیشتە ئەوەی دەبابەتان روبەڕو بکەنەوە، تا قەناستان روبەڕو بکەن، بە راست ئێوە ناترسن، یان بەدیوێکی تردا پشتتان بەچی قایمە؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە پشتمان بەخوای گەورە و بە میللەتەکەمان قایمە.

KNN: کە باس لە پاراستنی ئەزمونی هەرێمی کوردستان دەکرێت، یەکێتی و پارتی خۆیان دەکەن بەخاوەنی و شانازی ئەو خەباتەی کە لەرابردودا کراوە، پرسیارەکە ئەوەیە کە بەڕێزتان، یان بەشێکی زۆر، چ تۆ چ هاوڕێکانت، بەشداربون لەو خەباتە، ئێوە بۆ باسی ئەو شانازییە مێژوییە ناکەن؟

نەوشیروان مستەفا: پێمانوایە کە ئەوانەی باسی ئەوە دەکەن، بازرگانی پێوە دەکەن، ماوەیەکی زۆر بەسەر راپەڕیندا تێپەڕیوە، (٢٠) ساڵ بەسەر راپەڕیندا تێپەڕیوە، ئەوانەی لە راپەڕیندا تەمەنیان (٥) ساڵ بوە، ئێستا (٢٥) ساڵن، ئەوانەی (١) ساڵ بو، ئێستا (٢١) ساڵن. جیلی دوای راپەڕین خەمەکانی جیاوازە لە ئێمە، خەمی گەنجانی ئێستا، ئەوەیە کە چۆن کاری دەستکەوێت، چۆن بەکەرامەتەوە بژی، چۆن بتوانێت خێزان پێکەوە بنێت، چۆن بتوانێت نەوایەکی هەبێت شەوی تیا بکاتەوە، چۆن سەرچاوەیەکی ژیانی هەبێت، ئەمە خەمی گەنجی ئێستایە، ئێمە بۆئەوەی کۆمەڵەکەمان بۆ پێشەوە بەرین، ناتوانین تۆ وەکو منداڵانی کابرایەکی دەوڵەمەند، بێئەوەی خۆت ئیشبکەیت و تەمەڵ و تەوەزل بیت و دائیمەن بڕۆیت لە سەروەت سامانەکەی باوك و بنەماڵەکەت

بخۆیت، ئاخیرەکەی ئابوت دەبیت، دەبێت هەمو رۆژێك شتێكی زیادە بخەیتە سەری بۆئەوەی ئەو سامانەی بۆیان جێهێشتوە کەلەکە بێت، ئەمانە لەسەر رابردو دەژین، لەسەر میرات دەژیت، ئەمانە بەدرۆ لەسەر خوێنی شەهیدان دەژین، بەدرۆ لەسەر قوربانییەکانی پێشمەرگە دەژین، ئەمەیان کردوە بە وەسیلەیەك بۆ مانەوەی خۆیان لە دەسەلاتدا، (۲۰) سال راپەڕین تێپەڕیوە، چەند سال تێپەڕی بەسەر روخانی سەدام حوسێندا.

بێگومان، من شانازیی دەکەم بەو فەترەیەوە کە پێشمەرگە بوین لەگەل رەفیقەکانمدا و پێمانوایە، کە ئەم تەجروبەیەی ئێستا لە کوردستانی عێراق هەیە، بەشێکی، ئەگەر نەلێم بەشی زۆری، بەشێکی گەورەی ئێمە دەستمان هەبوە لەهێنانە بەرهەمی، ئێمە هەمو تەمەنی گەنجی خۆمانمان لەشاخەکانی کوردستان بەسەر بردوە، لەپێشمەرگایەتیدا بەسەربردوە، بەشی زۆری رەفیقەکانمان شەهید بون، بەلام ئێمە ناچین بیکەین بەمنەت بەسەر میللەتەکەمانەوە و بلێین، ئاوامان بۆ کردون و ناچین هەمو جارێك شتێك بێنە پێشەوە بازرگانی بکەین، ئەگینا منیش دەتوانم هەمو رۆژێك سەد منداڵی شەهید بهێنمە سەر تەلەفزیۆنەکەی خۆمان و قسەبکەن، دەتوانم سەد پێشمەرگە و فەرماندە ئەساسییەکانی پێشمەرگەی کوردستان کە وەختی خۆی دەستیان هەبوە لەهەلگیرساندنەوەی شۆڕشدا لە پاش ئاشبەتال، لە فەرماندە دێرین و گەورەکانی پێشمەرگە، رۆژانە بیانهێنینە سەر تەلەفزیۆن و گالتە بەوانە بکەن کە ئەو زەمانە لەو دیو سنورەوە و یان لەپانا حکومەتی عێراقیدا بون، بەلام ئەمانە ئیشی ئێمە نییە، ئێمە بەرنامەکەمان، بۆ ئێستاو بۆ پاشەڕۆژ، رابردو بەو ئەندازەیەی کە تەجروبەی لێوەربگیرێت، رابردو بەو ئەندازەیەی کە خەلك شانازیی بەسەروەرییەکانی بکات، رابردو بەو ئەندازەیەی لەلای خەلك خۆش و شیرینە، نەك هەمو رۆژێك وەکو حیکایەت بۆی بگێڕیتەوە تا وەکو کابرا توشی مەلەل دەبێت و تەلەفزیۆنەکانی دابخات، ئەگینا بەلێ رابردو

بەشێکی گەورەی هی ئێمەیە، سەروەرییەکانی رابردو، بەشێکی ئێمە دروستمانکردوە.

KNN: یەکێك لە خالە سەرەکییەکانی بەیاننامەکەتان، مەسەلەی مەنعی حیزبە لەکاروباری گشتیدا لە کۆمەڵگادا و بۆچونێك هەیە، تەنانەت لە میسر و تونیش دەستی حیزبی بوە ئەو حالەی دروستکردوە، رای بەڕێزت لەو بارەیەوە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، ئێمە زۆر جار باسی ئەوەمان کردوە، بەیاننامەکەی ئێمە، ئەو پێنج خالەی تیایەتی، پێنج خاڵیان وتنەوەی ئەو قسانەیە کە لە چەند ساڵی رابردو وتومانە، دوبارەکردنەوەی ئەو بەرنامەیەیە کە لەکاتی هەڵبژاردنەکدا بەڵێمان داوە بەدەنگدەرەکانی خۆمان، دو خاڵی تیایە کە مەسەلەی هەڵوەشاندنەوەی حکومەت و هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان و هەڵبژاردنی پێشوەختە بۆ پەرلەمانێکی تازەو بۆ حکومەتێکی تازە، ئەمەی نوێیە، ئەگینا ئەوانەی ترمان هەمو وتوەتەوە، یەکێك لەو بەلاَیانەی کە گەندەڵی لە کوردستانی عێراق هێناوەتە بەرهەم، تەداخولی حیزبە، نەك هەر لەکاروباری حکومەتدا، تەداخولی حیزبە لە بازاڕ، لە زانکۆ، لە رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، لە کاروباری راگەیاندن، هەتا تەداخولی حیزبە لەکاروباری مزگەوتدا، ئەم تەداخولە بوە بە سەبەبی ئەوەی کە جۆرێك لەگەندەڵی سیستماتیکی بەرهەمهێناوە، هەر بۆیە بەرەنگاربونەوەی ئەمەش، نەخشەیەکی سیستماتیکی دەوێت بۆئەوەی چۆن بتوانیت رێگەی لێ بگریت، مەسەلەی تەسکییەی حیزبی هەندێکجار ئیعتراف دەکەن کە هەیە و هەندێکجار دەڵێن، نەخێر شتی وانییە، تەسکییەی حیزبی، یەکێکە لەوانەی کە لەخولی داهاتوی پەرلەماندا ئێمە پڕۆژەیەك تەقدیم دەکەین، ئەوەی بەرتیل دەخواو ئەوەی بەرتیل دەدا،

هەردوکیان بە گوناهبار لەڕوی قانونییەوە حساب بن، داوا دەکەین پرۆژەیەکی قانونی وا بخرێتە بەردەم پەرلەمانی کوردستان و حکومەتی داهاتو جێبەجێی بکات، کە ئەویش ئەوەیە، هەر کەسێك تەسکییە بنوسێت و هەرکەسێك قبوڵی بکات، توشی سزادانی قانونی بێتو سزایەکی بۆ دیاری بکرێت، بۆئەوەی جارێکی تر لەکۆڵ ئەمە ببینەوە، مەسەلەن ئەمە یەکێکە لە نیشانەکانی گەندەڵی، یەکێکە لە نیشانەکانی تەداخولی حیزبی لەکاروباری حکومەتدا، تۆ ئەگەر حیزبی نەبیت، ناتوانیت هیچ پۆستێك لە پۆستە گرنگەکانی کوردستانی عێراق وەربگریت، بێگومان نەك هەر پۆستە گرنکەکان، ناتوانیت پۆستە نیمچە گرنکەکانیش وەربگریت، ناتوانیت ببیت بە مودیری ناحیەیەك، ناتوانیت ببیت بە قایمقام، ناتوانیت ببیت بە سەرۆکی شارەوانی، ناتوانیت ببیت بە سەرۆکی زانکۆ، ئەمە یەکێکە لەو شتانەی کە وەخێتك ئێوە باسی مەنغی حیزبی دەکەن لە کاروباری گشتی، ئێمە مەنعی حیزبایەتی ناکەین، ئێمە خۆمان حیزبین و خۆمان پێمانوایە حیزب کۆلەکەی ئەساسی ژیانی دیموکراسییە، بەلاّم سیستمی تاکحیزبی و دروستکردنی حکومەتی حیزب، ئەمە حکومەتی حیزبە، ئەمە دەولەتی نەتەوە نییە، ئێمە دەمانەوێت حکومەتی نەتەوە و دەولەتی نەتەوە دروستبێت، ئەمانە حکومەتی حیزبی دروستدەکەن و دەولەتی حیزبی دروستدەکەن.

KNN: قسەیەك هەیە کە نییەتی پشت بەیاننامەکەی ئێوە، بریتی بوە لەتێکدان و لە کودەتاو لەو چوارچێوەیەشدا، داوادەکەن کە پێویستە ئێوە داوای لێبوردن لە خەڵکی کوردستان بکەن؟

نەوشیروان مستەفا: ئەگەر داوای لێبوردن بێت، من پێموایە دەبێت ئەوان بێن و ئیعتزار بهێننەوە بۆ گەلی کوردستان، چونکە نیگەرانی و دلەڕاوکێ و پەژارەو ترسیان خستە ناو بازاڕ و ناو خەڵك، پێویستە ئیعتزار بهێننەوە بۆ هێزی پێشمەرگە، لەبەرئەوەی جارێکی خەریك بو سومعەی هێزی پێشمەرگە بشکێنن و تێوەی بگلێنن لە شەڕێکی ناوخۆدا، پێویستە ئیعتزار بهێننەوە بۆ بزوتنەوی گۆڕان، چونکە تۆمەتی نارەوا و جنێویان داوە بە بزوتنەوەی گۆڕان، ئەوان دەبێت ئیعتزار بهێننەوە.

KNN: قسەیەك هەیە کە ئێوە بەتەمای خۆپیشاندان بون؟

نەوشیروان مستەفا: ئەوە درۆیە، ئەگەر ئێمە خۆپیشاندان بکەین، ئێمە ئێستا خۆمان رێکخستوە لەهەمو شارەکاندا سەدان کەسمان رێکخستوە، خۆپیشاندان سازدانی جەماوەری دەوێت، خۆپیشاندان دەیەوێت خەڵك کوڵان بەکوڵان، دوکان و بەدوکان، دائیرە بە دائیرەو ماڵ بە ماڵ بگەڕێت بۆئەوەی خەڵك کۆبکرێتەوە لەسەر جادەکان، ئێمە شتی وامان نەکردوە، ئەوانەی کە باسی کودەتا دەکەن، بەڕاستی جارێکی دیکەش باسمکرد، ئەمانە فکریی سیاسییان زۆر موتەخەلیفە، عەقلیەتی سیاسییان دواکەتوە، عیملی سیاسەت نازانن، ئینقیلاب چۆن بە هێزێك دەکرێت کە هێزی چەکداری نەبێت، لە ولاتێکدا چۆن ئینقیلاب دەکرێت کە هێزەکانی تر هەمو حیزبین و هەر موئەسەی عەسکەری تێدا نییە تا بەهۆی موئەسەی عەسکەرییەوە ئینقیلاب بکەن، خۆمان هێزمان نییە، ئینقیلابی پێبکەین، ئینقیلاب تەعریفێکی دیاریکراوی هەیە لە عیلمی سیاسییدا، خۆپیشاندان جیایە، راپەڕین جیایە، ئیعتسام جیاوازە، مانگرتن

جیاوازه و هەر یەکە تەعریفی خۆی هەیە، بەلام ئەو بەدرۆ دەڵێ کودەتایە، کودەتای چی. . .

KNN: دوای ئەم قەیرانە، یان وەك خۆت وتت، دوای ئەم تەنگژەیە، ئاسۆکانی چارەسەر چۆن دەبینن؟

نەوشیروان مستەفا: ئاسۆکانی چارەسەر، بەشێکی بە دەست دەسەلاتە و بەدەست حیزبەکانی دەسەلاتە، کە دەڵێم دەسەلات، بەڕاستی من پێم سەیرە کە زۆرجار باسی ئەوە دەکەن هیچ وەزیرێکیان نەهێناوە بیدەن بەدادگا لەسەر گەندەڵی، ئێ گەندەڵی ئەسلەن لە سەرکردایەتی حیزبەکاندایە، بۆ باسی سەرکردایەتی حیزبەکان ناکەن و وەزیری قوڕ بەسەر چی بکات، هەندێك لە وەزیرەکان بەڕاستی ئینسانی زۆر زۆر باشو رێکوپێکن.

چی بکرێت، لەڕاستیدا ئەوە کەوتوەتە سەر ئەوەی کە یەکێتی و پارتی بڕیاریان داوە چی بکەن، ئەگەر دەرگای گفتوگۆ بکەنەوە بۆئەوەی سەرلەنوێ جارێکی تر گفتوگۆی دەستور بکرێت، سەرلەنوێ گفتوگۆی ئەو قانونە خراپانە بکرێت کە تەجروبەی تونس دوبارە ناکاتەوە.

KNN: واتە ناوەڕۆکی بەیاننامەکەی خۆتان، وەکو نەخشەی رێگەیە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، ئێمە سورین لەسەر بەیاننامەکە و دەرگای گفتوگۆ بکرێتەوە بۆئەوەی چۆن چارەسەری گەندەڵی و تەداخولی حیزب و مەسەلەی عەدالەتی ئیجتماعی و مەسەلەی شەفافییەتی میزانییە و هەمو ئەو مەسەلانەی کە لەبەیاننامەکە باسمانکردون، گفتوگۆی بکەین و بەیانەکەی ئێمە بەیانێکی ئیستیباقییە، بەیانێکە پێشتر هۆشیاریی داوە بە کۆمەڵێك لەو حیزبانە کە

دەڵێن، پێش ئەوەی گەردەلولەکە بێتە کوردستان، با دانیشین و چارەسەری بکەین.

KNN: بەوپێیەی کە خۆتان فراکسیۆنێکی (٢٥) کەسیتان هەیە لە پەرلەمان، مەسەلەی تەفعیلی پەرلەمان کە لە بەیاننامەکەتاندا هاتوە، تا چەند مەبەستە؟

نەوشیروان مستەفا: ئەو پەرلەمانەی ئێستا هەیە، بڕواناکەم بەو تەرکیبەوە بتوانێت تەفعیل بکرێت، ئومێدم وایە، تەفیعیل بێت.

KNN: لەماوەی رابردوداو پێشئەوەی بزوتنەوەکەی ئێوە دروستببێت، خەڵك بۆخواستی جیاجیا رژاوەتە سەر شەقامەکان، سەبارەت بەخواستەکانی خەڵك لەئێستادا، لەچەند ئاستێکدا دەبینرێت، رات چییە؟

نەوشیروان مستەفا: ئاستی خەڵك، پێموایە ئاستی داواکارییەکان گواستراوەتەوە، لە مەسەلەی زێراب و کارەبا و ئاو گۆڕاوە بۆ مەسەلەی ئیسلاحی سیاسی و ئیسلاحی ئیداریی و ئومێدم وایە لەو حەدەدا بوەستێت، چونکە ئەگەر وانەبێت، گەشەدەکات بۆ داواکاری گۆڕینی بنەرەتی، وەکو باسمکرد، ئەو گەردەلولە بەڕێکا، خەڵك داوا دەکات، ئازادی هەبێت، داوا دەکات حکومەتێکی باشی هەبێت، داوا دەکات پەرلەمانێکی باشی هەبێت، محاسەبەی ئەوانە بکرێت کە کەموکوڕییان هەیە، عەدالەتی ئیجتیماعی جێبەجێ بکرێت و ئەمانە هەموی کاری ئاسانن، کارێك نین کە بڵێین ئەمانە موستەحیلن.

KNN: لەم بەرنامەیەدا، باسمان لەکۆمەڵێك تەوەری زۆر کرد، بەتایبەت ئەو دەرس و پەندانەی چ لە تونس و چ لە میسر و هەرێمی کوردستان وەرمانگرتون، دوا قسەتان لەم بەرنامەیدا چی دەبێت؟

نەوشیروان مستەفا: من حەزدەکەم لەدوا قسەی خۆمدا، چیرۆکێکی فۆلکلۆری بگێڕمەوە، لەناو کورددا وا باوە و دەڵێن، مەلائیکەی گیانکێشان ناوی ئیزرائیلە، کابرایەك ئیزرائیل دۆستی دەبێت و پێی دەڵێت، تکات لێدەکەم، هەر وەختێك ویستت گیانم بکێشیت، پێشتر ئاگادارم بکە، لەپاش فەترەیەك، دەچێتە لای بۆئەوەی گیانی بکێشێت و دەڵێت، من و تۆ واڕێکەوتین کە پێشتر ئاگادارم بکەیت، ئەویش دەڵێت، پێشتر ئاگادارم کردویت، دەڵێت چۆن، دەڵێت گیانی یەکێکم لەلای چەپەوە کێشا کە دراوسێت بو، لەلای راستیشەوە گیانی دراوسێیەکی تۆم کێشا، دەبوایە بزانیت کە گیانکێشان، سەرەکەی گەیشتوەتە سەر تۆ.

من ئومێدم وایە، تونس و میسر بوبێتە دەرسێکی گەورە بۆ سەرکردەکانی کورد، پێشئەوەی ئیزارئیل بێت، ئەوان خۆیان عیلاجێکی وەزعەکە بکەن

# ئەم زمانە سیاسییەی کە ئەم جەماعەتە ئەمجارە بەکاریانهێناوە لەم بەیانەدا بەڕاستی نیشانەی دواکەوتنە لە بیری سیاسیدا

سازدانی: هۆشیار عەبدوڵا

لە بەرنامەی روبەڕوی کەناڵی ئاسمانی KNN نەوشیروان مستەفا باس لە هۆکاری بڵاوکردنەوەی بەیاننامەکەی ٢٩-١-٢٠١١ی بزوتنەوەی گۆڕان دەکات، هاوکات رایدەگەیەنێت: "ئێمە هەر لەسەرەتاوە جوڵانەوەکەمان، نیەتی ئەوەی هێناوە کە جوڵانەوەیەکی هێمنانە بێت، جوڵانەوەیەکی ئاشتییانە بێت، جوڵانەوەیەکی دیموکراتیانە بێت، جوڵانەوەیەك بێت پشت ببەستێت بە خەباتی مەدەنی، هەمو شێوەکانی توندوتیژیمان پێ خراپە"

KNN: سەرەتا با لەو بەیاننامەیەوە دەست پێبکەین کە بزوتنەوەکەتان لە ٢٩-١-٢٠١١ بڵاویکردەوە، ئەم بەیاننامەیە بۆ؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە وا هەست دەکەین لە هەرێمی کوردستان قەیرانێك و ئەزمەیەکی قوڵ هەیە کە چەند لایەنێکی هەیە، قەیرانەکە لایەنی سیاسی هەیە، لایەنی ئابوری هەیە، لایەنی کۆمەڵایەتی هەیە، لایەنی رۆشنبیری و. . . لایەنی جیاجیای هەیە، ئەم قەیرانە ئێمە پێمانوایە ئەوەی کە مەسئولە لە دروستبونی و ئەوەی مەسئولە لە چارەسەرنەکردنی تائێستا بەڕادەی یەکەم و لە پلەی یەکەمدا دەسەڵاتە، وەکو چۆن ئەوان سیناریۆی خۆیان هەیە سیناریۆکەیان بۆ چارەسەرکردنی ئەو ئەزمەیەی کە ئێستا لە هەرێمی کوردستاندا لە ئارادایە، بریتییە لە درێژەپێدانی دەسەڵاتی خۆیان، ئێمەش لەلای خۆمانەوە وەك هێزێکی سیاسی سیناریۆی تایبەتی خۆمان هەیە بۆئەوەی کە چۆن لەم قەیرانە دەرئەچیتە دەرەوە و چۆن چارەسەری ئەم قەیرانە دەکەیت بە چ رێگەیەك

چارەسەری دەکەین، ئەو بەیانەی ئێمە بریتییە لە سیناریۆیەکی سیاسی بۆ چارەسەرکردنی ئەو قەیرانە قوڵەی کە چەند ساڵە کوردستانی عێراق بەدەستییەوە دەناڵێنێت، ئەمە وەکو ئەوان باسی دەکەن نە کودەتایە و نە ئینقلابە و نە ئاژاوەگێڕییە و نە شتێکی خراپمان کردوە.

ئێوە خۆتان دەزانن لە چەند مانگی رابردودا لە عێراقدا هەڵبژاردن کرا چەندین جار هێزە سیاسییەکان داوای ئەوەیان کرد کە حکومەتەکەی مالیکی ببێت بە حکومەتی کار بەرێکردن (تصريف اعمال) یان حکومەتەکەی هەڵبوەشێنرێتەوە و حکومەتێکی تەکنۆکرات دابمەزرێت و ئەو حکومەتە لەکاربخرێت، چەندجار داوایان کرد کە ئەو پەرلەمانەی لە عێراقدا هەیە هەڵبوەشێنرێتەوە و سەرلەنوێ هەڵبژاردن بکرێتەوە، کەسیش نەچو بەگژیانا و کەسیش ئەمەی بە ئینقلاب و بە موئامەرە و بە پیلانی بێگانە ناونەبرد، ئەم بەیاننامەیەی ئێمەش سیناریۆیەکە و پێمانوایە چاکترین سیناریۆیە بۆ چارەسەرکردنی ئەو قەیرانەی کە ئێستا کوردستانی عێراقی تێدایە.

KNN: کاردانەوەی ئەوانت چۆن بینی؟ یان هەڵوێستت سەبارەت بە کاردانەوەکەی ئەوان چییە؟

نەوشیروان مستەفا: من بەلامەوە سەیرە دو حیزب کە خۆیان بە خاوەنی توراسێکی سیاسی زۆر ئەزانن و پێیانوایە کە تەجروبەیەکی سیاسی دورودرێژییان هەیە لەبواری موعارەزەکردن و لەبواری مقاوەمەکردن و لەبواری حوکمڕانیدا بەو زمانە سیاسییە قسە بکەن، لەلای من زمانی سیاسی هەر رێکخراوێکی سیاسی هێنەرەوەی ئەقڵی سیاسی ئەو رێکخراوە سیاسییەیە، ئەم زمانە سیاسییەی کە ئەم جەماعەتە ئەمجارە بەکاریانهێناوە لەم بەیانەدا بەڕاستی نیشانەی دواکەوتنە لە بیری سیاسیدا، ئەو وشانەی کە بەکاریانهێناوە وەکو تێکدەر و گێرەشوێن و ئاژاوەچی و کودەتاچی و. . . هتد، ئەمانە ئەچێتە خانەی جنێوی سیاسییەوە، ئەچێتە خانەی تەشهیرەوە، ناچێتە خانەی گفتوگۆی سیاسییەوە، من بەداخەوەم کە ئەوانە بەو رێگەیە بەرپەرچی

بەیاننامەکــەی ئێمــەیان دایــەوە، ئێمــە پێمــانوابو کــە ئەوانــە دادەنیــشن لێکۆڵینــەوەی لەســـەر دەکــەن و ئــەوانیش بــەدیلی خۆیانیــان دەبێــت بــۆ گفتوگــۆکردن لەوبارەیــەوە، ســیناریۆیەکی لــەوەی ئێمــە چــاکتر و ئاقڵانــەتر بەتایبەتی کە ئێستا دەسەڵات بەدەست ئەوانەوەیە شتێکیان بخستایەڕو، نەك بەو ئسلوبەی لە بەیاننامەکەیاندا بڵاویانکردۆتەوە.

KNN: باسی زمانت کرد، قسەیەك لەسەر ئێوە دەکرێت کە زمانی سیاسی ئێوە یان زمانی راگەیاندنی ئێوە زمانێکی توندە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ وامان پێ ئەڵێن! بێگومان ئەوە دەسەڵات وامان پێ ئەڵێت، رەنگە هەندێك لە دۆستەکانیشمان وامان پێ بڵێن، بەڵام بائێستا ئێمە هەق و حسابێك لەگەڵ یەکتریدا بکەین، چ بۆشاییەکیان بۆ ئێمە هێشتوەتەوە کاری تیا بکەین، دەسەڵاتی تەشریعی کە بریتیە لە پەرلەمان بەناوی زۆرینە و کەمینــەوە دەســتیان گرتــوە بەســەریدا بــەئارەزوی خۆیــان دەیــسوڕێنن کــەی بیانــەوێت کــۆی دەکەنــەوە کــەی بیانــەوێت بــڵاوەی پــێ دەکــەن، چ یاسـایەکیان بوێت تێی دەپەڕێنن، بەمانایەکی تر واتا دەسەڵاتی تەشریعیان داگیرکردوە، دەسەڵاتی تەنفیزی کە خۆی لە ئەنجومەنی وەزیراندا دەنوێنێت، بەڵێ قبوڵمانە ئەنجومەنی وەزیران نوێنەری ئەو دو حیزبەی دەسەڵات و چەند حیزبێکی ترە کــە بەشــدارن لەگەڵیانــدا، بــەڵام لــەخوار وەزارەتەکانــەوە هــیچ جێگایــەکیان نەهێشتوەتەوە بۆ ئێمە، لەخوار وەزارەتەکانەوە ئێمە وەکو خەڵکی ئەم وڵاتە هەقی ئەوەمان هەیە لە بریکاری وەزیری تەکنۆکرات، لە بەڕێوەبەری گشتی، لە بەڕێوەبــەری قوتابخانــە، لــە قایمقــام، لــە بەڕێوەبــەری ناحیــە، لــە ســەرۆکی شــارەوانی لــە بەڕێوەبــەری پــۆلیس و. . . هتــد، لەمانەشــدا مــن نــاڵێم بــەشمان هەبێت، بەڵام بەگوێرەی ئەو کەسانەمان کە کەفائەتیان هەیە پێویستە رەچاوی ئێمە بکرێت، بەڵام ئەوان هەرچی لە حیزبەکانی خۆیان نەبێت و هەرچی ملیان بۆ کەچ نەکات، هەرچی گومانیان لێ کردبێت کە سەربە بزوتنەوەی گۆڕانە، یان مــەیلێکی بــەلای بزوتنــەوەی گۆڕاندا هەیــە، هــەوڵیان داوە دەری بکەنــە دەرەوە،

تەنانەت لەم دواییەدا ئەو چوار مامۆستایەی کە کاتی خۆی بەڕێوەبەری قوتابخانە بون و ئێستا چونەتەوە بۆ قوتابخانەکانیان، بەڕێوەبەی قوتابخانەکانیان قبولْ ناکەن بێنە شوێنیان و پێیان دەڵێن هەتا لە مەڵبەندەوە فەرمانمان بۆ نەیات ئێمە دەوروتەسلیمتان لەگەڵ ناکەین، بە مانایەکی تر دەسەڵاتی جێبەجێکردنیشیان بەڕوی ئێمەدا داخستوە و هیچ مەجالێکی ئەوەمان نیە کە بتوانین ئێمە لەبواری دەسەڵاتی جێبەجێکردندا خزمەتێك بە میللەتەکەمان بکەین، لەبواری دەسەڵاتی دادوەریشدا خەریکن ئەو دەسەڵاتە بەرەو بەسیاسەتاویکردن دەبەن، رقیان لەهەر کەسێك بێت، بیانەوێت لەهەر کەسێك شکات بکەن، دەیکەن و ئیعاز ئەدەن کە سزابدرێن، بێجگە لەمەش بۆ بەدبەختی کورد لە کوردستاندا دو دەسەڵاتی تریش هەیە کە یەکێکیان دەسەڵاتی هێزە چەکدارەکانە، ئەوی تریشیانْ دەسەڵاتی راگەیاندنی حیزبییە، دەسەڵاتی هێزە چەکدارەکانیش کە بریتییە لە پێشمەرگە و ئاسایش و پۆلیس و زانیاری و پاراستن، ئەمانە هەموی لەژێر دەسەڵاتی خۆیاندایە، هیچ مەجالێکیان بۆ ئێمە نەهێشتوەتەوە کە بەشدارییان تێدا بکەین، دەسەڵاتی راگەیاندنیش نزیکەی چەند سەد کەناڵی ئاسمانی و ناوخۆیی و رادیۆ و رۆژنامە و گۆڤاریان هەیە، ئێمە تەنها یەك تەلەفزیۆنمان هەیە و یەك رادیۆمان هەیە و یەك رۆژنامەی هەفتانەمان هەیە و یەك سایتی ئەلەکترۆنیمان هەیە، لەبەرامبەردا ئەوان لەسەر و ٤٠٠ دەزگای جیاجیای راگەیاندنیان هەیە، لەبەرئەوە ئێمە هیچ مەجالێمان بۆ نەماوەتەوە نە لە دەسەڵاتی یاسادانان، نە لە دەسەڵاتی جێبەجێکردن، نە لە دەسەڵاتی دادوەری، واتە غەیری ئەوە، ئەو بۆشاییەی کە بۆ ئێمەیان نەهێشتوەتەوە ئێمە ئەگەر قسە نەکەین چی بکەین؟

KNN: چاوەڕوانی ئەوە ناکەن ئەو بەیاننامەیە جۆرێك لە توندوتیژی لێ بکەوێتەوە؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە هەر لەسەرەتاوە جوڵانەوەکەمان، نیەتی ئەوەی هێناوە کە جوڵانەوەیەکی هێمنانە بێت، جوڵانەوەیەکی ئاشتییانە بێت،

جولانەوەیـەکی دیموکراتیانـە بێـت، جولانەوەیـەك بێـت پـشت ببەسـتێت بـە خەباتی مەدەنی، هەمو شێوەکانی توندوتیژیمان پێ خراپە، بگرە ئێمـە خۆمـان بەشداریمان کردوە لە دروستکردنی ئەو دەمودەزگایەی کە ئێستا لـە هـەرێمی کوردستـاندا هەیـە، لـە بیناکانیـدا لـە شـەقام و ڕێگاوبانەکانیـدا، بۆیـە هـەرگیز پێمان خۆش نیە شتێك کە ئێمە و میللەتەکەمان بە ٢٠ سالٚ دروستمان کـردوە، لـەماوەی دو سـێ ڕۆژدا بڕوخێـت و تـەفروتونا بکرێـت، بـە تـەئکید ئێمـە لەگـەلٚ توندوتیژیدا نین و پێمان خۆش نیە، داوامان لـە کەسیش نـەکردوە توندوتیژی بنوێنێـت، هـەروەها ئێمـە هـیچ ئـامرازێکی توندوتیژیـشمان بەدەستەوە نیـە کـە بەکاری بهێنین، ئێمە هێزی چەکدارمان نیە، هێزێکـی سیاسـین، ئێمـە هێزێکـی جـــەماوەریمان هەیـــە کـــە بـــێ چـــەکە، هـــیچ دامەزراوەیـــەکی ســـەربازی و دامەزراوەیـەکی ئیرهابیمـان نیـە تـا بـەکاری بهێـنین، ئـەوە لایەنـەکانی تـرن کـە دامەزاروەی لەو بابەتەیان بەدەستەوەیە و دەتوانن ئیرهابی سیاسـی و فیکـری و کۆمەلایەتی بکەن.

KNN: باس لەوە دەکرا لە پەیوەندیتان بە هێزەکانی ترەوە، یاخود لەشێوازی کارکردنتانـدا بـاس لـەوە دەکـرا کـە لانـی کـەم لـە بەغدا جۆرێـا ، لـە یـەکڕیزیتان هـەبێت، بـەلام هـەرز و ئـەم یەکڕیزییـە جۆرێـك لـە کـەلێنی تێکـەوت، بۆچـونت لەوبارەیەوە چیە؟

نەوشیروان مـستەفا: ئێمـە سـەبارەت بـە یـەکڕیزی کـورد یـاخود ڕۆشـنتر بڵـێم، سـەبارەت بـەوەی کـەپێی دەوترێـت ئاسایـشی نەتـەوەیی یـان ئاسایـشی نیـشتیمانی کـورد، ئێمـە بۆچـونەکانمان لەگـەلٚ ئەوانـدا جیـاوازە، ئـەوان بۆچـونەکانی خۆیـان بینـا کـردوە لەسـەر بنـەمای دروسـتکردنی دوژمـن، هەنـدێکجار دوژمـنی وەهمـی، ئێمـە پێمـان وایـە یـەکڕیزی کـورد، ئاسایـشی نیـشتمانی کـورد، ئاسایـشی نەتـەوەیی کـورد، لـەناو کۆمـەڵگای کوردسـتانی عێراقـەوە دەسـتپێدەکات، ئەگـەر ئێمـە لێـرە لـەنێوان خۆمانـدا بتـوانین ئاشـتی کۆمەلایەتی بەدەستبهێنین، بە مانایەکی تر واتا ستەمی کۆمەلایـەتی نـەمێنێت،

جیاوازی نێوان چینەکان کەم ببێتەوە، عەدالەتی کۆمەڵایەتی هەبێت بۆ ئەوەی هەمو چین و توێژەکانی کۆمەڵ هەست بەوە بکەن بەشیان هەیە لە سامان و دەسەڵاتی ئەم وڵاتەدا، ئەگەر ئێمە بتوانین جۆرێك لە لێکتێگەیشتنی سیاسیمان هەبێت لەسەر ئەوەی کە کێ دوژمنە، کێ دۆستە کێ ناحەزە، تێگەیشتنی سیاسیمان هەبێت لەسەر ئەوەی کە ستراتیژی جوڵانەوەکەمان چییە؟، چوارچێوەی ستراتیژی جوڵانەوەی کوردستانی عێراق و سیاسەتی دەرەکی و ناوخۆیی هەرێمی کوردستان و مەسەلەی ئازادی دەربڕین، ئەو مەسەلە گرنگانەی کە پەیوەندییان بە ژیانی خەڵك و ئێستا و داهاتوی گەلەکەمانەوە هەیە، بەو جۆرە دەتوانین یەکڕیزی دروست بکەین، ئەو کاتە لە بەرامبەری دەرەوەشدا دەتوانیت یەکڕیز بیت، بەو مەنتیقە ئێمە پێمان وایە یەکڕیزی کورد لەناو کوردستانی عێراقەوە دەستپێدەکات، ئەگەر ئێمە بتوانین لێرە لەیەك تێ بگەین بۆئەوەی کە چۆن یەکڕیز بین، دەتوانین لە بەغدا و لە واشنتۆن و لە لەندەن و لە تاران و لە دیمەشقیش یەکڕیز بین، بەڵام ئەگەر ئەو بیەوێت بەناوی دوژمنی وەهمی و هەندێك دروشمی نادروستەوە لێرە غەدرمان لێ بکات و زوڵممان لێ بکات، لەلایەکەوە ئاشتی کۆمەڵایەتی بخاتە پشتگوێ و لەلایەکی ترەوە ئازادی سیاسی پشتگوێ بخات، لەلایەکی ترەوە هێزەکانی تر بخاتە پەراوێزەوە و بۆچونەوەکانیان بە هەند وەرنەگرێت و داوای یەکڕیزیشمان لێ بکات، ئێمە پێمان وایە یەکڕیزی بەو شێوەیە دروست نابێت، یەکڕیزی لەپێشدا لە کوردستانی عێراقەوە دروست دەبێت.

KNN: پەیوەندییەکانی ئێوە لەگەڵ یەکێتی و پارتی بەگشتی چۆنە؟

نەوشیروان مستەفا: یەکێك لە نیشانەکانی ئەو قەیرانەی کە ئێستا لە کوردستانی عێراقدا هەیە، رەهەندێکی سیاسی ئەو قەیرانە بریتییە لەو پەیوەندییە ناتەندروستەی کە لەنێوان ئێمە و حیزبەکانی دەسەڵاتدا هەیە، ئەم حیزبانە هەر فێری ئەوە بون پێیان بڵێیت قوربان، فێری ئەوە نەبون رەخنەیان لێ بگریت، بۆیە دەبینین لەوکاتەوەی کە بزوتنەوەی گۆڕان دامەزراوە و

فراکسیۆنەکانی کەوتوەتە ئیشکردن بەچاوی دوژمن تەماشای ئێمە دەکەن لەکاتێکدا ئێمە دوژمنی ئەوان نین، ئێمە لەسەرەتای دروستبونمانەوە لەگەڵ ئەوەدا بوین کە پەیوەندییەکی تەندروست لەنێوان گۆڕان و حیزبەکانی تردا دروست ببێت، راستە ئەوان لە حکومەتدان و ئێمە ئۆپۆزسیۆنین و لە دەرەوەی حکومەتین، بەڵام خۆ ئێمە دەمانتوانی لەسەر کۆمەڵێك شتی ئەساسی کە پەیوەندی بە ژیانی رۆژانەی میللەتەکەمان و ئێستا و داهاتوی میللەتەکەمانەوە هەیە دەمانتوانی مامەڵە بکەین و رێکبکەوین، ئەو پەیوەندییە ناتەندروستەی کە لەنێوان بزوتنەوەی گۆڕان و پارتی و یەکێتیدا دروست بوە، بێگۆمان ئەوە یەکێکە لەو لایەنانەی کە ئێستا لە هەرێمی کوردستان قەیرانە سیاسییەکەی قوڵتر کردوەتەوە.

KNN: ئەی پێتان وایە لەزۆر ئاستدا بزوتنەوەکەتان بزوتنەوەیەکی مەغدورە، بەتایبەت لە پەیوەستدا بەمەسەلەی بودجە و کۆمەڵێك رەهەندی تر؟

نەوشیروان مستەفا: من نامەوێت باسی مەغدوریەت و شتی لەو بابەتانە بکەم، هەر بەتەنیا مەسەلەی بودجە نیە، تائێستا مەسەلەی سزای سیاسی و ئەو کەسانە ماوە کە سزا دراون، تاوەکو ئێستاش تیرۆری سی سی هەیە، لە فەرمانگەکاندا هەرچی گومانی لێ بکەن کە دۆستی ئێمە یان سەر بە ئێمەیە یان لایەنگری ئێمەیە نەقڵی دەکەن یان دوری دەخەنەوە و هەڕەشەی لێ دەکەن و سزای دەدەن، کۆمەڵێك شتی لەو بابەتە هەیە، تا ئێستا بێجگە لە پەرلەمان، دولاکەی تر، ئەملایان لەترسی ئەولا یان ئەولا لەترسی ئەملا بەهۆی ئەوەی کە رێککەوتنێکی ستراتیژییان هەیە نەیانوێراوە پەیوەندییەکی ئاسایی دروست بکەن، هەر کاتێکیش لەگەڵ ئێمە پەیوەندییەکی ژێربەژێریان دروستکردوە، ویستویانە وەکو گورگەکەی هەیاسی خاس ئێمە بەکاربێنن بۆ ترساندنی لایەنەکانی تر، وەکو لە رابردودا یەکێتی ویستی لەگەڵ ئێمەدا خۆی نزیك بکاتەوە بۆ ئەوەی وەکو هۆکارێکی فشار بەکارمان بێنێت و وەزارەتێك لە وەزارەتەکانی بەغدا وەربگرێت و وەریشی گرت.

KNN: پەیوەندیتان لەگەڵ حیزبە ئۆپۆزسیۆنەکان لە کوردستاندا چۆنە؟
نەوشیروان مستەفا: ئێمە پەیوەندیمان لەگەڵ ئەوان ئاساییە، بێگومان جیاوازی هەمیشە دەبێت لە بۆچوندا، چونکە ئەوان خۆیان ئایدیۆلۆژیەتی سیاسی خۆیان و بەرنامەی خۆیانیان هەیە، ئێمە رێزمان هەیە بۆ بەرنامەی سیاسی و ئایدیۆلۆژیای ئەوان، بەلأم لەسەر کۆمەڵێك شتی زۆر گرنگ لەناو کوردستانی عێراقدا، لەناو پەرلەماندا ئێمە پێکەوە هاوکاری دەکەین، من دەمەوێت لێرەدا ئەوە باس بکەم کە دو حیزبە دەسەلأتدارەکەی هەرێم، نەك هەر خۆیان نەیانهێشتوە و نەیانویستوە پەیوەندی لەگەڵ ئێمەدا دروست بکرێت، بەڵکو فشاری زۆریش لە هەمو لایەنەکانی تریش دەکەن بۆئەوەی ئێمە دابڕێنن و پەراوێزمان بخەن، زۆرجار فشار لە حیزبەکانی تریش دەکەن بۆئەوەی کە لە ئێمە دور بکەونەوە، بەلأم بۆ خۆشبەختی تائێستا نەیانتوانیوە ئەو حیزبانەی کە لەناو پەرلەماندا پێکەوە کاردەکەین، وا بکەن درز بخەنە نێوانمانەوە.
KNN: پێگەی بزوتنەوەی گۆڕان بەرامبەر بە یەکێتی و پارتی چۆن دەبینن؟
نەوشیروان مستەفا: ئێمە پێمان وایە رۆژ بەرۆژ تەرازوی هێز بەلای ئێمەدا دەشکێتەوە و بەهێزتر دەبین.
KNN: ئێوە پێتان دەوترێت ئۆپۆزسیۆنێکی دژن و هەمیشە رەش بە سپی دەبینن و سپی بە رەش دەبینن، باس لەوە دەکەن بۆ نمونە هەر پرۆژەیاسایەك کە دێتە پەرلەمان ئێوە رەتی دەکەنەوە و پێی ناڵێن بەڵێ؟
نەوشیروان مستەفا: ئەمەش یەکێکی ترە لەو قسانەی کە دەخرێتە پاڵ ئێمە، کە لە راستیدا هیچ بنەمایەکی نییە، لە پەرلەمانی کوردستاندا ئێمە فراکسۆنێکمان هەیە کە کەمینەیە، ئەوانی تر زۆرینەن، وەکو پێشتر ئاماژەم پێکرد ئەوانە لە رێگەی ئەو زۆرینەیەوە بەجۆرێك لە جۆرەکان پەرلەمانیان داگیرکردوە، من حەز دەکەم لێرە باسی ئەوە بکەم کە لە چەند مانگی رابردودا هەر کاتێك ویستبێتیان کۆبونەوەیەك بکرێت کۆبونەوەیان پێ کردون و پرۆژەیان هێناوە و بەرنامەی کاریان داناوە، ئێمە دەتوانین یاساکان بکەین بە

چەند جۆرێكەوە، جۆرێكیان ئەو یاسایانەن كە پەیوەندییان بە ژیانی ڕۆژانەی خەڵكەوە هەیە لە بابەتی باج و موچە و كاروباری كشتوكاڵ و پیشەسازی و كرێی خانو و لەشفرۆشی و. . . هتد، بێگومان لەسەر هیچ كام لەو یاسایانە ئێمە گلەییمان نیە، هەر كاتێك ئێمە لەسەر ناوەڕۆكەكەشی ڕازی نەبین كە بە زۆرینە تێدەپەڕێت، ئێمە قبوڵی دەكەین و ڕێزی دەگرین و بە یاسای ولاّتی خۆمانی دەزانین، بەلاّم هەندێ یاسا هەیە كە ئێمە سێ سەوابتی تیا ڕەچاو دەكەین، هەر كامێك لەو سێ سەوابتەی ئێمە تێپەڕی كرد بێگومان ئێمە ڕزای نابین، یەكێكیان بریتییە لە سەوابتی قەومی، ئێمە پێمان وایە كۆمەڵێك یاسا هەیە پەیوەندییان هەیە بە سیستەمی سیاسی ئەم ولاّتەوە، پەیوەندییان بە پاشەڕۆژی سیاسی ئەم ولاّتەوە هەیە، پەیوەندییان بە پاشەڕۆی نەوەی داهاتووەوە هەیە، پەیوەندییان بە فیكری سیاسی ئەم حیزبە سیاسییانەوە هیە، ئەمە دەبێت جۆرێك لە تەوافوقی نیشتمانی لەسەر بێت، ئەگەر تەوافوقی سیاسی لەسەر نەبێت، ئێمە بەهیچ جۆرێك قبوڵی ناكەین و ئەمساڵیش ئەگەر ویستیان بەزۆرینە بیسەپێنن بەسەرماندا ئەوا دوای چەند ساڵێكی تر كۆمەڵێكی تر دێن و هەڵی دەوەشێننەوە، بۆیە ئێمە هەرگیز پێمان خۆش نیە ئێستا دەستورێك ڕەزامەندی لەسەر بدەین و پاش چەند ساڵێكی تر ئەو لایەنانەی تر كە لاواز بون، كۆمەڵێكی تر بێن و هەڵی بوەشێننەوە، بەڵكو ئێمە پێمان وایە پێویستە دەستورێك دابنێین كە لە ئێستاوە تا دەیان ساڵی تر پێویستی بە دەستكاریكردن نەبێت، هەندێك لە یاساكان دەچێتە ئەم خانەیەوە، خانەی سیستەمی سیاسیەوە، بەمانایەكی تر دەچێتە خانەی سەوابتی نەتەوەییەوە، ئەویش مەسەلەی هەڵبژاردن و مەسەلەی خۆپیشاندان و ئەنجومەنی ئاسایش و چەندین شتی ترە، ئەمانە بەشێكن لە سیستەمی سیاسی و پێویستە تەوافقی سیاسی لەسەر بكرێت، هی دوەممان ئێمە وەكو بەشێك لە دنیا، لە سەردەمێكدا لە خەبات و تێكۆشاندا بوین لەپێناو مافی مرۆڤدا، زۆر جار پەنامان بردوەتەبەر ڕێكخراوە نێودەوڵەتییەكان بۆ

بەرگریکردن لە مرۆڤی کورد، ئەم حکومەتەی ئێمە وەکو بەشێك لە حکومەتی عێراق و خۆشی وەکو حکومەتی هەرێمی کوردستان، پابەندە بە کۆمەڵێك رێککەوتنی نێودەوڵەتیەوە کە پەیوەندیی بە ماڤی مرۆڤ و دانپێدانان بە ماڤی مرۆڤەوە هەیە، بۆیە سەوابتێکی تری ئێمە کە سەوابتێکی جیهانییە بریتییە لە مافەکانی مرۆڤ، ناتوانین دژی شتێك بین لە سەرتاسەری دنیا قبوڵکراوە، بۆ نمونە ماڤ خۆپیشاندان مافێکی سەرەتایی مرۆڤە، ئەمە بەشێکە لە ماڤ مرۆڤ و ئێمە ناتوانین رەزامەندی لەسەر ئەمە بدەین، سەوابتێکی تری ئێمە ئەوەیە کە حەز دەکەم لەم مینبەرەوە بۆ هەمو کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانی رون بکەمەوە، ئەویش سەوابتی دینییە، هەرچی شتێك نەگونجێت لەگەڵ سەوابتی دینی کە دینی ئیسلامە، دڵنیا بن کە ئێمە رەزامەندی لەسەر نادەین و ئەوەندەی بۆمان بکرێت هەوڵدەدەین تێنەپەڕێت، چونکە بەلامانەوە شتێکی پیرۆزە.

KNN: دوا پڕۆژەیاسا کە ئێوە دژی وەستاونەتەوە، مەسەلەی ئاسایشە کە لە زۆر شوێن باسی ئاسایش دەکەن، هەروەها ئەو مەسەلەیە خاڵی یەکەمی ئەو بەیاننامەیەش کە ئێوە لە ٢٩ی مانگ بڵاوتان کردەوە، بۆچی ئەوەندە تەرکیزتان لەسەر بواری ئاسایش و پێشمەرگەیە؟

نەوشیروان مستەفا: من نازانم هەندێك جار موزایەدە بەسەر ئێمەدا دەکەن و خۆیان هەڵدەکێشن، ئێمە خۆمان لەوانە بوین کە دەستمان هەبوە لە دروستکردنی هێزی پێشمەرگەی کوردستان لەماوەی چەند ساڵی رابردودا، هەروەها بەدرێژایی نزیکەی ٤٠ ساڵی رابردودا دەستمان هەبوە لە دروستکردنی ئاسایش و. . . هتد، پێمان وایە ئەم دامەزراوانە واتە دامەزراوەی پێشمەرگە و ئاسایش و زانیاری و پاراستن، ئەمانە لەو دامەزراوانەن کە زەرورین بۆ نەتەوەی کورد و میللەتەکەمان و بۆ هەرێمی کوردستان کە هەبن، رەنگە ئەمانە لە ٢٠ ساڵی رابردوی حکومڕانیدا گەلێك کاری وایان کردبێت کە

پێچەوانەی یاسا و مافی مرۆڤ بێت، بەلاّم بەگشتی ئەمانە ئاسایشی کوردستانیان پاراستوە و ئەوانە هەمو هەڤاڵ و هاوڕێی ئێمە و براو کەسوکاری ئێمە و خۆشەویستی ئێمەن، بەهیچ جۆرێك ئێمە لەگەڵ ئەوەدا نین ئەو دەزگایانە هەڵبوەشێتەوە یان دەستکاری خراپی بکرێت، بەلاّم ئێمە سورین لەسەر ئەوەی کە دو گۆڕین لە هەمو ئەو دەزگایانەدا بکرێت، گۆڕینی یەکەم گۆڕینە لە وەزیفەکەیدا، حاڵی حازر بەهۆی دەسەلاّتی حیزب بەسەر ئەم دەزگایانەوە تەکلیفیان دەکەن کە بڕۆن جاسوسی بەسەر حیزبەکانەوە بکەن، لەکاتی ململانێی سیاسیدا ئەم حیزب دەیکات بەگژ ئەو حیزبدا و بۆ مەبەستی تایبەتی حیزبی بەکاریان دەهێنن، ئێمە پێمان وایە کە وەزیفەی ئەم دەزگایانە دەبێت لە وەیزفەی تەنفیزییەوە سەرچاوە بگرێت، ئەو کارانەی کە ئێستا دەیکەن بەشێکی کاری دادگایە، کاری پۆلیسە، ئێمە پێمان وایە ئەمانە کارەکەیان کۆکردنەوەی زانیارییە، ئەمانە کارەکەیان راونانی خەڵك و گرتنی خەڵك و حەپسکردنی خەڵك و تۆقاندنی خەڵك نیە، بەڵکو ئەمانە ئەو دەزگایانەن کە زانیاری کۆدەکەنەوە بە قازانجی ئاسایشی کۆمەڵ، بەوەی ئەمنی کۆمەڵگا پارێزگاری دەکەن لەو خەتەرانەی کە دێتەسەری، نەك خۆیان ببن نە سەرچاوەی هەڕەشە بۆ هاولاّتی و حیزبەکان، بە مانایەکی تر وەزیفەی ئاسایش ئەم ئەوە نیە کە خەڵك بگرێت، خەڵگ راوبنێت، خەڵك بترسێنێت و هەڵبکوتێتە سەر مالأن، بەڵکو بریتییە لە کۆکردنەوەی زانیاری، بەهەمان شێوە بۆ دەزگای زانیاری و دەزگای پاراستنیش، هێزی پێشمەرگە مافی ئەوەی نیە لە کاروباری ناوخۆدا تەدەخول بکات، بەڵکو دەبێت سنوری هەرێمی کوردستان بپارێزێت و سیستەمی سیاسی ولاّتەکەمان بپارێزێت، نەك ببێت بە دەسکەلا بەدەست حیزبێکەوە بۆئەوەی حیزبێکی تری پێ بترسێنێت و بیچەوسێنێتەوە،

ئەمە گۆڕینی یەکەمە کە ئێمە بە پێویستی دەزانین کە بکرێت، کە گۆڕینە لە وەزیفەدا، ئەگەر وەزیفەکەی بگۆڕێت باوەڕم وایە کە بۆچونی هەمو کورد دەگۆڕێت سەبارەت بەم دەزگایانە، گۆڕینی دوەم بریتییە لەوەی کە پێویستە سەرۆك و بەڕێوەبەری ئەم دەزگایانە لە خەڵکی میهەنی بێلایەن دابنرێن نەك لە خەڵکی حیزبیی تۆخ کە زۆر موتەحەمیسن، واتا بەگوێرەی کەفائەت و لێوەشاوەیی سەرۆکی ئەو دەزگایانە دابنرێت کە دەیان کەسی بەتوانا هەیە دەتوانن ئەو دەزگایانە بەڕێوەبەرن، لەسەر ئاستی سیاسیش کەس ناتوانێت تاوانباریان بکات بەوەی کە لایەنگری حیزبێك دەکەن.

KNN: گلەییەکی زۆر لەئەدائی پەرلەمان دەکرێت و باس لەوە دەکرێت کە ئەدائی سستە، بۆچونی بەڕێزتان لەوبارەیەوە چییە؟

نەوشیروان مستەفا: هەربۆیە داوامان کردوە هەڵبوەشێتەوە.

KNN: لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیدا، لەم دواییانەدا چەند گۆڕانکارییەکی گەورە رویاندا یەکێکیان مەسەلەی راپرسییەکەی باشوری سودانە، دەمەوێت رای بەڕێزتان سەبارەت بەو راپرسییە بزانین؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە خۆمان وەکو گەلێکی زوڵملێکراو کە بە مافی ئاسایی خۆمانی دەزانین مافی چارەنوسی خۆمانمان هەبێت، بە مافی ئاسایی خۆمانی دەزانین پاشەڕۆژی سیاسی خۆمان دیاری بکەین، باشوری سودان ئەو هەلەی بۆ هاتوەتە پێشەوە کە من لەناخی دڵەوە پێم خۆشە کە باشوری سودان نەیتوانی لەگەڵ باکوری سودانیدا پێکەوە بگونجێت و ساڵانێکی دورودرێژ شەڕو ململانێی خوێناوی هەبو لەنێوانیاندا، ئێستا میللەتەکە بە ئاراتی خۆی و لەرێگای دیموکراتییەوە گەیشتوەتە ئەوە، پێموایە ئەوە سابیقەیەکی زۆر

جوانه له یاسای نێودەوڵەتی و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و پەیوەندی نێوان میللەتاندا.

KNN: سەبارەت بە راپەڕینی گەلی تونس چی دەڵێن؟

نەوشیروان مستەفا: من خۆم لەسەر تونس شتێکی ئەوتۆم نەدەزانی، هەتا نەڕوخا نەمدەزانی کە ئەم پیاوە (زین العابدین بن علی) ئەوەندە پیاوێکی خراپە، چونکە بەدرێژایی دەیان ساڵ کشوماتی بەسەر ئەو ولاتەدا کشابو، خەڵك وایدەزانی ولاتێکە شامی شەریفە، بەلام ئەمە وەکو (مدینە اشباح) وابو واتە وەکو شاری تارماییەکان کە خەڵك لە تاریکاییدا دەترسێت، بەلام کشوماتییەکی زۆر بەسەریدا زاڵ بوە، تونسیش لەو بابەتە بو، وەکو چۆن لە قەبرسانێکدا هەست بەوە دەکەیت خۆڵی مردویان بەسەردا نیشتوە کەس دەنگی لێوە نایەت لەپڕێکدا لە هەمو قەبرێکەوە کەللە سەرێك و شەبەحێك دێتە بەرەوە، تونس رێك وابو، بێگومان هەر ولاتێك ستەمکاری تیا بێت، زۆرداری تیابێت، گەندەڵی تیابێت، درەنگ بێت یان زو گۆڕانی بەسەردا دێت و ئەوەش یەکەمجار نیە لەمێژوی ناوچەکەدا شتی وا روبدات، پێش ئەوان لە ئێران ئینقیلابی ئیسلامی بو رژێمی شا بە رێگای راپەڕین روخا، لە کوردستانی عێراق و عێراقدا، راپەڕینێکی زۆر گەورە بو کە بو بەهۆی ئەوەی کوردستانی عێراق ئازاد بو، بەلام باشوری عێراق کەوتەوە ژێر دەسەلاتی بەعسییەکان، ئەمەش پێم وایە کارێکی زۆر زۆر گەورەیە و نمونەیەك و پێشەنگێکە بۆ هەمو گەلانی ناوچەکە.

KNN: زۆر جار باس لە لەیەکچون یاخود جیاوازییەك دەکرێت لەنێوان مەسەلەی تونس لەگەڵ کوردستاندا، تۆ تاچەند ئەم جیاوازی و لەیەکچونانەدا رەوا دەبینیت؟ یاخود تەعلیق چیە لەو بارەیەوە؟

نەوشیروان مستەفا: لەیەکچونیش هەیە و جیاوازیش هەیە، بۆ نمونە ئێمە جیاوازین لەگەڵ ئەواندا پێم وایە ئەوان کارەباین هەیە ئێمە کارەبامان نیە، ئەوان جادە و حەدیقە و رێگاوبانی جوانیان هەیە لێرە نیە، لەویٚ موئەسەسەی عەسکەری بێلایەنە لێرە بێلایەن نیە، پێم وایە لەویٚ زانکۆکانیان ئاستی زانستییان زۆر باشە و لە ئاستی زانکۆکانی فەرەنسادایە لێرەدا ئەوە نیە، لەمانەدا لەیەك ناچین، بەلاّم ئەوەی کە لە یەك دەچین، لە گەندەڵیدا پێم وایە ئەگەر بۆڕی ئەوانمان نەدابێت ئەوا وەکو ئەوانین، لەمەسەلەی سەیتەرەکردنی یەك حیزب بەسەر هەمو جومگەکانی ژیانداا لێرە و لەویٚ لەیەك دەچن، لە کۆمەڵێك شتی لەو بابەتانە وەکو بێکاری و نزمە ئاستی گوزەرانی خەڵکدا لەیەك دەچن و لە تەزویری هەڵبژاردن

# نیگەرانین لەوەی ئیحتکاری سیاسی بۆ ئێستا و پاشەڕۆژ دەکرێت

سازدانی: هوشیار عبدولڵا

نەوشیروان مستەفا لە بەرنامەی روبەڕوی کەناڵی KNNدا باس لە داهاتوی بزوتنەوەی گۆڕان و کۆمپانیای وشە و شێوەی رێکخستنەوەی بزوتنەوەکە و وەرگرتنی سولفە لە حکومەتی هەرێم دەکات، هاوکات باس لەدواین گۆڕانکارییە سیاسییەکانی هەرێمی کوردستان و مەترسییەکانی بەردەم ئازادی رادەربڕین دەکات.

KNN: با لەوەرگرتنی بودجە لەلایەن بزوتنەوەی گۆڕانەوە دەست پێ بکەین، راستە کە بودجەتان وەرگرتوە؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە بودجەمان وەرنەگرتوە، سولفەمان وەرگرتوە، یەکێك لە بەندەکانی وەرەقەی ئیسلاحی سیاسی کە ئێمە لەگەڵ حیزبەکانی ترا خەریکین جێبەجێ بکەین، بریتیە لە چەند نوقتەیەك لە سەروی هەمویانەوە قانونی تەمویلی حیزبە سیاسیەکانی کوردستان، ئێستا ئەو قانونە لە بەردەمی پەرلەماندایە، هەر دەستاودەستی پێدەکەن و تائێستا جێبەجێ نەبوە، ئەوەی کە دەدرێت بە حیزبەکان بەناوی سولفەوە دەدرێت، بڕیار وایە ئەو قانونە کە دەرچو لە پەرلەمانەوە ئەوساکە حیزبەکان بە گوێرەی ئەو کورسیانەی لە پەرلەماندا هەیانە، یاخود بە گوێرەی ئەو دەنگانەی کە لەکاتی هەڵبژاردندا بەدەستیانهێناوە بە گوێرەی یەکێك لەو دو میعیارە بودجە وەر بگرن، ئەوەی کە ئێمە وەرمانگرتوە سولفەیە و بودجە نیە.

KNN: باشە ئەم سولفیە بەراورد بەوەی کە یەکێتی و پارتی وەریانگرتوە تائێستا، ئەوەی کە ئاشکراکراوە یاخود ڕاگەیەندراوە لەلایەن حکومەت زۆر کەمترە لەوەی کە ئێوە وەری دەگرن، بۆ قبوڵتانکرد؟
نەوشیروان مستەفا: بەڵێ ئێمە پێشتر تا میزانیەی ساڵی ڕابردو تەسدیق نەکرابو، حیزبە دەسەڵاتدارەکانی کوردستان بە ئارەزوی خۆیان پارەیان لە بودجەی کوردستان بردوە، بەگوێرەی هەندێك سەرچاوە کە وەختی خۆی باسیانکرد، بە هەردو حیزب نزیکەی ٧٠ ملیۆن دۆلاریان دەبرد، بەڵام دوای تەسدیقکردنی میزانیەی ساڵی ڕابردو، ئەم بڕە زۆر کەم بوەتەوە و پێموایە ئەمە سەرکەوتنێکی گەورەیە بۆ بزوتنەوەی گۆڕان کە لە پەرلەمانی کوردستاندا توانی ئەو مەسەلەیە بوروژێنێت، ئێمە ئەمانەوێت مەسەلەی تەمویلی حیزبەکان بە قانون ڕێکبخرێت، لەبەرئەوە ئێمەش ئەو قانونەی کە دەردەچێت جێبەجێی دەکەین، پێمان وایە ئەمە سەرەتایەکە بۆ ئەوەی حیزبەکانی تریش رابێن لەسەر ئەوەی بەشەکەیان هەرچەندێك بێت پێی ڕازیبن.
KNN: کۆمەڵێك هەنگاوی زۆرتان بڕیوە لە ڕێکخستنەوەی بزوتنەوەکەتاندا، ئێستا قسەو باسێك هەیە بەوەی کە جیاوازی بۆچون هەیە لەناو ئێوەدا بە تایبەت لە نێوان قیادەکاندا بۆ دیارکردنی چۆنێتی قیادەکردنی گۆڕان؟
نەوشیروان مستەفا: لەناو ئێمەدا ئێمە بۆچونی جیاواز هەیە و پێموایە ئەمە شتێکی تەبیعییە، بەڵام بۆچونەکانی ئێمە و جیاوازیەکانمان لەسەر شتی فیکری و لەسەر شتی سیاسی و لەسەر شتی ئایدۆلۆژی نیە، ئێمە ئەگەر جیاوازیشمان هەبێت لە بۆچوندا لەڕاستیدا جیاوازیەکانی ئێمە لەسەر شتی فەنیە، لەسەر شتی تەکنیکیە، لەسەر ئەوەیە کە بۆ نمونە، چۆن ناو شاری سلێمانی ڕێکبخەین یان چۆن ناو شاری هەولێر ڕێکبخەین، چۆن ناو شاری کەرکوك ڕێکبخەین، شتەکانمان زۆرتر فەنییە، هیچ پەیوەندیەکی بە کاروباری سیاسی یا بە خیلافاتی ئایدۆلۆژی سیاسی و. . . هتد نیە، بەلاشمەوە شتێکی زۆر زۆر تەبیعییە، چونکە ئێمە لە قۆناغێکداین کە سەرەتای دەستپێکردنی

جولآنەوەیەکی سیاسی تازەیە، ئەمانەوێت ڕێکخراوێکی تازە دروست بکەین بە هەیکەلێکی تازە، ئەگەر ناکۆکی و بۆچونی جیاواز لەسەر ئەوە نەبێت بێگومان شتێکی ناتەبیعییە.

KNN: باس لە هەیکەلێکی تازەو بۆچونی جیاواز و جیاوازیت کرد لە گۆڕاندا، ئێوە هەمان ئەو کادرە موتەفەریغە سیاسیانە دروست دەکەنەوە کە تەنها کار و پیشەی ببێ بە کاری سیاسی، یاخود کادرێك دروست دەکەن کاری سیاسی بکات و کاری ئاسایی خۆشی بکات؟

نەوشیروان مستەفا: بزوتنەوەی گۆڕان وەکو سەرەتا پێی وایە کە هەمو هاولآتیەکی کوردستان پێویستە جۆرێك لە سەربەخۆیی ئابوری و سەربەخۆیی دارایی هەبێت، بۆئەوەی ئازادی دەربڕینی بیروڕای هەبێت، هەر بەو مەنتیقە کە چۆن ئێمە پێمان خۆشە هەمو هاولآتیەك لە کوردستاندا چ ژن بێت چ پیاو بێت، جۆرێك لە سەر بەخۆیی ئابوری هەبێت، پێمان خۆشە هەمو هەڵسوڕاوێکی سیاسیش لەهەر حیزبێکی سیاسی بێت، جۆرێك لە سەربەخۆیی ئابوری و سیاسی هەبێت، بۆ ئەوەی نەبەسترێتەوە بەحیزبێکەوە و نەبێت بە کۆیلەی موچەی مانگانەی حیزبەکەی خۆی، لەبەرئەوە بەو مەنتیقە ئێمە هەوڵ ئەدەین کەمترین ژمارەی کادری موتەفەریغمان هەبێت، بۆ کادرە موتەفەریغەکانیشمان کارێکی وا دەکەین کە وەکو کارمەند کار بکەن، بۆ ئەوەی سیستەمی تازەبونەوەی دامودەزگاکانی بزوتنەوەی گۆڕان هەمیشە لە حاڵەتی ژیاندا بێت، وانەبێت لە حاڵەتێکدا بێت کۆمەڵێك خەڵك دەست بگرن بەسەر دامودەزگاکانی بزوتنەوەی گۆڕان و لە ئێستاوە تا ٥٠ ساڵی تر بمێننەوە.

KNN: لەماوەی ڕابردودا باس لەوە دەکرێت کە زۆرترین چالاکی ئێوە وەکو بزوتنەوەی گۆڕان زیاتر لە ڕێگەی فراکسیۆنەکانتانەوە بوە لە پەرلەمانی کوردستان و لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق، چالاکی بزوتنەوە سیاسیەکەتان لە دەرەوەی ئەم دو فراکسیۆنە چۆن دەبێت یاخود چی دەبێت؟

نەوشیروان مستەفا: ئەوە راستە ئێمە بەلامانەوە گرنگە کە پەرلەمان کارا بێت و پێمان وایە ئێمە لە ولاتێکدا ئەژین سێ دەسەلاتی گرنگی تێدایە، دەسەلاتی تەشریعی و دەسەلاتی قەزایی و دەسەلاتی تەنفیزی، دەسەلاتی تەشریعی بریتیە لە پەرلەمان کە فرکسیۆنەکەی ئێمە لەوێ بە چالاکی کار دەکەن، ئێمە پێمان خۆش نیە حیزبێك ببێت بە بەدیلی پەرلەمان یان حیزب ببێت بە بەدیلی حکومەت، ئێمە پێمان خۆشە پەرلەمان کارەکانی خۆی بکات و حکومەتیش کارەکانی خۆی بکات، بە مانایەکی تر ئەگەر ئێمە هەرچیەکمان بوێت کە لەگەڵ حکومەت باسی بکەین دەبێت لەناو هۆڵی پەرلەمان باسی بکەین، باقیەکەی تریشی ئەگەر خۆپیشاندان بێت یان رێپێوان بێت یان دەربڕینی نارەزایی بێت یا دەربڕینی پشتیوانی بێت، ئەوە چالاکی سەر جادەیە، ئێمە چالاکی جۆراوجۆرمان دەبێت، چالاکی رۆشنبیریمان دەبێت، چالاکی سیاسیمان دەبێت، بێگومان چالاکیمان لە بوارە جیاجیاکانی ژیاندا دەبێت.

KNN: با کەمێك بێینە سەر کۆمپانیای وشە، پێشتریش لە روبەڕوەکانی تردا باسمانکردوە، کۆمپانیای وشە زمانحاڵی بزوتنەوەی گۆڕانە یان نا؟

نەوشیروان مستەفا: کۆمپانیای وشە پێش بزوتنەوەی بزوتنەوەی گۆڕان دەمەزراوە بۆ ماوەیەکی زۆر، کاتێك کە کۆمپانیای وشە بۆ راگەیاندن دامەزرا هێشتا بزوتنەوەی گۆڕان و بیرۆکەی دامەزراندنی بزوتنەوەی گۆڕان و دەستپێکردنی بزوتنەوەی گۆڕان لە کایەدا نەبو، چونکە هێشتا ژمارەیەکی زۆری ئەوانەی کە هەڵسوڕاون، ئومێدێکی زۆریان بەوە هەبو کە لەناو داخلی حیزبە مەوجودەکانی کوردستاندا هەندێك ئاڵوگۆڕ بکرێت، پاش ئەوەی پێش هەڵبژاردن دەرکەوت ئەوە کارێکە ناکرێ، لەبەرئەوە پەنامان برد بۆ دامەزراندنی بزوتنەوەی گۆڕان، ئێستا ئەتوانیت بڵێیت تا ئەندازەیەکی زۆر کۆمپانیای وشە توانیویەتی لەدو هەڵبژاردندا پشتیوانیەکی زۆر گەرم لە بزوتنەوەی گۆڕان بکات، بەلام مانای ئەوە نیە کە زمانحاڵە، گەلێك جار لەناو دامودەزگاکانی کۆمپانیای وشە چ لە سایتەکەی لە رۆژنامەکەی لە تەلەفزیۆنەکەی لە

رادیۆکەی، کەسانێك قسە دەکەن بیروبۆچونی خۆیان دەردەبڕن، گەلێك جار دژی بزوتنەوەی گۆڕان قسە دەکەن، ڕەخنەی لیّ دەگرن و بیروباوەڕی جیاواز بلاّودەکەنەوە، ئەو پەراوێزی ئازادیەی کە لەناو دەزگاکانی کۆمپانیای وشەیە، پێم وانیە لە ناو دەزگا حیزبیەکانی تردا هەبێت.

KNN: ماوەی پێشو وازت لە پۆستی بەڕێوەبەری ڕێپێدراوی کۆمپانیای وشە هێنا کەسێکی ترت لە شوێنی خۆت دانا، بۆچی؟

نەوشیروان مستەفا: ئەوە ئیشکالێکی سیاسی هێناوەتە پێشەوە، ئیشکالە سیاسیەکە ئەوەیە لە سەرەتاوە من دامەزرێنەری کۆمپانیای وشە بوم و خاوەنی کۆمپانیای وشە بوم، لەهەمان کاتدا منیش یەکێکم لە دامەزرێنەرەکانی بزوتنەوەی گۆڕان، ئەمە جۆرێك لە تێکەلاّوی دروستکردوە لە بەینی کۆمپانیای وشە و لە بەینی بزوتنەوەی گۆڕان، ئێمە بەو ئیتیجاهە دەڕۆین، من خۆم یەکێکم لەو کەسانەی پێم باش نیە ئێمە تەجروبەی ڕاگەیاندنی حیزبی دوبارە بکەینەوە، من ئومێدم وایە هاوڕێکانم و هاوکارەکانیشم لەناو بزوتنەوەی گۆڕان و لەناو کۆمپانیای وشە، پێکەوە بتوانین بگەینە بۆچونێکی هاوبەش لەسەر ئەوەی کە چۆن ئەم دو دەزگایە لەیەکتری جیا بکەینەوە، کۆمپانیای وشە وەکو دەزگایەکی ڕاگەیاندنی جیاواز لە بزوتنەوەی گۆڕان بتوانێت ئەرکەکانی خۆی جێبەجیّ بکات.

KNN: ئەمە دەلالەتێکی تر نیە بەوەی کە لانی کەم تۆ واز لە هەر ڕۆڵێك یتری ئیعلامی دەهێنیت و خۆت تەرخان دەکەیت بۆ کاری سیاسی؟

نەوشیروان مستەفا: لە ڕاستیدا من هەر بە شتێکی شکلّی لە دەزگاکەدا بوم، ئەگینا هەر لە سەرەتاوە، لەوەتی کۆمپانیای وشە دامەزراوە کۆبونەوەی هەفتانەی سەرانی هەمو دەزگاکە خۆیان هەفتانە نەخشەی ڕێگای خۆیانیان داناوە، بیرو بۆچونەکانی خۆیان و هەندێکجار لە کۆبونەوەکاندا من بەشداریم کردوە و هەندێك جاریش بەشداریم نەکردوە، ئەگەر پرسیارێك لەوانە بکەن کە ئەو دەزگایانە بەڕێوە دەبەن تەلەفزیۆنە، ڕادیۆیە، سایتەکەیە، ڕۆنامەکەیە، تا

ئەندازەیەکی زۆر سەربەخۆییان هەبوە و ئازادییان هەبوە لە دەربڕینی بیروباوەڕی جیاواز و وەکو یەکەی جیاواز کاریان کردوە.

KNN: دەگوترێت رەنگە هۆکارێکی تریش بریتی بێت لەوەی کە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی کۆمپانیای وشە و گۆڕان لە یەك جیابکەیتەوە، راستە؟

نەوشیروان مستەفا: وەکو باسم کرد ئەگەر هاوڕێکانم و هاوکارەکانم یارمەتیم بدەن بەڵێ جیای دەکەینەوە.

KNN: لە ماوەی رابردودا کۆمپانیای وشە کەمپەینێکی راگەیاندوە دەربارەی ئازادی رادەربڕین، ئایا ئەم کەمپەینە بە دیاریکراوی دژی ئەو شکاتانەی پارتییە لەسەر دامودەزگاکانی ئێوە؟

نەوشیروان مستەفا: ناتوانیت بە تەحدید بڵێت ئەوەیە، بەلام رەنگە ئەوە سەرەتایەك بێت بۆ دەستپێکردنی ئەوە، ئێمە هەمومان نیگەرانین لەوەی هەست دەکەین لە کوردستانی عێراقدا، ئازادی رادەربڕین بەرەو بەرتەنگی و بەرەو بەرتەسکبونەوە دەڕوات، هەستدەکەین دو ساڵ لەمەوپێش قانونی رۆژنامەگەری دەرچو، بەلام تائێستا کاری پێناکرێت، هەست دەکەین بەوەی کە جۆرێك لە گوشار و زەخت لەسەر رۆژنامەوانی و لەسەر دەربڕینی بیروڕای ئازاد لە کوردستاندا هەیە، ئەمانەوێت ئەو نیگەرانیە دەربڕین و ئەو نیگەرانیە بگەیەنین بە سەرکردایەتی سیاسی هەمو حیزبەکانی کوردستان، کە یەکێك لە گرنگترین کۆڵەکەکانی ژیانی دیموکراسی چ لە کوردستان و چ لە شوێنەکانی تری دنیا میدیای ئازاد و ئازادی رادەربڕینە، ئەوە لە حاڵی حازردا لە کوردستانی عێراق لە مەترسیدایە، لەبەردەمی هەڕەشەدایە، ویستمان سەرنجی هەمو لایەك بۆ ئەوە رابکێشین، ئەگینا بە تەنها کاردانەوە نەبوە.

KNN: مەبەستان لەوە نەبوە کە بە تەنها پارتی کشانەوە لە داواکانی بکات یاخود داواکانی سەحب بکاتەوە؟

نەوشیروان مستەفا: بێگومان نەخێر، ئێمە لە کوردستانی عێراقدا نە سەتەلایتمان دروستکردوە نە ئینتەرنێتمان داهێناوە نە دەرمانێکی تازەمان بۆ

نەخۆشیە موهیمەکان داهێناوە، تەنها شتێك کە ئێمە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا شانازی پێوە بکەین ئەو جۆرە ئازادیەیە کە لە کوردستانی عێراقدا هەیە، ئێستا ئەو ئازادییە لە مەترسیدایە، نامانەوێت ئەو ئازادیەمان لە کیس بچێت، بە عەکسەوە ئەمانەوێت هەمیشە پەرە بسێنێت و گەشە بکات و دایمەن خۆمانی پێوە هەڵدەکێشین لە هەمو جێگایەکدا بڵێن کوردستانی عێراق جەزیرەیەکی ئازادە، جەزیرەیەك لەناو رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا شوێنێکە کە کەرامەتی ئینسان تیایدا مەحفوزە و مافەکانی ئینسان پارێزراوە، ئازادی رادەربڕین هەیە، ئازادی راگەیاندن هەیە، ئازادی رادیۆ هەیە، ئازادی تەلەفزیۆن هەیە، ئازادی جەریدە هەیە، ئەمانەوێت شانازی بەوە بکەین و ئەمانەوێت ئەو شانازیەمان بۆ بمێنێتەوە.

KNN: لەماوەی رابردودا ئێوە لە دوای ۷/۲۵ەوە ئۆپۆزسیۆنتان دروستکرد، ئەزمونێکی ئۆپۆزسیۆنتان تەقدیم کردوە، ئایا بە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکان، ئەتانەوێت لە دەسەڵاتی جێبەجێکردنیشدا چانسێك تاقی بکەنەوە یاخود بەرنامە و پلان و ستراتیج و بۆچونی خۆتان، یاخود روە جوانەکانی خۆتان بخەنەڕو لە دەسەڵاتی جێبەجێکردندا؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە لە سەرەتاوە بەرنامەیەکی سیاسیمان هەیە، کە بڵاومانکردوەتەوە و رامانگەیاندوە، ئەو بەرنامە سیاسییە تەنیا بۆ رەخنەگرتن نیە لە دەسەڵات، بۆ ئەوەیە کە لەڕێگەی هەڵبژاردنەوە چەندێك پێمان بکرێت ئێمە دەسەڵات بگرینەدەست و بەشدار بین لە دەسەڵاتدا، بۆ ئەوەی بتوانین بۆچونە سیاسیەکانی خۆمان و ئەو بەرنامەیەی کە هەمانە بۆ رێکخستنی بواری ژیان، بواری ئابوری، بواری کۆمەڵایەتی، بواری رۆشنبیری، بواری دارایی و ئەوانە جێبەجێ بکەین، بێگومان لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکانیشدا هەوڵ دەدەین کە ئەنجومەنی پارێزگاکان ژمارەیەکی زۆری بە هەڵبژاردن بکەوێتە دەست ئێمە.

KNN: لەسەر کام بنەما کاندیدەکانتان دیاری دەکەن، ئایە چانس دەدەن بەئەوانەی کە لەدو هەڵبژاردنی رابردودا کاندیدی ئێوە بون، بەڵام چانسی چونە پەرلەمانیان نەبو، نە لە عێراق، نە لە کوردستان؟
نەوشیروان مستەفا: ئەمجارە لەچاو دو هەڵبژاردنەکەی پێشودا زۆرتر ئێمە خۆمان رێکخستوە، ئێمە ئێستا لە وێستگەکانی هەڵبژاردنەوە خۆمان رێکخستوە تا لە هەندێك شوێن گەیشتوەتە ئەنجومەنی شار، ئێمە ئێستا ئەنجومەنی بنکەمان هەیە ئەنجومەنی بازنەمان هەیە، چەند هەفتەیەکی تر ئەنجومەنی شاریشمان ئەبێت، لەمەولا ئێمە کاندیدکردنی ئەوانەی کە کاندید دەکرێن بۆ ئەنجومەنی پارێزگاکان یان هەر دامودەزگایەکی تری وا گرنگ، بەرەوڕوی بنکەکانی خۆمانی دەکەینەوە، بەرەوڕوی قاعیدەی ئەکەینەوە، داوا دەکەین لە هەمو ئەوانەی کە بەشدارن لە بنکەکان و لە ئەنجومەنی بنکە و لە ئەنجومەنی بازنەکاندا، ئەوان خەڵکمان بۆ تەرشیح بکەن، لە پاشاندا رەنگە هەندێك دەزگای بێلایەن، دەزگای پسپۆڕ رابسپێرین بۆ ئەوەی لەسەر کۆمەڵێك پێوانە و پێوەری جیاجیا، لەوانە چڕی دانیشتوان، لەوانە نیسبەتی رێژەیی دەنگدانی بزوتنەوەی گۆڕان لەو ناوچەیە، هەروەها لە هەمانکاتدا لێوەشاوەیی و شارەزایی لەبوارە جیاجیاکاندا، ئەوانە ببنە پێوەر بۆ هەڵبژاردن، بە مانایەکی تر ئێمە هەوڵ دەدەین لە قاعیدەوە خەڵکمان بۆ تەرشیح بکرێت، ئەمجارە نەك لەسەرەوە تەرشیحی بکەین و بە خەڵك بڵێن دەنگی بۆ بدەن.
KNN: باست لەوە کرد کە ئەمجارە باشتر خۆتان ئامادەکردوە، لە رابردودا کۆمەڵێك رەخنەی زۆرتان لێگیراوە لەسەر ئەم دو هەڵبژاردنەی رابورد، یەکێك لەو رەخنانەی دەگیرێت، بە تایبەتیش کوردەکانی دەرەوە وەکو رەخنە ئاراستەی دەکەن، ئەوەیە کە ئێوە وەکو گۆڕان دەنگێکی زۆرتان لە ئەوروپا فەوتا، بەڵام لێی بێدەنگ بون، بۆ لێی بێدەنگ بون، ئەمجارە ئایا لەم حاڵەتانە بێدەنگ دەبن؟

**نەوشیروان مستەفا: یەکێك لە گیروگرفتەکان لە عێراقدا ئەوەیە هەمو دامودەزگاکانی کە ئێستا لە عێراقدا هەیە لەسەر بنچینەی موحاسەسەی سیاسی یاخود وەکو خۆیان ئەڵێن موحاسەسەی حیزبی دانراوە، کۆمسیۆنی باڵای هەڵبژاردنەکان وشەی سەربەخۆی پێوەیە، بەڵام لە راستیدا فرێ بەسەر سەربەخۆییەوە نییە، چونکە ئەوانەی کە ئەندامی کۆمسیۆنە باڵاکەن هەریەکەیان لەلایەن حیزبێکەوە پاڵێوراوە و لەلایەن حیزبێکەوە دانراوە، نوێنەرایەتی حیزبەکانە لەناو کۆمسیۆن باڵا، ئێمە هیچ نوێنەرایەتیەکمان نەبوە تاوەکو ئێستا نەشمانتوانیوە، ئێمە ناڕەزایەتیمان دەربڕی، لەڕاستیدا جۆرێك لە شاردنەوەی هەندێك شت بو، قۆناغی یەکەم باسی ئەوەیانکرد کە دەبێت دو ناسنامەیان پێ بێت، لە دواییدا قبوڵیان کرد وتیان یەك ناسنامە کافییە، بەڵام دوای ئەوەی خۆیان جێبەجێکرد کە خۆیان ویستبویان، ئێمە وەکو باسمکرد لەبەرئەوەی زۆری ئەو دەزگایانە بێلایەن نین، ئەگەر شکاتمان بکردایە پێموایە لە شکاتەکەمانیان نەدەپرسی، لەبەرئەوە زۆر لەسەری نەڕۆشتن.**

**KNN: لە زۆر ئاستدا فشارێکی زۆرتان لەسەرە لە ئاستی قا:یدەدا، لە ئاستی کۆمەڵی مەدەنیدا، لە ئاستی تەنانەت میدیای ئازاددا، کە ێوە ئەزمونێکی جیاواز و ئەزمونێکی نوێ لە کاری حیزبایەتی دابهێنن، ئەتوانیت پێمان بڵێیت کە چۆن دەتوانن ئەم جیاوازیە دروست بکەن؟**

**نەوشیروان مستەفا: یەکەم شت کە ئێمە ئەمانەوێت ئەزمونەکەمان تازە بێت، هەندێك مەفاهیمی سیاسی تازەمان هێناوەتە ناو بیری سیاسی کوردیەوە، لەوانە ئێمە باس لە رێکخراوێکی سیاسی دەکەین کە بەشێوەیەکی ئاسۆیی رێکبخرێت، رەنگە ئەو شێوەی ئاسۆیی و ستونییە لەوەوپێش باسنەکرابێت، رێکخراوی ستونی ئەو رێکخراوە ستالینی و بەلشەفییانەن کە لە ئەوروپای شەرقی وەختی خۆی پەیڕەویان کردوە، لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا تا ئەندازەیەکی زۆر تائێستا هەندێك لە حیزبە سیاسیەکان پەیڕەوی دەکەن، رێکخراوی ئاسۆیی جۆرێك لە لامەرکەزیەت جۆرێك لە ناوەندێتی ئەدا بە هەمو**

دامودەزگا گرنگەکانی خۆی، ئێمە ناچین لاسایی ئەو حیزبانە بکەینەوە لە سەروی هەرەمی تەنزیمی خۆماندا چەند کەسێك دابنێین و بڵێین ئەمانە لە هەمو کەسێك زیرەکترن لە هەمو کەسێك عاقڵترن لە هەمو کەسێك شارەزاترن، لەبەرئەوە ئەبێت هەمو بوارەکانی ژیانی ڕێکخراوەی سیاسی ئەم کۆمەڵە بڕیاری لێبدات، بە تەنیشت ئەوەوە ئێمە کۆمەڵێك دەزگای تر دروست دەکەین کە هەندێکی لە بابەتی فینتانکەکانی ئەوروپان، خانەی بیرکردنەوەن، مەسەلەن ئێمە لە تەنیشت ئەو سەرکردایەتیەی کە هەمانە کۆمەڵێك دامودەزگای ترمان هەیە، مەسەلەن بۆ ڕێکخستنەوەی دەرەوەی وڵات ژوری ڕەوەندی کوردستانیمان هەیە، بۆ کاروباری سیاسی یەکەی توێژینەوەمان هەیە، بۆ کاروباری قانونی یەکەی قانونیمان هەیە، لەم ماوەیەدا بۆ کاروباری دارایی و بۆ کاروباری ئابوریش یەکەیەکی تایبەتی دروست دەکەین، ژوری سیاسیمان ئەبێت، لە هەمان کاتدا ژورێکمان دەبێت بۆ پەیوەندی نیشتمانی، بۆ پەیوەندی سیاسی، بۆ ئەو جۆرە شتانە لە مەجموعی ئەوانە، بە شکڵێکی ئاسایی سەرکردایەتیەکت دەبێت، کاتێك کە هەڵبژاردن دێتە پێشەوە پرس بە دەزگای هەڵبژاردن دەکرێت، کاتێك پەیوەندی لەگەڵ وڵاتانی دراوسێ دەبێت پرس بە ژوری دیبلۆماسی دەکەین، کاتێك کە دانانی پرۆژەی قانون لە پەرلەمانی عێراق و لە پەرلەمانی کوردستان بێتە پێشەوە، تەعدیلەکانی بێت یان پرۆژەی تازە بێت، یان کۆنەکان بێت بۆ چارەسەرکردن پرس بە یەکەی قانونی ئەکەین، بۆ کاروباری سیاسی پرس دەکەین، بە مەجموع شێوەیەکی تازەی بەڕێوەبردن ئەهێنینە پێشەوە.

KNN: لە کوردستان ئۆپۆزسیۆنن، لە عێراق تائێستا هاوکارن، میکانیزمی ئەم دو حاڵەتەتان چۆن ڕێکخستوە؟

نەوشیروان مستەفا: هێشتا ڕێکمان نەخستوە، ئەوە جۆرێکە کە پێی دەوترێت ئیزدیواجیەتی مەعایر، دو پێوانەی بانێك و دو هەوا، ناکرێت ئێمە لە کوردستان ئەمان مەبدەئی زۆرینەی سیاسی لە مەسەلە چارەنوسسازەکانی

میلەتەکەماندا بەکاربهێنین، بەڵام لە عەرەبی قبولْ نەکەین، لەلایەنەکانی تری قبولْ نەکەین لە بەغدا، بڵێن ئێمە قبوڵمان نیە زۆرینەی سیاسی بڕیار بدات لەسەر مەسەلە چارەنوسسازەکانی عێراق، بێگومان ئەو مەبدەئە مەبدەئێکی باشە ئێمە قبولْ نەکەین لە مەسەلە چارەنوسسازەکانی عێراق بە هیچ جۆرێك مەبدەئی زۆرینە قبولْ نەکەین، مەبدەئی زۆرینە قبولْ بکەین لە هەمو حاڵەتێکدا عەرەب زۆرینەیە کورد کەمینەیە، هەتا ئەگەر لایەنێکی شیعە یان لایەنێکی سوننە بە تەنیا بگرین ئەوان ئەکسەریەتن و زۆرینەن ئێمە کەمینەین، بۆچی تۆ لە بەغدا لە مەسەلە چارەنوسسازەدا نەك لە مەسەلەکانی تردا، بێگومان تۆ ئەو مەبدەئت قبولْ نەبێت، کەچی بێیت لە کوردستاندا بۆ مەسەلە چارەنوسسازەکانی گەلی کورد بە مەبدەئی زۆرینە و کەمینە کار بکەیت، بێگومان ئەمە جۆرێکە لە ئیزدیواجیەتی مەعایر کە بەلای ئێمەوە قبولْ نیە، ئێمە قبولْ ناکەین لە کوردستان جۆرێك مامەڵەمان لەگەڵ بکەن لە بەغداش داوای یەکڕیزیمان لێ بکەن، ئێمە ئەو لایەنانەی ترمان لەگەڵ بێت یان لەگەڵمان نەبن، مەجموعەیەك سەوابتی نەتەوەیی خۆمانمان هەیە، ئەوان دیفاعی لێ بکەن و لێ نەکەن، ئێمە بە قەدەر توانای خۆمان دیفاعیان لێ دەکەین، لەسەری سور دەبین، لە مەسەلە موهیمەکاندا کە پەیوەندی بە چارەنوسی میلەتەکمانەوە هەیە بێگومان ئێمە لەگەڵ ئەو لایەنانەی تردا هاوکار دەبین، هاودەنگ دەبین، هاوهەڵوێست دەبین، لە مەسەلەکانی تردا ئێمە دیفاع لە حقوقی خۆمان دەکەین، لە کوردستانیش عەینەن شت هەرچی شتی خێر و خۆشی میلەتەکەمانی تێدا بێت، لایەنەکانی تریش تەرحی بکەن، ئەوەی جێگای داخە تائێستا ئێمە هەرچیەکمان تەرح کردوە ئەوان دژی راوەستاون، یان ئەوان شتێکیان تەرح کردبێت هاوڕێکانی ئێمەی دژی راوەستاون، پێویستە لەمەولا جۆرێك لە تەفاهوم بدۆزینەوە ئەو شتانەی کە قازانج و خێروخۆشی میللەتەکەمانی تێدایە هەوڵ بدەین جۆرێك لە بۆچونی هاوبەشی بۆ بدۆزینەوە.

بۆئەوەی هەمومان پێکەوە بیکەین، هەمان مەبدەئی بەغدا هەمان مەبدەئی لە کوردستانە.

KNN: مەبەستت چی بو لەوەی کە کۆمەڵێك حاڵەتی چارەنوسساز یاخود کۆمەڵێك شت هەیە کە لە کوردستاندا رەنگە تێپەڕاندنی ئاسایی بێت، بۆ نمونە بۆ پرۆژە قانونێکی تەبیعی، بەلاَم هەندێك پرۆژە یاسا هەبێت رەنگە قورس بێت، ئەمەوێت زیاتر رونکردنەومان بەیتیّ لەسەر ئەوە کە مەبەستت چیە لەوەی کە قبولّی ناکەن؟ باست لەوەکرد، کە کۆمەڵێك شت لە بەغداد بە شێوەیەکی تەوافوق تیّ دەپەڕێت، بەلاَم پێویستە هەمان حاڵەتیش لە کوردستان کۆمەڵێك حاڵەتی چارەنوسساز هەیە بە تەوافوق تێدەپەڕێت، دەتوانین نمونەیەکی لەو شێوەیەمان بدەیتیّ؟

نەوشیروان مستەفا: مەسەلەن بە بیروبۆچونی ئێمە مەسەلەی قەدەغەکردنی کاری حیزبی لەناو دەزگای پێشمەرگە و لەناو دەزگای ئاسایش و لەناو پۆلیس و لەناو دادگا و لەناو دائیرەکانی حکومەتدا، بە نیسبەت ئێمەوە مەبدەئێکی چارەنوسسازە، ئێمە بە هیچ جۆرێك پێمان باش نیە حیزبێك بە تاقی تەنها دەست بگرێت بەسەر موقەدەراتی میللەتی کورددا، لەو رێگایەوە خۆی بسەپێنێت، ئێمە بۆ وەرەقەی ئیسلاّحی سیاسی بەلامانەوە گرنگە چوار مەسەلە هەیە کە ئەمانە نەوعێك لە ئیجماع ئەگەر ئیجماعی کۆدەنگی لەسەر نەبێت، زۆرایەتیەکی سیاسی وا بێنینە پێشەوە کە بەلایەنی کەمەوە زۆری خەڵك لە سەری رازی بێت، یەکەمینیان ئەم مەسەلەی قانونی کۆمسیۆنە یان دەستەی باڵای هەڵبژاردنە لە کوردستاندا، لە کوردستانێکدا کە نە ئاسایش سەربەخۆیە نە پۆلیس سەربەخۆیە نە دادگا سەربەخۆیە نە دامودەزاگاکانی حکومەت سەربەخۆیە، نە ئیعلام سەربەخۆیە نە میزانیە سەربەخۆیە، تۆ وەختێك دەستەیەکی وادروست دەکەیت، من حەقی خۆمە نیگەران بم لەوەی کە بڵێم تۆ ئەتەوێت ئیحتیکاری دەسەلاّتی سیاسی بکەیت لە کوردستاندا بۆ ئێستا و بۆ پاشەڕۆژی خۆت، من حەقی خۆمە نیگەران بم لەوەی کە ترسی

دەسەڵات ئیجبار دەکەیت هەندێك شت بکات بەقازانجی خەڵك، کە لەئەنجامی زەختی تۆدایە، رەنگە ئێمە نەتوانین هەمو شتەکان بەدەستی خۆمان بکەین، بەڵام لاکەی دیکە ئیجبار دەکەین کە ئەو بیکات بەقازانجی میللەتەکەمان، لەو کاتەدا ئێمە پشتیوانیی دەکەین، ئێمە لەپاشەڕۆژیشدا کار بۆ ئەوە دەکەین کە فیعلەن دەسەڵات بگرینە دەستو لە رێگەی دەسەڵاتەوە ئەو بەرنامە سیاسییەی کەهەمانە جێبەجێی بکەین.

KNN: سەبارەت بەوە کە بەرامبەر ناچار دەکەن کۆمەڵێك ئیش بکات، دواجار دەڕژێتەوە جۆگەلەی ئێوەوە، ئەوەی کە لەسەردەمی هەڵبژاردنەکانیشدا وەکو نوکتەیەکی سیاسیی باس دەکرا کە هەتا شەقامێك قیرتاو دەکرا، دەیانوت ئەمە دەستخۆشییە بۆ گۆڕان، یان ئەوەی کە دەوترێت، تەنانەت دیاریکردنی بودجەی ئەحزابو بڕینی بەشێکی ئەم بودجەیە، دیسانەوە هەر لەژێر فشاری ئۆپۆزسیۆنو بەدیاریکراویش بزوتنەوەی گۆڕاندا بوە، ئەمانە بەدەستکەوتی خۆتان دەزانن؟

نەوشیراون مستەفا: بەڵێ، هەرچی شتێکی باش لەم وڵاتەدا بکرێت، بە دەستکەوتی خۆمانی دەزانین، یان هیچ نەبێت دەستێکی ئێمەی تێدایە.

KNN: بابێینە سەر تەوەری دوەم کە ئازادی رادەربڕینو ئازادی رۆژنامەگەریە، ئازادیی، لە ستراتیژی سیاسیی ئێوەدا چییە؟

نەوشیراون مستەفا: ئازادیی، لە ستراتیژی سیاسیی ئێمەداو چەمکی ئازادیی بەگوێرەی زەمان، بەگوێرەی زەمین، بەگوێرەی جیاوازی ئایدیۆلۆژی، جیاوازە لە گروپێکەوە بۆ گروپێکەوە دیکە، حیزبێکی شمولی، یاخود ئایدیۆلۆژیەتێکی شمولی، ئایدیۆلۆژیەتی لیبراڵی مەفهومی جیاوازیان هەیە، بێجگە لەوەش ئازادیی لەلای چینییەکان، لەلای نیپاڵییەکان، لەلای ئینگلیزییەکان، لەلای ئەمریکاییەکان، لەلای سویدییەکان، هەریەکە بەجۆرێك لە ئازادیی تێدەگات، بەڵام بێگومان ئێمە ئازادیمان بەلاوە گرنگە کە بریتییە لە ئازادیی سیاسیی، ئازادیی کۆمەڵایەتی، ئازادیی رۆشنبیریی، دابینکردنی ئەم جۆرە ئازادییانە

قوربانیدان بون، توشی سزا بون، توشی ناڕەحەتی بون، توشی نانبڕین بون، توشی فەقیری بون، توشی بێکاری بون، لەنرخی ئەوەدا، ئەوەمان داوەو پێشموایە، ئەوە سەرکەوتنی گەورەیە، بێگومان لەپاڵ ئەم دو سەرکەوتنەدا کە بەدەستمانهێناون، لەپاڵ ئەم دو گۆڕانەدا کە کردومانە، گۆڕانی دیکەشمان کردوە، ئەویش ئەوەیە کە تا حەددێکی زۆر دەتوانین بڵێین، ئێستا قیادەی سیاسیی کورد، هەرێمی کوردستان، پەرلەمانی کوردستان، لەکاروبارەکانیاندا بەجۆرێك لە جۆرەکان شەفافییەتێکیان پەیدا کردوە، لە گفتوگۆکانی ئەم دواییەی وەفدی کوردی لەبەغدا دەتوانن نمونەکە بهێننەوە.

KNN: درێژەدەدەن بەم نەهجە، بەم سیاسەتە، بەتایبەت کە لەدوای (٧/٢٥)ەوە، بۆ نمونە ئێوە دەتانتوانی بەشداریی بکەن لەحکومەت، بەڵام نەتانکرد، تا کەیو تاچەند درێژە دەدەن بەم نەهجە بۆ ئەوەی کە ئەم مەنزومە ئەخلاقییەی کە باسی دەکەیت، لەکوردستاندا بیکەن بەنەریت، یاخود کلتورێکی سیاسیی؟

نەوشیراون مستەفا: ئەوە بەستراوە بەهەڵسەنگاندنی هەلومەرجی سیاسیی کوردستانەوە، ئێمە کار بۆ ئەوە ناکەین کە بەتەنیا هەر ڕەخنە بگرینو هەر بڵێین فلان شت خراپەو بێگومان ئێمە هەر کارێکی باش کە حکومەت بیکات، پشتیوانیی لێدەکەینو دەنگی بۆ دەدەینو ئیسپاتیشمان کردوە لەپەرلەمانی کوردستان، ئەو شتانەی کە ئێمە بەلامانەوە ڕاستو باش بون، پێمانوابوە قازانجی میللەتەکەمانی تێدایە، بەبێ ئیعتیراز ئێمەش موافەقەتمان لەسەر کردوەو دەنگمان بۆ داوە، ئێمە ئیش بۆ ئەوە دەکەین لەپاشەڕۆژدا بێگومان دەسەڵاتی سیاسیی بگرینە دەست، یەعنی ئەو بەرنامە سیاسییەی کە ئێمە هەمانە، بەتەنیا بە موعارەزەیی جێبەجێ نابێت، ڕەنگە لە ڕێگەی ئەوەی کە ئێمە موعارەزە دەکەین، ڕەنگە بتوانین بەرامبەرەکەمان ناچار بکەین هەندێك جار وەکو چۆن لە دۆمینەدا بەرامبەرەکەت مەجبور دەبێت لەجیاتی ئەوەی کە پولەکە لەدەستیدا بتۆپێت، مەجبورە بێتە خوارەوە، هەندێك جاری وا هەیە کە

بەزەبری چەك سەر بەلایەكی دیكە دابنەوێنێت، یاخود ناكۆكییەكانیان بە زەبری چەك بەلادا بخەن، ئێمە بۆ یەكەمینجار لەمێژوی نوێی كوردستانی عێراقدا، ئسلوبی ململانێی سیاسییمان گۆڕی لەململانێی چەكدارەوە بۆ ململانێی سیاسییو پێموایە، ئەوە سەروەرییەكی گەورەیە كە بۆ گۆڕان تۆمار دەكرێت، ئێمە ناكۆك بوین لەگەڵ حیزبە دەسەلاّتدارەكاندا، بەلاّم پەنامان نەبردە بەر چەك، پەنامان نەبردە بەر توندوتیژیی، پەنامان نەبردە بەر شەڕ، پەنامان نەبردە بەر بێگانە، بەڵكو پەنامان بردە بەر میللەتەكەمانو سندوقی دەنگدان، پەنامان بردە بەر هەڵبژاردنو پێشموایە، ئێمە سەركەوتوبوین، ئێستا توانیومانە هێزێكی سیاسیی رێكخراو، چەند فراكسیۆنێكی سیاسیی لەهەولێرو لەبەغدا، لەسەر جادە هێزێكی سیاسیی بۆ ململانێی سیاسیی ئامادە بكەین، شانبەشانی ئەمە، گۆڕینێكی دیكەمان بەدیهێناوە، ئەویش ئەوەیە كە لەماوەی (١٨)ساڵی رابردودا، خەڵك پێی وابو، ئەوەی ببێت بە حیزبی بۆ مشەخۆرییە، بۆ ئیمتیازاتە، بۆ ئەوەیە كە تەعین بێت، بۆ ئەوەیە كە وەزیفەیەكی باشتر وەربگرێت، ئێمە هەوڵماندداوە، مەنزومەی قیەمی ئەخلاقی سیاسیی لەكوردستانی عێراقدا بگۆڕین بەوەی كە كاری سیاسیی و بەشداریكردن لەكاری سیاسیی تەنیا بۆ مشەخۆری نییە، بەڵكو بۆ خۆشەویستیی نیشتمانە، بۆ خۆشەویستیی گەلە، بۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندییە بالاّكانی نەتەوەیە، بۆ ئەوەیە كە لەژیانی رۆژانەدا لەكاروباری حكومەتیدا، خزمەتكردن بەخەڵك، چاككردنی پەیوەندیی لەگەڵ كۆمەلاّنی خەڵك، دەستپاكیی، داوێنپاكیی، دڵسۆزیی لەئیشوكاردا، دڵسۆزیی بۆ گەل، دڵسۆزیی بۆ نیشتمان، ئەمە لەو قییەمە سیاسییە بەرزانەن كە گۆڕان جارێكی دیكە هێناونیەتەوە بۆ سەر ساحەی كاركردنی سیاسیی، ئەوانەی كە دێن لەگەڵ ئێمەدا ئیش دەكەن، نەك هەر هیچ ئیمتیازێكیان دەست نەكەوتوە، بەڵكو بەهۆی ئەوەوە كە ئەو گۆڕانە بنەڕەتییەمان كردوە لە ململانێی سیاسییدا، ئەو گۆڕانە بنەڕەتیەمان كردوە لە ئەخلاقی سیاسییدا، هەزاران كەس لەئێمە توشی

# بەرگریی لە میدیای ئازاد دەکەین

سازدانی: هۆشیار عەبدوڵا

نەوشیروان مستەفا لە ساڵیادی هەڵبژاردنە مێژوییەکەی ٢٠٠٩/٧/٢٥ی پەرلەمانی کوردستان کە لیستی گۆڕان سەرکەوتنی بەرچاوی بەدەستهێنا تەئکید لەوە دەکاتەوە کە بزوتنەوەی گۆڕان سەرکەوتنی بەدەستهێناوە.
لەم دیدارەدا کەبەرنامەی ڕووبەڕووی کەناڵی KNN لەگەڵیدا ڕێکیخستوە، نەوشیروان مستەفا سەرۆکی بزوتنەوەی گۆڕان باس لەوە دەکات کە لەماوەی (١٨)ساڵی رابردودا، خەڵك پێی وابو، ئەوەی ببێت بە حیزبی بۆ مشەخۆریو ئیمتیازاتە، بەڵام بزوتنەوەی گۆڕان هەوڵیداوە مەنزومەی قیەمی ئەخلاقی سیاسیی لەکوردستانی عێراقدا بگۆڕێت.
KNN: ساڵێك تێدەپەڕێت بەسەر (٧/٢٥)دا، ئەو رۆژەی بۆ گۆڕان بوەتە رۆژێکی مێژوییو زۆر باسی دەکرێت، ئەو رۆژەی کە گۆڕانخوازەکان، یاخود ئەوانەی کە پشتیوانیی ئێوەیان کرد، توانییان ژمارەیەکی گەورە، یاخود فراکسیۆنێکی بەهێزی پەرلەمانیتان بۆ دروست بکەن، ساڵێك تێدەپەڕێت بەسەر ئەو مێژوەدا، بزوتنەوەی گۆڕان، یاخود گۆڕان چی کردوە؟
نەوشیراون مستەفا: ئەگەر حسابی ئەوە بکەین کەچەند کەسمان تەعین کردوە، یاخود موچەمان بۆ چەند کەس بڕیوەتەوە، رەنگە ئەوە گونجاو نەبێت، بەڵام ئێمە لەسەر ئاستی سیاسیی تەماشای کارەکە دەکەین، ئێمە چەند ئیشێکی گەورەمان کردوە، گرنگترین شت ئەوەیە کە ئێمە ئسلوبی ململانێی سیاسییمان لە کوردستانی عێراقدا، لەبنەڕەتەوە گۆڕی، بەدرێژایی (٥٠)ساڵی رابردو، هەرچەند لە جوڵانەوەی کورددا ناکۆکی دروست بوبێت، مونافەسە دروست بوبێت، ململانێ دروست بوبێت، لایەك پەنای بردوەتە بەر چەك بۆ ئەوەی

نەوشیروان مس... ...ێمە وەك پرسكردن پرسمان بە زۆركەس كردوە، هەر
ئەسڵەن لە ڕەوە... ...ردی لە دەروە ١٧ پرۆژەی جیاجیامان بۆ هاتوە لەسەر
ئەوەی كە چۆ... ...ۆن ڕێكخەینەوە، بەڵام ڕاپرسیمان نەكردوە، ڕاستە
پرسمانكرد...ە، ...اپرسیمان نەكردوە، بێجگە لەوە ئێمە لە كوردستاندا
ئەژین لەناو س... ...كی قانونی تایبەت بە كوردستانی عێراقدا دەژین، تۆ
ئەگەر بتەوێ... جوڵانەوەیەكی سیاسی وەكو ڕێكخراوێكی سیاسی
تەنانەت ئە... ڕێكخراوێكی (NGO) وەكو ڕێكخراوێكی كۆمەڵگەی
مەدەنی كار بكە... ...ێت بڕۆیت بۆ وەزارەتی ناوخۆ و لە ئەنجومەنی وەزیران
ئیجازە وەربگرێ... كوردستانی عێراقدا قانونێك هەیە پێی دەڵێن قانونی
ئەحزاب، ئێمە ڕ... ...ن بەگوێرەی ئەو قانونە ڕێگای كاری سیاسیان پێداوین،
ئەگەر ئیجازەمان... گرتایە نەیان دەهێشت كاری سیاسی بكەین.

KNN: دوا...و... ...م، یەكێكیان تایبەتە بە یەكێتی نیشتمانی كوردستان،
ئەوەی تریان تا... بە پارتی دیموكراتی كوردستان، پرسیاری تایبەت بە
یەكێتی دەگوترێ... ...ە گۆڕان جۆرێك لە پەیوەندی ژێربەژێری هەیە لەگەڵ
یەكێتیدا تا چەند... ...ە؟

نەوشیروان مست... ...ەگەڵ یەكێتی نیشتمانی كوردستان ئێمە هیچ جۆرە
پەیوەندیەكی نهێ... نیە، هیچ جۆرە پەیوەندیەكی ڕەسمیمان تائێستا نیە،
تەنها لە پەرلەما... ...ێنەرەكانی ئێمە و نوێنەرەكانی ئەوان یەكتری ئەبینن،
ئەگینا هیچ ج... پەیوەندیەك نەبوە، هەرچەندە ئێمە پێمان خۆشە
پەیوەندیمان لەگە... ...ا ئاسایی بێت، پێمان خۆشە ئەوان وەفد دروست بكەن،
ئێمە وەفد در... ، بكەین دانیشین، ئەجندای ئاشكرامان هەبێت بۆ
موناقەشەكردن، ... موشتەرەكمان هەبێت موناقەشەی بكەین، بەڵام تائێستا
هیچ لە بەینماندا...

KNN: پرسیار... ...ەت بە پارتی، پارتی دیموكراتی كوردستان ئێستا بەرەو
كۆنگرەیەكی نوێ... ...ات تەعلیقت لەسەر كۆنگرەكەیان و بۆچونت چیە؟

نەوشیروان مس... من لە ئێستاوە پیرۆزباییان لێدەكەم و تەمەنای
سەركەوتنیشیان

نازانێت واریداتی بۆ کوێ دەچێت، ئێمە لەگەڵ ئاشکراکردنی ئەوانەین، مەسەلەن دەڵێن عقودی نەوت ئەمە پەیوەندی بە ئەمنی قەومیەوە هەیە، باشە بەڵێ ئەمە پەیوەندی بە ئەمنی قەومیەوە هەیە، وەرە لە بەردەمی پەرلەماندا کە بە حساب هەڵبژێردراوی خەڵکن، لەوێ باسی بکە و موناقەشەی کە ئەگەر باوەڕ ناکەیت بەوان، بڕۆ لە ئەنجومەنی وەزیران باسی بکە، ئەگەر لەلای ئەنجومەنی وەزیران باسی ناکەیت، بڕۆ لای مەجموعەیەك لە سەرکردایەتی حیزبەکانەوە باسی بکە، لەگەڵ ئەوان باسی ناکەیت هیچ نەبێت لیژنەیەکی موختەس لەناو پەرلەمان لەناو حیزبەکان بدۆزەرەوە کە موختەس بێت و جێگای سیقە بێت، بڕۆ لەلای ئەوانە باسی بکە، بۆئەوەی لە پاشەڕۆژدا ئێمە توشی ئیشکالی قانونی نەبین لەگەڵ ئەجیالی داهاتودا پێمان بڵێن، باوك و باپیری ئێمە غەڵەتیان کردوە لە نەزانیدا رۆیشتون کاری وایانکردوە، کە ئێمە ئێستا پێمان عیلاج ناکرێت، وەکو دەستێکی شکاو بۆی بەجێهێشتوی کە بە گۆجی ئەمێنێتەوە هەتا هەتایە.

KNN: بۆچونتان سەبارەت بە کەرکوك، بە کوردستانی بونی کەرکوك و سازش لەسەر ئەو شارە چیە؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە کەرکوك بە بەشێك لە کوردستان دەزانین و هەرچیمان لەتوانادا بێت بۆ ئەوەی کەرکوك بگەڕێتەوە بۆ سەر هەرێمی کوردستان، ئەوەی لە توانای ئێمەدا بێت ئەیکەین، ئێمە لایەنگری ئەوە نین هیچ جۆرە سازشێك لە کوردستانی بونی کەرکوك بکرێت.

KNN: وەك ستراتیج، گۆڕان باوەڕی بە دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی هەیە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ باوەڕمان هەیە.

KNN: بۆچی پرستان بە رەوەندی کوردی نەکرد لەکاتی بڕیاردانتان کە بزوتنەوەی گۆڕان لە بزوتنەوەیەکی جەماوەریەوە بگۆڕن بە حیزبێکی سیاسی؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە بایەخێکی زۆرمان بۆ هەڵسوڕاوەکانمان هەیە، بەردەوام دەبین لەسەر ئەوەی کە ناوبەناو دەورە بکەینەوە، نەك بە مانای ئەو دەورە کاسریانەی کاتی خۆی بۆ زیادکردنی معاش و پلەو پایە، مەسەلەن بۆ نمونە ئێمە ماوەیەکی تر هەمو ئەوانەی کە مەسئولی بازنەکانن دەورەیان بۆ دەکەینەوە لەسەر ئەوەی واجباتی مەسئولی بازنە چیە؟، لەکاتی هەڵبژاردن، لەدوای هەڵبژاردنەکان، بۆ هەمو ئەوانەی کە هەڵبژێردراون، بۆ سکرتێری بازنەکانە دەورەیان بۆ بکەینەوە، بۆ ئەوەی بزانن ئەرکی سکرتێر چیە، بۆ ئەوانەی بەڕێوەبەری کارگێڕین دەورەیان بۆ دەکەینەوە، بێجگە لەوەش ئێمە ئەو ژورانەی کە دروستمان کردوە ئەو یەکەی توێژینەوانەی کە دروستمان کردوە لەمەولا ناوبەناو مەسەلەن یەکەی توێژنەوەی سیاسی تەکلیف دەکەین جارێك بێت لە سەر پەیوەندی عێراق و ئێران، پەیوەندی کوردستانی عێراق و ئێران، جارێك لەسەر پەیوەندی کوردستانی عێراق و حکومەتی عێراق و تورکیا، جارێك لەسەر سوریا، جارێك لەسەر ئەمەریکا، بەتایبەتی لەکاتی ئەزەماتدا بێت بۆ هەڵسوڕاوەکانی گۆڕان موحازەرەیان بۆ بدەن بۆ ئەوەی لەڕوی هوشیاری سیاسیەوە و لەڕوی ئاستی تێگەشتنیانەوە بۆ سەروە بچێت و بەرز بێتەوە.

KNN: گۆڕان رێکخراوی پیشەیی دروست دەکات یان نا؟

نەوشیروان مستەفا : ئێمە دروستی ناکەین نەخێر.

KNN: گۆڕان تێڕوانینی بۆ سیاسەتی نەوتی چیە؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە بەلامانەوە گرنگە سامانی سروشتی لە کوردستاندا لەژێر دەسەڵاتی کوردستان خۆیدا بێت، زۆر بەلامانەوە گرنگە نەوت و غاز و هەمو مەعدەن و هەمو سامانی سروشتی کە لەسەر ئەرزی کوردستانە و لەژێر ئەرزی کوردستاندایە، لە ژێر دەسەڵاتی قانونی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا بێت، بەڵام ئێمە لایەنگری ئەوەین ئاشکرابێت، کەسێك نازانێت مەسەلەن عقودی نەوت لە کوردستاندا چۆنە، کەس نازانێت مەرجەکانی چیە، کەس

هەڵبژاردن ببێت، سەرەتا بەهەڵبژاردن پەیڕەوی دەکەین، هەندێك دەزگا هەیە کە پێویستی بە پسپۆڕی هەیە، تۆ ناتوانیت بیکەیت بە هەڵبژاردن، بۆ نمونە یەکەی توێژینەوەی سیاسی ناتوانیت تۆ بە هەڵبژاردن دایبنێیت، ئەبێت کەسانێك بێنین لەو بوارەدا پسپۆڕبن، چونکە چۆن پزیشکی و ئەندازیاری و دادگا، ئەمانە هەریەکە جۆرێك لە شارەزایی ئەوێت، مەسەلەن وەختێك ئێمە ژوری دارایی دروست دەکەین، پێویستیمان بەوەیە کۆمەڵێك مودیری حیساباتی ئەقدەم دەقیق بێنین، خەڵکی لەو بابەتانە بێنیت کە لەبواری دارایدا ئیختصاسیان هەیە و شەهادەیان هەیە، وەختێك کە تۆ ژوری قانونی دروست دەکەیت، یەکەی قانونی دروست دەکەیت، دەبێت لەو کەسانە بێت کە خریجی کولێژی حقوقن کە مامۆستان لە جامیعە لەو بوارەدا و حاکمی موتەقاعیدن، دەبێت لەمانە دروست بکرێت، من پێویستم بە هەڵبژاردن نیە و ناشتوانیت بە هەڵبژاردن بیکەیت، جا لەبەر ئەوەی دو جۆرە دامەزراوەمان هەیە.

KNN: گەنج لە کوێی بزوتنەوەی گۆڕاندایە؟

نەوشیروان مستەفا: لە هەمو شوێنەکانیایەتی، لە هەمو جومگەکانیایەتی.

KNN: پرۆژەتان هەیە بۆ چالاککردنی ژنان؟ یەکێك لەو رەخنانەی کە زۆرجار لە ئاستی حیزب و لە رێکخراوەکانیتر دەگیرێت؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە کۆمەڵێك ژنی هەڵسوڕاوی لێوەشاوە و چالاك و چاك و خاوەن رێزمان هەیە، لەگەڵ ئەوانەدا لە گفتوگۆداین، پرۆژەی چالاککردنی ژن یاخود بەشداریکردنی چالاکانەی ژن لەبورای ژیانی سیاسیدا، لەبواری رێکخراوەیدا سپاردومانە بە خۆیان، ئێستا خۆیان لەناو خۆیاندا خەریکی ئامادەکردنی پرۆژەیەکن، ئێمە لەباتی ئەوان بڕیار نادەین، ئەوان خۆیان هەر بڕیارێکیاندا و گەیشتنە هەر جۆرە پرۆژەیەك ئێمە پشتیوانیمان لەسەرە و جێبەجێکردنمان لەسەرە.

KNN: تا چەند بایەختان بۆ چۆنایەتی هەڵسوڕاوەکانتان هەیە لە بزوتنەوەکەتاندا؟

پێکردوە هەم لە سەرەوە دەستمان پێکردوە بۆ خوارەوە لە ئاوەڕاستدا یەك دەگرینەوە.

KNN: دەوترێت بزوتنەوەکە ئێستا کە هاتوە سەرێکی هەبوە کە بریتییە لە قیادە کۆنەکانی یەکێتی، ئایە ئەم دۆخە وەکو خۆی دەمێنێتەوە؟

نەوشیروان مستەفا: پێموایە ئەوە بەشێکی راستی تێدایە، بەلاَم هەموی راستی نیە، لە تەنیشت ئەوانەوە دەیان کەسی تری گەنجمان هەیە بەشدارن لە دانانی بڕیاری سیاسی، لەناو ئێمەدا وەکو باسمکرد ئێمە مۆدێلێکی تازەی کاری سیاسیمان هێناوەتە پێشەوە، پرۆسەی ئەوەی کە پێی دەوترێت (العملیات الصنع العمل السیاسی) لە شوێنێکی وەکو ئێراندا جیاوازە لە سوریا، سوریا جیاوازە لە تورکیا، تورکیا جیاوازە لە ئەمەریکا، ئەمەریکا جیاوازە لە بەریتانیا، هەر ولاَتەوە مۆدێلی تایبەتی خۆی هەیە، لەناو حیزبەکانی کوردستانیشدا پرۆسەی بڕیاردانی سیاسی هەر حیزبێك میکانیزمی تایبەتی خۆی هەیە، لەلای ئێمەش میکانیزمێکی تر هەیە کە جیاوازە لە حیزبەکانی تر لەبەرئەوە پێیان وایە هەر رەفیقە کۆنەکانی منە، لە تەنیشت رەفیقە کۆنەکانی منەوە کۆمەلێك رەفیقی تازەشم هەیە کە بەشداری دەکەن لە بڕیاردانی سیاسی لە داڕشتنی بڕیاری سیاسیدا.

KNN: لەسەر مەسەلەی داڕشتنی بڕیاری سیاسی و بەشداریکردنی ئەم خەلکانە، داوایەکی زۆر هەیە لەسەرئەوەی کە پێدانی بەرپرسیارێتی یاخود دیاریکردنی هەر کەسێك بۆ هەر شوێنێك، لەسەر بنەمای تەعین نەبێت، بەلکو بە هەلبژاردن بێت، رای بەڕێزت؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە دو جۆرە دامەزراوەمان هەیە، دو جۆرە دەزگامان هەیە، هەندێکیان دەزگای سەر بە رێکخراوەیین و کاروباری رێکخراوەیی بەڕێوە دەبەن، بێگومان پێویستە ئەمانە بە هەلبژاردن بێت، لەوانە مەسەلەن ئەنجومەنی بنکەیە، ئەنجومەنی بازنەیە، ئەنجومەنی شارە، ئەنجومەنی پارێزگایە، لەپاش ماوەیەکی تر ئەنجومەنی سەرکردایەتیە، ئەمانە مەفروزە بە

خوارەوەیە بۆ سەرەوە یان لە سەرەوەیە بۆ خوارەوە، ئایە لە نێوان ئەم دو مۆدێلە، جیاوازی را هەیە ئێستا لەناو بزوتنەوەی گۆڕاندا؟
نەوشیروان مستەفا: هەردوکێتی، هەم لە خوارەوە دەستمان پێکردوە وەکو باسمکرد ئێمە لە وێستگەوە دەستمان پێکردوە، وێستگەمان کردوە بەیەکەی بنچینەیی بۆ خۆڕێکخستن لە سەرو وێستگەوە ئەنجومەنی بنکەمان هەیە لە سەروی ئەنجومەنی بنکەوە ئەنجومەنی بازنەمان هەیە، بۆ نمونە سلێمانی و قەرەداخ و عەربەت و بازیان و راپەڕین ٢٥ بازنەن، شاری هەولێر ٢٥ بازنەیە هەمو قەزاو ناحیەکان رێکخراون هەر ناحیەیەك بازنەیەکە هەر قەزایەك بازنەیەك یان دو بازنەیە بەگوێرەی قەوارەی ناوچەکان و ئێستا بەرەو ئەوە دەچین کە ئەنجومەنی شارەکانیش دروست بکەین، لە هەمان کاتدا ئێمە وەکو لە سەرەوە باسمکرد کۆمەڵێك دەزگای سەرکردایەتیمان هەیە، مەسەلەن لە ئیعلامدا ئەو برادەرانەی کە سەرپەرشتی ئیعلام دەکەن ئەوانە تا حەدێکی زۆر پرس بەوان ئەکەین دەربارەی ئیعلام، یەکەی توێژینەوەمان هەیەو ژوری رەوەندی کوردستانیمان هەیە، لە شارەکانی تریشدا لەهەریەکە نەواتێکی قیادیمان هەیە لەکاتی هەڵبژاردنەکاندا ئەوەیانکردوە، ئەو کەسانەی کە ئێستا لە پەرلەماندا کاردەکەن پێش دو رۆژ لەمەوپێش ئێمە کۆبونەوەیەکی فراوانی فراکسیۆنەکەی کوردستان و فراکسیۆنەکەی هەولێرمان کرد بە ئامادەکردنی کۆمەڵێك خەڵکی تر، جۆرێکە لەشێوەی قیادەکردنی بەعزێك ئیدارەی ئەزەمات کاتێك ئەزەمات دێتە پێشەوە، بە مانایەکی تر ئێمە هێشتا تەواو نەبوین، کۆمەڵێك ژور دروست دەکەین وەکو باسمکرد، ژوری رەوەندی کوردستانیمان هەیە، ژوری سیاسی دروست دەکەین، ژوری دارایمان هەیە کە ئێستا سەرپەرشتی دارایی بزوتنەوەی گۆڕان دەکات، ژوری پەیوەندی نیشتمانیمان دەبێت، ژوری پەیوەندی دیبلۆماسیمان دەبێت، کۆمەڵێك لەم ژورانەمان دەبێت کە پێکەوە هەمو ئەمانە سەرکردایەتی دروست دەکەن، ئێستا هەم لە خوارەوە دەستمان

ئینتیخابات لە کوردستان بکەیت، بێگومان ئەم ئینتیخاباتە دەچێتە ژێر پرسیارەوە.

KNN: زۆرجار باس لەوە دەکرێت کە ئەگەر کێشەکانتان لە کوردستان چارەسەر نەکرێت ئەیبەنە بەغدا، ئەگەر لێرە میکانزمێك بدۆزنەوە بۆ چارەسەرکردنی باشتر نیە؟

نەوشیروان مستەفا: من زۆرم پێ باشە هەرچی کێشەیەك لەناو هەولێر روبدات لەناو هەولێردا چارەسەر بکرێت، لەناو دهۆك روبدات لەناو دهۆکدا چارەسەر بکرێت، لەناو سلێمانیدا روبدات لەناو سلێمانیدا چارەسەر بکرێت، کە دەڵێم کێشە مەبەستم کێشەی سیاسییە، ئەگەر لەم شوێنانە نەبو کێشەکە ببرێتە بەردەم پەرلەمانی کوردستان، بەڵام پەرلەمانی کوردستان کە زۆرینەی سیاسی بیەوێت جۆرێك لە دەسەڵاتی زۆردارانە بەکاربهێنێت، ئەوەی کە پێی دەوترێت مافێکی هەیە فیعلەن زۆرایەتیە تەعەسوب بە بەکارهێنانی مافەوە بکات، من مەجبورم پەنا بەرم بۆ بەغدا، دوای ئەوە بۆ ئەوان بە چاوی دوژمن تەماشای بەغدا بکەن؟، لە کاتێکدا شەڕ دەکەن لەسەر ئەوەی سەرۆك کۆمار لە خۆیان بێت، نائیبی سەرۆك وەزیران لە خۆیان بێت، وەزیری خارجیە لە خۆیان بێت و وەزیری مالیە لە خۆیان بێت و وەزیری نەوت لە خۆیان بێت و رەئیسی ئەرکانی جەیشەکەی لە خۆی بێت و مەسئولی جیهازی ئیستخباراتی عەسکەری لەخۆی بێت، ئەی باشە ئەم دەوڵەتە ئەگەر دوژمنی ئێمەیە وەرن مقاتەعەی بکەن، هەمومان موقاتەعەی دەکەین، ئەگەر خۆ ئێمە شەریکین لەم دەوڵەتەدا خۆشت بە شەریکێکی سەرەکی دەزانیت لەو دەوڵەتەدا، منیش حەقی خۆمە شکات بکەم لەلای و پەنای بۆ بەرم، کە یارمەتیم بدات لە حەلکردنی موشکیلەکانمدا، لە کاتێکدا تۆ یارمەتیم نادەیت لە حەلی موشکیلەکان.

KNN: کەمێك دەگەڕێمەوە بۆ ناو بزوتنەوە سیاسیەکەتان، رێکخستنەوەتان جارێکی تر ئەم پرسیارەم کردوە و مەبەستم هەیە لەم پرسیارە، ئەوەیە کە لە

ئەوەم هەبێت هەڵبژاردن بەشێوەیەکی سیستەماتیك تەزویر بکرێت، حەقی خۆمە ترسی ئەوەم هەبێت کە تۆ بەو تەریقەیە نایەیت من بە کوشتن و برین و. . . بسرپیتەوە و ئیبادەم بکەیت، بەڵام بە ڕێگەی هەڵبژاردن، هەڵبژاردنێك کە هەمو دامودەزگاکانی سەر بە خۆتە، لەبەرئەوە تەبعەن نیگەران دەبم، نوقتەیەکی تر مەسەلەی تەمویلی ئەحزابە، تۆ لەکاتێکدا خۆت بە ئارەزوی خۆت تەسەڕوف دەکەیت بە میزانیەی هەرێمی کوردستانەوە میزانیەی خەیاڵیی گەورە تەسەڕوف دەکەیت بە واریداتی گومرگەوە بە واریداتی نەوتەوە، ئێمە مەحروم دەکەیت، خەڵکەکانی ئێمە دەردەکەیت لە وەزیفە و نانی ئەبڕیت و ماوەی ١٥ مانگ ناهێڵیت معاش وەربگرێت، بێگومان من حەقی خۆمە نیگەران بم و ترسم هەبێت لەوەی کە تۆ بەرامبەر بەمنی ئەکەیت، چوار مەسەلە بەلای ئێمەوە زۆر گرنگە کە پێمان وایە چارەنوسسازە، ئەوە مەسەلەی قانونی کۆمسیۆنی هەڵبژاردنەکانە، مەسەلەی قەدەغەکردنی حیزبایەتیە لەناو دامودەزگای ئاسایش و دامودەزگای چەکدار و ئەمنیدا، مەسەلەی تەمویلی حیزبەکانە بۆئەوەی بە قانون تەنزیم بکرێت و هەر حیزبە بە قەدەر حەقی خۆی بەر بکەوێت، مەسەلەی ئەوەیە کە جارێکی کە هەتا ئەگەر مومکین بێت لە سنورێکی تەسکدا تەعدیلکردنی دەستوری هەرێمی کوردستان، ئەگەر بۆ پڕوپاگەندەش نەبێت لەناو پەرلەمان لە شوێنەکانی تردا، هەندێك مادە و هەندێك بەندی دەستوری کوردستان پێش ئەوەی بخرێتە ئیستیفتاوە پێویستی بەوە هەیە کە جارێکی تر چاوی پیابخشێنینەوە و مناقەشەی بکەین، بۆئەوەی دەستورەکە خەڵکی کوردستان بەهی خۆی بزانێت، بەڵام تۆ لە کاتێکدا بتەوێت بە ئارەزوی خۆت قانونێك دابنێیت لە وەختێکدا لە بەغدا فەراغێکی دەستوری هەیە فرسەت بێنیت، بڕۆیت قانونێك دابنێیت بۆ دروستکردنی دەزگای هەڵبژاردن و دەزگایەکی هەڵبژاردن بە ئارەزوی خۆت دابنێیت و کارمەندەکانی خۆت تەعینی بکەیت و بڕۆیت بەو دەزگایە

KNN: دوا پرسـيارم ئەوەيـە كـە سـالێك تێدەپـەڕێت بەسـەر بزوتنەوەيـەكی سياسيی تازەدا كە بە هەمو پێوەرێك، جۆرێك لـە رچەشـكاندنی تێـدابوەو وەكـو باس دەكرێت، ئەركێكی سياسيی قورسی لەسەرە، هەر لانيكەم لەبەرئەوەی كـە ئۆپۆزسيۆنی دروستكردوە، بە كورتی پرسيارەكە ئەوەيە، ماندو نەبون؟

نەوشيراون مستەفا: بيسميلـلا، تازە دەستمان پێكرد

قانونانەی کە لەعێراقدا هەبون، لەوان باشترە، بەڵام من ئومێدم وایە، باشتریش بێت.

KNN: دەوترێت، یەکێتیو پارتی کار بۆ هەموارکردنەوەی ئەم یاسایە دەکەن، چونکە پێیانوایە: جۆرێك لە ئازادیی زیاتر، یاخود ئەوەی کە خراپ بەکارهێنانی ئازادیی، ئەو گوزارشتەی کە خۆیان دایانهێناوە، لەم یاسایەدایە؟

نەوشیراون مستەفا: هیوادارم، بیر لەشتی وا نەکەنەوە.

KNN: ئەم پرسیارە، ڕەنگە تا ڕادەیەك شەخسی بێت، لە واژۆکردنی مۆڵەتی حیزبەکەتانداو لە تەنیشت ناوەکەی خۆتدا نوسیوتە، نەوشیروان مستەفا ئەمین، ڕۆژنامەوان، تۆ خۆت بە ڕۆژنامەوان دەزانیت، یان سیاسیی؟

نەوشیراون مستەفا: ئەزانی من (٣) جار پەساپۆرتم لە عێراق وەرگرتوە، یەکەم جار ساڵی (١٩٧٠) وەرمگرتوەو لەسەر پیشەکەم نوسراوە (صحفی)، جاری دوەم ساڵی (١٩٨٤) دەرمهێناوە کە مفاوەزاتمان دەستپێکرد، لەسەر ئەوەش هەر نوسراوە (صحفی)، لەدوای روخانی سەدامیش کە جارێکی دیکە پەساپۆرتێکم دەرهێناوە، لەسەری نوسراوە (صحفی)، بۆ مەعلوماتت، لەکۆتایی شەستەکانەوە، ئەندامی کارابوم لە سەندیکای ڕۆژنامەوانانی عێراقدا، ئەو زەمانەی کە هەمو چەند سەد ڕۆژنامەنوسێك لە عێراقدا هەبون، ئێستاش هەر ئەندامم لە یەکێتیی ڕۆژنامەنوسانی بەریتانیا، یەعنی بە پیشە ڕۆژنامەنوسم.

KNN: کەواتە سەرۆکایەتیی حیزبێك، یاخود بزوتنەوەیەکی سیاسیی پەسەند دەکەیت، یان سەرنوسەری ڕۆژنامەیەك؟

نەوشیراون مستەفا: بەداخەوە، نەمتوانیوە ڕێبازی ژیانی خۆم، یان ڕێبازی سەرەکیی ژیانم هەڵبژێرم، ئەگەر بەدەست خۆم بوایە، حەزم دەکرد ببومایە بە مامۆستای زانکۆ، بەڵام بوم بە سیاسیی، ئێستاش ئەگەر بەدەست خۆم بێت، ڕەنگە سەرنوسەری ڕۆژنامەیەکم پێ باشتربێت لەوەی کە سەرۆکایەتیی حیزبێك بکەم.

نابێتەوە، یەعنی بەمانایەکی دیکە، ئێمە موشکیلەمان لەگەڵ ئەدائی سیستمی بەڕێوەبردندا هەیە، نەك لەگەڵ ئەشخاسدا.

KNN: زۆرترین ئەو هێرشانە، یاخود ئەو قسانەی دەنوسرێن لە میدیای بەرامبەرەوە بەرامبەر بە بزوتنەوەی گۆڕان، زۆرترینیان بەرامبەر خودی نەوشیروان مستەفان، رات چییە، یاخود هیچ کاردانەوەیەکت هەیە بەرامبەر بەم نوسینانە؟

نەوشیراون مستەفا: ئەوەندەی پەیوەندیی بەخۆمەوە هەیە، گەردنیان ئازاد بێت، هیوادارم خوا هیدایەتیان بدات، ئەوانەی ئینسانی گومڕان بێنەوە سەر رێگەی راست، یان ئەوانەی لەپشتی ئەوانەوەن، بێنەوە سەر رێگەی راست.

KNN: ئەوانەی کە لەسەرت دەنوسن، دەیانخوێنیتەوە؟

نەوشیراون مستەفا: ئەوەندەی فریا بکەوم، بەڵێ، دەیخوێنمەوە، ئەوانە پۆلێنیشیان دەکەم لە عەقڵی خۆمدا، هەمو ئەوانەی کە رەخنەم لێدەگرن، یان رەخنە لە جوڵانەوەکە دەگرن، من بە نەزەری ئیعتبار وەریدەگرم، ئینجا ئەو رەخنەیە دڵسۆزانە بێت، یان دوژمنانە بێت، رەخنەکە راست بێت، یان درۆ بێت، بە نەزەری ئیعتبار وەریدەگرین، ئەگەر رەخنەکە راست بو، هەوڵدەدەین چارەسەری بکەین، ئەوەی ئیلاقەشی بە جنێوەوە هەیە، ئیهمالی دەکەین، ناڵێم گەردنیان ئازاد بێت.

KNN: ئێستا، ئەگەر لە دۆخێکی وادا بین‌و ئەوەی کە دەوترێت زۆرجار فەوزایەکی ئیعلامیی هەیە، وەزیفەی کێیە ئەو فەوزا ئیعلامییە ئەمە سنوردار بکات؟

نەوشیراون مستەفا: وەزیفەی یاسای رۆژنامەگەریە، ئەرکی دادگاکانە.

KNN: رات چییە سەبارەت بەم یاسایە، یاسای رۆژنامەگەریی؟

نەوشیراون مستەفا: ئەگەر ئەم قانونەی کە لە کوردستاندا دەرچوە، بەراورد بکرێت لەگەڵ قانونەکانی پێشو، لەگەڵ قانونی عقوباتی عێراقی، لەگەڵ ئەو

لە میدیا دروستبوە، یاخود ئەوەی کە باس دەکرێت پێیدەوترێت میدیای سێبەر، بە رای تۆ، وەزیفەی ئەم جۆرە میدیایە چییە؟

نەوشیراون مستەفا: هەر عەینەن ئەو شتانەیە کە وەختی خۆی باسمانکردون.

KNN: یەعنی ئەو (٣) وەزیفەیەیە؟

نەوشیراون مستەفا: هەر دیسانەوە تاریکاندنە، ونکردنی راستییەکانە، گەوجاندنی خەڵکەو دێواندنی بەعزێك سەرکردەو ئەوانەیە، عەینی وەزیفە دەبینن، بەڵام ئەمانە لە سێبەرو لە تاریکیدا.

KNN: ئێوە تۆمەتبار دەکرێن بەوەی کە زمانی راگەیاندنی ئێوە، زمانێکی زۆر توندو هێرشکەرە، زمانێکە رەحم ناکات، بە مانایەك لە ماناکان، لەبەرامبەریشدا زۆرترین هێرش‌و پەلامار بۆ سەر ئێوەیە، هەندێکجار بۆ سەر شەخسی ئێوەیە، ئەم هاوکێشەیە لای تۆ چۆنە، یەعنی جۆرێك لە تۆمەتبارکردن هەیە لە هەردو بەرەکەوە؟

نەوشیراون مستەفا: وەکو باسمکردوە، رەخنەم گرتوە لە ئەدائی سیاسیی، رەخنەمان گرتوە لە سیاسەتی فلأن حیزب، رەخنەمان گرتوە لە سیاسەتی حکومەت، رەخنەمان گرتوە لە ئەدائی سیاسیی ئەنجومەنی وەزیران، رەخنەمان گرتوە لە ئەدائی سیاسیی پەرلەمان، رەخنەمان گرتوە لەو مەسەلانە، بەڵام بەهیچ جۆرێك داخڵی ناوزڕاندن‌و شکاندنی شەخس‌و ئەوانە نەبوین، چونکە ئێمە کێشەمان لەگەڵ شەخسدا نییە، ئێمە پێمانوایە: لە سیستمێکی باشدا ئینسانی خراپ جێگەی نابێتەوە، خراپەکە، یان دەبێت باش بێت، یان دەخرێتە زیندانەوە، لە سیستمێکی ناباشدا، ئینسانی باشیش یان مەجبور دەبێت لەگەڵیدا بڕوات، یان دەریدەپەڕێننە دەرەوە، لەبەرئەوە ئێمە کێشەمان لەگەڵ سیستمی بەڕێوەبردندایە، ئەگەر سیستمێکی بەڕێوەبردن هەبێت، خەڵکی خراپ جێگەی تیا نابێتەوە، یان دەخرێتە زیندانەوە، یان دەخرێتە دەرەوەی سیستمەکە، لە سیستمێکی باشدا خەڵکە خراپەکانیش جێگەیاز.

(BBC) لەلایەن جۆرێك لەباجەوە بودجەی پێدەدرێت، كە هەمو كەسێك كە تەلەفزیۆنی هەبێت دەبێت باج بدات، باجی تەلەفزیۆن بدات، باجەكە دەچێت بۆ (BBC)، لەهەمان كاتدا ئەگەر ئەو پارەیە بەشی نەكرد لەپارەی یانسیب بەشێكی بۆ تەواو دەكەن، ئەگەر ئەوەش تەواوی نەكرد، لە پەرلەمانی بەریتانیا بە قانون پارەی پێدەدەن، واتە چی تیایە ئەگەر رۆژنامەوانی ئازاد لەكوردستانیشدا بە جۆرێك لەجۆرەكان حكومەت كۆمەكێكی داراییان بكات، وەكو باسم كرد، ئێمە ولاتێكی بچكۆلەمان هەیە، بازارێكی بچوكمان هەیە، ریكلام بەئەندازەی پێویست نییە، بەلام تەبعەن ئەوە نەبێت بە سەبەبی ئەوەی كە رۆژنامەی پێ بكرنو خەلكەكانی پێ بكرنو رۆژنامەوانی ئازادی پێ بێدەنگ بكەنو پێ كپ بكەنەوە.

KNN: دەوترێت، ئێوە زیاتر ئۆپۆزسیۆنێكی ئیعلامین، تا ئۆپۆزسیۆن بن لەناو هۆلی پەرلەماندا، بە گوزارشتێكی دیكەش، نەهجی سیاسیی خۆتان لەپشت رۆژنامەكانەوەو لەپشت میدیاوە زیاتر شاردوەتەوە تا چالاكییەكی سیاسیی لەسەر ناو هۆلی پەرلەمان؟

نەوشیراون مستەفا: پێموایە، ئەوە حوكمێكی نادروستە، چونكە چۆن لە ئیعلامدا موعارەزەمان پیشانداوە لەناو هۆلی پەرلەمانیشدا فراكسیۆنی گۆران شانبەشانی دو فراكسیۆنی دیكە لەگەلێك مەسەلەی گرنگدا دەوری موعارەزەیان بینیوە، پرۆژەی بەدیلیان پێشكەش كردوە، رەخنەی مەعقولیان گرتوەو قسەیان كردوە، ئێمە هەم لە هۆلی پەرلەماندا، هەم لە ئیعلامدا، لەسەر بەعزێك مەسەلە ئیعتیرازمان گرتوەو موعارەزەمان پیشانداوەو لەئایندەیەكی نزیكدا كە لەبەغداش فراكسیۆنەكەمان كەوتەگەر، لەوێش دەوری خۆمان دەبینین.

KNN: یەكێك لە بۆچونە هەرە دیارەكانی ئێوە سەبارەت بە میدیای حیزب لەماوەی رابردودا، ئەوە بوە كە (٣) وەزیفەو ئەركی خراپی هەبوە، یاخود سلبی هەبوە كە بریتی بون لە: تاریكاندنو گەوجاندنو دێواندن، ئێستا جۆرێك

بەلامەوە ئاسایی نییە دەسەڵات بەکاربهێنن بۆ چاوسورکردنەوە، بۆ ترساندن، بۆ گڤ کردن لەمیدیای ئازاد.

KNN: یەکێك لە لەمپەرەکانی بەردەم میدیای ئازاد کە بەردەوام باسی لێوەدەکرێت، کێشەی داراییە، هەندێکجار جیاواز لەوەی کە حکومەت پرۆژەی نییە بۆ هاوکاریکردنی ئەم میدیایە، تەنانەت زۆرجار سەرچاوەکانی داهاتیان لە شێوازی ریکلامو ئەوانەش سنوردار دەکات، ئێوە وەکو ئۆپۆزسیۆن، پرۆژەتان چییە بۆ ئەم دۆخە کە وەکو هەڕەشە وایە لەبەردەم میدیا ئازادەکەدا، ئامانجتان پشتیوانیکردنیانە؟

نەوشیراون مستەفا: ساڵو نیوێك لەمەوپێش، داوام لە کۆمەڵێك خەڵکی قانونی کرد کە پرۆژەیەکمان بۆ بنوسن بۆ ئەوەی بینێرین بۆ پەرلەمان، ئەو زەمانە ئێمە فراکسیۆنو شتی وامان نەبو. لەگەڵ چەند رۆژنامەنوسێکدا کە لەبواری رۆژنامەوانی ئازاددا کاردەکەن، موناقەشەم کردو لەگەڵ ئەو برادەرانە لەسەر ئەوەی کە ئایا ئێمە ئەو پرۆژەیە تەقدیم بکەین یان نا، پێشموایە کە ئەگەر پرۆژەکەمان تەقدیم کردبوایە، ئیحتیمالی زۆر هەبو کە لەوانەبو قبوڵی بکەن، ئەو دۆستە بەرێزانە باوەڕیان وابو کە پێشکەشکردنی ئەو پرۆژەیە لەو کاتەدا، کارێکی نادروستە لەبەر ئەم هۆکارەی خوارەوە، وتیان ئەگەر پرۆژەکەمان تەقدیم کرد، پارەیان بڕییەوە بۆ یارمەتیدانی رۆژنامەوانیی ئازاد، پێماندەڵێن، ئەوانیش بۆیە رەخنەیان نەگرت بۆ ئەوەی پارە وەربگرنو فیعلەن پارەیان وەرگرتو کڕیمانن، وتیان، ئەگەر رەفزیشی بکەنەوە، ئێمە لەسەر رەخنەگرتن بەردەوام بین، پێماندەڵێن، وەلا ئەمانە بۆیە رەخنە دەگرن، داوای پارەیان کردو نەمان داونەتێ، لەبەرئەوە وتیان با ئەوە بهێڵینەوە، ئەگینا لە وڵاتانی بچوکی وەکو کوردستاندا کە ژمارەی دانیشتوان کەمە کە بازاڕی ریکلام کەمە، کە بازاڕی فرۆشی رۆژنامە کەمە، کە خوێندەواری رۆژنامە کەمە، بەتەبیعەتی حاڵ دەوڵەت مەسئولە لەوەی کە بەجۆرێك لەجۆرەکان کۆمەکی دارایی دەزگاکانی راگەیاندن بکات، لە وڵاتێکی زۆر گەورەی وەکو بەریتانیا کە تا ئێستا وەکو

KNN: بۆچونێك هەیە كە لە وەتەی میدیای ئازاد دروست بوە، دەسەڵاتی سیاسیی تا رادەیەكی زۆر پێی سەرخۆش نەبوە، لەناو هۆڵی پەرلەماندا، لەشوێنی جیاجیادا، باس لەوە كراوە كە ئەمانەی نوێنەرایەتی میدیای ئازاد دەكەن، سیخوڕن، دەستی بێگانەن، تابوری پێنجن، ئێستاش رەنگە تازەترین قسە ئەوە بێت كە رەنگە سەر بەئێوەن وەكو بزوتنەوەی گۆڕان؟ ئەم دۆخە بۆ؟

نەوشیراون مستەفا: یەكێك لەو شتانەی لە كوردستاندا بەداخەوە، لەماوەی (١٨)ساڵی رابردودا چەسپیوە، ئەوەیە كە لە كوردستاندا فێر نەبون موعارەزە قبوڵ بكەن، بەڵكو یان ئاشتییەكی لەرزۆك هەبوە لەبەینی لایەنە سیاسییەكانداو رێككەوتون لەسەر دابەشكردنی دەستكەوتو ئەوانە، یاخود شەڕیان كردوە، یەعنی دەستاودەستكردنی هێمنانەی دەسەڵات لەكوردستاندا هێشتا نەبوە بە نەریتێك، هەرچی چوە دەسەڵاتەوە، بەهەمو نرخێك دەیەوێت ئەو دەسەڵاتە بپارێزێتو پێیانوایە، میدیای ئازاد كە رەخنەیان لێدەگرێت دەبێت بەهۆی ئەوەی كە ئەوانە نەتوانن تا سەر لەسەر دەسەڵاتدا بەو شێوەیەی كە ئێستا بەڕێوەی دەبەن، بمێننەوە، وە ئەوانە عەیبو عارەكانیان دەردەخەن، میللەت هۆشیار دەكەنەوە، كەموكوڕییەكانیان پیشان دەدەن، ئەوانیش نایانەوێت لە دەسەڵات دابەزنە خوارەوە، نایانەوێت دەسەڵات دەستاودەست بكات لەدەستێكەوە، لەحیزبێكەوە بۆ حیزبێك، لە گروپێكەوە بۆ گروپێك، بەهەمو نرخێك پارێزگاریی خۆیان لەمانەوە لەدەسەڵاتدا دەكەن، یەكێك لەوانە ئەو بوختانانەیە كە بۆ رۆژنامەوانی ئازادی دەكەن.

KNN: هەڵوێستی ئێوە وەكو بزوتنەوەی گۆڕان، سەبارەت بەو هێرشە توندەی دەكرێتە سەر میدیای ئازاد، چییە؟

نەوشیراون مستەفا: بەلامەوە شتێكی ئاساییە كە دەسەڵات بەرگریی لەخۆی بكات، بەلامەوە شتێكی ئاساییە كە موقابیلی ئەو رەخنانەی كە لێی دەگیرێت ئەوانیش رونكردنەوە بدەن، بەڵام بەلامەوە ئاسایی نییە هەڕەشە بكەن،

که جولانەوەیەکی لیبرالییە، پەراوێزی ئازادیی لەناو ئەو دامودەزگایانەی بزوتنەوەی گۆڕاندا زۆر زۆر زیاتر دەبێت لەپەراوێزی ئازادیی لەناو ئەو حیزبانەی دیکە کە ئێستا هەن، من ئومێدم وایە، بتوانین پارێزگاری ئەوە بکەین کە هەمیشە دامودەزگایەکی سەربەخۆو ئازادمان هەبێت بۆ کاروباری راگەیاندن، بەهەمو شێوەیەك هەوڵدەدەین کە ئەو غەڵەتانەی لایەنە سیاسییەکانی دیکە لەبواری راگەیاندنی حیزبدا کردویانە، دوبارەیان نەکەینەوە.

KNN: ئەم پەراوێزی ئازادییە دەگاتە ئەوەی کە بتوانن رەخنە لەخۆشتان بگرن؟

نەوشیراون مستەفا: بێگومان لەدوای هەڵبژاردنی مانگی (٧)ی ساڵی پارەوە، خۆم کە کۆبونەوەم کرد لەگەڵ هەمو ئەوانەی لە بواری راگەیاندنەکەدا ئیشیان دەکرد لە کۆمپانیای (وشە)، نازانم جەنابت لەوێ بویت، بەهەمویانم وت، بەهیچ جۆرێك رەحم بە برادەرەکانی خۆشمان نەکەن، چۆن رەخنە دەگرن، ئەگەر هەرچی کەموکوڕییەکیان کرد، رەخنەیان لێبگرن.

KNN: لە روبەڕوبونەوەی پێشودا، باستان لەوە کرد کە یەکێك لەئامانجەکانتان وەکو بزوتنەوەی گۆڕان، پشتیوانیکردنی میدیای ئازادە، چۆن؟

نەوشیراون مستەفا: بەڵێ، ئێمە پێمانوایە، یەکێك لە کۆڵەکەکانی ژیانی دیموکراسیی لە وڵاتانی دنیا، میدیای ئازادە، رەخساندنی هەلە بۆ کارکردنی میدیای ئازاد، لەبەرئەوە لە کوردستانیشدا بەهەمو توانامانەوە داکۆکیو بەرگریی لەمیدیای ئازاد دەکەین، داکۆکی لێدەکەین لە روی سیاسییو مادییو قانونییو مەعەوییەوە، پێمانوایە یەکێك لە کۆڵەکەکانی ژیانی دیموکراسی لە کوردستانیشدا دەبێت میدیای ئازاد بێت، بۆیە بەهەمو توانامانەوە لەهەرچی بوارێکدا پێویست بێت، پشتیوانیی لەمیدیای ئازاد دەکەین.

ئەگینا لەهەمو ولاتانی دنیا، تورکیا بەنمونە بهێنینەوە، یان تەنانەت ئێران بەنمونە بهێنینەوە کە دو ولاتی دراوسێی ئێمەن، یان کوەیت بەنمونە بهێنینەوە، ئەحزاب لەویّ بەم دەزگای راگەیاندنە نییە کە هەیە، لەکوردستان عێراقدا وەختێك هەمو حیزبە دەسەلاتدارەکان دامودەزگای حکومەتیان بە کاملیی بەدەستەوەیە، میزانییەی حکومەتیان بە کاملیی بەدەستەوەیە، هێزە چەکدارەکانی ولاتەکەیان بە کاملیی بەدەستەوەیە، تۆ چۆن دەتوانیت ململانێی فیکری سیاسیی لەگەلّ ئەم لایەنانەدا بکەیت، ئەگەر تۆش، وەکو چۆن ئەوان دەزگایەکی راگەیاندنیان هەیە، تۆش دەزگایەکی راگەیاندنت نەبێت بیروبۆچونەکانی تۆ رۆشن بکاتەوە، من تەمەننا ئەکەم، رۆژێك وای لێبێت کە هەمو دەزگا ئیعلامییە حیزبیەکان لەکوردستاندا ببن بەدەزگای ئیعلامی ئازادو سەربەخۆ، حیزبەکان هەمو وەکو یەك وابن، ئەوساکە پێموایە، ئێمەش پێویستیمان بەوە نابێت دەزگای راگەیاندنی تایبەت بەخۆمانمان هەبێت.

KNN: ئەم قسەیەت، بۆنی ئەوەی لێدێت کە زیاتر بەلای ئەوەدا یەکلایی ببنەوە کە دەزگا راگەیاندنەکەتان بخەنە سەر بزوتنەوەی گۆڕان، بەتایبەت دەمەوێت، ئەوەت بیر بخەمەوە کە لەناو یەکێتیدا پڕۆژەیەکت تەقدیم کرد، پڕۆژەیەکی چاکسازیی کە تیایدا لەیەکێك لەبڕگەکانیدا هاتوە کە دەزگای ناوەندی راگەیاندن، بدرێتە دەست کۆمپانیا، ئێستا کۆمپانیای (وشە) خۆی کۆمپانیایە، خستنەسەر بزوتنەوەی گۆڕان جۆرێك لەجیاوازی دروست ناکات لەو بۆچونە؟

نەوشیراون مستەفا: وەکو باسمکرد، تا ئێستا ئەوەمان بەلایەکدا نەخستوە، بەلام لەهەمو حالەتێکدا هەتا ئەو زەمانەی هەمو حیزبەکان لەکوردستاندا، دامودەزگای ئیعلامیی خۆیانیان هەبێت، بزوتنەوەی گۆڕانیش مەفروزە دەزگای راگەیاندنی خۆی هەبێت، بەلام ئەوە بەو مانایە نییە کە (KNNو سبەیو رۆژنامەی رۆژنامەو دەنگی گۆڕان) هەموی بکرێت بە هی گۆڕان، لەهەمو حالەتێکدا ئێمە وەکو هێزێك کە باوەڕمان بە ئازادیی هەیە، باوەڕمان بەوە هەیە

KNN: کاروانی سیاسیی ئێوە لەگەڵ کاروانی رۆژنامەگەریتان، تا رادەیەك بەیەکەوە دەستپێدەکات، بەتایبەت لەسەردەمی رۆژنامەی رزگارییدا، بۆچونێك هەیە کە ئازادیی راگەیاندن، یاخود ئازادیی بیروڕا لەسیاسەتدا سنوردارترە، تاکو رۆژنامەگەریی، وایە؟

نەوشیراون مستەفا: بەڵێ، ئەوە راستە، چونکە ئەوانەی دەچنە ناو رێکخراوێکی سیاسییەوە بەئارەزوی خۆیان، دەبێت پابەندبن بەبەرنامە سیاسییەکەوە، هەرچەندە ئەوە لەحیزبێکەوە بۆ حیزبێکی دیکەو لە رێکخراوێکەوە بۆ رێکخراوێکی دیکە دەگۆڕێت، پابەندبون بەبەرنامەی سیاسیی حیزبێکەوە، بەشێك لەو ئازادییەت لێ دەستێنێتەوە، بێگومان ئەمە لە حیزبێکی شمولیدا، لە حیزبێکی تۆتالیتاردا پابەندییەکە زۆر بەهێزترە، پەراوێزی ئازادیی زۆر کەمترە وەك لەحیزبێکی لیبراڵی، رەنگە پەراوێزی ئازادیی لە حیزبێکی لیبراڵیدا زیاتر بێت، ماوەی ئیشکردنت زیاتر بێت.

KNN: کۆمپانیای (وشە)تان دامەزراند بۆ رەخنە، بە فەلسەفەکەی خۆشتان رەخنە بەزمانی گوڵ، بەڵام ئێستا تا رادەیەك دەزگاکانی راگەیاندن وەکو ئۆرگانی بزوتنەوەی گۆڕان دەردەکەون، سیاسەتی ئاڕاستەکردن، یاخود سیاسەتی راگەیاندنی ئێوە چۆنە؟

نەوشیراون مستەفا: ئێمە لەسەر مەسئەلەی ئەوەی کە ئایا کۆمپانیای (وشە) هەموی تەسلیم بە بزوتنەوەی گۆڕان بکەین، یان وەکو دەزگایەکی جیاوازو سەربەخۆ بمێنێتەوە، تا ئێستا لەناو خۆماندا لەگفتوگۆداینو ساغمان نەکردوەتەوە، من زۆر بەلامەوە گرنگە کە لە کوردستاندا دەزگای راگەیاندنی ئازاد هەبێت، زۆر زۆر بەلامەوە گرنگە کە ئێمە چاو لە میللەتانی پێشکەوتوی دنیا بکەین، میللەتانی پێشکەوتوی دنیا، حیزبەکانیان دامودەزگای ئیعلامی تایبەت بەخۆیانیان نییە، رەنگە هەندێك دەزگای ئیعلامی هەبێت، بەشکڵێك لە شکڵەکان پشتیوانی لەسیاسەت، یان لەبیروبۆچونی حیزبێك بکات، بەڵام بەم شیکڵەی ئێستا لەکوردستاندا هەیە، رەنگە تەنیا وڵات کە وابێت، سوریا بێت،

تەلەفزیۆنی ئازاد هەبێت، رادیۆی ئازاد هەبێت، سینەمای ئازاد هەبێت، بێجگە لەوە خەڵك ئازادیی خۆپیشاندانو مانگرتنو رێپێوانو کۆکردنەوەی ئیمزای هەبێت، هەروەها دەیبەستینەوە بەوەی کە دەبێت دادگا سەربەخۆ بێت، ئازادیی هەبێت، زانکۆکان سەربەخۆ بنو ئازادییان هەبێت، مزگەوتەکان سەربەخۆ بنو ئازادییان هەبێت، بازاڕ سەربەخۆ بێتو ئازادیی هەبێت، ئەمە هەمووی بەیەکەوە گرێدراوە لەگەڵ یەکتریدا.

KNN: جیاوازیی هەیە لەنێوان راگەیاندن، یاخود ئازادیی راگەیاندن لە دۆخی شۆڕشدا، لە دۆخی حوکمڕانیدا؟

نەوشیراون مستەفا: بەڵێ، بێگومان لە زەمانی شۆڕشدا، من باسی شۆڕشی کوردستانی عێراق دەکەم، نامەوێت مەسەلەکە بگشتێنم، تەعمیمی بکەم بۆ هەموی، لەسەردەمێکدا کە تۆ لەشۆڕشدای خەباتی چەکدار دەکەیت، خەباتی نهێنیی دەکەیت، خەباتی رێکخراوەیی دەکەیت، لەبەرامبەری تۆدا هێزێکی دڕندە بەهەمو چەکێكو شەبەکەیەکی جاسوسی فراوانیو راگەیاندنو ئیعلامو ئەمانەی هەیە، لەو حاڵەتەدا رەنگە پاراستنی ئاسایشی شۆڕشەکە، یان پاراستنی ئاسایی جوڵانەوە چەکدارەکە، پاراستنی ئاسایشی رێکخراوە سیاسییەکە، ئەولەویەتی هەیە لەچاو مەسەلەی ئازادییدا، یەعنی پاراستنی ئاسایشی شۆڕشەکە تاحەددێکی زۆر سنور دادەنێت بۆ ئازادیی رادەربڕینو ئازادیی بچوك دەکاتەوە، لەکاتێکدا هەمو شۆڕشەکە لەپێناوی بەدیهێنانی ئازادییدا ئیش دەکات، وەختێك کە تۆ دەسەڵاتت گرتە دەست، مەفروزە ئازادیی لە وڵاتەکەدا جێبەجێ بکەیت، مەفروزە ئەو بەڵێنانەی کە کاتی خۆی بەخەڵکتداون جێبەجێیان بکەیت، تۆ لە فەترەیەکدا کە فەترەی شۆڕش بوە، داوات لەخەڵك کردوە، قوربانیی بدەن، قوربانییان تەنیا بەژیانی خۆیان نەداوە، بەڵکو قوربانییان بەوە داوە کە تەنازولیان لە بەشێك لە ئازادییەکانی خۆیان کردوە لەپێناو ئەوەی کە ئازادییەکەی گەورەتر بهێننەدی کە ئەویش ئازادیی وڵاتەکەیانە، وڵاتێکی ئازاد، بەتاکی ئازادو بەکۆمەڵی ئازادەوە دەبێت.

لەناو کۆمەڵگەی کوردیدا بەلای ئێمەوە زۆر زۆر گرنگن، ئێمە پێمانوایە، ئازادیی تاك، یان ئازادیی کۆمەڵ کاتێك تەواو دەبێت کە دەگاتە سنوری دەستپێکردنی ئازادیی تاکێکی دیکە یان کۆمەڵێکی دیکەو پێمانوایە، تەنیا سنور بۆ ئازادیی ئەوەیە کە دەستدرێژی نەکردێتە سەر ئازادیی خەڵکی دیکە، مەفهومی ئازادیی لای ئێمە ئەوەیە.

KNN: ئێستا لە کوردستانداو لە دۆخە سیاسییەکەشدا، باس لەوە دەکرێت، باس لەسنوردانان بۆ ئازادیی دەکرێت بەبیانوی خراپ بەکارهێنانی ئازادییەوە، بۆچونتان لەم بارەیەوە؟

نەوشیراون مستەفا: ئەوە بۆچونێکی ورد نییە، چونکە لە کوردستاندا یاسای رۆژنامەگەریی دەرچوە، خراپ بەکارهێنانی رۆژنامە، ئەو قانونە دەتوانێت رێگەی لێ بگرێت، ئەگەر بە رێکوپێکی جێبەجێ بکرێت، بەڵام بەداخەوە ئەو قانونە کە نزیکەی دو ساڵە لە پەرلەمانی کوردستانەوە دەرچوە، بەڵام تا ئێستا لە دادگاکانی کوردستاندا جێبەجێ نەکراوەو پێموایە، ئەگەر ئەو قانونە جێبەجێ بکرێت، رەنگە تا ئەندازەیەکی زۆر بتوانێت رێگە لەوە بگرێت کە ئازادیی رۆژنامەوانی خراپ بەکار نەهێنرێت.

KNN: بۆچونێك هەیە کە سیاسییەکانی کورد وەك پێویست لە ئازادیی تێنەگەیشتون، کێشەی تێگەیشتن لە ئازادییان هەیە؟

نەوشیراون مستەفا: پێموایە، ئەوە راست نییە، سیاسییەکانی کورد بەدرێژایی تەمەنی خۆیان کاریان کردوە لەپێناوی دابینکردنی ئازادییدا، باوەڕم وایە کە بەچاکی لە ئازادیی تێگەیشتون، بەڵام وەختێك تۆ دەگەیتە دەسەڵات، پاراستنی دەسەڵات دەکەوێتە سەرو پاراستنی ئازادییەوە.

KNN: با بێینە سەر مەسەلەی ئازادیی رادەربڕین، رادەربڕین یاخود ئازادیی را لە ستراتیژی بزوتنەوەی گۆڕاندا چۆنە؟

نەوشیراون مستەفا: ئازادیی رادەربڕین لەلای ئێمە چ لەئاستی تاكو چ لەئاستی کۆمەڵ، ئازادیی رادەبڕین بریتییە لەوەی کە رۆژنامەی ئازاد هەبێت،

# ئێمە ئۆپۆزسیۆنین پێویست ناکات دەسەڵات تەگبیرمان بۆ بکات

سازدانی: هۆشیار عەبدولاّ

نەوشیروان مستەفا لەم چاوپێکەوتنەدا کە بەرنامەی روبەروی کەناڵی (کەی ئێن ئێن) لەگەڵی سازداوە سەبارەت بە پرسی خۆرێکخستنەوەی بزوتنەوەی گۆران و کۆمەڵێك باس و خواسی هەنوکەی سەر گۆرەپانی سیاسی کوردستان و عێراق بیروبۆچونی بزوتنەوەی گۆڕان دەخاتە رو.

KNN: بالەسەرەتاوە لە مۆڵەتەکەتانەوە دەستپێبکەین، ئێوە لەدوای (٧/٢٥) باستان لەوە دەکرد وەکو قەوارەیەکی سیاسیی بەشێوەیەکی یاسایی لە هەرێمی کوردستاندا کاردەکەن، بەلاّم لەچوارچێوەی قانونی پۆلّ بریمەردا، دواتر پەناتان بۆ ئەوە برد کە لە حکومەتی هەرێمی کوردستاندا مۆڵەت وەربگرن، بۆچی؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە لە دو هەڵبژاردندا دوجار داوامان لە کۆمسیۆنی بالاّی هەڵبژاردنەکان کردوە، لەهەردو جارەکەدا وەکو دو لیست چوینەتە هەڵبژاردنەوە، جاری یەکەم (٧٠٠) کەس پشتیوانی لە داواکەمان کردوە، ئەوە شتێکی ئاساییە لە عێراقدا هەمو ئەو رێکخراوانەی کە بەشدارییان لە هەڵبژاردندا کردوە هیچ ئیجازەیەکیان لە حکومەت وەرنەگرتوە، تەنیا لەو رێگەیەوە هاتونەتە ناو ژیانی سیاسییەوە، ئێمەش پێمانوابو: لە کوردستانیش بەهەمان رێگە دەتوانین بەشداریی بکەین، بەلاّم کاربەدەستەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان زۆرجار ئینتیقائی سەیری قانونەکانی عێراقو سەیری

دەستوری عێراقی دەکەن، ئەو قانونانەی کە بە قازانجی تایبەتی خۆیان بێت، ئەو مادانەی کە بە قازانجی تایبەتی خۆیان بێت جێبەجێی دەکەن، ئەوەی بە قازانجی تایبەتی خۆیان نەبێت، بۆ نمونە کاتی خۆی موچەی وەزیرەکانیان زیاد کرد، یەکسەر لێرە موچەکانیان زیاد کردن، پێمانوتن: بۆ زیادتان کردوە؟، وتیان: وەڵلاّ لە بەغدا زیادی کردوە، قانون دەرچوە، ئەگەر قانونێکی پێچەوانەی ئەوە دەربچێت موچە کەم بکەنەوە، ئەوان دەڵێن: وەڵلاّ ئێمە عایدی بەغدا نین، قانونی خۆمانمان هەیە، بە قانونی خۆمان، یەعنی بەشێوەیەکی ئینتیقائی موعامەلە دەکەن، لەبەرئەوە بە ئێمەیان وت: ئەمە ناخوات لە کوردستان، ئێمە قانونی ئەحزابو رێکخراوەکانمان هەیە، دەبێت بەگوێرەی ئەوە داوای مۆڵەت بکەن، ئێمە داوای مۆڵەتمان کردو مۆڵەتمان وەرگرتوە.

KNN: ئەو مۆڵەتە بۆچی زەرور بو؟

نەوشیروان مستەفا: ئەو مۆڵەتە زەرورە بۆ ئەوەی ئێمە حزورێکی سیاسیی، حزورێکی قانونی، حزورێکی رێکخراوەیمان لەهەمو چالاکییەکانی ناو کۆمەڵگەی خۆماندا هەبێت، بۆ ئەوەی بتوانین مقەڕاتمان هەبێت، بۆ ئەوەی بتوانین کۆڕو کۆمەڵ ببەستین، بۆ ئەوەی بتوانین کۆنگرە بەڕەسمیی ببەستین، بۆ ئەوەی بتوانین کۆنفرانسی مەحەلی ببەستین، بۆ ئەوەیە.

KNN: بۆچونێك هەیە، کە پێیوایە: ئەو مۆڵەتەتان تەنها بۆ ئەوە داواکردوە، بۆ ئەوەی بتوانن بودجە لە حکومەتی هەرێمی کوردستان وەربگرن؟

نەوشیروان مستەفا: وا بزانم مەسەلەی بودجە بەشێکە لەو قانونەی کە لە پەرلەمانی کوردستاندا دایاننناوە بۆ دیاریکردنی کۆمەککردنی دارایی هەمو رێکخراوە سیاسییەکانو حیزبە سیاسییەکانی کوردستانی عێراق، لەو چوارچێوەیەدا، بەڵێ ئێمە داوای بودجە دەکەینو داواشمان کردوە، بەلاّم ئێمە مۆڵەتەکەمان تەنیا بۆ بودجە نییە، بودجە بۆ جێبەجێکردنو راپەڕاندنی ئیشوکارەکانمانە، ئەگینا ئێمە راپەڕاندنی ئیشوکارو چالاکییەکانمان نەبێت، ئەسڵەن ئێمە پێویستیمان بە بودجە نییە بۆ ژیانی تایبەتی خۆمان، مۆڵەتمان

وەرگرتوە بۆ ئەوە بتوانین لەهەمو قەزاكاندا مقەڕ بكەینەوە، بۆ ئەوەی بتوانین كۆڕو كۆمەڵ ببەستین، بۆ ئەوەی كە كەی ویستمان خۆپیشاندان بكەین بەڕەسمیی، بۆ ئەوەی بتوانین ئێمە لەمەولا لەهەمو بوارەكانی ژیانی سیاسیی كوردستانی عێراقدا هەبونێكی رەسمیمان هەبێت.

KNN: باسی بودجەمان كرد، باری داراییتان چۆنە؟

نەوشیروان مستەفا: لەسایەی خواوە بارودۆخی داراییمان باشە.

KNN: مەسەلەی خۆڕێكخستنەوەتان بەچی گەیشت؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە هێشتا لە قۆناغی سەرەتایی خۆڕێكخستنەوەین، دوای ئەوەی كە مۆڵەتی یاساییمان وەرگرتوە، پێش ئەوەی كە مۆڵەتی یاسایی وەربگرین، ئێمە لە هەندێ شوێندا، هەندێك ئەنجومەنو لیژنەمان دروستكردوە، كە پەیوەندیی بە هەڵبژاردنی پەرلەمانی كوردستانو هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراقییەوە هەبو، دوای ئەوە ئێمە نەچوین وەكو حیزبەكانی دیكە كۆمیتەو لیژنەو لقو شتی دیكەی لەو بابەتانە دروست بكەین، ئێستا دەستمانكردوە بە خۆڕێكخستن بەجۆرێك لەخوارەوە دەستمانپێكردوە بۆ سەرەوە، ئێمە وەكو هێزێك دەتوانین شانازیی بەوەوە بكەین، كە كەرەستەیەكی گەورەی خۆڕێكخستنمان هەیە، ئێمە هێزێك نین بڵێین، لەپێشدا دەستەی دامەزرێنەرمان دروستكردوە، دەستەی دامەزرێنەر بڵاودەكەینەوە بە كوردستاندا بۆ ئەوەی بچێت پڕوپاگەندە بكات بۆ ئەم رێكخراوە سیاسییە، بۆ خۆشبەختی ئێمە بەرەو ژوری (٤٠٠) هەزار كەس دەنگیان پێداوین، لەناو ئەوانەدا خەریكی خۆڕێكخستنین، لەخوارەوە دەستمانپێكردوە، لە بنكەكانی خوارەوە دەستمانپێكردوە، نەك لەسەرەوە.

KNN: گرنگترین تایبەتمەندیی لەو خۆڕێكخستنەوەیەدا كە چەند جارێكی دیكەش بەیەكەوە گفتوگۆمان لەگەڵ كردویت، ئێستا رەنگە یەكیانت وتبێت كە ئەوەیە، كە لەخوارەوە بۆ سەرەوە خۆتان رێكخستوە، بەڵام لەسەر تایبەتمەندییەكانی خۆڕێكخستنەوەی ئێوە دەتەوێت بڵێیت چی؟

نەوشیروان مستەفا: رەنگە دو تایبەتمەندیمان هەبێت جیاوازمان بکات لە حیزبە تەقلیدییەکان، یەکێکیان ئەوەیە: ئێمە هەوڵمانداوە ئەوەندەی مومکین بێت دەسەلاتەکان دابەش بکەین بەسەر شارەکاندا، واتا هەمو شارێك کەسایەتیی تایبەتی خۆی هەبێت، دەسەلاتی تایبەتی خۆی هەبێت، تەنانەت بازنەکانیش جۆرێك لە کەسایەتیو دەسەلاتی تایبەتی خۆیان هەبێت، واتا دابەشکردنی دەسەلات بەشێوەیەکی ئاسۆیی بەسەر ئۆرگانەکانی ئەم رێکخراوە، ئەوە یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی ئێمە، لەمەش گرنگتر ئێمە هەوڵمانداوە لەم رێکخستنە تازەیەدا جۆرێك لە سیستمی کارکردنی رێکخراوەیی بێنینە کایەوە، کە هەمیشەو لەهەمو کۆنگرەیەکدا قابیلی تازەبونەوە بێت، واتا ئێمە نایکەین بەحیزبی کۆمەڵێك کادیری پیشەیی، کە هیچ ئیشوکارێکیان نەبێت غەیری حیزبایەتی، ئەو سیستمی کارەی کە ئیشی پێدەکەین، ئێمە ئومێدمان وایە کە سیستمێك بێت هەمیشە تازەبونەوەی تیابێت.

KNN: خۆشت باستکرد، کە قاعیدەیەکی جەماوەریی بەرفراوانتان هەیە لانیکەم ئەوانەی کە دەنگیان پێداون، هەڵبژاردنی ئەوانەی کە دیاری دەکرێن کە لەگەڵتان ئیش بکەن بۆ بزوتنەوەی گۆڕان، پرۆسەیەکی ئاڵۆز نییە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ پرۆسەیەکی ئاڵۆزە، چونکە ئێمە دیاریمان نەکردوە کێ ئەندامی ئێمەیە تائێستا، کێ ئەنداممان نییە، لەپاش فەترەیەکی دیکە پاش ئەوەی پرۆسەی خۆڕێکخستن گەیشتە قۆناغی ئامادەکردنو ئەنجامدانی ئەنجومەنی شارەکان، ئەوساکە رەنگە فۆرمێك بلاوبکەینەوە، کێ دەیەوێت ببێت بە ئەندام، کێ دەیەوێت وەکو پشتیوانو لایەنگر بمێنێتەوە، بەلام هەڵسوڕاوەکانی ئێمە تا ئەندازەیەکی زۆر دیارن، ئێمە دو هەڵبژاردنمان بەڕێکردوە، لە هەردو هەڵبژاردنەکەدا لە هەمو شارەکاندا ئێمە ئەنجومەنمان هەبوە، کۆمیتەمان هەبوە، لە هەندێك جێگە گروپمان هەبوە، گروپی پشتیوانیمان هەبوە، لەناو ئەمانەدا دیاربون، ئەوانەی کە هەڵسوڕاو بونو

کاریان کردوەو ماڵ بەماڵ گەڕاون، لەسەر سندوقەکان بریکار بون، یان چاودێر بـون، لەشـارەکاندا سەرپەرشـتی هەڵمـەتی هەڵبـژاردنیان کـردوە، ئێمـە هەڵسوڕاوەکانمان لەناو ئەوانەدان.

KNN: دەوترێت زۆرترین ئیعتیمادتان لەسەر ئەوانەیە، کە کۆن، یان پێتشتر لە یەکێتی لەگەڵتاندا بون؟

نەوشیروان مستەفا: ئەوە زۆرجار ئەو قسەیە باسدەکرێت، ئێمە هەمو ئەوانەی کـە لـە یـەکێتی نیـشتمانیی هاتوینەتـە دەرەوە، بـە کـادیرە سـەرکردەییەکانو ئەوانـەی خـوارەوە ژمارەمـان ناگاتـە (٣) هـەزار کـەس، ناگاتـە (٢) هـەزار کـەس، ئەوانەی کە دەنگیان بەئێمە داوە بەرەو ژوری (٤٠٠) هەزار کەسە، ئەوانەی کە لە حیزبەکانی دیکەوە هاتون، ئێمە تەجروبەیەکی رابردومـان هەیـە هـی زەمانی پێـشمەرگایەتی، لـە زەمـانی پێـشمەرگایەتیدا ئەوکەسـانەی کـە عەسـکەرییان دەکـرد لـەڕیزی جەیـشی عێراقـدا کـە دەهاتنـە دەرەوە، سـازدانو رێکخـستنیان لـەناو ریـزی پێـشمەرگەدا زۆر ئاسـانتر بـو لەوانـەی کـە هـەرگیز سـەربازییان نەکردبو، ئەوانەی کە سەربازییان کردبو، کۆمەڵێك شتی سەربازیی فێرببون، کە لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا دوبارە دەبوەوە، زۆر بۆ ئێمە ئاسان بوبۆئەوەی کە کەسێك کە دەهاتە دەرەوە، بەئاسانی بکرێت بە فەرماندەی مەفرەزە، بکرێت بە فەرماندەی کەرت، بکرێت بەجێگری تیپ، بکرێت بە فەرماندەی تیپ، ئەوانە کە تازە بـون هـیچ تەجروبـەیکی ژیـانی سـەربازییان نـەبو، چـەند مانگێك دەبوایـە لەگەڵیان خەریك بیت، بۆ ئەوەی فێریان بکەیت کە قۆناغی تازە چییە. بەهـەمان شێوە ئەوانەی لە رێکخراوە سیاسییەکانەوە هاتونەتە ناو ئێمەوە، نـەك بەتـەنیا لەناو یەکێتییەوە، تەنانەت ئەوانەی لـەناو حیزبـەکانی دیکەشـەوە کـە هاتونەتـە نـاو ئێمـە، گـەنجینەیـەکی گـەورەی تەجروبـەی ژیـانی رێکخراوەیـیو ژیـانی سیاسییو ژیانی گشتییان هەیە، ئێمە کـەڵك لـە هـەمویان وەردەگرینو سودیان لێوەردەگرینو بۆ ئێمە ئەوە سەروەتێكو سامانێکی گەورەیە.

KNN: دەوترێت کە بزوتنەوەکەتان دابەش بوە بۆ دو ئاست، یاخود دو نەوە، یان ئەوەی نازانم پێی دەڵێن، حیزبیو ناحیزبی، ئەوانەی کە پێشتر لە حیزبەکەتان لە یەکێتی نیشتمانیدا لەگەڵتان بونو ئەوانەش کە پێشتر حیزبایەتیان نەکردوە، زۆرجاریش پەلدەهاوێت بۆ ئەوەی، کە بڵێن: لەناو بزوتنەوەی گۆڕاندا تەکەتول دروست بوە؟

نەوشیروان مستەفا: پێموایە ئەوە شتێکی ئاساییە، ململانێی نەوەکان لەهەمو جیهاندا هەبوە، لە کوردستانیشدا هەیە، ئەوەی جێگەی خۆشحاڵییە ئێمە یارمەتیمان داون بۆ ئەوەی ئەو ململانێیە ئێستا بەشێوەیەکی ئاشکرا بێتە کایەوە، جیلی تازە هەوڵ بدات جێگەی جیلی کۆن بگرێتەوە، ئەوە قانونێکی تەبیعییە (نوێ کۆن دەبێت، کۆن جێگە چۆڵ دەکات بۆ نوێ) ئەوەی کە تۆ باسی دەکەیت ململانێی من پێموایە: ئەوە شتێکی زۆر ئاساییە بەو ئەندازەیە نییە، وەکو نەیارەکانی ئێمە زۆر باسی دەکەن، ئێمە هەوڵ دەدەین تەجروبەی کۆن، تەجروبەی پیر لەگەڵ هیممەتی گەنجدا تێکەڵاو بکەین، لادێیو شاریی تێکەڵاو بکەین، کۆنو تازە تێکەڵاو بکەین، حیزبیو غەیرە حیزبی تێکەڵاو بکەین، من هەر بۆ نمونە بۆ ئەوەی بزانیت کە ئەوە تا چ ئەندازەیەك ئەو قسەیە کە تۆ کردتو خەڵك ئەوە دوبارە دەکەنەوە، تا چ ئەندازەیەك ورد نییە، ئێمە لە شارێکی وەکو شاری سلێمانیدا بەتایبەتی لەناو شارەکەدا لەسەر سندوقەکان پێویستیمان بە (١٠٩٦) کەس بوە بۆ بریکاری، بۆ سەرپەرشتی بنکەکان پێویستیمان (١٨٠) کەس بوە، بۆ سەرپەرشتی بازنەکان پێویستیمان بە زیاتر لە (٤٠) کەس بوە، هەمو ئەوانەی کە لە یەکێتی هاتونەتە دەرەوە لە شاری سلێمانیدا کۆنەکانی کە جەنابت باسی دەکەیت ژمارەیان ناگاتە (٢٠٠) کەس، یان (٣٠٠) کەس، باقیەکەی دیکەمان لەکوێوە هێناوە؟

KNN: زۆرجار باس لەوە دەکەن کە لە دیدارو روبەڕوبونەوەکانی دیکەشدا، بەوەی کە ئێوە شێوازێکی نوێ لە کاری سیاسیی لە کوردستان بەرهەم دەهێنن، یان لانیکەم شێوازێکی نوێ لە کاری سیاسیی کە لە ئەزمونی حیزبە

تەقلیدییەکانی دیکەی کوردستان ناچێت. سیماکانی ئەم تازەییە، دوای تێپەڕبونی دو هەڵبژاردن بەسەر ئەزمونی بزوتنەوەکەتاندا چییە؟
نەوشیروان مستەفا: یەکێك لەگرنگترین ئەو ئەزمونانەی کە ئێمە ئێستا تاقیدەکەینەوەو دامان هێناوە، ئەزمونی دانانی چەكو هەڵگرتنی دروشمی سیاسییە، ئێمە جوڵانەوەکەمان لە باتی ئەوەی بە تفەنگ شەڕ بکاتو لە باتی ئەوەی لەکاتی ناکۆکیدا پەنا بۆ چەك بەرێتو ئیحتیکام بۆ چەك بەرێت، پەنای بۆ دەنگدانو بۆ قسەکردن بردوە، بۆ یەکەمینجارە لەمێژوی تازەی میللەتەکەماندا، ئێمە موعارەزەیەکی مەدەنیمان لەچوارچێوەی قانونەکانی هەرێمی کوردستاندا هێناوەتە کایەوە کە دەوری خۆیان بەشێوەیەکی زۆر باش دەبینن لە ئاشکراکردنی ئەو شتانەی کە پێویستە میللەتەکەمان بیزانن، من پێموایە، بەتەنیا ئەو سەروەرییە باس بکەین، ئەو داهێنانە باس بکەین، پێموایە، ئەوە شتێکی تازەیە لەجوڵانەوەی کورددا، ئێوە خۆتان دەزانن کە کورد بەدەست شەڕی ناوخۆوە چەند توشی دەردو نەهامەتی بوە، بۆ یەکەمینجارە کە وامانکردوە، جوڵانەوەیەکی سیاسیی بێتە پێشەوە، بەبێ بەکارهێنانی چەك، بەبێ بەکارهێنانی زەبروزەنگ، بەبێ ئەوەی کە پەنا بەرێت بۆ توندوتیژیی، جۆرێك لە کاری سیاسیی هێمنانە، کاری سیاسیی قانونی، کاری سیاسیی مەدەنی بێنێتە کایەوە، ئومێدمان وایە، ئەمە سەرەتای قۆناغێکی تازە بێت لە ژیانی میللەتەکەماندا.
KNN: یەکێك لەو سیماتە ناشیرینانە کە پێشتریش ئێوە لە خیتابی ئیعلامی خۆتاندا نەقڵتان کردوە، کردنەوەی بارەگای حیزبی بوە لە گەڕەكو کۆڵانو شارو شارۆچکەکاندا، سیاسەتی ئێوە بۆ کردنەوەی بارەگا چۆنە لە کوردستاندا؟
نەوشیروان مستەفا: ئێمە هەوڵدەدەین کە کەمترین ژمارەی بارەگامان هەبێت، هەوڵدەدەین، لەهەر قەزایەکدا لە بارەگایەك زیاترمان نەبێت، پێشنیازمان کردوە بۆ فراکسیۆنی گۆڕان لە پەرلەمانی کوردستاندا کە پڕۆژەیەك پێشکەش بکەن،

لەو پڕۆژەیەدا وەکو بەشێك لە تەعدیلکردنی قانونی ئەحزاب، یاخود وەکو پڕۆژەیەکی سەربەخۆ، بۆ دیاریکردنی ژمارەی بارەگای حیزبەکان لەناو شارەکاندا، پێمانوایە، هەبونی ژمارەیەکی زۆری بارەگای حیزبی لەناو شارەکاندا، لەناو کوچەو کۆلانەکاندا، لەناو شەقامەکاندا، بێجگە لەوەی کە دەبێت بەبار بەسەر میزانیەی گشتییەوە، دەبێت بەبار بەسەر دراوسێکانیشەوە، دراوسێکانیش هەراسان دەکات، ئازادیی خەڵکیش تێکدەدات، بۆیە پێمان باشە، نەك هەر ئێمە، بەڵکو حیزبەکانی دیکەش ژمارەی بارەگاکانی خۆیان لەناو شارەکاندا کەم بکەنەوە.

KNN: دەوترێت کە بزوتنەوەی گۆڕان، کۆنگرە نابەستێت، ئێوە پێشتر پێتانوابوە، هەمو رێکخستنێك پێویستی بە کۆنگرە هەیە بۆ ئەوەی نویێ بێت‌و لەنوێبونەوە نەوەستێت؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، ئێمە نەك هەر کۆنگرە دەبەستین، پاش ئەوەی پرۆسەی خۆڕێکخستنەوە تەواو بو، فۆرمی داواکاری ئەندامێتیی بلاودەکەینەوە، پاش ئەوەی پرۆسەی ئەندامگیریمان تەواو کرد، ئێمە نەك هەر کۆنگرەی گشتیی دەبەستین، یان کۆنگرەی نیشتمانی دەبەستین، بەڵکو کۆنفرانسی محەلی شارەکانیش دەبەستین، واتا لەهەمو شارەکاندا کۆنفرانسی محەلی دەبەستین، کۆنفرانسە محەلییەکان تەنیا بۆ ئەوە نابێت کە چەند کەسێك هەڵبژێرن بۆ مەسئولیەت‌و ئەوانە، بەڵکو زۆر تر کۆنفرانسە محەلییەکان بۆ ئەوە بێت کە پێویستییەکانی هەلومەرجی کۆمەلایەتی، ئابوری، رۆشنبیری بزانین بۆ ئەوەی بتوانین هەمیشە ئێمە بەرنامەی تازە پێشکەش بکەین‌و بهێنینە کایەوە.

KNN: مەسئولییەت لە فەلسەفەی سیاسیی بزوتنەوەی گۆڕاندا چییە، تەکلیفە، یان تەشریفە، ئەرکە، یان رێزلێنانە، کامیانە؟

نەوشیروان مستەفا: بێگومان، لای ئێمە ئەرکە.

KNN: پەیوەندیتان بە هێزە کوردستانییەکانەوە چۆنە؟

نەوشیروان مستەفا: تائێستا پەیوەندییەك كە پێی بوترێت، پەیوەندیی سیاسی، لەنێوان ئێمەو لەنێوان حیزبە كوردستانییەكان بەتایبەتی یەكێتیو پارتیدا نییە. لەسەر ئاستی پەرلەمان، پەرلەمانتارەكانی ئێمە، ئەوان دەبینن، ئەوان هی ئێمە دەبینن، گفتوگۆ دەكەن لەناو هۆڵی پەرلەماندا، جاروباریش كە سەرۆكایەتیی هەرێمی كوردستان نوێنەری هەمو لایەنەكان بانگ دەكات، نوێنەرەكانی ئێمەش دەچن بۆ ئەوێ، بەڵام وەكو پەیوەندیی دوقوڵی، تائێستا لەگەڵ هیچ لایەنێكدا بەتایبەتی لەگەڵ هەردو حیزبی دەسەڵاتداردا پەیوەندیمان نییە، ئومێدمانوایە كە لە پاشەڕۆژدا باش ببێت.

KNN: لە گرژییەكانی ئەم دواییەتاندا لەگەڵ پارتی دیموكراتی كوردستان، یاخود ئەو زمان زبریەی كە لە راگەیاندنەكانی پارتی دیموكراتی كوردستاندا بەرامبەر بە گۆڕان بەكارهات، بێدەنگیتان هەڵبژارد، بۆچی؟

نەوشیروان مستەفا: بۆ ئەوەی كە هەلومەرجی كوردستان بارگرژتر نەبێت.

KNN: لە كۆنگرەكەی یەكێتیی نیشتمانیی كوردستانیشدا، لە كۆنگرەی (٣)دا، تاڵەبانی دیسان هێرش، یاخود باسی بزوتنەوەی گۆڕانی كردوە، لانیكەم، بەخراپ یاخود ناباش، لەسەر ئەوەش بێدەنگیتان هەڵبژارد؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، لەبەر هەمان سەبەب، بۆ ئەوەی بارگرژی زیاتر دروست نەبێت، پاش ئەوە بەڕاستی ئێمە زۆر موراعاتی وەزعی ئەو برادەرانەمان كرد، وەزعی ئەو كەسانەمان كرد كە لە كۆنگرەكەدا بونو ئومێدمان وابو كە كۆنگرەیەكی هێمنو سەركەوتوبێتو باش بەڕێوەبچێت، لەبەرئەوە تەحەمولی ئەوەمان كرد، چیمان پێدەڵێن، جوابمان نەدانەوە.

KNN: باسی كۆنگرەمان كرد، ئەنجامەكانی كۆنگرەی (٣)ی یەكێتیی نیشتمانی كوردستانت بەلاوە چۆنە، یاخود تەعلیقت لەسەری چییە؟

نەوشیروان مستەفا: من هیچ تەعلیقێكم لەسەری نییەو نامەوێت هیچ هەڵسانگاندنێكیشی لەسەر بڵێم، بەڵام لەناخی دڵەوە تەمەننا دەكەم،

سەرکەوتو بن‌و قۆناغێکی تازە لە ژیانی ڕێکخراوەکەیاندا دەستپێبکەن، کە بە خێرو خۆشی میللەتەکەمان‌و بە قازانجی میللەتەکەمان بێت.

KNN: بەلاّم کەسێك کە نیوەی عومری خۆی لە بزوتنەوەیەکی سیاسییدا بەسەربردبێت، ئێستا ڕاستە لێی جیابوەتەوە، یان بزوتنەوەیەکی سیاسیی سەربەخۆی هەیە، بەلاّم هیچ تەعلیقێکی لەسەر نەدا، شتێکی ئاساییە بەڕای بەڕێزت؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، ئێستا ئێمە جولاّنەوەیەکی دیکەمان بەڕێخستوە، بێجگە لەوەش هێشتا زوە بۆ ئەوەی هەڵسەنگاندنێك بکەین بۆ ئەنجامەکانی کۆنگرە.

KNN: پەیوەندیتان بە میدیای ئازادەوە چۆنە، ئەو میدیایەی کە دەوترێت، هەمو شتێك کە دەنوسن، یاخود کە دەیڵێن، ئێوە لەپشتییەوەن، یاخود ڕاستتر ئەوەی کە ئێوە خاوەنی میدیای ئازادن؟

نەوشیروان مستەفا: لەڕاستیدا ئێمە خاوەنی میدیای ئازاد نین، ئێمە تەلەفزیۆنمان هەیە، رادیۆمان هەیە، رۆژنامەمان هەیە، سایتمان هەیە بەناوی خۆمانەوەو هەمو ئەو شتانەی بلاّویدەکەینەوە بەبێ ئەوەی شەرم لەکەس بکەین، بەناوی خۆمان‌و بەوێنەی خۆشمانەوە بلاّویدەکەینەوە، بەلاّم ئێمە بێگومان پشتیوانیی لە میدیای ئازاد دەکەین، هەندێك لایەن‌و هەندێك کەس کە ئێمە بەوە تاوانبار دەکەن کە ئێمە لەپشتی میدیای ئازادەوەین، یاخود هەموی بەقسەی ئێمە دەکات، لەڕاستیدا ئەوە ڕاست نییە، ئێمە ڕاستە لەپشتی میدیای ئازادەوەین، چونکە یەکێك لەبەرنامەکانی کە ئێمە ئیشی بۆ دەکەین، دابینکردنی ئازادیی ڕادەربڕینە لە کوردستانداو ئێمە پێمان خۆشە هەمو حیزبە سیاسییەکانی کوردستان فێری ئەوە ببن، لەباتی ئەوەی تفەنگ بەکاربهێنن، لەباتی ئەوەی حەبسخانە بەکاربهێنن، بواری ڕاگەیاندن بەکاربهێنن بۆ دیفاعکردن لەخۆیان، لەهەمان کاتدا بۆ ڕونکردنەوەی بیرو بۆچونەکانی خۆیان، من لێرەوە ڕایدەگەیەنم، ئێمە مەسئولیەتمان، تەنیا بەو

دامودەزگایانەی راگەیاندنە کە خۆمان بەڕێوەی دەبەین، ئەوانەی دیکە، ئەو سایتانەی کە ئێمە لێی مەسئول نین، ، یاخود ئەو گۆڤارانەی لەبواری میدیای ئەهلیــدا دەردەچــن، ئەوانــە خۆیــان ســەربەخۆن، خۆیــان بەرپرســن لەبیروبۆچونەکانی خۆیان.

KNN: راتان لەسەر فراکسیۆنەکەی کوردستانتان چۆنە، لەکارەنیان رازیین، یان سیاسەتی گۆڕانیان جێبەجێ کردوە؟

نەوشیروان مستەفا: ئەوانە خۆیان جۆرێك لە ئازادییان هەیە لەئیشوکارەکانی خۆیاندا، بڵێم سەد لەسەد لێیان رازیم، یان لێیان ناڕازیم، ناتوانم وا بڵێم، چونکە هێشتا ساڵی یەکەمی تەمەنیان تەواو نەبوە، هێشتا (٣)ساڵی دیکەیان لەبەردەمدا ماوە بۆ کارکردن، بەلاّم لەڕاستیدا دەتوانم بڵێم، نیوە رازیمو نیوە ناڕازیم.

KNN: دەوترێـت، ئێـوە وەکـو بزوتنـەوەی گـۆڕان، یـان لـەڕێی کـارکردنی فراکسیۆنەکەتانەوە، هەڵبەتە فراکسیۆنەکەی بەغداتان تائێستا ئیشی نەکردوە، لەبەرئـەوەی کـە ماوەیـەکی زۆر نییـە، بـەلاّم دەوترێـت، کـە ئێـوە ئـەزمونی ئۆپۆزسیـۆنێکی سلبیتان تەقدیم کردوە، یاخود رۆڵێکی ئیجابیتـان نییـە لـە بنیاتنانی کاری دامەزراوەییو لە باشکردنی دامەزراوەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا؟

نەوشـیروان مـستەفا: کێن ئەوانەی وامـان پێـدەڵێن، ئـەوە ئەوانـەن کـە سـەر بـە دەسەلاّتن، با بڕۆن تەگبیر بۆ خۆیان بکەن، زۆر جار باسی ئەوە دەکەن، وەڵلاّ ئەمە ئۆپۆزسیۆنێکی تەندروست نییەو ئەمە ئۆپۆزسیۆنێکی پۆزەتیڤ نییەو ئەمـە ئۆپۆزسـیۆنێکی سـەلبیە، بـا بـڕۆن خۆیـان بـە دەسـەلاّتێکی پـۆزەتیڤو دەسەلاّتێکی وەکو خۆیان باسی دەکەن، هەقی وایە ئەوانەی کە ئیش بۆ ئەوان

دەکەن، تەگبیر بۆ مەسئولەکانی خۆیان بکەن، تەگبیر بۆ ئێمە نەکەن، ئێمە موعارەزەین‌و خۆمان دەزانین چی دەکەین.

KNN: بۆچونتان، یاخود چاوەڕوانیتان لە فراکسیۆنەکەی بەغداتان چۆنە؟

نەوشیروان مستەفا: ئومێدم وایە کە کاری زۆر باش بکەن.

KNN: لەوێ، لە بەغدا دەتوانن چی بکەن؟

نەوشیروان مستەفا: دەتوانن زۆر شت بکەن، دەتوانن دیفاع لەمافەکانی نەتەوەیی کورد بکەن، ئەوانەی لەدەستوری عێراقدا سەلمێنراون، دەتوانن ئەگەر لەکوردستان، هەندێك کێشە هەیە چارەسەریان نەکرێت، بیبەنە بەغدا، دەتوانن زۆر شت بکەن.

KNN: تا چەند بەجدیی بەشداریتان کردوە لە ئیئتیلافی لیستە کوردستانییەکان؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، ئێمە بەشدارییەکی جدیمان کردوە، ئەوە دو لایەنی هەیە، لایەنێکی پابەندییە بە پرسە نەتەوەییەکانی گەلەکەمانەوە، کە بێگومان ئەگەر ئێمە زیاترو زۆرتر سور نەبین لەهەمو لایەنەکانی تر بەتایبەت کە ئێمە بەتەمای هیچ پۆستێکی گەورەنین، لەوان کەمتر پابەندی ئەو پرسە نەتەوەییانە نابین، بێگومان ئێمە پابەند دەبین بە پرسە نەتەوایەتییەکانەوەو لەوەدا هاوبەشین لەگەڵیاندا، لەمەسەلەکانی دیکەدا سەربەخۆیی سیاسیی فراکسیۆنەکەی خۆمان دەپارێزین بۆ دەربڕینی بیروبۆچونە تایبەتییەکانی خۆمان.

KNN: بۆچونتان سەبارەت بە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکان، بەڕای ئێوە، لەوادەی خۆیدا ئەنجامدەدرێت؟

نەوشیروان مستەفا: دەبێت ئەو پرسیارە لە ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستان بکەین.

KNN: خیتابی سیاسیتان بەرامبەری چۆنە، داوا دەکەن لەوادەی خۆیدا بکرێت، یاخود دواخستنی بەلاتانەوە ئاساییە؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە پێمانوایە، هەرچی زوتر بکرێت، باشترە.

KNN: دەوترێت، لەئێستاوە لە خۆئامادەکردندان؟

نەوشیروان مستەفا: ئەگەر ئەمڕۆ هەڵبژاردن ببێت، خۆمان بۆ ئامادە کردوە، سبەینێش بێت هەر ئامادەین، دو سبەیش بێت هەر ئامادەین.

KNN: شتێکی دیکەش دەوترێت، دەوترێت بۆ پۆستی پارێزگاری سلێمانی، نەوشیروان مستەفا خۆی کاندید دەکات؟

نەوشیروان مستەفا: هەندێك رۆژنامە هەیە، بە هەڵبەستی هەواڵی درۆ دەژی، ئەوە یەکێکە لەو هەوالأنە.

KNN: لەکۆتاییدا، دو پرسیاری تایبەت لە ژیانی شەخسیی خۆت لێبکەم. لەماوەی رابردوداو پێش دروستکردنی بزوتنەوەی گۆڕان، یەکێك بوی لەوانەی لەبواری نوسیندا، بەتایبەتی لە بواری رۆژنامەوانییەوە، لە بواری ئەو مێژوەی کە خۆت تیایدا ژیاویت، دۆکیۆمێنتت کردوەو نوسیوتە، ئێستا بەتەواوەتی لێی دور کەوتویتەتەوە؟

نەوشیروان مستەفا: ئێستا زۆری وەختەکەم تەرخانکردوە بۆ ئەو کارە سیاسییەی کە پەیوەندیی بە بزوتنەوەی گۆڕانەوە هەیە، بەلأم هێشتا دانەبڕاوم لەو بوارە رۆشنبیرییەی کە کاتی خۆی کارم تیا کردوە.

KNN: واتـه لەئایندەدا ئەزموونـەکانی شـێوەی قەڵەمـەکان، پەنجـەکان یـەکتر دەشکێنن، هەمو ئـەو کتێبانـەی تـری کـه بڵاوتکردونەتـەوه سـەبارەت بـه مێـژوی سیاسیی ناوخۆی هەرێمی کوردستان، بەرهەمی دیکه دەبینین؟

نەوشیروان مستەفا: ئەگەر پێویستی کرد.

KNN: دوا پرسـیارم ئەوەیـه کـه ئێـستا کـاتی مۆندیالـه، نەوشـیروان مـستەفا هاندەری چ وڵاتێکه؟

نەوشیروان مستەفا: بـۆ مـن، هـەمو ئـەو تیپانـه وەکـو یـەك وان، بـەڵام تەمـەننای ئـەوە دەکـەم، رۆژێـك لـه رۆژان، تیپـی کوردسـتان بـه ئاڵای کوردسـتانەوە لـەناو مۆندیالدا بەشداری بکات.

# سەر بۆ هیچ فشارێکی سیاسی دانانەوێنین

سازدانی: وشیار عەبدولا

بەرنامەی روبەڕوی کەناڵی ئاسمانی KNN ئەم دیمانەیەی لەگەڵ نەوشیروان مستەفا ئەنجامداوە، تیایدا نەوشیروان مستەفا باس لە کاری داهاتوی بزوتنەوەی گۆڕان بە گشتی و لە بەغدا بەتایبەتی دەکات، لەبەر گرنگی دیمانەکە سبەی دەقی دیمانەکە بڵاودەکاتەوە:

KNN: یەکەم پرسیار بەوە دەست پێدەکەم کە لە نێوان ٧/٢٥ و ٣/٧دا بزوتنەوەی گۆڕان چۆن دەخوێنیتەوە، بەتایبەت لە ئاستی بەراوردکاری دەنگەکاندا؟.

نەوشیروان مستەفا: ئەوە دو هەڵبژاردنە، هەڵبژاردنێکیان هی ٢٥/٧ە بۆ پەرلەمانی کوردستان و هەڵبژاردنێکی دیکە ٣/٧ بۆ پەرلەمانی عێراق، کە بە دو سیستمی هەڵبژاردنی جیاواز بەڕێوەچوە، هەڵبژاردنی یەکەم بە سیستمی یەك بازینەیی داخراو لە هەمو هەرێمی کوردستاندا بەڕێوەچو، هەڵبژاردنی دوەم بە چەند بازنەیی، واتە هەر پارێزگایەك بە بازنەیەك و بە سیستمی کراوە بوە، کە ئەم سیستمەیان سیستمێکی نوێ بو لە هەمو عێراقدا، لەبەرئەوە بە نسبەت ئێمەشەوە نوێبو، رەنگە هەندێك کەموکوڕیشی تێدابوبێت، بەڵام گرنگترین شت ئەوەیە کە ئێمە لە هەڵبژاردنی یەکەمدا توانیمان پێگەیەکی بەهێز لەناو پەرلەمانی کوردستاندا دابمەزرێنین، لە هەڵبژاردنی دوەمیشدا توانیومانە پێگەیەکی بەهێز لەناو پەرلەمانی عێراقدا دابمەزرێنین.

رەنگە هەندێك کەس پێی وابێت کە لە هەڵبژاردنی دوەمدا کەممان هێنابێت و لە هەڵبژاردنی یەکەمدا زۆرمان هێناوە، بەڵام لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستاندا نرخی کورسیەك ١٨ هەزار دەنگ بوە، لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی

نوێنەرانی عێراقدا نرخی کورسیەك نزیکەی ٥٠ هەزار دەنگە، ئێمە ٨ کەسمان چوەتە پەرلەمانی عێراقەوە، بەلاّم بە هەشت (پەنجا هەزار) دەنگی چونەتە ئەو ئەنجومەنەوە، ئەگەر بەگشتی کۆی بکەیتەوە، هەر کورسیەکی ئێمە ٦١ هەزار کەس دەنگی پێداوە بەپێی ژماردنی کۆی دەنگەکان، لەکاتێکدا لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستاندا نرخی یەك کورسی بۆ پەرلەمانی کوردستان ١٨ هەزار بوە، لەبەرئەوە پێم وایە لەم هەڵبژاردنەشدا پێشکەوتنێکی گەورەمان بەدەستهێناوە، پێمان وایە ئەمەش سەرکەوتنێکی دیکەی بزوتنەوەی گۆڕانە لە بواری کاری پەرلەمانیدا.

KNN: چاودێرانی سیاسی پێیان وایە لە دوای ٢٥/٧وە، ئەو سیاسەتانەی کە روبەڕوی ئێوە بونەوە لە توندویژی و سزای سیاسی، زۆر زۆر توندتر بوەتەوە، دەکرێت بزانین کە دیارترین سزای سیاسی چی بوە کە بەرامبەر بزوتنەوەکەی ئێوە ئەنجام دراوە؟

نەوشیروان مستەفا: لە هەڵبژاردنی ٢٥/٧ دا، ئەو هێزە سیاسیانەی مونافەسەی ئێمەیان دەکرد، پێیان وابو کە ئێمە هێزێکی بچوکین و ژمارەیەکی کەمی کورسیەکان بەدەست دەهێنین، لەبەرئەوە تا ئەندازەیەکی زۆر مەسەلەکەیان بە جدی وەرنەگرتبو، بەلاّم کە ئەنجامەکانی هەڵبژاردن دەرچو، ئەوکاتە بابەتەکەیان بەجدی وەرگرت، لەبەرئەوە بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراقی خۆیان چاکتر ئامادەکرد.

لەم هەڵبژاردنەدا دەتوانین لەسەر دو ئاست بڕوانین بۆئەوەی دیاری بکەین بەرامبەر بەئێمە چیانکردوە، یەکێکیان ئاستی ڕاگەیاندنە، کە جەنگێکی سایکۆلۆژی زۆر توندوتیژ و خەستیان بەرامبەر بە ئێمە لەدەزگاکانی ڕاگەیاندا بەکارهێنا، دەتوانین بڵێین کە جەنگێکی زۆر بە شدەت دژی ئێمە بەڕێکرا، من پێشم وایە کە پسپۆڕی بیانی و بێگانەیان هێنابو بۆ ئەوەی لەو جەنگە سایکۆلۆجیەدا هاوکارییان بکەن، لەسەر ئەرزی واقعیش، ئەوەی پێی دەوترێت "ئیرهابی حکومەتی"، ئەوەی لەدەستیان هات و پێیان کراوە بەهەمو شێوەکان

ئیرهابی حکومەتییان بەرامبەر بە دۆست و لایەنگرەکانی ئێمە بەکارهێناوە هەر لەوەی کە خەڵکیان دەرکردوە و لەشوێنێکەوە گواستویانەتەوە بۆ شوێنێکی دیکە بۆئەوەی دەست لەکارەکەی هەڵبگرێت یان هەڕەشەیان لێکردوە، هەر لەوەی کە هەڕەشەیان لەکەسوکاری کردوە، هەر لەوەی کە هەندێك جار ئیغرائاتیان کردوە، ئەوەی کە کوردی کۆن پێیان وتوە "گفت و گەف"، واتە لەلایەکەوە هەڕەشە و لەلایەکەوە بەڵێن. . . هەمو ئەوانەیان بەکارهێناوە.

KNN: لە دەستپێکی کردنەوەی کەمپینی بانگەشەی هەڵبژاردن بۆ ٣/٧، یەکێك لە وتە دیارەکانی تۆ لە ئاهەنگی کردنەوەکەدا بریتی بو لەوەی کە فراکسیۆنەکەی ئێوە دەبێتە پارێزەری داکۆکیکردن لە مافی خەڵکی کوردستان، دوای دەرکەوتنی ئەنجامەکانیش هەمان بۆچونتان هەیە؟

نەوشیروان مستەفا: ئێستەش هەر وا ئەبین، ئێمە پێمان وانیە کە ژمارەی کورسی لە پەرلەمانی عێراقیدا کاریگەرییەکی ئەوتۆی هەبێت لەسەر دیفاعکردن و داکۆکیکردن لە مافەکانی گەلی کورد، ئێمە پێمانوایە کە چۆنایەتی ئەو نوێنەرانەی لە پەرلەماندا کاردەکەن و ئەو سیاسەتەکەی فراکسیۆنەکە کاری پێدەکات، تەنانەت لەوانەیە نوێنەرەکان ئەوەندە رۆڵیان نەبێت، واتە لەکاتێکدا کە سیاسەتی حیزبێت یان لایەنێکی سیاسی، سیاسەتێکی دیاریکراو بەرامبەر بە مەسەلەیەك لەلایەن فراکسیۆنەکەوە جێبەجێ دەکرێت، ئەوە رۆڵی کاریگەری هەیە.

بەبێگومان لەم خولەی پەرلەمانی عێراقیدا نوێنەرەکانمان و فراکسیۆنەکەمان، دەبێت بە داکۆکیکارێکی سەرسەختی مافە نەتەوەییەکانی کورد.

KNN: لەو چوارچێوەیەدا دانوستانتان لەگەڵ هێزە کوردیەکان لەسەر چ بنەمایەکە؟ دەتانەوێت هاوبەشبن یان بەشداربن لە گەڵیاندا؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە لەگەڵ لایەنەکانی دیکەدا هەمومان لەیەك شوێندا دەژین کە ناوی هەرێمی کوردستانە، پێمان خۆشبێت و پێمان ناخۆشبێت چارەنوسمان بەیەکەوە بەستراوە، واتە ئەوان پێیان ناخۆشبێت و پێیان

خۆشبێت، چارەنوسیان بەچارەنوسی ئێمەوە بەستراوە، ئێمەش بەهەمان شێوە.

مامەڵەکردنی ئێمە لەگەڵ ئەواندا لەسەر چەند بنەمایەکە، یەکێك لەو بنەمایانە ئەوەیە کە چەند مافێکی دەستوری کورد لە دەستوری دائیمی عێراقدا هاتوە و لەخولی رابردوی پەرلەمانی عێراقدا جێبەجێ نەکراوە، ئێمە کارنامەیەکمان بۆداناوە بۆ ئەو جێبەجێکردنی ئەو مافانەی لە کابینەی رابردودا جێبەجێ نەکراوە، لەهەمان کاتدا هەرێمی کوردستان هەندێك کێشەی هەڵواسراو و چارەسەر نەکراوی هەیە لەگەڵ حکومەتی ناوەندی، ئەویش دیسانەوە دەبێت ئێمە لەهەردو بوارەکەدا هاوکاری بکەین لەگەڵ فراکسیۆنە کوردیەکانی دیکەدا هاوکاری بکەین بۆئەوەی بتوانین کە کێشەکانی نێوان هەرێم و ناوەند و مافە دەستوریەکانیشمان جێبەجێ بکەین، لەهەمان کاتیشدا ئێمە هەوڵ دەدەین کە پەرلەمانی عێراقی و دامودەزگای عێراقی بۆ زیاتر دیموکراتیزەکردنی هەلومەرجی کوردستانی عێراق بەکاربهێنین.

KNN: مەبەستت لەمە چییە؟ بەشێك لە نەیارەکانتان پێیان وایە کاتێك ئێوە هەولێر یان هەرێم و بارودۆخی کوردستان دەبەستنەوە بە بەغداوە، ئەمە وەکو جۆرێك لە ئیبتیزازی سیاسی بەکاردەهێنن بۆ هاوپەیمانی کوردستانی یان بۆ هێزەکانی دیکە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، پێم وایە ئەو لکێدانەوەیە ناڕاستە، ئێمە بەشێکین لە عێراق، تائێستا هەرێمی کوردستان بۆ وەرگرتنی موچە ١٧٪ی بودجە لە بەغدا وەردەگرێت، واتە بۆ موچە پشت دەبەستێت بە بەغدا، خۆراك و سوتەمەنی و داو دەرمان، ئەوەی کە دێت بۆ کوردستان لەبەغداوە دێت.

ئێمە وەختێك کە دەڕوانینە بەغدا و دامەزراوەکانی دەوڵەتی عێراق، ئێمە زۆرمان پێخۆشە کە لە هەرێمی کوردستاندا سیستمێکی کارکردن و ئازادی رادەربڕین و پاراستنی ماف مرۆۋ بەشێوەیەك بێت کە هەمومان شانازی پێوە بکەین و لە هەمو جێگایەك بەرگری لێ بکەین، زۆریشمان پێ خۆشە کە ئەو

کێشانەی لە کوردستانی عێراقدا روده‌دات لەناو خۆماندا چارەسەری بکەین، لەناو پەرلەمانی کوردستان و ئەنجومەنی وەزیراندا چارەسەری بکەین، لە گفتوگۆی دو قۆڵی و سێ قۆڵی و چوار قۆڵی لایەنە سیاسیەکاندا چارەسەری بکەین، بەڵام کە ئەوە قابیلی چارەسەرکردن نەبێت، بێگومان دەیبەین بۆ بەغدا، ئەو قسەو باسانەش کاریگەری لەسەر ئێمە نابێت.

KNN: دەوترێت کە لەدانیشتنەکانی لیستە کوردستانیەکان لەگەڵ سەرۆکی هەرێمدا، ئێوە کێشەی سزای سیاسیتان کردوە بە ئەجێندایەکی سیاسی و کردوتانەتە پێشمەرج و کردوتانەتە خاڵێك لە خاڵەکان، رەخنەی ئەوە دەگیرێت کە دەبوایە ئەو بابەتە بە روکارە رەهەندێکی سیاسی پێ نەبەخشرایە، بەڵکو بکرێت بە ناڕەزایی تێکرای چین و توێژەکان، تەعلیقی ئێوە چییە لەسەر ئەو رەخنانە؟

نەوشیروان مستەفا: پێم وایە رەنگدانەوەی ئەوە لە راگەیاندنی کوردیدا تا ئەندازەیەك بەچاکی رەنگی نەداوەتەوە و پیشان نەدراوە، ئێمە هەرگیز لابردن یان نەهێشتنی سزای سیاسی ناکەین بە پێشمەرج بۆ قبوڵکردنی هەمو تەنازولە سیاسیەکانی تر.

ئێمە پێمان وایە سزای سیاسی چ بە نسبەت دۆستان و ئەندام و لایەنگرەکانی ئێمەوە، چ بە نسبەت لایەنەکانی دیکەوە نابێت بمێنێت ئەمە پێچەوانەی مافی مرۆڤە، لە وڵاتانی پێشکەوتوی دنیادا کە دەڕواننە خەڵك، ئەوانەی بێئیشن، موچەیەکیان پێ دەدەن تا ئەوکاتەی ئیشێکیان بۆ دەدۆزنەوە، زۆر شتێکی نا مەنتیقیە لە هەرێمی کوردستاندا حکومەت یاخود حیزبەکان پەنابیەن بۆئەوەی موچەی خەڵك ببڕن لەبری ئەوەی موچە ببڕینەوە بۆ ئەو خەڵك تا ئیشیان بۆ دەدۆزنەوە، لەبەرئەوە پێم وایە رەنگدانەوەی ئەو داواکارییە بەباشی رەنگی نەداوەتەوە، ئەگینا ئەوە پێشمەرجی ئێمە نییە، ئێمە چاککردنی هەلومەرجی کوردستان لە هەمو رویەکەوە، ئەوانە مەرجی ئێمەیە بۆ جۆری هاوکارییەکان

لەگەڵ لایەنەکانی دیکەدا، نەك بە تەنیا گێڕانەوە چەند سەد کەسێك کە نانیان بڕاوە.

KNN: لە کوردستاندا لەدوای ٧/٢٥ ئێوە ئۆپۆزسیۆنتان دروستکرد، بەمانا هەرە فیعلییەکەی و کۆمەڵێك چەمکتان خستوەتە وەسەتی سیاسی کە تا ئێستاش ئاڵوگۆڕێکی گرنگی پێ دەکرێت، لە ئاستی بەغداوە دەتانەوێت چی بگۆڕن؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، بەغدا هاوشێوەی کوردستان، لە کوردستانیش تا ساڵێك لەمەوپێش هەمو لایەنە سیاسیەکانیش پێیان وابو کە ئەوەی بەشدار نەبێت لە کێکی حکومەتدا، ماڵوێران دەبێت و ئەپوکێتەوە و ئەپلیشێتەوە و لەناودەچێت، ئێمە لەماوەی ساڵی رابردودا ئیسپاتمانکرد کە دەتوانیت ئۆپۆزسیۆن بیت و لەناویش نەچیت، بەداخەوە لە عێراقدا تائێستا زاڵە بەسەر هەمو لایەنە سیاسیەکاندا، پێیان وایە کە ئەگەر لە ئۆپۆزسیۆندا بن، مەحو دەبینەوە و هیچیان پێوە نامێنێت و ئەپوکێنەوە، لەبەرئەوە بە باوەڕی من لەم قۆناغەدا هیچ یەکێك لەو لیستانەی پێیان دەوترێت "لیستە براوەکان" ئامادەنین ببن بە موعارەزە، بەڵکو هەمویان چاویان لەوەیە کە بەشێك لە وەزارەتەکانیان بەربکەوێت و وەزارەتی چەوریشیان بەربکەوێت بۆئەوەی بتوانن خەڵکەکەی خۆیانی پێ رازی بکەن و خۆیانی پێ بەهێز بکەن.

لەبەغدا ئەگەر کورد هەموشی ببێت بە ئۆپۆزسیۆن، ئەوکاتە ئۆپۆزسیۆنێکی کاریگەر نابێت، لەناو ئەو هێزە کوردیەی لە پەرلەمانی عێراقدایە ئێمە بەتەنیا موعارەزە نین و هیچ شتێکی ئەوتۆی لێ سەوز نابێت، بەڵام ئێمە بەئسلوبی خۆمان هەمو ئەو بیرو بۆچونانەی کە هەمانە لەسەر دۆخی عێراق و کوردستان بێگومان لە چوار ساڵی ئایندەدا، فراکسیۆنەکەمان دەیخاتە بەردەمی پەرلەمان، جا ئەگەر لەناو حکومەتدا بین یان لە دەرەوەی حکومەتدا بێت.

KNN: باست لەوەکرد کە بەشێکی زۆر لە لیستە براوەکان بەشداری دەکەن لە کێکی حکومەتدا، باسیشت لەوەکرد کە ئەگەر کورد لە ئۆپۆزیسۆندا بێت رەنگە

دەنگێکی ئەوەندە کاریگەری نەبێت، کوردی بونی هەندێك پۆست (ئەگەر بەشداریکرا لە حکومەتدا) کاریگەری ناکاتە سەر بێدەنگ بونی ئێوە تەنها لەبەر ئەوەی کوردە، بۆ نمونە ئەگەر وەزیرێك کورد بو، بەڵام گەندەڵ بو، ئێوە لێی بێدەنگ دەبن تەنها لەبەرئەوەی کوردە؟

نەوشیروان مستەفا: بێگومان نەخێر، ئێمە لە زوەوە باسی ئەوەمان کردوە کە ئەو مەبدەئە جاهیلییەی عەرەبەکانیش پێشتر کاریان لەسەر کردوە "انصر اخاك چالما او مچلوما"، ئێمە هەرگیز پەیڕەوی ئەوە ناکەین، هەر وەزیرێك یان کاربەدەستێك لە کوردستان یان بەغدا کە لە رێگەی راست دەرچو، تۆمەتبارکرا بە کۆمەڵێك شت، لەوانە گەندەڵی و شتی تریش، ئێمە لێی بێدەنگ نابین لەبەرئەوەی کوردە یان ئەگەر سەربەخۆشمان بێت تەنانەت کار لەسەر ئەوە دەکەین کە رایکێشین بۆ بەردەمی دادگا.

KNN: هەر لەسەر مەسەلەکانی پۆستەکانی بەغدا، بەڕێزت ئەزمونێکیشت هەیە لەساڵی ١٩٩٢ دا چەند بۆچونێکت هەبو بۆ ئەوەی سود لە خەڵکی بێلایەن بکرێت، رەنگە لە ئەزمونی دو هەڵبژاردنەکەش دو فراکسیۆنەکەش هەوڵی ئەوەیان دابێت کە بەدوای خەڵکی بێلایەندا بگەڕێن، ئێستاش بۆچونتان وایە کە بۆ وەرگرتنی پۆستەکان لە بەغدا مەرج نییە خەڵکەکان لە چوارچێوەیەکی سیاسیدابن، یان سود وەربگیرێت لەخەڵکی بێلایەنیش ئەگەر بەتوانا بو؟ قسەکەی من لەوێوەیە کە پێشتر پۆستەکان لەلای پارتی و یەکێتی لەسەر بنەمای حیزبی دەدران بەخەڵك.

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، ئێمە یەکێك لەو هۆیانەی کە پاڵی پێوەناوین کە بزوتنەوەیەك بەناوی بزوتنەوەی گۆڕانەوە بهێنینە پێشەوە، پێمان وایە کە یەکێك لەو گۆڕانکارییانەی کە ئێمە ئەمانەوێت بیکەین لە سەرجەمی کۆمەڵگەی کوردی و سیاسەتی کوردی و لە پەیوەندی نێوان هەرێم و ناوەند ئەو بە حیزبیکردنی کۆمەڵگایە، ئێمە کاتێك باس لە گوتاری سیاسی خۆمان دەکەین کە جیاوازە لە گوتاری سیاسی حیزبەکانی دیکە، ئەوە کە ئێمە دەمانەوێت

گوتاری حیزبی بگۆڕین بە گوتاری نیشتمانی و نەتەوەیی و لە هەمان کاتدا هەوڵ بدەین کە بە حیزبیکردنی کۆمەڵگە و پۆستە گرنگەکانی کورد و بەحیزبی کردنی پەیوەندی نێوان هەرێمی کوردستان و بەغدا بگۆڕین بۆ پەیوەندی نێوان کورد و حکومەتی بەغدا، لەو چوارچێوەیەشدا پێمان وایە کە هەمو خەڵکی کوردستان و عێراق ماف خۆیانە پۆستی بەرز بەدەست بهێنن و جێگەی خۆیان بکەنەوە.

KNN: ئەگەر بە ژمارەی کورسی بێت، بزوتنەوەی گۆڕان بەتەمای چ پۆستێکی وەزارەتە لە بەغدا؟

نەوشیروان مستەفا: تا ئەو گفتوگۆیانە بەلایەکدا نەکەون، ئێمە هیچ بیروبۆچونێکی تایبەتیمان نییە لەسەری.

KNN: واتە خۆتان ئامادە نەکردوە بۆ ئەوەی چ حەقیبەیەکی وەزاری وەردەگرن لە حکومەتی نوێی عێراقدا؟

نەوشیروان مستەفا: چاوەڕێی ئەو گفتوگۆیانە دەکەین کە بە ڕێگاوەیە.

KNN: دەوترێت کە قسەیەك لەگەڵ نەوشیروان مستەفادا کراوە بۆئەوەی بێدەنگ بێت لەئاستی هەرێمی کوردستان، یاخود لانی کەم بەڕوی میدیاکانی دەرەوەدا بۆئەوەی تا ئەوکاتەی کێشەی سزادراوە سیاسیەکان یەکلایی دەکرێتەوە و لە کوردستاندا نامێنێت، بۆئەوەی گوتاری کوردی پەرت نەکرێت، ئایا ئەمە هیچ بنەمایەکی هەیە و ڕاستە؟

نەوشیروان مستەفا: ئەو قسەیە هیچ بنەمایەکی نییەو هیچ کەس و لایەنێك داوای لە من نەکردوە کە بێدەنگ بم، دڵنیابە ئێمە سەردەمێك قەسفی کیمیایی نەیتوانیوە بێدەنگمان بکات، لەبەرئەوە ئێمە سەر بۆ هیچ فشارێکی سیاسی دانانەوێنین کە بەرگری لە ماف هاوڕێ و دۆست و لایەنگرەکانی خۆمان بکەین، ئەو قسەیە بێ بنەمایە و پێموایە ڕۆژنامەیەکی ناوخۆیی لێرە بڵاوی کردبویەوە کە خۆی دروستی کردبو هەواڵەکە.

KNN: ئێوە لە رابردودا زۆر رەخنەتان لە نوێنەرایەتی کورد گرتوە لە بەغدا، دکرێت بزانین کە گرنگترین ئەو نەریتە تازانە چین کە ئێوە دەتانەوێت لە نوێنەرەکانتاندا هەبێت لە بەغدا، بەتایبەت لەسەر بنەمای خستنەڕوی هەمو راستیەکان و مەسەلەی شەفافیەت؟

نەوشیروان مستەفا: ئەوەی کە ئێمە بەلامانەوە گرنگە، فراکسیۆنی گۆڕان لە بەغدا پێشتر بەرنامەیەکیان هەبوە لە کاتی هەڵبژاردندا، ئەو بەرنامەیەی کە بۆ بەغدا خستومانەتەڕو درێژەکێشانی ئەو بەرنامەیەیە کە لە ٧/٢٥دا خرابوەڕو، واتە یەکتری تەواو دەکەن.

وەکو باسیشم کرد، گرنگترین شت ئەوەیە کە گوتاری فراسیۆنەکەی ئێمە جیاواز دەبێت، گواتاری ئێمە گوتارێکی نیشتمانی و نەتەوەیی دەبێت و حیزبی نابێت، نەك هەر بەرگریکردن لە کوردستان بە ئەرکێك دەزانن بەڵکو بەرگریکردن لە ماف هاولاتیانی عێراقیش، وەکو بەرگریکرد لە ماف مرۆۋ و ئەو مەسەلە ئەساسییانەی کە پەیوەندی بە شەفافیەت و دادپەروەری کۆمەڵایەتی و پەیوەندی بە دانانی سنورێك بۆ دەستێوەردانی حیزبە سیاسیەکانەوە هەیە لە کاروبارەکانی حکومەت، هەمو شەو شتانە ئێمە لە پەرلەمانی عێراقیشدا بێگومان بەرگری لێدەکەین و لەسەری بەردەوام دەبین.

KNN: دەوترێت کە لەسەر ئاستی عێراق و لەسەر ئاستی کوردستان کارەکانتان دژ یەك دەبنەوە، بۆ نمونە دەبێت لە بەغدا پێویستە شەڕێك بکەن بۆ ئەوەی بودجەیەکی باش بێتە کوردستانەوە، بەلام لەهەرێمی کوردستان بودجەکە بەو شێوە ناشەفافانە پەسەند دەکرێت کە خۆتان لێی نارازی بون و هۆڵی پەرلەمانتان بۆ بەجێ هێشت، ئەو دژاو دژی و حاڵەتە لای ئێوە چۆن کەوتوەتەوە؟

نەوشیروان مستەفا: پێم وایە هیچ دژی یەکتری نین، بەپێچەوانەوە ئێمە دەتوانین کە ئێمە دەتوانین پەرلەمانی کوردستان وەکو هێزێکی پشتگیری بەهێز بۆ پرۆسەی دیموکراتیزەکردنی کوردستان بەکاربهێنین، بۆ نمونە با بەراوردێك

بکەین لەنێوان هەلومەرجی کوردستان و هەلومەرجی عێراقدا، عێراق لەدوای روخانی سەدام حسێنەوە، مەسەلەی ئارام و ئاسایشی لێ دەربهێنە، کە بۆ خۆشبەختی کە لە هەرێمی کوردستاندا ئاسایش و ئارامی هەبوە، بەڵام لە بەغدا بۆ ناخۆشبەختی ئیرهاب هەبوە و ئاسایش و ئارامی تێدا نەبوە و تەقینەوە هەبوە، با بەراوردێك بكەین لەنێوان دەسەلاّتەكاندا ئەوەی کە پێی دەوترێت سێ دەسەلاّتەکە- (جێبەجێکرد و یاسادانان و دادوەریی).

ئەگەر بڕوانیتە پەرلەمانی عێراق و بەراوردی بکەین بە پەرلەمانەکەی ئێمە لەچوار ساڵی رابردودا، کەس ناتوانێت ئینکاری ئەوە بکات کە پەرلەمانی بەغدا زۆر ئەکتیڤتر و فرەبیتر بوە لەبیر و بۆچونەکانیدا لەچاو پەرلەمانەکەی هەرێمی کوردستاندا.

دەسەلاّتی دادوەری لە بەغدا تا رادەیەکی زۆر سەربەخۆیی هەیە لەچاو ئەو دەسەلاّتی دادوەرییەی کە لە کوردستاندا هەبوە، ئەوان کەمتر دەستێوەردانی حیزبی لە کاروبارەکانیاندا هەبوە و کەمتر کارگەربون بە دەسەلاّتی بەرپرسە بالاّکان و کاربەدەستە گەورەکان.

واتە دەسەلاّتی دادوەری لە بەغدا دەتوانین بڵێین سەربەخۆترە لەچاو کوردستان، دەسەلاّتی یاسادانان چالاکتر، دەسەلاّتی جێبەجێکردن کە ئەگەر خۆی بنوێنێت لە کۆمەڵێك لە دامو دەزگاکانی وەکو سوپا و پۆلیس و ئەم جۆرە شتانە، دەڕوانیت لەچوار ساڵی رابروردا سوپای عێراقی دروستکراوەتەوە لەسەر بنەمانی ئینتیما بۆ عێراق، سبەینێ سەرکردەی سوپای عێراق و وەزیری بەرگری بگۆڕدرێت و هەرکەسێکی دیکە بکرێتە سەرۆکی گشتی سوپای عێراق، ئەوان گوێڕایەڵی دەبن، بە بەراوردکردن لەگەڵ هێزە چەکدارەکانی کوردستانی عێراق کە ئەوان کۆمەڵێك دامەزراوەی عەسکەری و ئەمنییان دروستکردوە کە بۆ دەوڵەتی عێراقیان دروستکردوە، تائێستا ئێمە لەکوردستاندا ئەوەمان نییە، وەرە بۆ بواری ئازادی رۆژنامەگەری، بزانە لە بەغدا چەند ئازادی رۆژنامەگەری هەیە و لە کوردسانیش تا چ ئەندازەیەکە!

بۆیە ئێمە بەغدا بەپشتیوانێك دەزانین بۆ پرۆسەی دیموکراتیزەکردن، بۆ نمونە تۆ میزانیەت بە نمونە هێنایەوە، کاتێك لە هەولێر ئێمە توشی کێشە ببین لەسەرئەوەی کە میزانیە شەفاف نیە، دەتوانیت لە بەغداش هەمان بابەت بوروژێنیت، وەزیری دارایی بانگ بکەیت بۆ پەرلەمانی بەغدا ئادەی جەنابی وەزیر ١٧٪ی میزانیەی عێراق تەرخانکراوە بۆ هەرێمی کوردستان، ئێمە هاوکارەکانمان لە فراکسیۆنی گۆڕان لە پەرلەمانی کوردستاندا ئەو مەسەلەیەیان وروژاندوە، بەڵام ئەوان ئامادە نین ئاشکرای بکەن.

لە بەغدا وەزارەتی دارایی هەیە، لە هەمو وەزارەتەکانی بەغدا موفەتیشیەت (چاودێریکردن) هەیە، لەسەر ئاستی عێراق دیوانی چاودێری دارایی هەیە و لەسەر ئاستی عێراق دەستەی نەزاهە هەیە، لە پەرلەمانی عێراقیدا لیژنەیەك هەیە بەناوی نەزاهەوە، ئێمە ئەتوانین ئەوانەیان لێ بوروژێنین، ناتوانێت وا بەئاسانی شتەکان بکات بە ژێر لێوەوە، وەکو چەند ساڵی رابردو، بۆیە ئێمە پێمان وایە ئەوان پشتیوانییەکی گەورەن بۆ ئێمە.

KNN: ئەگەرچی لەماوەی رابردودا دوچاری دو هەڵبژاردنی قورس بونەتەوە، کە بەشێك لە چاودێران پێیان وایە کە چەسپاندنی دوکۆڵەکەیە بۆ گۆڕان، بەڵام سەبارەت بە پرسی رێکخستنەوەی بزوتنەوەی گۆڕان، رات چییە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، ئێمە ئێستا لەبەردەمی ئەوەداین کە بەشێوەی ساڵی رابردو، چەند مانگی رابردو ناتوانین ئیدارەی بزوتنەوەی گۆڕان بکەین، بزوتنەوەی گۆڕان دەبێت لە چوارچێوەیەکدا رێکبخرێت، بەڵام حەز دەکەم هەمو ئەو کەسانەی کە لێدوانەکانی من دەخوێنێتەوە، ئێمە هەوڵ دەدەین مۆدێلێکی سیاسی تازە لە کوردستاندا دابهێنین، کە جیاوازبێت لەو مۆدێلە سیاسیانەی کە حیزبەکانی کوردستانی عێراق تا ئێستا پەیرەویان کردوە.

KNN: تەنها لەڕوی شکڵەوە یان ناوەڕۆکیش؟

نەوشیروان مستەفا: لە هەمو روێەکەوە.

KNN: قسەیەك هەیە لەسەر ئەوەی کە باڵباڵێن لەناو بزوتنەوەی گۆڕاندا دروست بوە، ئەوە تا چەند راستە؟.

نەوشیروان مستەفا: ئێمە حیزبێکی عەقائیدی و ئایدیۆلۆجی نین، بێجگە لەوەی ئێمە حیزبێکی ستالینی نین، لەناو ئێمەدا گروپیش و باڵیش و فلآنە و فیسارە هەیە و جائیزیشە هەبێت، بەڵام لە کۆتاییدا ئێمە یەك ستراتیژمان هەیە، یەك سیاسەتمان هەیە، یەك بەرنامەمان هەیە کە کاری بۆ دەکەین، لەبەرئەوە بەلامەوە شتێکی ئاساییە ئەوەی کە ئەڵێن باڵباڵێن و. . . با هەبێت چییە؟!.

KNN: ئەو داواکاری مۆڵەتی کارکردنەی پێشکەشی وەزارەتی ناوخۆتان کردوە، گەیشتوەتە کوێ؟

نەوشیروان مستەفا: مۆڵەتەکەمان پێشکەش کردوە، هەمو ئەو مەرجە یاساییانەی کە بەگوێرەی قانونی حیزب و رێکخراوە سیاسیەکانی کوردستانی عێراقدا ویستویانە هەمویمان جێبەجێ کردوە و ئێستاش لە چاوەڕوانی ئەوەداین و ئومێدمان وایە کە بەزوترین کات مۆڵەتی یاساییمان پێ بدەن.

KNN: دوا پرسیارم لەسەر ئەوەیە کە بەرێزت بەشێکی زۆری تەمەنی خۆت لە بزوتنەوەی سیاسی کورددا بەسەر بردوە، دەستیشت هەبوە لە دروستکردنی کۆمەڵێك بزوتنەوەی سیاسیدا، بەشێکی لەکاتی خەباتی شاخدا بوە و ئێستاش لەسەردەمی خەباتی شار و مەدەنیدا، ئایندەی بزوتنەوەی گۆڕان چۆن دەبینیت لە هەرێمی کوردستان؟

نەوشیروان مستەفا: من ئایندەی گەنجەکانی وڵاتەکەم زۆر گەش دەبینم، لەبەرئەوە ئایندەی بزوتنەوەی گۆڕانیش زۆر گەش دەبینم.

# بەبێ چارەسەرکردنی کێشەی دەرکراوە سیاسییەکان، هاوکاریی هاوپەیمانی کوردستانی ناکەین

دیمانەی: الشرق الاوسط

سلێمانی: شێرزاد شێخانی

لەگەڵ تەواوبونی ماوەی چاودێریکردنی ئەنجامی هەڵبژاردنەکان بە راگەیاندنی ئەنجامی بەرایی رەسمی بەر لەچەند رۆژێك، گۆڕەپانی سیاسی عێراق ئێستا جموجوڵی فراوانی هێزە سەرکەوتوەکانی هەڵبژاردنە، بەمەبەستی پێکهێنانی هاوپەیمانێتی لە ئایندەدا، بەجۆرێك گرەنتی پێکهێنانی حکومەتی عێراقی داهاتو بکات، لەبەرئەوەی هیچکام لە فراکسیۆن و قەوارە سیاسییەکان زۆرینەیان بەدەستنەهێناوە کە بتوانن حکومەت پێکبهێنن، بۆیە بەئامانجی پێکهێنانی حکومەتی داهاتو فراکسیۆنە گەورەکان زۆر پێویستیان بەو حیزبانە هەیە، کە رێژەیەك لە کورسییەکانی پەرلەمانیان بەدەستەێناوە.

فراکسیۆنی ئۆپۆزسیۆنی گۆڕان لە کوردستان کە بۆ یەکەمجار بەشداریی لە کێبڕکێی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق کرد، ئێستا بوەتە ژمارەیەك لە هاوکێشەی سیاسیی عێراق، دەتوانێت کاریگەریی هەبێت لەسەر هاوسەنگی سیاسیی لە دیمەنی عێراق. لەچوارچێوەی دیاریکردنی ئەو رۆڵە (الشرق الاوسگ) چاوی بە نەوشیروان مستەفا سەرۆکی لیستی گۆڕان کەوت و لەسەرەتاوە پرسیاری لەبارەی هەڵوێستی فراکسیۆنەکەی و مەرجەکانی بۆ بەستنی هاوپەیمانێتییە سیاسییەکانی داهاتون لێکرد و وتی: "هەڵوێستی پێشوەختمان بەرامبەر هیچ لایەنێکی بەشداری پرۆسەی سیاسی و براوە لە

هەڵبژاردنی گشتیدا نییە، ئەگەر ژمارەی کورسییەکانی زۆربن یان کەم، سەبارەت بەمەرجەکانیش مەرجی پێشوەختمان نییە بۆ گفتوگۆکردن، تەنانەت بۆ کاری هاوبەشیش لەگەڵ هەرلایەنێك کە لەناو پەرلەماندا بێت، جگە لە زاڵکردنی بەرژەوەندی باڵای نیشتمانی گەلی عێراق بەسەر بەرژەوەندییەکانی گروپێك یان تایەفەیەك یاخود حیزبێکی سیاسی، پاراستنی سیستمی دیموکراتی پەرلەمانی فرەیی ئیتیحادی".

لەبارەی ئەو هێزانەی کە بزوتنەوەکە بەنزیکتر لەخۆی لەڕوی دیدو هەڵوێستە سیاسیەکانەوە دەیانبینێت و دەکرێت پشتیان پێببەسترێت و هاوپەیمانێتییان لەگەڵ بکرێت، وتی: "ئێمە هەڵوێستەکانمان لەسەر بنەمای بەرنامە و ئەو دروشمە سیاسییانەی لەکاتی پروپاگەندەی هەڵبژاردن بانگەشەی بۆ کراوە بنیات نانێین، بەڵکو لەسەر بنەمای ئەو خاڵە سەرەکییانەی حکومەتی ئیئتلاف داهاتوە لەبەرنامەی وەزاریی خۆی و رەچاوکردنی بەرژەوەندی گشتی و خزمەتکردنی گەلی عێراق لەو بەرنامەیەدا".

لەبارەی ئەو مەترسییانەی فراکسیۆنی هاوپەیمانی کوردستانی دەیخاتەڕو سەبارەت بەهەوڵی هەندێك هێزی سیاسیی عێراقی بۆ لاوازکردنی رۆڵی کورد لە بەغدا، جەختکردنەوەی سەرکردەکانی هاوپەیمانی لەسەر سەوابتە نەتەوەییەکان، شەرق ئەوسەت پرسیاری لێکرد ئایا هاوکاری هاوپەیمانی کوردستان دەکەن لەو مەسەلانەی لە داهاتودا دەخرێنەڕو و مەرجەکانیان بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ ئەو هاوپەیمانیەدا، نەوشیروان مستەفا وەڵامی دایەوە: "چەندین کێشەی هەڵپەسێردراو لەنێوان حکومەتی هەرێمی کوردستان و حکومەتی ناوەندیدا هەیە و هەندێکیمان لە حکومەتەکانی پێشو بەمیرات بۆ ماتەوە، کێشەی کۆنن و دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی پێش روخانی رژێمی پێشو، هەندێکیشیان تازەن و لە ماوەی دوای روخانی رژێم دروستبون، ئەم کێشانە چاوەڕێی چارەسەرکردنن بۆئەوەی حکومەتی ناوەندی بیپەرژێتە سەر مەسەلە زۆر گرنگەکانی پەیوەست بەبنیاتنانەوەی دامەزراوەکانی دەوڵەتی نوێی

عێـراق، بۆئـەوەی عێـراق بـەهێزبێت لـە نـاوخۆ و بـەهێز بێـت لەچوارچێوەی ئیقلیمـی. بـەڵام دیـدمان بـۆ چارەسـەرکردنی ئـەم کێشانە جیـاوازە لەهەنـدێك روەوە لەدیدی هاوپەیمانی کوردستانی، لەبەر ئەم هۆیە بەلیستێکی سەربەخۆ بەشـداریمان لـە هەڵبژاردنـدا کـرد. . . خـاڵێکی تـر پەیوەنـدی بـەم مەسـەلەیەوە هەیە، دەسەڵات لـە هـەرێمی کوردسـتان بەدەست هاوپـەیمانی کوردسـتانەوەیە، ئەم دەسەڵاتە لەماوەی دو هەڵبژاردنەکەی ئەم دواییانە، هەڵبـژاردنی پەرلـەمانی هـەرێمی کوردسـتان لـە یولیـۆ (تـەموز)ی سـاڵی رابـردو و هەڵبـژاردنی مـارس (ئازار)ی پەرلەمانی عێراق، دەنگدەرانی لیستی گۆڕانی ئازارداوە، سەدان کەس لــە کارمەنــدانی وەزارەتــەکانی نــاوخۆ و پێــشمەرگە و پاســەوانی ســنور لـەکارەکانیان دەرکـراون، وەزارەتـی پـەروەردە لەبـەر هۆکـاری سیاسـی سـەدان مامۆسـتای گواسـتۆتەوە، بـە راشـکاوی پێمـانوتون ئێمـە نـاتوانین لـە بەغـدا هاوکارییـان بکـەین، لەکاتێکـدا ئـەوان دژایـەتی هـەوادارانی ئێمـە دەکـەن لـە کوردسـتان. سـەبارەت بـەو مەترسییانەی خراونەتـەڕو، من پێموایـە دابەشبون نییە لە ریزی کوردیدا، بەڵکو جیاوازیی هەیە لەبۆچونی سیاسیی بۆ کێشەکان و چارەسەرەکان. کورد لەعێراق هێزیان لەژمارەی کورسییەکانیان لە پەرلـەمانی عێراق سەرچاوە ناگرێت، بەڵکو لەوەوەیە کە پێکهاتەیەکی سەرەکی دەوڵـەتی عێـراقن. ئیـستحقاقی نەتـەوەیی و ئیـستحقاقی هەڵبـژاردن هەیـە، رەنگـە ئیستحقاقی هەڵبژاردن کاربکاتە سەر بچوککردنەوە یان پەراوێزخستنی رۆڵـی کـورد لـە بەدەسـتهێنانی پۆسـتە وەزارییـەکان، بـەڵام ئـەوە کارناکاتـە سـەر ئیـستحقاقی نەتـەوەییان لـە پرۆسـەی بنیاتنانـەوەی دەوڵـەتی عێـراق و دامەزراوەکانی".

لـەبارەی رادەی ئامـادەیی فراکسیۆنی گـۆڕان بـۆ بەشـداریکردن لـە حکومـەتی داهـاتوی عێـراق و ئـەو مەرجانـەی لەبەرامبـەردا دەیانخاتـەڕو، سـەرۆکی فراکسیۆنی گۆڕان وتی: "ئەگەر بەرنامەی وەزاری حکومەتی داهاتو نزیك بێت لەبەرنامەی سیاسیمان بەشداریی تێدا دەکەین، بەشداریی ئێمە و بەشداریی

کورد له حکومەتی داهاتو بۆ ئێمه گرنگه و هەروەها بۆ حکومەتی عێراقیش، مەرجمان گونجاوی بەرنامەی حکومەتی داهاتوه لەگەڵ بەرنامەی سیاسیمان وەکو بزوتنەوەی گۆڕان".

نەوشیروان مستەفا قسەکانی بەوەسفکردنی هەڵبژاردنەکەی ئەم دواییە کۆتاییهێنا بەوەی "هەنگاوێکی گرنگ بوە له چەسپاندنی پرۆسەی دیموکراتی له عێراق، ئێمه لەو بڕوایەداین که سازدانی هەڵبژاردن ئەگەر ساختەکاریشی تێدا بکرێت لەنەکردنی باشتره

نەوشیروان مستەفا: رازی نابین به بەڕێوەبردنی وڵات له رێگەی زۆرینه و کەمینەوە

سازدانی: کەناڵی ئاسمانی ئەلجەزیره

ئەمڕۆ بەڕێز نەوشیروان مستەفا ئەمین سەرۆکی بەرەی ئۆپۆزیسیۆن له کوردستانی عێراق میوانمانه

ئەلجەزیره: ئەم کاتەت باش بەڕێز نەوشیروان

نەوشیروان مستەفا: ئەم کاتەی ئێوەش باش.

ئەلجەزیره: دوای ئەوەی لیستەکەتان توانی به دەنگی جەماوەر رچەی دەسەڵاتی رەهای هەردو حیزبی دێرین و ناسراوی کوردی"یەکێتی نیشتمانی کوردستان به سەرۆکایەتی تاڵەبانی و پارتی دیموکراتی کوردستان به سەرۆکایەتی بارزانی" بشکێنێ له هەڵبژاردنەکان، ئێستا راو بۆچونتان چیەو چۆن له هەڵبژاردنەکانی مانگی داهاتوی عێراق دەڕوانن؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان بەشێکه له هەڵبژاردنه گشتیەکان له سەرانسەری عێراقداو بۆچونمان وایه پرۆسەی

کارکردنی سیاسی بەردەوامە و ئێمەش هاوبەشی ئەو پرۆسەیەین، بۆیە هیوادارین بە سەرکەوتویی کۆتایی پێ بێت.

ئەلجەزیرە: کەواتە ئێوە گەشبینن؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ گەشبینین.

ئەلجەزیرە: هەندێ کەس پێیان وایە نەخشەی نوێی لیستی گۆڕان بە پەیوەندیکردنی "جەوهەر نامیق" سەرکردەی پێشوی پارتی دیموکراتی کوردستان و هەندێ کەسایەتی تر بە لیستی گۆڕانەوە، فراوان بوە، هەندێکی تر بە پێچەوانەوە پێیان وایە دەنگەکانتان کەم دەکات، خۆتان ئەم بابەتە چۆن دەبینن؟

نەوشیروان مستەفا: دوای سەرکەوتنمان لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان پێمان وایە بزوتنەوەکان فراوان بوە. ئێمە پێمان وانیە بزوتنەوەی گۆڕان تەنها تایبەت بێت بە توێژێکی تایبەتی کۆمەڵگا یاخود بە ئاڕاستەیەکی سیاسی دیاری کراو، بەڵکو دەکرێ لەژێر سێبەری کارکردنی بزوتنەوەکەدا چەندەها بۆچون و رەنگی جیاواز لە ناو توێژو چینەکانی کۆمەڵگاو ئاڕاستە سیاسیەکانی تر پێکەوە تەنها گوتارێکی سیاسی کۆمان بکاتەوە. بۆیە سنوری کارکردنی ئێمە بە شێوەیەکی باش فراوانی بە خۆیەوە بینیوەو پێمان وایە لە هەڵبژاردنەکانی داهاتو بە فراکسیۆنێکی بە هێزەوە دەڕۆینە پەرلەمانی عێراقەوە.

ئەلجەزیرە: زۆرباشە، ئەی سروشتی پەیوەندی ئێوە چۆنە لەگەڵ حیزبە کوردیەکانی تر هەر لە پارتی و یەکێتیەوە کە کوردستان بەڕێوە دەبەن تا ئەو حیزبانەی تر لەبەرەی ئۆپۆزیسیۆن دان؟

نەوشیروان مستەفا: پەیوەنی بزوتنەوەکەمان لەگەڵ هەمو حیزبەکانی سەر گۆڕەپانی سیاسی کوردستانی عێراق ئاساییە، ئێمە لە پەرلەمانێکدا بەشدارین هەردو حیزبی دەسەڵاتدار تێیدا زۆرینەن و بەشدارین لەو دەسەڵاتەی یاسادانان کە لە کوردستانی عێراقدا هەیە. بۆیە پەیوەندیەکانمان لەگەڵ هەردو

حیزبە دەسەلآتدارەکە و حیزبەکانی تریش زۆر ئاساییە. لە ئایندەشدا بە گوتارێکی هاوبەشی جیاواز لەم گوتارەی کە ئێستا بالآدەستە پێکەوە هاوبەش دەبین.

ئەلجەزیرە: ئەو جیاوازیە چیە لە گوتاری ئێوەدا هەیە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، گوتاری ئێمە جیاوازە بەو پێیەی کۆمەڵگای کوردیش وەك هەمو کۆمەڵگایەکی تر لە چەند توێژێکی کۆمەلآیەتی جۆراوجۆر و لە چەند ئاراستەیەکی سیاسی جیاواز پێکهاتوە، لێرەدا گوتاری ئێمە گوتارێکی عەقلآنی دادپەروەرانەی جیاوازە لەو گوتارە عەفەویە دڵگەرمانەیەی جەماوەر دەوروژێنێت بۆ مەبەستی بانگەشەی هەڵبژاردن. گوتاری ئێمە گوتاری بونیادنانی دەوڵەتی یاسا سەروەرە هەر بۆیە گوتاری ئێمە لە روانگەی هاوبەشی سیاسیشەوە لە گوتاری ئەوان جیاوازە، گوتاری ئێمە لە روی سروشتی پەیوەندیەکانی هەرێم بە مەرکەزەوە جیاوازە، چونکە ئەو پەیوەندیەی ئێستا هەیە پەیوەندی حیزبەکانە بە حکومەتی مەرکەزی بەغدادەوە ئێمەش دەمانەوێ پەیوەندیەکان لە پەیوەندی حیزبەوە بگوێزینەوە بۆ پەیوەندی گەل بە حکومەتی مەرکەزیەوە.

ئەلجەزیرە: ئایا لیستی گۆڕان دەڕواتە پاڵ لیستی هاوپەیمانی کوردستانی ئەگەر بانگهێشتی بکرێ بۆ بەدیهێنانی ئەم خواستە؟

نەوشیروان مستەفا: لە روی ئامانج و بنەمای کاردکردنەوە یەك ئامانج و بنەمامان هەیە، بەلآم لە روی شێوازی کارکردنەوە ئێمە لەوان جیاوازین و باوەڕناکەم لە ئێستادا لەگەڵ هەر لایەنێکدابێ هاوپەیمانی سیاسی دروست بکەین، لەبەرئەوە چاوەڕێ دەکەین تا دوای هەڵبژاردنەکان ئەنجامەکان ببینین و دواتر بڕیار لەسەر ئەو مەسەلەیە دەدەین.

ئەلجەزیرە: بەڕێز نەوشیروان پێش کەمێ لەمەوبەر وتت پەیوەندی ئێستای هەرێم بە حکومەتی مەرکەزەوە پەیوەندی حیزبەکانە، تێڕوانینت بۆ ئەو پەیوەندیە چیە؟

نەوشیروان مستەفا: دوای روخانی رژێمی پێشوی عێراق، حیزبە کوردیەکان کوردستانیان بەڕێوە دەبرد، ئەو حکومڕانیە بەشێوەیەك بو حیزب هەمو سەرچاوەکانی ژیانی قۆرخ کردبو بۆخۆی لەبەرئەوە پەیوەندیەکانی هەرێم بە بەغدادەوە پەیوەندی حیزبی بون کە لەلایەن سەرکردایەتی ئەو حیزبانەوە ئەم پەیوەندیە بەڕێوە دەبرا. بەڵام ئێستا ئێمە کۆمەڵگایەکی دەست لەناو دەستمان دەویٚ، لەلایەك مەبەستمانە ساردو سڕی نێوان گەلی کوردو حکومەتی مەرکەزی و لەلایەك ساردو سڕی پەیوەندیەکانی کوردو عەرەب، تیٚ بپەڕێنین. دەمانەویٚ دەوڵەت و کۆمەڵگایەکی نوێی وەها دروست بکەین لەسەر هەماهەنگی و لێکگەیشتن و تەواوکردنی یەکتر بونیاد نرابیٚ.

ئەلجەزیرە: بەڕێز نەوشیروان دەکریٚ بڵێین ئەو ساردو سڕیەی باست لێوەکرد لە نێوان ئێوەو دەسەڵاتدارانی کوردستانیشدا هەیە، بەو پێیەی ئێوە پێشتر دەسەڵاتدارانی کوردستانتان بەوە تۆمەتبار کردوە کە دەستدرێژیان کردوەتەوە سەر لایەنگرانتان تا ئەو رادەیەی وەك خۆتان باستان لێوە کردوە کوشتن و گرتن و نانبڕین لەناو ئەو حاڵەتانەدا هەبوە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵیٚ ئەمە راستە، دوای هەڵبژاردنەکانی مانگی تەمموزی رابوردو ژمارەیەکی زۆر لە لایەنگرو پشتیوان و ئەو کەسانەی دەنگیان پێدابوین روبەڕوی دەرکردن بونەوە لە ناو وەزارەتەکانی ناوخۆ و پێشمەرگە، هەروەها لە وەزارەتی پەروەردەش چەندین بەڕێوەبەری قوتابخانە گوازرانەوەو پلەکانیان لیٚ سەندرایەوە. تا ئێستاش بەشێك لە لایەنگرو هەڵسوڕاوانمان روبەڕوی لێدان و سوکایەتی پێکردن و جنێو پێدان دەبنەوە تا رادەی تیرۆرکردن.

ئەلجەزیرە: ئایا هیچ بەڵگەیەکتان هەیە ئەو روداوانە بسەلمێنیٚ؟

نەوشیروان مستەفا: هەمو ئەوانەی روبەڕوی ئەو حاڵەتانە بونەتەوە رۆشتونەتە دادگا، بۆیە من لێرەدا نامەویٚ دەستی تۆمەتبارکردن بۆ هیچ لایەنێك رابکێشم، بەڵام ئەوەندە هەیە هەمو ئەو کەسانەی روبەڕوی ئەو حاڵەتانە بونەتەوە لە هەڵسوڕاو و لایەنگرانی بزوتنەوەی گۆڕان بون.

ئەلجەزیرە: وابزانم ئێوەو ئەو کەسانەش سکالآتان کردوە لای حکومەتی عێراقی و رێکخراوە نێودەوڵەتیەکان بە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکانیشەوە، ئایا تائێستا هیچ وەلآمێکی ئەو سکالآیانە لەو لایەنانەو هەروەها دادگاکانەوە وەك خۆتان باستان لێوەکرد بە دەست ئێوە گەشتوەتەوە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، دادگا بەردەوامە لە لێکۆڵینەوەکانی خۆی، لەو لایەنانەی تریشەوە وەلآمی ئەوەمان دراوەتەوە کە بەرگری لە بزوتنەوەکەو هەڵسوڕاوەکانی بزوتنەوەکە دەکەن.

ئەلجەزیرە: بەڕێز نەوشیروان مستەفا، لە ماڵپەڕەکانی ئینتەرنێت و رۆژنامەکاندا پشێویەك لە نێوان ئێوەو سەرۆك جەلال تاڵەبانی دروست بو سەبارەت بە سروشتی پەیوەندیەکانی هەردوکتان بە رژێمی پێشوی عێراق و ئەمریکیەکانەوە، هەروەها سروشتی فەرمانداری لەناو یەکێتی نیشتمانی کوردستان، هۆکاری ئەو پشێویە چی بو، یاخود ئێستا کۆتایی پێهاتوە؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە لەگەڵ برا سەرکردەکانمان لە زۆرێك بابەتی بنەڕەتیدا ناکۆکین، بەڕێوەبردنی ئیدارەی هەرێمی کوردستانی عێراق یەکێکە لەو بابەتانە. ئێستا لە کوردستان حکومەت تێهەڵکێشە بە حیزبەکان، تەنانەت دوای هەڵبژاردنەکانیش سەرکردایەتی حیزبەکان حکومەتی کوردی بەڕێوە دەبەن. لە هەمو کایەو شوێنەکانی تریشدا هەر لە زانکۆ و مزگەوت و بازاڕ و بەڕێوەبەرایەتیەکانی حکومەتەوە بگرە تا کاروباری رۆژانەی خەڵك دەستێوەردانی حیزب بەدی دەکرێ. لەبەرئەوە ئێمە داوامان لێکردون دەسەلآتی حیزبەکانیان لە دەسەلآتی حکومەت جیابکەنەوە.

بەڕێز نەوشیروان بۆئەوەی قسەکانت زیاتر رونتربن تۆ زیاتر مەبەستت پارتی دیموکراتی کوردستانە بە سەرکردایەتی بارزانی و یەکێتی نیشتمانی بە سەرکردایەتی تاڵەبانی، مەگەر وانیە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ راستە.

ئەلجەزیرە: فەرموو

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ باس لەو دو حیزبە دەکەم.

فەرمو بەردەوام بە لەسەر گەیاندنی بۆچونەکانت.

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، بۆ نمونە ئەگەر پشتگیری حیزبت نەبێ ناتوانیت ببیتە دادوەر، ناتوانیت ببیتە وتاربێژی مزگەوتێ، سەرۆکی زانکۆیە، ناتوانیت ببیت بە سەرۆکی کۆلیژێ. لەبەر ئەمەیە ئێمە داوامان کردوەو بەردەوام هەوڵدەدەین حیزب لە حکومەت جیا بکەینەوە بەو مەبەستەی حکومەت بتوانێ بۆ کاروبارە رۆژانەکانی خۆی یەکلا ببێتەوە. بۆ نمونە دامەزراوەی پێشمەرگە و ئاسایش و پۆلیس هەمویان سەر بە سەرکردایەتی حیزبەکانن و تەنها بە رواڵەت سەر بە حکومەتن، بۆیە ئێمە هەوڵدەدەین پشتیوانی حیزب لەم دامودەزگایانە بگۆڕین بە پشتیوانی حکومەت لێیان و بەڕاستی بخرێنە سەر وەزارەتە پەیوەندیدارەکانیان، ئەمەیە ناکۆکیەکانی ئێمە. هەروەها شەفافیەت لە بودجەدا زۆر بەلای ئێمەوە گرنگە، کەس نازانێ چۆن بودجەی حکومەت خەرج دەکرێ. ئێمە لە هەرێمی کوردستان لە سەدا حەڤدەی بودجەی عێراق وەردەگرین، بەلام یەکەمجارە لەم ساڵدا حکومەت بودجە دەنێرێ بۆ پەرلەمان بۆ تاوتوێکردنی.

ئەلجەزیرە: تۆ دەتەوێ حکومەتی هەرێمی کوردستان بە گەندەڵی تاوانبار بکەیت وا بەوشێوەیە مەبەستە باس لە بودجەی دیاریکراوی هەرێم بکەیت؟

نەوشیروان مستەفا: مەبەستمان تاوانبارکردن نیە، بەڵکو دەمانەوێ گەندەڵی بە هەمو جۆرەکانیەوە دەربخەین هەر لە گەندەڵی ئیداری و داراییەوە بیگرە تا گەندەڵی سیاسی و ئەخلاقی بەربلاو کە لە کوردستاندا هەیە. لەبەرئەوەیە ئێمە هەوڵ دەدەین سنورێك بۆ گەندەڵی دابنێین بەهەمو جۆرەکانی وەك مەحسوبیەت و دەستوەردانی حیزب لە کاروباری حکومەت.

ئەلجەزیرە: کەواتە تۆ دەتەوێ دەسەڵاتی سەرۆکی حکومەت کەم بکەیتەوە.

نەوشیروان مستەفا: ئەمە لەناو کاری ئێمەدا نیە.

ئەلجەزیرە: لەناو کارەکانی ئێوەدا نیە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ.

ئەلجەزیرە: راوبۆچونی بزوتنەوەی گۆڕان چیە سەبارەت بە کێشە هەڵپەسێردراوەکانی نێوان هەرێم و بەغداد وەك کەرکوك و گرێبەستەکانی نەوت دوای ئەوەی هەڵوێستی ئێوە سەبارەت بە هاوپەیمانی کوردستان هەڵویستێکی نا رەزامەندانە بو لە پەرلەمانی عێراقدا، تۆ چ رێگەچارەیەك بۆ ئەم گرفتانە پێشنیار دەکەیت؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، کێشە هەڵپەسێردراوەکانی نێوان هەرێم و بەغداد دەکرێن بە دو بەشەوە، بەشێك لە کێشەکان کۆنن و لە رژێمەکانی پێشوترەوە ماوەتەوە بە تایبەت کێشەی ئەو شوێنانەی بە جێ ناکۆکەکان دەدرێنە قەڵەم، کۆمەڵێ کێشەی نوێی تریش هەیە کە بزوتنەوەی گۆڕان هیچ رۆڵێکی نەبوە لە دروستبونیان. بۆ کێشەی جێ ناکۆکەکان دەقێکی دەستوری هەیە بۆ چارەسەرکردنی، تائێستا ئێمە پابەندین بە جێبەجێ کردنی ئەو ماددەیە لە رێگەی گفتوگۆ و لێکگەیشتن نەك لە رێگەی هەڕەشە یاخود هەر رێگە چارەیەکی تر. ئەوەندەش پەیوەندی ئێمە بە کێشە نوێیەکانیشەوە هەیە وەك گرێبەستەکانی نەوت، پێمان وایە دەبێ شەفافیەت هەبێ لە چۆنیەتی داڕشتنی گرێبەستەکانداو لایەنەکانی گرێبەستەکەو دابەشکردنی داهاتەکان لەگەڵ ئاشکراکردنی ناوەڕۆکی گرێبەستەکان بۆ حکومەتی مەرکەزی، هەروەها پێمان وایە دەبێ ئەو گرێبەستانە بە پەرلەمانی کوردستان و عێراقیشدا بڕوات.

ئەلجەزیرە: بەڕێز نەوشیروان وەك دەزانن عێراق زۆرینەی عەرەبە و وەك وڵاتیش ئەندامی دەستەی کۆمکاری عەرەبیە، بەڕێزتان ئەم پەیوەندیەی عێراق و ئینتیمای عێراق بە جیهانی عەرەبیەوە چۆن هەڵدەسەنگێنن؟ یاخود دەبێ ئەو پەیوەندی و ئینیمایە بەڕای تۆ چۆن بێ؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە پێمان وایە پێکهاتەی گەلی عێراق لە دو پێکهاتەی سەرەکی پێکهاتوە واتە نەتەوەی عەرەب و نەتەوەی کورد. راستە نەتەوەی عەرەب زۆرینەیە لە عێراقدا، بەڵام رازی نابین بە بەڕێوەبردنی وڵات لە رێگەی زۆرینە و کەمینەوە، زۆرینەی عەرەبی و کەمینەی کوردی. بەڵکو ئێمە داوای وڵاتێکی یەکگرتوی فیدراڵی دەکەین کە تێیدا بەپێی رێکەوتنی هەمو پێکهاتەکانی عێراق وڵات بەڕێوە ببرێ.

ئەلجەزیرە: نەوشیروان مستەفا ئەمین سەرۆکی بزوتنەوەی گۆڕانی ئۆپۆزیسیۆن لە کوردستانی عێراق زۆر سوپاست دەکەم بۆئەوەی لەم چاوپێکەتنەدا لە شاری سلێمانیەوە لەگەڵماندا بویت.

نەوشیروان مستەفا: سوپاس

# ئێمه لەگەڵ یەکخستنی ریزەکانی کوردین. . . بەڵام بەو ریگایەنا "براکەت سەربخه ئەگەر ستەمکاربو یان ستەملێکراو"

**دیمانەی: الشرق الاوسط**

**له عەرەبییەوە: فەلاح حەسەن**

نەوشیروان مستەفا سەرۆکی بزوتنەوەی گۆڕان خوازیاریی خۆی پیشاندا سەبارەت بە بەڕێوەچونی پرۆسەی هەڵبژاردنەکانی داهاتوی عێراق بەشێوەیەکی هێمن و سەقامگیر و داواشی لە لایەنگرانی بزوتنەوەکەی کرد پابەند بن بە یاساکانی هەڵبژاردن و جێبەجێکردنی رێنماییەکانی کۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکان.

ئەو داوایەی نەوشیروان مستەفا بۆ رەواندنەوەی ئەو مەترسییانە بو کە لە ئێستادا بەدی دەکرێت لەبارەی دوبارەبونەوەی هەمان ئەو گرژییانەی کە لە هەڵبژاردنەکانی رابردوی هەرێمی کوردستان سەریانهەڵدا، لە هەمان کاتدا بۆ رەواندنەوەی مەترسییەکانی سەرهەڵدانی روبەڕوبونەوەی چەکداری بو، لەو چوارچێوەیەشدا سەرۆکی بزوتنەوەی گۆڕان داوایکرد کە پێویستە شەقامی کوردی دڵنیا بێت لەوەی بزوتنەوەی گۆڕان بزوتنەوەیەکی جەماوەریی ناچەکدارییە و بڕوای بە بونی میلیشیای چەکداری نیە، لە هەمان کاتدا کۆنترۆڵی هیچ دەروازەیەکی هەرێمی کوردستان یاخود عێراقمان نەکردوە و تەنها بەشداریمان کردوە لە کێبڕکێیەکی سیاسیی نایەکساندا.

راشیگەیاند: سەرکردەکانی لایەنی بەرامبەر بەرپرسن لە سەلامەتی کێبڕکێی سیاسی لە کوردستان و گرەنتی بەڕێوەچونی پرۆسەی هەڵبژاردن بەشێوەیەکی

دیموکراتی و بێخەوش و ئاشتییانە، لە هەمان کاتدا هەر ئەوان لەتواناياندايە جەنگ و کوشتاری ناوخۆیی هەڵبگیرسێنن نەك بزوتنەوەی گۆڕان.
لە دیمانەیەکدا لەگەڵ ڕۆژنامەی شەرقلئەوسەت، نەوشیروان مستەفا لەبارەی پێشبینییەکانی بۆ پێکهاتەی نەخشەی سیاسیی عێراق لە دوای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەران، پێی وابو: ناتوانرێت وێنەیەکی پانۆرامی بۆ هێزە سیاسییەکانی ناو پارێزگاکانی عێراق دابڕێژرێت، لەبەرئەوە پێشبینی ناکرێت گۆڕان لە سەنگ و قورسایی سێ پێکهاتە سەرەکییەکەی عێراق لە پەرلەماندا روبدات کە بریتین لە شیعە و سوننە و کورد، بە تایبەتی لە کاتێکدا کە تاوەکو ئێستاش دەنگدەری عێراقی لە هزریدا رزگاری نەبوە لە هەژمونی مەزەبی یاخود نەتەوەیی، بەڵام پێشبینی دەکەین پارچەپارچەبون و جیابونەوە لە نێوان پێکهاتەکاندا روبدات.
لەبارەی ئەگەرەکانی پێکهێنانی هاوپەیمانی لەنێوان بزوتنەوەی گۆڕان و هێزە عێراقیەکانی دیکە، نەوشیروان مستەفا تەئکیدیکردەوە کە بزوتنەوەکەیان پێی باشە ئەو بابەتە بۆ دوای پرۆسەی هەڵبژاردنەکان دوابخات، ئەو کات هەڵوێستی خۆمان رون دەکەینەوە لەبارەی پێکهێنانی هاوپەیمانێتی یاخو تەنانەت بۆ بەشداریکردن لە ئیئتیلافێکی حکومیدا لەسەر بنەمای خاڵی هاوبەش لە بەرنامەی سیاسیدا.
ئاماژەی بەوەشکرد کە بزوتنەوەی گۆڕان تەئکید لەسەر پێویستیی یەکخستنی ریزەکان دەکاتەوە لە کوردستان، بەڵام نەك لەسەر بنەمای عرقیبون و پرەنسیپی (براکەت سەربخە ئەگەر ستەمکار یاخود ستەملێکراو بێت)، بەڵکو لەسەر بنەمای ئەو خاڵە هاوبەشانەی کە لە بەرنامەی سیاسیدا هەیە، بە تایبەتی لە مەسەلە چارەنوسسازەکاندا ئیتر ئەو مەسەلانە کوردی بن یان عێراقی بن.

الشرق الاوسط: لە ڕێگای لێدوانی سەرکردایەتی کوردەوە هەست بەوە دەکرێت کە مەترسییەکی گەورە لەئارادایە لەبارەی هەوڵی لایەنە عێراقیەکان بۆ لاوازکردنی ڕۆڵی کورد لە بەغدا، ئایا ئێوە وەك بزوتنەوەی گۆڕان هەست بەو مەترسیە دەکەن، ئەی هەڵوێستتان چیە لەبارەی ئەو هەوڵانەوە؟

نەوشیروان مستەفا: کورد یەکێکە لە پێکهاتە سەرەکییەکانی عێراق و ناتوانرێت پەراوێز بخرێت، جگە لەوەش لە ئێستادا کورد لە عێراقدا بەهێزە و عێراقیش بە کوردەوە بەهێزە، ڕەنگە چەند هێزێك هەبن بیانەوێت ڕۆڵی کورد لە بەغدا لاواز بکەن، بەڵام لە بەرامبەریشدا چەند هێزێکی عەرەبی هەن کە هێزی سەرەکی و گرنگن و سورن لەسەر شەراکەتی تەواوی کورد لە بنیاتنانەوەی دەوڵەتی نوێی عێراق و دامودەزگا بنیاتنەرەکانی لەسەر بنەمای پەیوەندییە مێژویی و بەرژەوەندییە چارەنوسسازە هاوبەشەکان.

الشرق الاوسط: هەمیشە سەرکردەکانی هاوپەیمانی کوردستانی تەئکیدی لەسەر پێویستیی یەکڕیزیی هێزە کوردییەکان دەکەنەوە بۆ بەشداریکردنیان لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی داهاتوی عێراق، ئێوە وەك بزوتنەوەی گۆڕان لایەنی ئۆپۆزسیۆنتان هەڵبژاردوە، بەڵام ئێوە ئامادەییتان تێدایە کە لە پێناو ڕوبەڕوبونەوەی پێشهاتەکاندا، بچنە پاڵ لیستی هاوپەیمانیی کوردستان لە بەغدا؟

-نەوشیروان مستەفا: ئێمە لای خۆمانەوە تەئکید دەکەینەوە لەسەر یەکڕیزیی هێزە کوردییەکان، بەڵام نەك لەسەر بنەمای ڕەگەزیی و پرەنسیپی (براکەت سەر بخە ئەگەر ستەمکار یاخود ستەملێکراو بێت)، بەڵکو لەسەر بنەمای خاڵە هاوبەشەکانی بەرنامە سیاسیەکان، بەتایبەتی لە مەسەلە چارەنوسسازەکاندا، بەبێ جیاوازی لەنێوان مەسەلە کوردی و مەسەلە عێراقیەکاندا.

الشرق الاوسط: لە ئێستادا چەندین لایەن داوا دەکەن بەرەی سیاسی نیشتمانی لە عێراق پێکبهێنرێت، دوایین داواکاری لەو جۆرەش لەلایەن عەممار

حەکیمەوە بو لە کورد، کە داوایکرد بەرەیەکی هاوبەشی شیعە و کورد پێکبهێنرێت، هەڵوێستی ئێوە لەبارەی ئەو داواکارییەوە چیە و ئایا لە دوای هەڵبژاردنەکان پێکهێنانی هاوپەیمانی لەگەڵ کام هێزی سیاسی یاخود کام پێکهاتەی عێراقیدا بە باشتر دەزانن؟

—نەوشیروان مستەفا: بزوتنەوەی گۆڕان پێی باشە پێکهێنانی بەرە و هاوپەیمانێتی بۆ دوای هەڵبژاردنەکان دوابخات، بۆ ئەوەی چاوەڕێ بکەین بزانین هەڵبژاردنەکانی داهاتو چ گۆڕانکارییەك دەهێنێتە ئاراوە، ئەو کات هەڵوێستی خۆمان دەردەبڕین لەبارەی پێکهێنانی هاوپەیمانی یاخود تەنانەت بەشداریکردن لە ئیئتیلافێکی حکومی بەربلاۆ یان بەرتەسکدا لەسەر بنەمای خاڵە هاوبەشەکان لە بەرنامەی سیاسیدا.

الشرق الاوسط: زۆرێك لە راڤەکارە سیاسییەکان پێشبینی ئەوە دەکەن لە دوای هەڵبژاردنەکان گۆڕانکاری زۆر لە هاوکێشە سیاسیەکاندا بێتە کایەوە، تۆ وەك سیاسەتمەدارێکی کورد پێشبینی ئەوە دەکەیت کە لە داهاتودا گۆڕانکاریی فیعلی لە نەخشەی سیاسی عێراقدا روبدات، ئایا خوێندنەوەتان بۆ لێکەوتەکانی ئەو گۆڕانکارییانە چیە لەسەر بارودۆخی عێراق؟

—نەوشیرون مستەفا: ناتوانرێت وێنەیەکی پانۆرامی بۆ هێزە سیاسییەکانی عێراق بکێشرێت لە ١٨ پارێزگادا، تاوەکو بتوانین بۆچونێکی دیاریکراو بخەینەڕو، هەروەك تاوەکو ئێستاش ناوەندێکی لێکۆڵینەوەی سەربەخۆ نیە کە پشتی پێ ببەسترێت، من شەخسی خۆم پێشبینی ناکەم گۆڕانکاری لە سەنگ و قورسایی هەرسێ پێکهاتە سەرەکییەی عێراقدا روبدات لەناو پەرلەماندا، کە بریتین لە شیعە و سوننە و کورد، چونکە دەنگدەری عێراقی تاوەکو ئێستاش دەرباز نەبوە لە هەژمونی تائیفی و نەتەوەیی، بەڵام پێشبینی دەکەین پارچە پارچەبون و جیابونەوە لە ناو ئەم پێکهاتە و ئەو پێکهاتەدا روبدات، بەشێوەیەکی گشتی ئەنجومەنی نوێنەرانی داهاتوی عێراق فوسەیفەسائێکی سیاسی لەخۆی بگرێت، هیچ حیزبێك و هیچ ئیئتیلافێك ناتوانن زۆرینەی رەها

**یاخود زۆرینەی سادەش بەدەستبهێنن، لەبەرئەوە حکومەتی داهاتوی عێراق پێدەچێت حکومەتێکی ئیئتیلاف بچوك یاخود مامناوەند یان فراوان بێت.**

**الشرق الاوسط: بەم دواییانە چەندین داواکاری سەریانهەڵدا لەبارەی گەڕانەوەی حیزبی بەعس بۆ ناو پرۆسەی سیاسی، هەندێك کەس و لایەن خۆشحاڵن بە گەڕانەوەی بەعس کە یەکێك لەوانە جەلال تاڵەبانی سەرۆك کۆماری عێراقە، لە کاتێکدا هەندێکی دیکە ترسیان لەو داواکارییانە هەیە، ئێوەی (گۆڕان) وەك هێزێکی ئۆپۆزسیۆن لە کوردستان هەڵوێستتان لەو بارەیەوە چییە؟**

**-نەوشیروان مستەقا: ئێمە لە کوردستان بەر لە هەمو شتێك، دو جار ئاشتەوایی نیشتمانیمان ئەنجامداوە لەگەڵ یاریدەدەرانی رژێمی بەعس و ئەویش لە دو قۆناغی مێژوییدا بوە، یەکەمیان لە کاتی سەرهەڵدانی راپەڕینی کوردستاندا بو لە ئازاری ١٩٩١، دوەمیشیان لە کاتی روخانی رژێمی بەعس بو لە ساڵی ٢٠٠٣، لە هەردو حاڵەتەکەدا ئەزمونەکەمان سەرکەوتو بو، ئەنجامی باشی هەبو لە هەمو بوارەکاندا و کۆمەڵگای کوردیش بەدورگیرا لە روداوەکانی تۆڵەسەندنەوە و پاکتاوکردن و زۆربەیان گەڕانەوە ناو بارودۆخی نوێی سیاسی و کۆمەڵایەتی، بەڵام بەداخەوە ئەو ئەزمونە بەهۆی چەندین هۆکاری جیاوازەوە سەرجەم عێراقی نەگرتەوە، لە ئێستادا چەندین مادەی دەستوری و یاسای عێراقی هەن کە رێگری دەکەن لە گەڕانەوە و بەشداریکردنی بەعسیەکان بۆ ناو پرۆسەی سیاسی، بەتایبەتی ئەو بەعسییانەی کە تاوانیان لەدژی عێراقییەکان ئەنجامداوە، ئەو بەعسییانە پێویستە بدرێنە دادگا، بەڵام بە هەزاران بەعسیی دیکە هەن کە تاوانیان ئەنجام نەداوە و ئەو یاسایانە نایانگرێتەوە، کەواتە چ رێگرییەك هەیە لەبەردەمیاندا بۆ بەشداریکردنیان لە پرۆسەی سیاسیدا، لەروی پرەنسیپەوە ئێمە لەگەڵ هێنانەدی دادپەروەریداین نەك تۆڵەسەندنەوە، ئێمە لەگەڵ پرۆسەی ئاشتەوایی نیشتمانیداین و لەگەڵ بە سیاسیکردنی ئەو مەسەلەیەدا نین.**

الشرق الاوسط: ئێوه له هه‌ڵبژاردنه‌كانی هه‌رێمی كوردستاندا ئه‌نجامێكی پێشبینی نه‌كراوتان به‌ده‌سته‌ێنا، كه‌ ئه‌ویش بریتی بو له‌ یه‌ك له‌سه‌ر چواری كورسییه‌كانی په‌رله‌مان، به‌ڵام به‌شداریكردنتان له‌ كابینه‌ی حكومه‌تی هه‌رێمدا ره‌تكرده‌وه‌، سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ی كه‌ به‌رهه‌م ساڵح، كه‌ ئه‌وكات كاندیدی پۆستی سه‌رۆكی حكومه‌ت بو داوای لێكردن به‌شداری بكه‌ن، ئایا ئێوه‌ په‌شیمان نین له‌ به‌شدارینه‌كردنتان له‌ حكومه‌ت؟ هۆكاره‌كانی به‌شدارینه‌كردنتان له‌ حكومه‌ت چی بو؟

-ئێمه‌ به‌ لیستێكی سه‌ربه‌خۆ به‌شداریمان له‌ هه‌ڵبژاردنه‌كاندا كرد، كه‌ به‌رنامه‌یه‌كی سیاسیی جیاوازمان پێیه‌ له‌ به‌رنامه‌ی لیستی كوردستانی، به‌رنامه‌ی لیسته‌كه‌مان به‌دیل ده‌خاته‌ڕو بۆ چۆنێتی به‌ڕێوه‌بردنی حكومه‌ت و دژایه‌تیكردنی گه‌نده‌ڵی ئیداریی و دارایی و سیاسی و ئه‌خلاقی و چه‌سپاندنی دادی كۆمه‌ڵایه‌تی و هێنانه‌كایه‌ی شه‌فافیه‌ت له‌ بودجه‌ی هه‌رێم و په‌یوه‌ندییه‌ سیاسیه‌كان و رێگرتن له‌ ده‌ستێوه‌ردانی حیزب له‌ به‌ڕێوه‌بردنی رۆژانه‌ی فه‌رمانگه‌ حكومییه‌كان و بازاڕ و زانكۆ و دادگاكان و مزگه‌وته‌كاندا، هه‌روه‌ها گۆڕینی هێزی ئاسایش و پێشمه‌رگه‌ له‌ هێزی حیزبییه‌وه‌ بۆ دامه‌زراوه‌ی حكومیی بێلایه‌ن له‌ هه‌ڵبژاردن و ناكۆكییه‌ حیزبییه‌كاندا و ته‌رخانكردنیشیان به‌ ته‌نها بۆ پاراستنی كۆمه‌ڵگا، به‌ڵام حكومه‌تی ئێستای هه‌رێم به‌ هه‌مان پێوه‌ره‌كانی رابردو پێكهێنرایه‌وه‌ له‌ پێناو به‌رده‌وامیدان به‌هه‌مان سیاسه‌ته‌كانی رابردو كه‌ هه‌مان سلبیاته‌كانی رابردوی له‌خۆ گرتوه‌، له‌به‌رئه‌وه‌ به‌شداریمان له‌ حكومتدا نه‌كرد و په‌شیمانیش نین له‌ به‌شدارینه‌كردنمان، به‌پێچه‌وانه‌وه‌ پێمان وایه‌ كارێكی باشمكان كردوه‌.

الشرق الاوسط: كوتله‌كه‌ی ئێوه‌ وه‌كو ئۆپۆزسیۆن له‌ په‌رله‌مان كار ده‌كات، ئایا تاوه‌كو ئێستا ئێوه‌ رازین له‌ ئه‌دای كوتله‌كه‌تان له‌ په‌رله‌ماندا؟

—نەوشیروان مستەفا: حیزبە باڵادەستەکان ویستیان رۆڵی پەرلەمان پەکبخەن تاوەکو وادەی هەڵبژاردنەکانی عێراق، بۆ ئەوەی هیچ بوارێك نەمێنێتەوە بۆ دەرکەوتنی رۆڵی فراکسیۆنی گۆڕان لە پەرلەمان و ژیانی سیاسیدا، بۆیە پەرلەمان چوە ناو پشوی زستانەوە بەبێ ئەوەی هیچ یاسایەك بەدەست بهێنێت، سەرەڕای هەمو ئەوانەش، بەڵی ئێمە رازین لە ئەدای فراکسیۆنەکەمان لە پەرلەمان، چونکە چەند تەقالیدێکی نوێی پەرلەمانییان هێناوەتە کایەوە لەبارەی ئۆپۆزسیۆنی ئیجابی لەژێر سایەی پەرلەمان و تێکەڵاوبونی رۆژانە لەگەڵ توێژە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان لەنێو کۆمەڵگادا.

الشرق الاوسط: بەم دواییانە حکومەتەکەی بەرهەم ساڵح چەند هەنگاوێکی گرتەبەر لەپێناو بەدامەزراوەییکردندا، بۆ نمونە: شاشکراکردنی بودجەی ساڵانەی حکومەت و دانانی چوارچێوەی یاسایی بۆ بودجەی تەرخانکراوی حیزبەکان، هەروەها هەوڵیداوە بۆ یەکخستنەوەی هێزی پێشمەرگە، هەڵوێستی ئێوە لەبارەی ئەو هەنگاوانەوە چیە؟

—نەوشیروان مستەفا: بەبڕوای ئێمە هەمو ئەو بڕیارنە دەچنە چوارچێوەی هەڵمەتی بانگەشەی هەڵبژاردنەکانی ئایندەوە و ئامانج لێیان بریتییە سەرقاڵکردنی ناوخۆ و چەواشەکردنی دەنگدەری کورد، لە کاتێکدا کە هیچ شتێکی لەو جۆرە نەکراوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە کاروباری رۆژانە و هەڵسوکەوتە ئیدارییەکانیان پێچەوانەی ئەوەیە کە بانگەشەی بۆ دەکەن، ئێمە نازانین باس لە چ جۆرە شەفافیەتێك دەکەن لە کاتێکدا کە ئەوان وردەکارییەکانی بودجەی هەرێمیان ئاشکرا نەکردوە و ئەو پارەیەش کە مانگانە پارتی و یەکێتی لە بودجەی گشتی دەیبەن ئاشکرا نەکراوە، هەروەها سنورێك دانەنراوە بۆ رێگرتن لە کۆنترۆڵکردنی داهاتەکانی هەرێم لەلایەن ئەو دو حیزبەوە، جگە لەوەش سنور بۆ دەستێوەردانی رۆژانەی حیزب لە کاروباری حکومەت و زانکۆ و بازاڕ و رێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و مزگەوتەکان دانەنراوە، هەروەها هێزی (پێشمەرگە و ئاسایش)یان لە هێزی حیزبییەوە

پێنەکراوەتە هێزی حکومیی بێلایەن؟ کەواتە ئەو دەوڵەتە موئەسەساتیە کامەیە کە ئەوان باسی لێوە دەکەن؟ ئەوان لە کاتی هەڵبژاردن و لە دوای هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی کوردستانیشدا سزای زیاتر لە ٢٠٠٠ لایەنگری ئێمەیاندا بە بڕینی موچەی مانگانە و نانبڕاوکردنیان یاخود دەرکردن یان گواستنەوەیان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی زۆر دور ئەمەش وەك سزایەك لەبەرامبەر دەنگنەدانیان بە لیستی کوردستانی، ئەوان تاوەکو ئێستاش بەردەوامن لە پەیڕەوکردنی ئەو بەرنامە هەڵەیە.

الشرق الاوسط: سەبارەت بە بودجەی حیزبەکان کە لە ئێستا بەدواوە لەچوارچێوەی یاسای بودجەدا دابەشدەکرێت، لە ترسی ئەوە هەیە کە دارایی فراکسیۆنەکەتان ببێتە سەرچاوەی هێز و راکێشانە جەماوەر یاخود بەکارهێنانی بەئامانجی پێکهێنانی هێزێکی سەربازی، ئایا ئێوە ئامادەییتان تێدایە گرەنتی ئەوە بدەن کە پابەندبن بە پرۆسەی دیموکراتییەوە، بەتایبەتی کە ئێستا خەڵك ترسی لەوە هەیە دوبارە لاپەڕەکانی شەڕی ناوخۆ هەڵبدرێتەوە؟

-نەوشیروان مستەفا: بزوتنەوەی گۆڕان بزوتنەوەیەکی جەماوەریی ناچەکدارییە و بڕوای بە بونی میلیشیای چەکداری نیە و کۆنترۆڵی هیچ کام لە پێگەکانی هەرێمی کوردستان یاخود عێراقی نەکردوە، تەنها بەشداری کردوە لە کێبڕکێیەکی سیاسیی نابەرابەردا، بەڵام سەرکردەکانی لایەنی بەرامبەر، یەکێکیان لەسەر کورسیی سەرۆکایەتی کۆماری عێراق دانیشتوە لە بەغدا (تاڵەبانی)، دوەمیشیان سەرۆکی هەرێمی کوردستانە (بارزانی)، هەردوکیشیان سەرۆکی هێزی پێشمەرگە و ئاسایش و ئیدارە حکومییەکانن، بە تایبەتی ئەوان بەرپرسن لە سەلامەتیی رکابەرکردنی سیاسی لە کوردستاندا و گرەنتیکردنی بەڕێوەچونی پرۆسەی سیاسی بەشێوەیەکی هێمن و ئاشتییانە و بێخەوش و دیموکراتی، هەر ئەوان دەتوانن جەنگ و کوشتاری ناوخۆیی هەڵبگیرسێنن نەك بزوتنەوەی گۆڕان.

الـشرق الاوسـط: سـەرکردەکانی یـەکێتی نیشتمانی کوردسـتان تۆمـەتبارت دەکـەن بـەوەی کـە دەستپێـشخەریت کـردوە لـە بـەرپاکردنی هەڵمـەتێکی ڕاگەیانـدنی بەرنامەبۆداڕێـژراو لـەدژیان، دەمانـەوێت بـزانین بـەهۆی چـییەوە جیاوازیـەکانتان گەیشتە قۆنـاغی دابڕان و دژایـەتیکردنێك کـە لـە بـەم دواییـە گەیشتە هەوڵی شکاندنی پەنجەکان؟

–نەوشیروان مستەفا: هەمو ئەوانەی کە سەر بە دەزگای ڕاگەیاندنی یەکێتین، لە ماوەی شەش مانگی ڕابردودا بە تایبەتی دەزگا ڕاگەیاندنە کوردییەکانیان، دەزانن کە یەکێتی دەستیکرد بە هەڵمەتی ڕاگەیاندنی ڕۆژانەی چڕوپڕ لەدژی سەرکردە و کەسایەتییە دیارەکانی گۆڕان، هەتا بارودۆخەکە گەیشتە حاڵەتی تەخوین، دەیانەوێت بەو شتانە بمانگێڕنـەوە بۆ ڕابردو و چیرۆکەکانمان پـێ بگێڕنـەوە و ناکۆکییـەکان بکـەن بـە شـتی شەخسی، لـەبری ئـەوەی گفتوگـۆی بەرنامەی سیاسیەکانی ئێستا و داهاتوی هـەرێمی کوردستان و عێـراق بکـەین، لە ڕابردوشدا مومارەسەی ماڤی خۆمانمان کردوە لـە ڕوی ڕەخنـەی سیاسییەوە بـەجۆرێکی بابەتییانـە و دور لـە تەشـهیر و ناوزڕانـدن، ئێمـە وەڵامـی هێرشـی ڕاگەیاندنـەکانی ئـەوانمان نەداوەتـەوە هێنـدەی کـە بـەرگریمان لـە ڕاسـتییەکان کـردوە و بەرچـاوڕونییەکمان داوەتـە ڕای گـشتی، سـەرکردایەتی سیاسـی لـە کوردسـتان تـاوەکو ئێستاش نەگەیـشتۆتە ئـەوەی کـە ڕەخنـەی سیاسـی و ڕای پێچەوانە قبوڵ بکات.

الـشرق الاوسـط: لـەم دواییـەدا هـەواڵی ئـەوە بڵاوبـۆوە کـە مەسعود بـارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان چاوی کەوتوە بە یەکێك لە نوێنەرانی فراکسیۆنی گـۆڕان و بـاس لـەوە دەکرێـت کـە سـەرۆکی هـەرێم بەباشـی زانیـوە لێکتێگەیـشتنێکی هـەبێت لەگـەڵتان بـۆ ئـەوەی دواتـر لەگـەڵ تاڵـەبانی بگەنـە لێکتێگەیشتنێکی هاوبەش، تا چەند ئەو هەواڵانە ڕاستن؟

–نەوشـیروان مـستەفا: لــە سـلێمانیدا ڕۆژنامــە و گۆڤـاری زۆر دەردەچـن، هەندێکیان لێدوان و هەواڵی هەڵبەستراو بڵاودەکەنەوە لەپێناو زۆرترین فرۆش

و کێبڕکێی بڵاوکراوە هاوشێوەکانیدا، ئەو هەواڵەش دەچێتە چوارچێوەی ئەو جۆرە هەواڵە دروستکراوانەوە.

الشرق الاوسط: لەکاتی هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستاندا، بارودۆخی هەڵمەتی بانگەشەی هەڵبژاردن گەرم و گوڕ و تاڕادەیەکی زۆر گرژ و ئاڵۆز بو بە تایبەتی لە سلێمانی، ئێوەش لەبەردەمی هەڵبلژاردنی پەرلەمانی عێراقدان، ئایا هیچ پەیامێکی دیاریکراوتان پێیە بۆ لایەنگرانی بزوتنەوەکەتان کە پابەندبن بە رێنماییەکانی هەڵبژاردنەوە؟

—نەوشیروان مستەفا: داوا دەکەم لە سەرجەم لایەنە بەشداربوەکانی هەڵبژاردنی داهاتوی عێراق، هەروەك چۆن داوامانکردوە لە سەرجەم هەڵسوڕوانی بزوتنەوەکەمان کە پابەندبن بە یاساکانی هەڵبژاردن و رێنماییەکانی کۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکان، خوازیاریشین پرۆسەکە بە ئاشتییانە بڕوات بەڕێوە.

الشرق الاوسط: بەرهەم ساڵحی سەرۆکی حکومەت رایگەیاندوە کە نامەیەکی ئاراستەی تۆ کردوە وەکو سەرۆکی بزوتنەوەی گۆڕان لەبارەی بارودۆخی ئاڵۆزی سلێمانی و هەوڵی پێکەوە ئاساییکردنەوەی بارودۆخەکە، ئایا تۆ ئامادەویت لەگەڵ سەرۆکی حکومەت دابنیشیت لەو بارەیەوە؟

—نەوشیروان مستەفا: گرژی و ئاڵۆزییەکان یەك لایەنەبو، بەو پێیەی لەماوەی چەند هەفتەی رابردودا هەندێك لە چالاکوان و هەڵسوڕاوانی گۆڕان روبەڕوی دەستدرێژی و هێرشی شەخسی بونەوە، هەر لە بڕینی موچەوە دەستی پێکرد و بەردەوام بو هەتا تەقەکردن لە کەسایەتی و ماڵی کەسایەتییەکان و سەرشکاندن، تا گەیشتە ئاستی کوشتن، ئەو دەستدرێژییانە لەدژی ئێمە ئەنجامدران، بەلاّم هیچ بەرگرییەکیشمان نەکردوە تەنها پەنامان بۆ هێزی پۆلیس و دادگا بردوە، پێشمان وایە تاوەکو ئێستا هیچ جددیەتێك بەدی ناکەین لەبارەی بەدواداچونی ئەو دەستد

# نەوشیروان مستەفا: بەشێك لەهەمواری یاسای هەڵبژاردن بەزیانی کوردە

سازدانی هۆشیار عەبدولاّ:

نەوشیروان مستەفا لەم دیدارەدا کە بەرنامەی روبەروی کەناڵی ئاسمانی knn لەگەڵیدا سازیکردوە مەترسییەکانی خۆی سەبارەت بە زیادنەبونی کورسییەکانی هەرێمی کوردستان بەرامبەر کورسی پارێزگاکانی تری عێراق دەخاتەڕو پێی وایە :" نیسبەتی کورد لە پەرلەمانی عێراقیدا لە (٢١٪) دادەبەزێتە خوارەوە بۆ کەمتر لە (١٨٪)ە، کە ئەوە گرفتێکی گەورە دەخاتە ناو پەرلەمانی عێراق". هەروەها نەوشیروان مستەفا وەلاّمی تۆمەتانەی جەلال تاڵەبانی دەداتەوە کە لە دوا پلنیۆمی یەکێتیدا لەبارەیەوە وتبوی. .

*هەموارکردنی یاسای هەڵبژاردن لە عێراقدا و ئەو پاشهاتانەی، کە بە دوای خۆیدا هێنا، رای ئێوە سەبارەت بەو هەموارکردنە چییە؟

نەوشیروان مستەفا: هەمو جارێ، کە قانون دەردەچێت دەبێت لەگەڵ ئەو پێشکەوتنانەی، کە لەگەڵ کۆمەڵدا هاتوەتە پێشەوە بگونجێت، ئەمجارە قانونی هەڵبژاردن چوار گۆڕینی بنەڕەتی کردوە لە قانونی ساڵی (٢٠٠٥) گۆڕینی یەکەمیان ئەوەیە، کە ئەمجارە لەباتی ئەوەی عێراق یەك دائیرەی ئینتیخابی و یەك لیست ببێت بوە بە (١٨) دائیرەی ئینتیخابی و (١٨) لیستی جیاواز، ئەوە گۆڕانی یەکەمە واتە لە یەك بازنەییەوە بوەتە فرە بازنەیی، گۆڕینی دوەمیان جاران لیستی داخراوبو ئێستا بوەتە لیستی کراوە، یەعنی دەنگدەر دەتوانێت دەنگ بدات بەو پاڵێوراوانەی، یان بەو کاندیدانەی کە ناوەکانیان دەزانێت کێیە و کێ نییە، کە ئەمەش گۆڕینێکی گرنگە، گۆڕینی سێیەمیان پەرلەمانی پێشو

ژمارەی ئەندامەکانیان (٢٧٥) کەس بو ئێستا بوە بە (٣٢٣) کەس یەعنی زیادی کردوە و زۆریش زیادی کردوە، گۆڕینی چوارەم ئەوەیە، کە لە هەڵبژاردنی پێشودا بە گوێرەی قانون (٤٥) کورسی لە (٢٧٥) کورسییەکە دەچو بۆ کەمایەتییەکان و دەچو بۆ دەرەوەی عێراق ئەمجارە ئەوەیان زۆر کەم کردوەتەوە لەباتی (٤٥)ەکە بوە بە (١٥) لەوەش (٨)ی دەچێت بۆ کەمەنەتەوایەتییەکان و (٧)ی دەمێنێتەوە بۆ عێراقییەکانی دەرەوەی وڵات، ئەمە بە دەرەجەی ئەساسی ئەم چوار گۆڕینەیە، کە لە قانونەکان رویداوە.

*ئەگەر ئەم چوار گۆڕینە لەبەرچاو بگرین هەست دەکەیت کامەیان باشە و کامەیان خراپە، بەتایبەت بە لەبەرچاوگرتنی سود و زیانەکانی بۆ گەلی کورد؟

نەوشیروان مستەفا: بەڕای من دوان لەو گۆڕینانە بە قازانجی کوردە و دوانیشی بە زەرەری کوردە، گۆڕانی یەکەم کە لە لیستی داخراوەوە کراوە بە لیستی کراوە ئەوە بە قازانجی ژیانی دیموکراسییە، نەك هەر لە کوردستاندا بەڵکو لە هەمو عێراقدا، گۆڕانی دوەم ئەوەی کە لە یەك بازنەیی و یەك لیستییەوە کراوە بە فرە بازنەیی و فرە لیستی بۆ (١٨) موحافەزە، ئەمەش دیسان بە قازانجی ژیانی دیموکراسییە لە کوردستان و لە عێراقدا، بەڵام دوانەکەی دیکەیان زیادکردنی ژمارەی ئەندامانی پەرلەمان بەبێ ئەوەی کە کورد حیسابێکی بۆ کردبێت و شان بەشانی ئەو زیادبونەی کە لە ناوچەی شیعەکاندا لە ناوچەی سوننی و ناوچەی عەرەبیدا زیادی کردوە حیسابی ئەوەمان بکردایە، کە کوردیش دەبوایە بە هەمان ڕێژە لە پەرلەماندا نیسبەتی زیادبکردایە، یان ڕێژەی زیادی بکردایە ئەوە یەکێکە لەوانەی، کە زەرەری لێداوین یەعنی زیادبونی ژمارەی ئەندامانی پەرلەمانی عێراق لە (٢٧٥)ەوە بۆ (٣٢٣) لە کاتێکدا، کە ژمارەی ئەندامانی پەرلەمانتارانی کورد رەنگە زیاد نەکات، یا وەکو خۆی دەمێنێتەوە، یا کەمتر دەبێتەوە، پێموایە" ئەمە شتێکی زۆر نائاساییە و ئەمە بە زەرەری کوردە، گۆڕینی دوەمیش کە بە زەرەری کوردە و بە قازانجی کورد نییە، ئەویش ئەوەیە تا ئەندازەیەکی زۆر دەنگدەرانی کوردی

دەرەوەی وڵات بێ بەش کراون، چونکە بۆ هەمو ئەوانەی کە لە دەرەوە دەژین. ئێستا نزیکەی (٣) ملیۆن بۆ (٤) ملیۆن عێراقی لە دەرەوەی عێراق دەژین لەوە بەشێکی گەورەی کوردە تەنیا ئەوانە (٧) کورسییان بۆ دانراوە، کە لەو (٧) کورسییە رەنگە (٢) یا ئەوپەڕی (٣) کورسی بەر دەنگدەری کورد دەکەوێت لە سەرتاسەری دونیا، کە ئەمە من پێموایە دیسان ناهەقییە بەرامبەر بە ئێمە کراوە.

*دەستکاریکردنی ئەو ژمارانە لە کورسی پەرلەمان چۆن زیان بە کورد دەگەیەنێت؟

نەوشیروان مستەفا: لەکاتی نوسینی دەستوری عێراقدا لە راستیدا ئەو رێژانەی دەنگدان، کە دانرابو بە شێوەیەکی وادانرابو، کە نەوعێك لە تەوافوق تەئمین بکات لە بەینی کورد و لە بەینی لایەنەکانی دیکەدا، بۆ نمونە ئەو کاتەی کە پەرلەمانی عێراقی (٢٧٥) ئەندام بو لەوە نزیکەی (٢١٪)ی بەر کورد کەوتبو لە دەنگدانێك بە گوێرەی دەستوری عێراقی هەندێك دەنگدان هەیە، کە نیسبەتێکی دیاریکراوی پێویستە مەسەلەن هەڵبژاردنی سەرۆك کۆمار، هەڵبژاردنی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران، هەڵبژاردنی سەرۆکی پەرلەمان و جێگرەکانیان پێویستی بەوەیە، کە (٢/٣)ی تێکڕای ئەندامانی پەرلەمان دەنگی لەسەر بدەن لەوکاتە وەختی خۆی کە لە کاتی نوسینی دەستوریدا حیساب کرابو بەبێ دەنگی کورد نەدەکرا، ئەو (٢/٣)یە تەئمین کرێت لەبەر ئەوە، ئەوە زەمانێك بو گوێ لە دەنگی کورد بگیرێت و حیسابێك بۆ کورد بکرێت لەو پلەو پایە بەرزانەی، کە لە عێراقدا هەیە ئێستا لەم حاڵەتە، کە ژمارەی ئەندامانی پەرلەمانی عێراق دەبێت بە (٣٢٣) کەس نیسبەتی کورد لە پەرلەمانی عێراقیدا لە (٢١٪) دادەبەزێتە خوارەوە بۆ کەمتر لە (١٨٪)ە، کە من پێموایە" ئەمە خەلەلێکی گەورە دەخاتە ناو پەرلەمانی عێراق، لە داهاتوداو بەو ئەندازەی کە جاران کورد دەیتوانی مەسەلەن هەر قانونێك پێویستی بەوە بوایە (٢/٣)ی

دەنگەکان بەدەست بێنێت، کورد دەیتوانی دەورێکی کاریگەری هەبێت و هەندێك لە قانونەکانی دیکە پێویستی بەوە بو، کە (٥٠+١) بێت لەوەشدا کورد دەیتوانی دەنگی هەبێت، ئەمە ئێستا هەڵتەکیوە بە شێوەیەکی وا، کە کورد دیارە حیسابی ئەوەی نەکردوە زیادبون لە موسڵ، زیادبون لە بەسرە، زیادبون لە شارەکانی دیکەی عەرەبنشین، چ کاریگەرییەکی هەیە ئەگەر لە هەمان کاتدا تۆ زیادنەکەیت؟ چونکە هەمو هەرێمی کوردستان (٣) کورسی زیادی کردوە تۆ حیسابی ئەوە بکە لە (٣٢٣) کورسی (٣) کورسی بۆ کورد زیادی کردوە باقییەکەی دیکەی بۆ لایەنەکانیتر بوە.

*پێتوایە عێراقی دوای (٢٠٠٣) راستە عێراقی تەوافوقی بوە، بەڵام ژمارە دەوری بینیوە؟

نەوشیروان مستەفا: لە پەرلەمانی داهاتودا یەکێك لەو خەتەرانەی، کە بەڕاستی دەبێت جێی مەترسی هەمولایەکمان بێت لە کوردستاندا و دەبێت هەوڵبدەین، کە ئەو خەلەلە راست بکەینەوە، ئەویش ئەوەیە بە تەقدیری من لە پەرلەمانی داهاتودا مەبدەئی تەوافوق یەعنی سەرەتای سازان، کە پێکهاتنە لەسەر کۆمەڵێك شت ئەمە پێموایە" پشتگوێ دەخرێت لە موقابیلی ئەوەدا سەرەتای کەمینە و زۆرینە یەعنی (ئەقەلیەت و ئەکسەریەت) دێتە پێشەوە، چونکە کورد دەبێت بە ئەکسەریەتێکی بچوك لە پەرلەمانی داهاتودا، ئێمە لە پەرلەمانی پێشودا بە گوێرەی دەستوری عێراقی دو زەمانەتمان هەبو کە تەئمینی تەوافوقی دەکرد لە بەینی کورد و لە بەینی پێکهاتەکانی دیکەی عێراقدا ئەو دو مەبدەئە ئەو دو سەرەتایە ئەو دو مادە دەستورییە یەکێکیان ئەو دەنگدانە بو، کە من باسم کرد یەعنی ئەو نیسبەتە بو کە نەیاندەتوانی بەبێ دەنگی کورد (٢/٣) تەئمین بکەن، یا (٥٠+١)ی مەجموعی ئەندامی پەرلەمان تەئمین بکەن، ئێستا بەبێ ئەمە دەتوانن بیکەن و بەبێ منەتیش دەتوانن بیکەن، زەمانی دوەم ئەوەبو کە ئێمە ئەنجومەنی سەرۆکایەتیمان هەبو ئەنجومەنی سەرۆکایەتی

پێکهاتوه لە (٣) کەس نوێنەرێکی کوردە، نوێنەرێکی شیعەیە و نوێنەرێکی سوننەیە و هەریەك لەم (٣) نوێنەرە، کە یەکیان سەرۆك کۆمارە دوانیان جێگرن بۆیان هەبو هەرچی قانونە بچێت بۆ ئەنجومەنی سەرۆکایەتی ڤیتۆ بەکار بێنن و رەفزی کەنەوە و بیگێڕنەوە بۆ ناو پەرلەمان لەم دەورەیە ئەنجومەنی سەرۆکایەتی نامێنێت دەبێتەوە بە سەرۆك کۆمار بە تاقی تەنیا، کە بو بە سەرۆك کۆمار ئیحتیمالی زۆری هەیە، کە بەر کورد نەکەوێت ئەمجارە یەعنی کوردێك نەبێتەوە بە سەرۆك کۆماری عێراق لەبەر ئەوە ئەو ڤیتۆیەمان لەکیس چو هەقی ڤیتۆمان نامێنێت، وەختی خۆی وا بیرکرابوەوە کە ئەنجومەنی سەرۆکایەتی نەمێنێت لە بەرامبەری ئەوە (مەجلیسی ئەقالیم) دروست بکرێت، واتە لەکاتی هەمواری ئەو قانونە ئەو برادەرانەی ئێمە، یا ئەو کەسانەی ئێمە کە لە بەغدا نوێنەرایەتی کوردیان کردوە بیریان لەوە نەکردوەتەوە بەدیلێك بدۆزنەوە بۆ ئەنجومەنی سەرۆکایەتی بۆ ئەوەی لە حاڵەتێکدا ئەگەر ئەنجومەنی سەرۆکایەتی نەما و ئەو ماڤ ڤیتۆیەمان نەما شتێکی دیکەمان هەبێت بەدیلی ئەمە بێت و بتوانێت جێگەی ئەوە بگرێتەوە.

*سەبارەت بەو ترسانەی هەیە لە هەموارکردنەکە بۆ ئایندەی عێراق وەکو بەڕێزت باسی دەکەیت باشە کورد بەشداربوە لە حکومەتی عێراقیدا و کورد وجودێکی دیاری هەبوە بەوپێیەی، کە سەرۆکایەتی کۆمار و جێگری سەرۆکی ئەنجومەن و هەمو پۆستەکانی دیکە کێ بەرپرسیارە لەوەی، کە ئەم بارودۆخە بەم شێوەیە تێدەپەڕێت و تێپەڕیوە تا رادەیەك؟

نەوشیروان مستەفا: کێ بەرپرسیارە؟ ئەوانەی کە دەسەڵاتیان بە دەستەوەیە لە کوردستان و لە بەغدا، من نامەوێت تۆمەت پاڵ کەس بدەم، بەڵام دەبوایە وەزارەتی بازرگانی، دائیرەکانی وەزارەتی بازرگانی، کە کارتی خۆراك رێك دەخەن وەزارەتی بازرگانی هەرێمی کوردستان وەزارەتی بازرگانی بەغدا ئەوانەی، کە لە بەغدا پۆستی بەرز بەرزیان هەیە دەبوایە لەباتی ئەوەی کە هەر

خەریکی ئەوە بن زەخت لە ئێمە بکەن و تەزویر لە ئێمە بکەن، دەبوایە بیانزانیایە کە خەڵکی دیکە هەیە تەزویر لەوان دەکات دەبوایە نەیانهێشتایە ئەو تەزویرەیان لێ بکرێت.

من نامەوێت کەس تۆمەتبار بکەم، چونکە ئەوە لە پاش ماوەیەکی دیکە دەردەکەوێت، کە خەتاکە هی کێ بوە لەخۆوە من نامەوێت هیچ دابەش بکەم بەسەر خەڵکدا، بەڵام تۆ وەرە لێی بکۆڵەرەوە بۆچی نەینەوا توانیویەتی لە ماوەی (٥) ساڵدا بایی (١٢) کورسی کارتی خۆراك دروست بکات؟! بۆچی بەسرە لە ماوەی (٥) ساڵدا توانیویەتی لە ژمارەیەکی کەمەوە ببێت بە (٢٤)؟! بۆچی نەجەف، کەربەلا فلاّن ئەمانە بە نیسبەتێکی زۆر زیادیان کردوە، یەعنی مەعقولە سلێمانی لە ماوەی (٥) ساڵدا زاوزێی نەکردبێت و هیچ کەسێکی نەگەیشتبێتە تەمەنی دەنگدان؟! جاری پێشو (١٥) کورسی بوە، ئێستاش (١٥) کورسی هەیە مەعقولە هەولێر، کە پایتەختی هەرێمی کوردستانە بەو ژمارە زۆرەوە تەنیا بایی (١) کورسی ژمارەکەی زیادی کردبێت، یا دهۆك بایی (١) کورسی ژمارەی زیادی کردبێت، یان بایی (٢) کورسی ژمارەی زیادی کردبێت لەکاتێکدا بە تەنیشت ئەوەوە شوێنی وا هەیە بە ملیۆن زیادی کردوە ئەمە دەکەوێتە سەر شانی کێ؟ پێموایە پێویستە پەرلەمانی کوردستان لێی بکۆڵێتەوە.

*لەکاتێکدا لە هەرێمی کوردستاندا ئارامیی هەبوە، بەڵام لە ناوچەکانی دیکە جۆرێك لە توندوتیژی هەبوە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ وایە

*لە دۆخێکی لەم شێوەیەدا چی چارەسەرە؟

نەوشیروان مستەفا: من پێش ئەوە بێمە سەر چارەسەر دەمەوێت مەترسییەکانی ئەوەی، کە ئەگەر لە پەرلەمانی عێراقدا مەبدەئی تەوافوق

پەیڕەوی پێ نەکراو مەبدەئی (ئەکسەریەت و ئەقەلیەت) جێبەجێ کرا، من دەمەوێت لەسەر ئەوە قسە بکەم، چونکە ئێمە لە بەردەمی هەڵبژاردنداین ئەم هەڵبژاردنە چوار ساڵی داهاتو لە عێراقدا ئەم پەرلەمانە تەشریعیات دەکات و قانون بەڕێوە دەبات و وەزارەت دروست دەکات و وەزارەت دەڕوخێنێت و وەزیر بانگدەکات بۆ موحاسەبە، بە بیروبۆچونی من مەترسییەکی زۆر گەورە هەیە، کە لە پەرلەمانی داهاتودا وەکو چۆن پێشتر مالیکی و ئەوانە داوایان دەکرد، کە مەبدەئی (ئەقەلیەت و ئەکسەریەت) لە پەرلەماندا پەیڕەو بکرێت، نەک مەبدەئی تەوافوق ئەمجارە ئیحتیمالی زۆر هەیە بەهۆی ئەو ژمارە زۆرەوە، کە هەندێك لە پارێزگاکانی ناوەڕاست و خواروی عێراق زیادی کردوە ئەو مەبدەئە پەیڕەوی بکەن و گەر ئەوەیان پەیڕەوی کرد، یەکەم شت نیسبەتی کورد لە وەزارەتەکانی بەغدا لە دامودەزگای ئیداری عێراقدا کەم دەبێتەوە، دوەم دەبێت ئێمە بیر لەوە بکەینەوە، کە بودجەی هەرێمی کوردستان دیسان ئەوەش دەکەوێتەوە بەر موناقەشە ئەو (١٧٪)یە دەکەوێتەوە بەر مەترسی، سێیەمیان مەسەلەی پێشمەرگەیە، کە پێموایە لە پەرلەمانی داهاتودا ئەگەر بەو تەریقەیە موعامەلەی لەگەڵ بکرێت پێشمەرگە وەکو میلیشیا مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت و ناهێڵن ببێت.

سەرەتایەکی دیکە ئەویش ئەوەیە، کە ئێمە هەوڵی ئەوەمانە کە سامانە سروشتییەکانی کوردستان لەژێر دەسەڵاتی هەرێمی کوردستاندا بێت، پێموایە عقودی نەوت و ئەوانەش دەتوانن هەڵبوەشێننەوە و گەلێ شتی دیکەی لەو بابەتانە، یەعنی بە مانایەکی دیکە عێراق وەختێ خۆی ئێمە خۆمان رازی بوین لەبەر ئەوەی، کە خارجییە و دیفاع و مالییە بەدەست مەرکەزەوەیە، ئەگەر بەمجۆرە بڕوات مەرکەزێکی بەقوەت دروست دەبێت و تەنانەت ناهێڵن هەرێمی کوردستان جۆرێك لە پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتانی دونیا هەبێت و ئەو سەردانانەی کە سەرۆکایەتی هەرێم و پەرلەمان و وەزیرەکانی ئێمە دەیکەن بۆ شوێنەکانی دیکەی دونیا بۆ ئەوەی پەیوەندی پاش لە بەینی هەرێمی

کوردستان و شوێنەکانی دیکەدا دەربکەن دەیخەنە چوارچێوەی وەزارەتی خارجییەوە و پێشمەرگە دەخەنە چوارچێوەی وەزارەتی دیفاع و میزانییەی (١٧٪) دەخەنە چوارچێوەی میزانییەی عێراقییەوە، یەعنی ئەوە مەترسییەکانە، کە بەڕاستی من دەمەوێت لە ئێستاوە هەمو کەسێکی لێ بەئاگا بێنم و خەڵك هۆشیار بکەمەوە.

*سەبارەت بەو مەترسیانە چارەسەر چییە، ئایا کورد چی بکات؟ یەك لیست بێت هاوهەڵوێست بێت، یەك گوتاری هەبێت بەتایبەت کە ئێوە وەك بزوتنەوەی گۆڕان زۆرجار تۆمەتبار دەکرێن بەوەی، کە گوتاری هاوبەش، یاخود یەك لیستی کورد ڕەتدەکەنەوە و بەفیعلیش ڕەتتان کردەوە؟

نەوشیروان مستەفا: جارێ با لە پێشدا بۆت باس بکەم یەك لیستی و فرەلیستی ئێستا لە کوردستاندا موشکیلەی نەماوە، سلێمانی (١٥) کورسی هەیەو هەولێر (١٤) کورسی هەیە و دهۆك (٩) کورسی هەیە، هەتا ئێوارە تەزویر بکەین و تەزویر نەکەین و یەك لیست بین و دە لیست بین، پانزە لیست بین، ژمارەی کورسییەکانی سلێمانی نە زیاد دەکات، نە کەم دەکات عەینی کورسی دەچێتە ناو پەرلەمانی عێراقەوە ئەوانەی هەولێریش دەچێتە پەرلەمانی عێراقەوە دەتوانین جارێکی دیکە لە بەغدا هاوپەیمانێتی بکەین و ڕێك بکەویت لەسەر ئەم شتە قەومیانەی، کە پەیوەندی بە چارەنوس و پاشەڕۆژی میللەتەکەمانەوە هەیە، بڕواناکەم هیچ کوردێك هەبێت لاریی لەوە هەبێت، کە ئێمە بتوانین گوتاری سیاسیی هاوبەشمان هەبێت لەسەر ئێستاو پاشەڕۆژی میللەتەکەمان چار چییە؟ ئێمە پرۆتێستێکمان نوسیوە بۆ مفەوەزییەت لەسەر ئەو وەزعە و فراکسیۆنی گۆڕانیش لە هەولێر بەیاننامەیەکی دەرکردوە و داواشیان کردوە، کە کۆبونەوەیەکی خێرای پەرلەمانی کوردستان بکرێت، من خۆشم پەیوەندیم بە هەندێك لە پەرلەمانتارەکانی خۆمان لە بەغدا کردوە، کە لەوێش ئەم

مەوزوعە بوروژێنن و باسی بکەن لەبەر ئەوە لە هەمو لایەکەوە هەوڵمان داوەو با چاوەڕێ بکەین بزانین هەڵویستی پەرلەمانی کوردستان و هەڵویستی ئەنجومەنی وەزیرانی کوردستان و هەڵویستی لەسەرو هەموانەوە سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان لەم مەوزوعەدا چی دەبێت، بێگومان هەرچی بڕیار و هەڵویستێکی ئەوان لە قازانجی کورد بیدەن ئێمە بەبێ سێ‌و دو پشتیوانیان دەکەین.

*لە پلنیۆمی (ی. ن. ك) مام جەلال لە قسەکانیدا لێپرسیراوێتی کۆمەڵێك هەڵویستی خستوەتە ئەستۆی تۆ رای بەڕێزت چییە؟

نەوشیروان مستەفا: من یەکەم هەواڵەکانی، کە بە من گەیشتووە هی دەستی دوەمە یەعنی لە دەزگاکانی راگەیاندن و لە دەمی ئەم و ئەوەوە بیستومەتەوە، من خۆم نە لە تەلەفزیۆندا گوێم لێبووە چی باس کردوە و نە بە نوسینیش خوێندومەتەوە چی باس کردوە، ئەوەی کە بیستومە ئەوەیە کە لە رۆژنامەکاندا بڵاو کراوەتەوە ئەوەی کە بیستومە ئەوەیە، کە ئەوانەی لەو پلنیۆمەدا بەشدارییان کردوە بەدەم بۆیان گێڕاومەتەوە و یاخود کەسی سێیەم بۆی گێڕاومەتەوە، لەبەر ئەوە گێڕانەوە شتێکی لەسەر بینا ناکرێت تاوەکو بڵێیت مادە بە مادە خاڵ بەخاڵ و ئیتیهام بە ئیتیهام جوابی بدەمەوە، ئەوە هی یەکەمە هی دوەمیش بەڕاستی من بەلامەوە سەیرە کابرایەك بەشی هەرە زۆری تەمەنی مەسئول بوبێت مەسئولی یەکەمی جولانەوەیەکی گەورەی وەکو جولانەوەی کورد بوبێت بەم تەمەنەوە بڕوات پاکانە بکات بۆ حیزبی بەعس، پاکانە بکات بۆ سەدام حسێن تاوانی کیمیابارانکردنی شارێکی گەورەی کوردستان، کە ئێستا بوە بە رەمز بۆ جولانەوەی کورد لەباتی ئەوەی بیخاتە سەر نیزامی بەعسی، بیخاتە سەر ئەوانەی کە ئێستا لە دادگاکاندا مەحکەمە دەکرێن، بیخاتە سەر هاوڕێکانی خۆی من زۆر بەداخەوەم بۆ ئەوە.

*بەرپرسێکی (ی. ن. ك) لە ئەورروپا وتویەتی مانگانەی نەوشیروان مستەفا (٦) دەفتەر دۆلارە رای بەڕێزت؟

نەوشیروان مستەفا: جارێ یەکەم لە کوردستانی عێراقدا مانگانەی (٦) دەفتەر دۆلاری هەر نییە، ئەوە یەکێك لە دەسەلاتدارانی یەکێتی لە کۆڕێکدا لە ئەورروپا باسی کردوە، من حەزدەکەم بە خەلك بلێم رادەی راستی ئەم خەبەرە بەقەدەر راستی ئەو قسانەیە، کە لە پلنیۆمدا کراوە لەسەر من نە ئێستاو نە لە رابردوشدا نە پارەی تەقاعودیم وەرگرتوە و نە موچەم هەبوە و نە ئێستا موچەم هەیە لە حکومەتی هەرێم و نە موچەیەك هەیە لە حیزب و نە پارەی خانەنشینی وەردەگرم، ئەو پارەیەی من، من ئومێدم وایە ئەو برادەرە بیخاتە سەر میزانییەی مانگانەی مەکتەب

# دەمانەوێت نەریتێکی تازەی سیاسیی دابێنین

سازدانی: هۆشیار عەبدوڵڵا

لەم دیدارەدا نەوشیروان مستەفا تیشك دەخاتە سەر خۆرێکخستنەوەی بزوتنەوەی گۆڕان‌و میکانزمەکانی ئەو رێکخستنەوەیەو ئاماژە بەوە دەکات کەئێستا شێوەیەکی تازەی رێکخراوەییان دەستپێکردوە، کە جیاوازە لە حیزبە تەقلیدییەکانی ئێستای کوردستان بە تایبەتی لە دو حیزبە سەرەکییەکەو هەوڵدەدەن ئەم حیزبە مەسرەفی کەم بێت‌و بەرهەمی زۆر بێت هەوڵدەدەن ئەم حیزبە بارەگای کەم بێت، بەلام پەل‌وپۆو رایەڵی فراوانی هەبێت هەوڵدەدەین ئەم حیزبە کاروبارەکانی هەموی رۆشن بێت شەفاف بێت سەرکردایەتییەکەی شەفاف بێت سەرکردایەتییە فەرعییەکانی شەفاف بێت کاروبارەکانی شەفاف بێت‌و خەڵك بیبینێت‌و خەڵك ئاگادار بێت‌و خەڵك خۆیان بەشدار بن لە کاروبارەکانیدا.

KNN: داهاتوی بزوتنەوەی گۆڕان چی بەسەر دێت؟

نەوشیروان مستەفا: ئەم بزوتنەوەیە دەستی پێکردوە بۆ ئەوەی بەردەوام بێت دەستی پێکردوە بۆ ئەوەی رێبازێکی تازە لە جولانەوەی کورددا لە ژیانی سیاسیی کوردستانی عێراقدا بێنێتە کایەوە، ئەم بزوتنەوەیە دەبێت بە هێزێکی گەورە بەڵکو دەتوانم بڵێم" لە ئایندەیەکی نزیکدا دەبێتە هێزێکی سەرەکی، ئەم هێزە سەرەکییە لە پێناوی دو ئەرکی سەرەکیدا کار دەکات، کە لایەکیان بریتییە لە بەدیهێنانی خواستەکانی کۆمەلانی خەڵکی کوردستان لە کوردستانی عێراقداو لەسەر ئاستی کوردستان هەوڵدەدات بۆ عەدالەتی ئیجتماعی‌و خواستەکانی دیکەی خەڵکی کوردستان لەسەر ئاستی عێراقدا هەوڵدەدات بۆ بەدیهێنانی مافە نەتەوەییەکانی کورد، کە لە دەستوری عێراقدا

جێبەجێ كراوە، وە ئەمە ئومێدمان وایە ببێت بە هێزی سەرەكی ناو مەیدانی جولانەوەكە.

KNN: كاتی ئەوە نەهاتوە ئەم بزوتنەوەیە بە شێوەیەكی رەسمیی رێك بخەن و بارەگا بكەنەوە بە شێوەیەكی فەرمیی كار بكەن؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، كاتی ئەوە هاتوەو دەستیشمان پێكردوە ئێمە لەپێش هەڵبژاردنی پەرلەمانی كوردستان و جۆرێك لە كۆكردنەوەی خەڵك و جۆرێك لەخۆ رێكخستنمان دەست پێ كردبو و ئێستا خەریكی خۆرێكخستنین خەریكی خۆ ئامادەكردنین بۆ هەڵبژاردنی داهاتو و ئەو خۆرێكخستنەی كە لە كاتی هەڵبژاردنی یەكەمدا دەستمان پێكردوە ئێستا درێژەی پێ دەدەین و خەریكین باشتر رێكی بخەین و لە دوای هەڵبژاردنی داهاتوی پەرلەمانی عێراقیش هەر بەردەوام دەبین.

KNN: بۆچی ئەم رێكخستنەوەیە جۆرێك لە دواكەوتنی پێوە دیارە؟

نەوشیروان مستەفا: جۆرێك لە دواكەوتنی پێوە دیارە، بەلام ئێمە دوانەكەوتوین، ئێمە ئەو ماوەیە هەموی خەریكی گفتوگۆ بوین لەناو خۆماندا بۆ ئەوەی شێوەیەكی تازەی رێكخراوەیی بدۆزینەوە هەولمان داوەو داوامان لە كۆمەڵێك خەڵكی شارەزا كردبو، كە پێشنیازو بیرو بۆچونەكانی خۆیانمان بۆ بنوسن بە سەدان وتار لە رۆژنامەكان و لە گۆڤارەكان و لە سایتەكاندا نوسراوە هەمویمان خوێندوەتەوەو هەولمانداوە شێوەیەكی تازەی خۆرێكخستن بۆ جولانەوەكە ئامادە بكەین و كردوشمانە.

KNN: ئەم شێوازی رێكخستنەوەیە چۆنە؟

نەوشیروان مستەفا: گرنگترین مەسەلە ئەوەیە ئێمە نامانەوێت تەجروبەی حیزبەكانی رابردو دوبارە بكەینەوەو نامانەوێت ئەو نەخۆشیانەی، كە لە حیزبەكانی دیكەدا هەبون لەم رێكخستنەدا دوبارە بێتەوە.

KNN: ئەو نەخۆشیانە چین؟

**نەوشیروان مستەفا: ئەو نەخۆشیانە لە سەروی هەموویانەوە ئەو هەوڵەیە، کە حیزبەکانی ئێستا دەیدەن بۆ قۆرغکردنی گۆڕەپانی کارکردن بۆ بە حیزبیکردنی کۆمەڵگە، بۆ بە حیزبیکردنی بازاڕ، بۆ بە حیزبیکردنی زانکۆکان، بۆ بە حیزبیکردنی دادگاکان، بۆ بە حیزبیکردنی پەیوەندییەکانی نێوان نەتەوەی کوردو بەغدا، نێوان نەتەوەی کوردو گەلانی دراوسێ، نێوان کوردو وڵاتانی دیکەی دونیا، دەمانەوێت چەمکی حیزبی بون ببێت بە چەمکێکی سیاسیی جیاواز لە چەمکی هاوڵاتی بون، ئێستا چەمکی هاوڵاتی بون خەریکە وای لێ دێت ببێت بە چەمکی حیزبی بون، ئێمە دەمانەوێت جارێکی دیکە کۆمەڵەکەمان بینا بکرێتەوە لەسەر بنچینەی هاوڵاتی بونی کوردستانی، نەك لەسەر ئەساسی ئەوەی کە تۆ ئەندامی لە فلان حیزبدا یاخود حیزبیت، یان جیزبی نیت.**

**KNN: دواجار گەیشتن بەو فۆرمە، یا بەو شێوە رێکخستنە کە خۆتان دەتانەوێت، کە دور بێت لەو نەخۆشیانە لانیکەم؟**

**نەوشیروان مستەفا: ئێمە ئێستا شێوەیەکی تازەی رێکخراوەییمان دەستپێکردوە، کە پێموایە جیاوازە لە حیزبە تەقلیدییەکانی ئێستای کوردستان بە تایبەتی لە دو حیزبە سەرەکییەکەو هەوڵدەدەین ئەم حیزبە مەسرەفی کەم بێت و بەرهەمی زۆر بێت هەوڵدەدەین ئەم حیزبە بارەگای کەم بێت، بەڵام پەل‌وپۆو رایەڵی فراوانی هەبێت هەوڵدەدەین ئەم حیزبە موچەخۆری زۆر کەمی هەبێت، بەڵام فراوانترین پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵانی خەڵکدا ببێت، هەوڵدەدەین ئەم حیزبە کاروبارەکانی هەموی رۆشن بێت شەفاف بێت سەرکردایەتییەکەی شەفاف بێت سەرکردایەتییە فەرعییەکانی شەفاف بێت کاروبارەکانی شەفاف بێت و خەڵك ببینێت و خەڵك ئاگادار بێت و خەڵك خۆیان بەشدار بن لە کاروبارەکانیدا.**

**KNN: هێڵە گشتییە سەرەکییەکانی ئەم رێکخستنەوەی ئێوە، ئەگەر بکرێت زیاتر باسی بکەیت؟**

نەوشیروان مستەفا: جیاوازی بەینی ڕێکخستنەوەی ئەم جوڵانەوەیە لەگەڵ بە ناو بیڵێین یەکێتیو پارتیدا، کە دو حیزبی سەرەکین ئەوەیە" ئەم جوڵانەوەیە نابێتە خاوەنی ڕێکخستنێکی هەرەمی، نابێتە خاوەنی ڕێکخستنێکی عەمودی بە مانایەکی دیکە ئێمە نە مەکتەبی سیاسیمان دەبێت، نە کۆمیتەی سەرکردایەتیمان دەبێت، بەڵکو بەو شکڵە دەستمان پێ نەکردوە، کە ئێمە لە سەرەوە بۆ خوارەوە یاخود لە خوارەوە بۆ سەرەوە، بەڵکو لە ناوەڕاستەوە دەستمان پێ کردوە هەوڵدەدەین هەمو پارێزگایەك ئەنجومەنی تایبەتی خۆی هەبێتو هەمو قەزایەك ئەنجومەنی تایبەتی خۆی هەبێتو بە رایەڵەیەکی پتەو ئەنجومەنی قەزاکان لەگەڵ ئەنجومەنی پارێزگادا دەبەسترێتەوە، ئەنجومەنی پارێزگا بریتیی دەبێت لە رایەڵەی جۆراوجۆر لەوانە: رایەڵەی پەیوەندی کۆمەڵایەتی، رایەڵەی پەیوەندی پیشەیی، رایەڵەی پەیوەندی ڕێکخراوەپیشەییەکان، رایەڵەی پەیوەندی سیاسیی، رایەڵەی پەیوەندی میدیایی لە هەمان کاتدا نوێنەرایەتی فراکسیۆنەکانی تیادا بێت لە پاشەڕۆژێکی نزیکدا، کە هەڵبژاردن لە بەغدا کرا نوێنەری فراکسیۆنەکەی بەغداشی تێدا بێت لە هەمو پارێزگاکاندا نوێنەری ئەنجومەنی پارێزگاکانی تێدا دەبێت، بە شێوەیەکی وابێت کە شێوەیەکی عەمودی نییە، بەڵکو شێوەیەکی ئوفوقی هەیە شێوەیەکی پانو پۆڕی هەیە، شێوەی فەرشی هەیەو هەوڵدەدەین هەمو توێژەکانی کۆمەڵی کورد تیایدا بەشداری بکەنو وابێت کە هەرکەسێك بتوانێت هەر پارێزگایەك هەست بەوە نەکات پارێزگایەکی دیکەی بەسەریدا زاڵ دەبێت، بەشەکەی دەخوات لە پاشاندا ئەم ئەنجومەنی پارێزگایانە، کە دروست دەبێت خۆشیان لە بەینی خۆیاندا جۆرێك لە هاوکاریو تەنسیقو سەرکردایەتییەکی هاوبەش دروست دەکەن، کە لە هەمان کاتدا خۆیان جۆرێك لە سەربەخۆییو تایبەتمەندێتی تایبەتی خۆیان دەپارێزنو لە چوارچێوەی ئامانجە گشتییەکاندا پێکەوە لەگەڵ پارێزگاکانی دیکەیشدا کاردەکەن.

KNN: فۆرمی سەرکردایەتییە گشتییەکە بەم شێوەیە دەبێت لەنێوان پارێزگاکاندا پێك دەهێنرێت؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، لەناو پارێزگاکان پێك دەهێنرێت.

KNN: ئەی سەرۆکی ئەم بزوتنەوەیە؟

نەوشیروان مستەفا: یەکێك لەو شتانەی، کە ئێمە دەمانەوێت ئەمجارە گۆڕینی تێدا بکەین دەمانەوێت چەمکی سەرۆکی مەدەلحەیات کۆتایی پێ بێنین، من لە راستیدا سەرۆکی بزوتنەوەکە نیم بە گوێرەی قانونی عێراقیو بە گوێرەی مفوەزییەتی عولیا هەمو لیستێك، کە پێشکەش دەکرێت دەبێت لیستەکە هەر بە رەسمیی سەرۆکێکی هەبێت پێی دەڵێن :سەرۆکی لیستی فلاًن من بۆیە پێیان وتم سەرۆکی، لەبەر ئەوەی سەرۆکی لیستی گۆڕان بوم لە کاتی هەڵبژاردنی پەرلەمانو ئێستا فراکسیۆنەکەمان سەرۆکی خۆی هەیە، وەکو باسمکرد ئێمە دەمانەوێت نەریتێکی تازەی سیاسیی دابێنین ئەویش کۆتایی هێنانە بە سەرۆکی مەدەلحەیات، ئەندام مەکتەبی سیاسیی مەدەلحەیات، ئەندام سەرکردایەتی مەدەلحەیات ئەمانە قابیلی گۆڕینو تازەبونەوەو نوێبونەوەبێت.

KNN: واتە یەك تاك مەرجەعییەت، یاخود یەك ئەوەی نابێت، کە ببێت بە مەرجەعییەت یاخود بە شێوەیەکی ئاسۆیی دەمێنێتەوە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ بێگومان ئەو سەرۆکایەتییە، یا ئەو سەرکردایەتییەی کە دێتە پێشەوە هەمیشە لە نوێبونەوەو قابیلی تازە بونەوەدایە بە گوێرەی ئەوەی، کە ئەنجومەنی پارێزگاکانو ئەنجومەنە گشتییەکەی کە بۆ هەمو پارێزگاکان دادەنرێت ئەوان دەتوانن ناو بەناو بیگۆڕن لە ئایندەدا رەنگە کۆبونەوەی فراوان بکرێت کۆبونەوەی گەورە بکرێت، کە نوێنەرایەتی هەمو ئەوانەی تێدا بێت وەکو باسم کرد یەکێك لەو نەریتانەی، کە ئێمە دایدەهێنین ئەوە دەبێت، کە کۆتایی بێنین بە سەرۆکو سەرکردایەتی مەدەلحەیات.

KNN: وەك یەكێك لە هاوڕێكان پرسیویەتی جۆرێك لە فرە رەنگیو فرە بۆچونی لەناو گۆڕاندا كۆبوەتەوەو گوزارشتێكی وای كردوە وەكو پەلكە زێرینە رەنگاورەنگن، بەلأم هاو هەلویستن ئەم هەماهەنگیو هاوهەلویستییە چۆن دەتوانن بیپارێزن؟

نەوشیروان مستەفا: بەلێ ئەوە یەكێكە لە شانازییەكانی ئێمە من زۆر بە خۆشحالییەوە دەلێم، كە لەناو ئێمە بیرو بۆچونی جیاواز هەیە، ئایدیۆلۆژی جیاواز هاتوەو ئێمە پێمان وایە" حیزبی تاك ئایدیۆلۆژی سەردەمەكەی تێپەڕیوە بە تایبەتی لە قۆناغی ئێستای كوردستانی عێراقدا كۆمەلێك ئامانجی هاوبەش هەیە، كە توێژە كۆمەلأیەتییە جیاوازەكان كۆدەكاتەوەو كۆمەلێك ئامانجی هاوبەش هەیە سەرەڕای جیاوازی بیرو بۆچونی سیاسیی جیاواز سەرەڕای ئایدیولۆژی جیاواز سەرەڕای جیاوازی ناوچەیی سەرەڕای هەموی ئەوانە كۆمەلێك ئامانجی هاوبەش هەیە، كە ئێمە دەتوانین لە دەوری كۆببینەوە لە سەروی هەمویانەوە مەسەلەی عەدالەتی كۆمەلأیەتی هەیە مەسەلەی جیاكردنەوەی حیزبە لە حكومەت، مەسەلەی ئەوەیە كە چەمكی هاولأتی بون دور لە ئینتیمای حیزبی بهێنینەوە بۆ ناو كوردستانی عێراقو مافی مرۆڤ مەحەلی رەخساندنی هەلی یەكسان بۆ هەمو هاولأتیانو مەسەلەی دیموكراسییو مەسەلەی فرەیی ئەمجۆرە شتانە ئەمە شتی هاوبەشە لە بەینی هەمو ئەو بیروبۆچونە رەنگاوڕەنگانە ئەو پەلكەزێرینەیەیەی، كە ئەو برایە باسی كردوەو ئێمە ئومێدمان وایە تا ماوەیەكی درێژتریش ئێمە دەتوانین لە كوردستانی عێراقدا بەو پەلكە زێرینەییە درێژە بە كارو خەباتو تێكۆشانی خۆمان بدەین.

KNN: پرسیاری كوردستانم لێ كردیت، ئەی سەبارەت بە ئەوروپا رێكخستنەكانتان چۆن رێكخستوەتەوە، ئایا بیرتان لەوە كردوەتەوە فۆرمێك، یاخود ئالیەتێكیش بۆ ئەوروپا رێك بخەن؟

نەوشیروان مستەفا: ئەوروپا بێگومان جیاوازە لەگەڵ کوردستانی عێراقدا هەلومەرجی ژیان لە ئەوروپا بەتایبەتی بە نیسبەت رەوەندی کوردییەوە لە ئەوروپا جیاوازی هەیە لەگەڵ کوردستانی عێراق، لە کوردستانی عێراقدا تۆ دەتوانیت لە چوارچێوەی ناحیەو قەزاو پارێزگا لەسەر بنچینەی پیشە لەسەر بنچینەی توێژی کۆمەڵایەتی لەسەر هەریەك لەوانە دەتوانیت ناوچەکان رێك بخەیت ئەوروپا تایبەتمەندی خۆی هەیە، جالیەی کوردی لە ئەوروپا رەوەندی کوردی لە ئەوروپا رەوەندێکی گەورەیەو رەوەندێکی جۆراوجۆرە لەبەر ئەوە ئێمە رێزی تایبەتمەندێتی ئەوروپا دەگرین ئەو جۆرە رێکخستنەی، کە لە کوردستاندا بەدەستمانەوەیە لە ئەوروپا جۆرێکی دیکە دەبێت لە ئەوروپا بێگومان دەست پێشخەرییەکە لەوانەوە هاتوەتە پێشەوە داهێنانێکی تازەیان کردوە، کە نیشانەی هوشیاریی سیاسییەکی قوڵە بە نیسبەت رەوەندی کوردییەوە لە ئەوروپا هەر لە کاتی هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستانەوە هەزاران کەس لە رەوەندی کوردی لە ئەوروپا بەبێ ئەوەی هیچ ئامۆژگارییەك لە ئێمە وەربگرن فەرمانێك لە ئێمە وەربگرن دەستورێك لە ئێمە وەربگرن داوایەك لە ئێمە وەربگرن، خۆیان هەستیان بە پێویستیی قۆناغەکە هەستیان بە پێویستی خۆرێکخستن کرد، لەبەر ئەوە بە سەدان گروپ و کۆمیتەو تاقمی جۆراوجۆر بەناوی پشتیوانی کردنی لیستی گۆڕانەوە دروست کرد خۆیان رێکخست، کۆبونەوە، پارەیان کۆکردەوە پیتاکیان کۆکردەوە، پشتیوانیان کرد لەم جولانەوەیە، ئەمە خۆی لە خۆیدا داهێنانێکی تازەیە لە جولانەوەی کورددا، کە هەزاران کەس بەبێ ئەوەی لە لایەکەوە هانبدرێن، یان داوایان لێبکرێت خۆیان خۆیان رێکبخەن، ئێمە لە ئەوروپا رەوەندی کوردی تیایدایە سەر بە دینێکی جیاوازە تیایدایە سەر بە مەزەبێکی جیاوازە، تیایدایە سەر بە ناوچەیەکی جیاوازە، تیایەتی سەر بە توێژێکی کۆمەڵایەتی جیاوازە ئێمە حورمەتی هەمو ئەم جیاوازیانە دەگرین مەسەلەن ئەگەر یەزیدییەکان بۆ خۆیان گروپێکیان رێکخست و شیعە بۆ خۆیان گروپێکیان رێکخست و فەیلییەکان بۆ

خۆیان گروپێکیان ڕێکخستو کاکەییەکان بۆ خۆیان گروپێکیان ڕێکخست، تەنانەت ئەگەر هەولێرییەکان یاخود زاخۆییەکان یا سلێمانییەکان لەسەر ئەساسی ناوچە خۆیان ڕێکخست گرنگترین شت ئەوەیە، کە ئێمە هەوڵبدەین چوارچێوەی ئەو ئامانجە هاوبەشانەی کە ئێستا لە کوردستانی عێراقو ڕەوەندی کوردی لە دەرەوە ئیشی بۆ دەکات هەوڵبدەین چوارچێوەیەك بۆ ئەوە بکێشین لەناو ئەو چوارچێوەیەدا هەمو بۆ ئەوە کار بکەین ئێمە لە کوردستانی عێراق بەدەستمانەوەیە لە چەند ڕۆژی داهاتودا دەستەیەك ڕادەسپێرین، کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵ هەمو ئەو گروپانەی دەرەوە بکاتو سەرەڕای جیاوازی بیروبۆچونیانو سەرەڕای جیاوازی شێوەی ڕێکخستنەکانی، کە خۆیان بە چاکی دەزانن بە نیسبەت وڵاتەکانی خۆیانەوە لەگەڵ هەمویاندا پەیوەندی دەکەینو هەوڵدەدەین جۆرێك لە تەنسیقو هەماهەنگی لە بەینی هەمو ئەو گروپانەدا دروست بکەین بۆ ئەوەی لە پێناوی ئامانجی هاوبەشدا بتوانین کاری هاوبەش بکەین، شەرت نییە ئێمە ڕێکخستنی یەکگرتومان هەبێت، یا یەك ڕێکخستنمان هەبێت، یا یەك مەرکەزی ڕێکخراوییمان هەبێت.

KNN: وەکو باسی دەکەین بەم شێوەی بزوتنەوەکەتان ڕێکخستوەتەوەو فراکسیۆنێکی پەرلەمانیتان هەیە وەکو ئەمرێکی واقیع وەکو هێزێك لەسەر گۆڕەپانی سیاسیی کوردستاندا سروشتی مامەڵەی هێزە سیاسییەکان وەکو لە دیدارەکانی ڕابردوشدا باستکردوە جۆرێك لە دژایەتی پێوە دیارە، ئەم دژایەتیکردنە تا کوێ بڕدەکاتو تا چەند قبوڵی دەکەن؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە ئومێدمان وایە کە لایەنەکانی دیکەیش بەتایبەت یەکێتیو پارتی بە چاوی دوژمن تەماشای ئێمە نەکەن، ئێمە خەڵکی یەك وڵاتینو خەڵکی کوردستانی عێراقینو هەمومان چارەنوسمان بە یەکەوە بەستراوەو ژیانمان بەیەکەوە بەستراوە خۆشیو ناخۆشیمان بەیەکەوە بەستراوە، ئێمە بە چاوی دوژمن تەماشای هیچ لایەنێکی کوردستانی ناکەین هەر لەسەر ئەم بنچینەیەشە ئێمە پێمان خۆشە دەرگای گفتوگۆ، دەرگای

وتوێژ، دانوستاندن پێکەوە کارکردن، دەرگای دۆزینەوەی زمانی هاوبەش بۆ کاری هاوبەش، بۆ ئامانجی هاوبەش لەگەڵ یەکێتیو پارتیش بکەینەوە.

KNN: سەبارەت بە سەرچاوەی داراییتان وەك هاوڕێیەك پرسیویەتی دەتوانن، کە هەڵبژاردنەکانی کە لەبەردەمتاندایە بۆ پەرلەمانی عێراقی تەمویل بکەن سەبارەت بە سەرچاوەی دارایی ئێوە چی دەڵێن؟

نەوشیروان مستەفا: ئەمە دو لایەنی هەیە، یەکێکیان ئێمە لە پەرلەمانی کوردستاندا (٢٥) کورسیمان هەیەو یەکێتیو پارتی بە هەردوکیان (٥٩) کورسیان هەیە، ئەگەر (٥٩)کەی ئەوان دابەش بکەین یەکێکیان (٢٩)ی بەردەکەوێتو یەکێکیشیان (٣٠) بەردەکەوێت لە هەردو حاڵەتەکەدا یەکێکیان (٥) کورسیی لە ئێمە زیاترەو یەکێکیشیان (٤) کورسیی، ئەم دو حیزبە هەریەکەی نزیکەی (٣٠) ملیۆن یان زیاتر مانگانە لە بودجەی هەرێمی کوردستان وەردەگرن بۆ مەسرەفی حیزبەکانی خۆیان، ئێمە پرۆژەیەکمان تەقدیمی پەرلەمان کردوە بۆ رێکخستنی یارمەتی دارایی هەمو حیزبە سیاسییەکانو قەوارە سیاسییەکان، ئێمە ئومێدمان وایە ئەمە ا، چەند هەفتەی داهاتودا جێبەجێ بکرێت ئەوساکە یەکێتیو پارتیو هەمو حیزبەکانی دیکەی کوردستان بە گوێرەی ئەو قانونەی، کە لە پەرلەمانی کوردستانەوە دەردەچێت یارمەتی دارایی بدرێن ئێمەش بە قەدەر قەوارەی خۆمان وەکو قەوارەیەکی سیاسیی کەڵك وەربگرین لە بودجەی هەرێمی کوردستان بۆ ئەوەی بتوانین تەمویلی جوڵانەوەکەمان بکەینو مەسرەفی جوڵانەوەکەمان لەلایەن حکومەتی هەرێمەوە بکێشرێت، بەڵام تائێستا ئێمە بۆ خۆشبەختی لەناو میللەتەکەماندا ژمارەیەکی زۆر سەرمایەدارو خێرۆمەندو خەڵکی هۆشیاری تێدایە، کە قازانجیان لەوەدایە گۆڕان لە کوردستانی عێراقدا ببێت بەتایبەتی بازاڕی ئازاد لە کوردستاندا بخوڵقێت بازاڕی ئازاد بەو مانایەی، کە دەستێوەردانی حیزبو حیزبایەتیو مەسئولەکانی حیزبی تێدا نەمێنێت، بەڵێ ئەوانە بە هەمو توانایانەوە پشتیوانی مالیی ئێمەیان کردوەو تەمویلی جوڵانەوەکەی ئێمەیان

کردوه، بۆ ئەوەی ئەو ئامانجە هاوبەشەی کە لە بەینی ئێمەو ئەواندا هەیە، کە ئەویش ئازاد کردنی بازاڕو زانکۆو دادگایە لە دەسەڵاتی حیزب، بەڵێ ئەوانە یارمەتیمان دەدەن.

KNN: ئاسۆی ئایندەی سەرچاوەی دارایی ئێوە تەنیا ئەو پرۆژەیاسایەیە بۆ پەرلەمان؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە ئومێدمان وایە ئەوە بێت بەڵێ.

KNN: باشە ئەگەر نەیانکرد، یاخود دەسەلات بەشداریی پێ نەکردن، یاخود بودجەی نەدانێ چی دەکەن؟

نەوشیروان مستەفا: با ئێمە خۆشبین بین لە پێشدا ئومێدمان وابێت کە دەبێت.

KNN: باشە ئەگەر کردیان‌و بودجەیان پێ نەدان؟

نەوشیروان مستەفا: زۆر شت هەیە ئێمە بیکەین، بەلاّم لە کاتی خۆیدا باسی دەکەین.

KNN: باشە چی دەکەن؟

نەوشیروان مستەفا: زۆر شت هەیە ئێمەش بیکەین وەکو باسم کرد با چاوەڕێ بکەین، با خۆشبین بین‌و ئومێدمان هەبێت بۆ ئەوەی کە ئەو ڕێگەیە دەگرن.

KNN: یەکێك لەو پرسیارانەی، کە چەند هاولاّتییەك بۆی ناردوین باس لەوە دەکات، کە ئەگەر بزوتنەوەی گۆڕان نەهاتایەتە ساحەکە کۆمەڵێك گۆڕانکاریی هەبو رەنگە وەك خۆی بمابایە، یاخود بەو شێوەیە خراپ نەبوایە بەتایبەت سەبارەت بە مەسەلەی تەدەخولاتی حیزب لە هەمو کون‌و قوژبنێکی ژیان‌و مەسەلەی هاتنەپێشەوەی تەزکییە، یەعنی بە کورتی پرسیارەکە ئەوەیە کە لەگەڵ هاتنەوەی گۆڕان جارێکی دیکە بە حیزبی بونەوەی کۆمەڵگە جۆرێك لە تۆخبونەوە تۆخبوەتەوە رای بەڕێزتان؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە پێش ئەوەی دەست بکەین بەم جولاّنەوەیە حیزب تەدەخولی کردبو لە هەمو بوارەکانی ژیاندا تەزکییەی حیزبی‌و دامەزراندنی خەڵك لەسەر بنچینەی حیزبی ببو بە نەریتێك لە کوردستانی عێراقدا، ئەسڵەن

یەکێك لە هۆکاری دروستبونی ئەم جولآنەوەی ئێمە جیاکردنەوەی حیزب بو لە حکومەت، هەر بۆیە خەڵکیش لێمان کۆبوەوە ئەو بۆچونەی کە ئەو برایە باسی کردوە یاخود ئەوەی ئێمە بوەتە هۆی ئەوەی، کە پەراوێزی ئازادی کەمکردوەتەوەو تەدەخولی حیزبیو تەزکییەی زیادکردوە لە کۆنەوە ئەو دو بۆچونە لە جولآنەوەی کورددا هەبوە لە زۆر کۆنەوە لە زەمانی شێخ مەحمودەوە لە زەمانی بارزانییەوە لە زەمانی شۆڕشی نوێو لە زەمانی یەکێتیو پارتیشدا لەناو خەڵکدا ئەم دو جۆرە بۆچونە هەبوە، بۆچونێکیان ئەوە بوە، کە هەمومان بێدەنگ بینو لەگەڵ حکومەتدا بین، ئەگینا توشی زەرەر دەبینو فیعلەن بەهۆی شۆڕشو ئەمانەشەوە زۆرجار توشی ئەوە بوین، خەڵك کوژراوەو دێهات وێران بوەو مزگەوت روخاوەو جادەو رێگەوبان روخاوە یەعنی ئێمە بۆ ئەوەی خەڵك توشی زەرەرو زیان نەبێت نابێت خەبات بکەین، ئەمە شتێکی موئەقەتە ئێمە پێمانوایە" ئەمە شتێکی کاتییە ئەو پرسیارەی کە ئەو برادەرە کردویەتی لەسەر تەزکییەی حیزب راست دەکات، سزادان زیادی کردوە نەقڵ زیادی کردوە دەرکردن زیادی کردوە تەنانەت رێگەنەدان بۆ ئەوەی ئێمە مەقەڕات بکەینەوەو بارەگامان هەبێتو بنکەمان هەبێتو نوسینگەمان هەبێت هەمو ئەمانە دەچێتە خانەی ئەوەوە، کە پەراوێزی ئازادی خەریکە وردە وردە کەم دەکەنەوە بە ئومێدی ئەوەی، کە لە هەڵبژاردنی داهاتودا تۆڵەی هەڵبژاردنی رابردومان لێبکەنەوەو ئەو کورسیانەی ئێمە هێناومانە لێمان بسەننەوە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە ئێمە تەسلیم بینو سەردابنەوێنین.

KNN: سروشتی کردنەوەی بارەگا لای ئێوە چۆنە، ئێستا یەکێتیو پارتی یاخود بەشێکی زۆر لە حیزبەکان لە هەمو گەڕەكو شوێنێکدا بارەگایان هەیە ستراتیژی ئێوە لە کردنەوەی بارەگا چۆنەو بە چ ئالییەتێکە؟

نەوشیروان مستەفا: بێگومان حیزب دەبێت بارەگای هەبێت رێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی مەفروزە بارەگایان هەبێت، بەڵام لە راستیدا کردنەوەی بارەگا بەو شێوەیەی، کە لە ئێستادا هەیە لە هەولێرو دهۆكو سلێمانی

دیمەنێکی زۆر ناشارستانییەو ناشرینە بەتایبەتی لە کۆڵانەکاندا بەو ژمارە زۆرەوە، کە ئێستا هەیە ئێمە بارەگاش بکەینەوە ڕەنگە لە شارە گەورەکاندا بارەگای سەرەکی بکەینەوە نوسینگەیەکی سەرەکی دەکەینەوە بۆ ڕاپەڕاندنی ئیش‌و کارەکانی خۆمان‌و تاکو ئێستا ئێمە لەڕوی قانونییەوە بەپێی ئەو قانون‌و تەعلیماتانەی، کە لە بەغدا ئیشی پێ دەکرێت هەقی ئەوەمان هەیە، کە بارەگا بکەینەوە، کە تائێستا بارەگامان نەکردوەتەوە لە ڕاستیدا لە دوای هەڵبژاردنی ڕابردو وەزارەتی داخلی‌و وەزارەتی ناوخۆ داوایان لێ کردین، کە بارەگاکان دابخەین لە ئەو گفتوگۆیانەی، کە هاوکارەکانی ئێمە کردویانە ئەوانە باسی ئەوە دەکەن، کە ئەمان قانونی تایبەتی خۆیان هەیە، کە پەیڕەوی دەکەن‌و ئەم کارەی پێ دەکەن پەیڕەوی ئەو قانونانە ناکەن، کە لە بەغدایە ئەمەش دیسان دەمانباتەوە بۆ ئەوەی، کە جارێك باسی ئیزدواجییەتی مەعایرمان کرد کاتێك کە لە بەغدا قانون‌و قەرارو نیزام دەردەچێت بۆ زیادکردنی مەعاش‌و موچەی وەزیرو ئەندامی پەرلەمان ئەمانە دەڵێن ئێمە عێراقین، یەکسەر جێبەجێی دەکەن کاتێك قەرارو قانونێك دەردەچێت، کە لە بەرژەوەندی ئەواندا نییە دەڵێن ئێمە کوردستانین‌و قانونی بەغدا جێبەجێ ناکەین، ئەگینا بە گوێرەی پەسەندکردنی کۆمسیۆنی بالای هەڵبژاردنەکان، لە بەغدا گۆڕان وەکو قەوارەیەکی سیاسیی هەقی ئەوەی هەیە، کە لە هەمو شارەکانی عێراقدا بنکەو بارەگای خۆی بکاتەوە، چ بۆ هەڵمەتی هەڵبژاردن، چ وەکو قەوارەیەکی سیاسیی تەنانەت ئێمە هەقی ئەوەمان هەییە موعامەلە بکەین پڕۆژەی بازرگانیی‌و تیجاری‌و ئەوانە بکەین، هەقی موڵکییەتمان هەیەو هەقی ئەو شتانەمان هەیە، بەڵام لێرە پێیان وتوین، کە قانونەکانی کوردستان ڕێگە بەوە نادات ئومێدمان وایە، کە لە ڕێگەی قانونییەوە بتوانین ئەو موشکیلە حەل بکەین.

KNN: سەبارەت بەوەی، کە گۆڕان وەکو نزیکی تا ڕادەیەك نزیکترە لە پارتی‌و قسەیەك هەیە لەسەر ئەوەی، کە بەڕێز نێچیرڤان بارزانی پەیوەندیی بە ئێوەوە

هەبێت، یا پەیوەندیی لەگەڵتان گرتبێت، یا جۆرێك لە نزیكیی هەبێت رای بەڕێزتان؟
نەوشیروان مستەفا: لەسەر ئاستی حیزبی تاكو ئێستا لە نێوان گۆڕانو یەكێتیو لە نێوان گۆڕانو پارتی هیچ دانیشتنێكی رەسمیمان نەبوە لەسەر ئاستی حكومەتیش حكومەت تازە دروست بوە هێشتا نەمانبوە، بەلاّم ئێمە ئومێدمان وایە كە لە ئایندەیەكی نزیكدا لەسەر ئاستی حیزبیشو لەسەر ئاستی حكومەتیش نوێنەرەكانی ئێمە نوێنەری پارتیش ببینەنو نوێنەری یەكێتیش ببینەنو نوێنەری هەمو لایەكانی دیكە ببینن بۆ ئەوەی لەسەر شتە باشەكان بتوانین كاری هاوبەش بكەینو زمانی هاوبەش بدۆزینەوە بۆ ئەوەی بتوانین پێكەوە كار بكەین.
KNN: ئێستاش كۆمەڵێك هەن، كە ئێوە وەكو مونشەق لە یەكێتی تەماشا دەكەن رای بەڕێزتان؟
نەوشیروان مستەفا: ئێمە مونشەق نین لە یەكێتی مونشەق ئەوەیە، كە وەختێك كۆمەڵێك لە حیزبێكدا ژمارەیەكی زۆر جیادەكەنەوە بەناوی هەمان حیزب دەڕۆن ئیش دەكەن، ئێمە بەناوی یەكێتییەوە ئیشمان نەكردوە ئێمە ناومان گۆڕانەو تەنانەت كە لە یەكێتیش هاتوینەتە دەرەوە ئێمە وەكو ئەفراد هاتوینەتە دەرەوە، ئێمە نەچوین وەكو گروپێكی گەورەی مونەزەم، یا وەكو جەناحێك یا وەكو چەند مەڵبەندێك لە یەكێتی بێینە دەرەوە، سەدان هەزار كەسی ئێمە هەر ئەسڵەن یەكێتی نەبون، كە ئێستا لەناو گۆڕاندا كاردەكەن ژمارەیەك لە كادیرەكانی ئێمە راستە لەناو یەكێتییەوە هاتون، بەلاّم ئەوان وەكو ئەفراد هاتونو نە مونشەقنو نە خۆشیان بە مونشەق دەزانن.
KNN: لە دو سێ رۆژی رابردودا یەكێتیی نیشتمانیی كوردستان پلنیۆمی بەست قسەیەكتان هەیە لەوبارەیەوە بیڵێن؟

**نەوشیروان مستەفا: یەکێتی هەقی خۆیەتی کۆنگرە ببەستێت، کۆنفرانس ببەستێت کۆنگرە ببەستێتو کۆبونەوەی فراوان بکات، پلنیۆم بکات، ئێمە تەمەنناى خۆشیان بۆ دەکەینو تەمەنناى سەرکەوتنیان**

# ئەوان وتارێکی نەتەوەیی روکەشیان هەیە

**دیمانە: هوشیار عەبدولاّ**

**کەناڵی ئاسمانی knn لە بەرنامەی روبەڕودا، سەبارەت بە پرسی کورد لە عێراق و چۆنیەتی بەشداری بزوتنەوەی گۆڕان لە هەڵبژاردنە پەرلەمانییەکەی عێراقدا، کۆمەڵێك پرسیاری خەڵك و پرسی پەیوەست بەو مەسەلەیەی ئاڕاستەی نەوشیروان مستەفا کردوە، هاوکات ناوبراو لەو بەرنامە تەلەفزیۆنیەدا رایدەگەیەنێت کە بزوتنەوەی گۆڕان بە لیستی جیا بەشداری ئەو هەڵبژاردنە دەکات و ستراتیژیەتی کاری بزوتنەوەی گۆڕان بۆ بەغدا دەخاتەڕو.**

**Knn: هەڵبژاردنەکانی عێراق بەڕێوەیە ئێوە وەکو بزوتنەوەی گۆڕان هیچ ئامادەکاریتان کردوە؟**

**نەوشیروان مستەفا: بەڵێ ئێمە خەریکی خۆئامادەکردنین بۆ بەشداریکردن لە هەڵبژاردنی داهاتوی پەرلەمانی عێراقدا، بۆ ئەوە لە پێش هەمو شتێکەوە ئێمە قەوارەیەکی سیاسیمان بە ناوی گۆڕانەوە تۆمار کردوە بێجگە لەوە دامەزراوەی هەڵبژاردنمان دروست کردوە، کە ئەوان ئەمجارە وەکو دەزگایەکی پیشەیی سەرپەرشتی کاروباری هەڵبژاردنەکانمان دەکەن، ئێستا خەریکی ئامادەکردنی بەرنامە و پلاتفۆرمی سیاسی و ئامادەکردنی ناوی کاندیدەکانی پەرلەمان نین.**

**Knn: کەواتە بە بایەخەوە سەیری ئەم هەڵبژاردنە دەکەن؟**

**نەوشیروان مستەفا: بێگومان بەلامانەوە کارێکی زۆر زۆر گرنگە، چونکە کوردستان بەشێکە لە دەوڵەتی عێراق، پەرلەمانی عێراقی رەنگە لە هەندێك لایەنەوە گرنگتربێت لە هەڵبژاردن لە پەرلەمانی عێراقیدا رەنگە گرنگتر بێت لە هەندێ لایەنەوە لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان، چونکە لەوێ جۆری**

بەشداریکردنی کورد لە دەزگای بڕیاردانی سیاسی عێراقدا لە دەوڵەتی عێراقدا لە بودجەی عێراقدا لە سیاسەتی دەرەوەی عێراقدا لە جەیشی عێراقیا، پەرلەمان ئەو دەزگایەیە کە لە بەغدا ئەو جۆرە شتانە دیاری دەکا.

Knn: بە شێوەیەکی گشتی وا لە قسەکانت دەخوێنمەوە کە هەڵبژاردنی عێراقیتان پێ گرنگترە لە هەڵبژاردنی کوردستان؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ لە بەرئەوەی پەرلەمانی عێراقی وەکو باسم کرد ئەو دەزگایەیە کە تەشریع بۆ هەمو عێراق دائەنێت، ئەو دەزگایەیە کە ساڵانە میزانیە بە قانون تەسدیق دەکات ئەو دەزگایەیە کە وەزارەتی عێراقی دادەنێت و سەرۆك کۆماری عێراق هەڵدەبژێت، سەرۆکی پەرلەمان هەڵدەبژێرێت، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق هەڵدەبژێرێت، ئێمە لە دەستوری عێراقیدا کۆمەڵێك ماف نەتەوایەتیمان جێگیرکراوە، رەنگە پەرلەمان و وەزارەتی بەغدا ئەو جێگایە بێت کە ئێمە ئەتوانین هەوڵبدەین بۆ جێبەجێکردنی ئەو مافە دەستوریانە.

Knn: بۆ هەڵبژاردنی عێراق بە لیستی جیا بەشداری دەکەن؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ بە لیستی جیا بەشداری دەکەین.

Knn: بەڵام راگەیاندنی نەیارەکانتان لە سەر ئەو بەجیاوازی بەشداریکردنە جۆرێ لە تۆمەتتان بۆ دروست دەکەن کە ئێوە هەوڵ دەدەن خیتابی کوردی پەرت بکەنەوە لەگەڵ شۆفێنەکانیشدا هاوپەیمانێتی ئەبەستن؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ ئەوە بەشێکە لەو پڕوپاگەندە ناڕاستەی کە دژی ئێمە دەکرێت، من لەم دوانگەیەوە گەلەکەی خۆمان ئەکەم بە شایەت بۆ ئەوەی بزانن ئەم تاقمانەی کە ئەم جۆرە بوختانانە بڵاودەکەنەوە تا چ رادەیەك پشت بە درۆکردن دەبەستن، بۆ ئەوەی لەکاتی هەڵبژاردندا ببینن ئایا ئێمە هاوپەیمانێتی لەگەڵ چ لایەنێکدا دەکەین، لەگەڵ چ لایەنێکدا نایکەین لەئێستاوە تاوەکو هەڵبژاردن ئێمە تەنسیق لەگەڵ هەمو ئەو لایەنانە ئەکەین کە بەشداری هەڵبژاردن دەکەن، بۆ ئەوەی کە هەڵبژاردن بە ئارامی تێبپەڕێت، بۆ

ئەوەی بە پاکی و بێگەردی تێپەڕێت، بۆ ئەوەی زۆرترین ژمارەی خەڵك بەشداری بکات لە هەڵبژاردندا، بەڵام بۆ مەسەلەی هاوپەیمانێتی لەگەڵ لایەنی فرەئامێر نە لە کوردستان و نە لە عێراقدا ئێمە لەگەڵ هیچ لایەنێکی تردا حاڵی حازر هاوپەیمانێتی سیاسی ناکەین.

Knn: لەگەڵ هێزە کوردیەکاندا بۆچی؟

نەوشیروان مستەفا: لەگەڵ هێزە کوردیەکاندا لە بەرئەوەی ئێمە وتاری سیاسیمان جیاوازە، لەگەڵ ئەواندا ستراتیجی کارکردنمان لە بەغدا جیاوازە، ئەوان وتارێکی نەتەوەیی روکەشیان هەیە، کە لەگەڵ جێبەجێکردنیدا لەسەر ئەرزی واقیع زۆر جیاوازە لە یەکتری.

Knn: بەڵام ئەم بەجیا بەشداریکردنە لە هەڵبژاردن زیان بە کورد ناگەیەنێت؟ یاخود زیان بە وجودی کورد لە عێراقدا ناگەیەنێت؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە پێمان وایە ئەم لایەنانەی ئێستا زیانی گەورەیان بە کورد گەیاندوە، وایان کردوە سلێمانی و هەولێر و دهۆك دابەش ببێت، دو ئیدارەییان دروستکردوە، تاوەکو ئێستا دو پێشمەرگە دو ئاسایش، زانیاری و پاراستنیش لە لایەکی ترەوە، وەزارەتی مالیە دو وەزارەتە پێشمەرگە دو وەزارەتە ناوخۆ دو وەزارەتە ئەمانە وایان لە کوردستان کردوە، لە کوردستانەوە بڕۆ بۆ کەرکوك کە یەکێکە لە گرنگترین مەسەلەکانی کە بە درێژایی مێژوی هەفتا هەشتا ساڵی رابردوی کورد هەمو پێوەی مەشغوڵبوە، لە کەرکوکیشدا ئەبینی کە دیسانەوە کوردایەتیان نەکردوە بە بەرنامەی کار، یەعنی هاوڵاتیبونی کوردستانیان نەکردوە بە بەرنامەی کار، بەڵکو لەوێش دیسانەوە ئیدارەیان دو بەش کردوە و کردویانە بەئیدارەی دو حیزب، ئاسایشی دو حیزبەکە جیاوازە پۆلیسی دو حیزبەکە جیاوازە تەنانەت لەشکری موچەخۆرەکانیشیان بەشێکی سەربە هەولێرە و بەشێکی سەربە ئیدارەی سلێمانیە، یەعنی بە عەمەلی ئەوان زیانیان بە یەکێتی ریزەکانی کورد گەیاندوە نەك ئێمە، حاڵی حازر شیعەکان بە چەند لیستێك بەشدار دەبـ

عەرەبی شیعە عەرەبی سونە بە چەند لیستێك دائەبەزن، کوردیش ئەگەر بەچەند لیستێك دابەزێت، ئەتوانین ئێمە شتی موشتەرەك لە پاشەڕۆژەدا لە پەرلەمانی عێراق بدۆزینەوە لە بەینی خۆماندا.

Knn: ئەو شتە موشتەرەکە ستراتیجیە ناکرێت لە پێشدا بکرێت؟

نەوشیروان مستەفا: ڕەنگە زۆر کەس ئەو پرسیارەی کردبێت، تۆ چۆن دەتوانیت لەگەڵ هێزێکی سیاسیە پێکەوە بچیتە ناو هاوپەیمانییەکی سیاسیەوە بۆ چوار ساڵی داهاتو، لە کاتێکدا ئەو ڕۆژانە خەڵکت لێدەردەکات، واخەریکە کەرتی پەروەردە وێران دەکەن، بەڕێوەبەرەکان و جێگری بەڕێوەبەر و مامۆستاکان بە ئارەزوی خۆیان بەپێی دەستکەوتی حیزبی ئەهێن و ئەبەن، قایمقام و بەڕێوەبەری ناحیە لە سەربیروبۆچونی سیاسی سزا ئەدەن، پێشمەرگە دەرئەکەن ئاسایش دەرئەکەن ئەفسەر دەرئەکەن، یەعنی چۆن ئەتوانی لەگەڵ ئەمانەدا زمانێکی هاوبەش و بەرنامەیەکی هاوبەشت هەبێت بۆ ئیشکردن، چۆن دەتوانیت باوەڕی پێبکەیت کە لە پاشەڕۆژدا دیسان جارێکی ترلێت هەڵنەگەڕێتەوە.

Knn: باشە دەگەڕێمەوە بۆ یەکێك لە قسەکانت کە باست لەوە کرد کەس ئەوەندەی ئەوان زیانی بەیەك ریزی کورد نەگەیاندوە چۆن؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ من باسم کرد جارێ یەکەم لە کوردستانی عێراقدا کە بە ناو یەك ئیدارەیە لە راستیدا دو ئیدارەیە، یەکێك لەو شتانەی کە ئێمە کاری بۆ ئەکەین ئەوەیە کە چۆن پێشمەرگە و ئاسایش و پۆلیس لە هێزێکی حیزبیەوە بکرێت بە هێزێکی نشتیمانی، واتە بکرێت بەهێزێکی حکومەتی، چۆن وەزارەتی ناوخۆ ببێت بە یەك وەزارەت، وەزارەتی پێشمەرگە ببێت بەیەك وەزارەت، وەزارەتی دارایی ببێت بە یەك وەزارەت، ئەو پەیوەندیەی کە ئێستا ئەم دو حیزبە لەگەڵ بەغدا دروستیان کردوە بە حیزبیکردنە، کێشەی کەرکوکیان بەحیزبی کردوە، لەناو کوردستانیشدا خۆ ئەگەر سەربەیەکێك لەم دو حیزبە نەبیت ناتوانیت پۆستێکی گرنگت هەبێت، لە بەغداش

پەیوەندیەکانی کورد و حکومەتی ناوەندی بەغدایان وا لێکردوە کە کردویانە بە پەیوەندی دو حیزب لەگەڵ حکومەتی مەرکەزی بەغدا، لەکاتێکدا ئەمە پەیوەندی دو نەتەوەیە لە نێوان کورد و عەرەبدا، پەیوەندی نێوان هەرێمی کوردستان و حکومەتی مەرکەزییە، خۆی لەڕاستیدا دەبێت ئەم پەیوەندییە لە نێوان نەتەوەی کورد و حکومەتی مەرکەزیدا بێت لە بەغدا، ئەمە پەیوەندی نێوان دو حیزب نییە لەگەڵ بەغدا.

Knn: باشە ئەگەر دو ئیدارەیی هەیە کۆمەڵێك وەزارەت جیاوازە دو دەسەڵاتی حیزبی هەیە تەنانەت دو هەرێمی سیاسی هەیە، بۆچی ئەوەندە بانگەشە بۆ یەك لیستی دەکەن؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ ئەوانە کە بانگەشە بۆ یەك لیستی دەکەن، بۆ ئەوەیە جارێکی تر سەرلەنوێ بە هێزێکی یەکگرتووەوە لە خزمەتی حیزبەکانی خۆیاندا بێت، ئێستا وای لێهاتوە دەسکەوتی حیزب گرنگترە لە دەسکەوتی نەتەوەیی، لەناو دەسکەوتی حیزبیشدا دەسکەوتی کەسی یەکەم و دەستوپێوەندەکانی خزم و کەسوکارە نزیکەکانی بوە بە شتێکی سەرەکی، ئێمە دەمانەوێت مەفهوم و چەمکی هاولاتیبونی کوردستانی لە کوردستاندا بەبێ ئەوەی گوێ بدەیتە رەچەڵەکی عەشیرەتی بنەماڵەیی ناوچەیی مەزەەبی دینی بێت، واتە چەمکی هاولاتیبون لە کوردستانی عێراقدا جێگیر ببێت.

Knn: باشە ناکرێت بەدوای کۆمەڵێك خاڵی هاوبەشدا بگەڕێن بۆ ئەوەی لانی کەم ئیتفاقێکی لەسەر بکەن، یاخود رێکەوتنێکی لەسەر بکەن؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ ئەکرێت، بەلام وەکو باسم کرد ئەوانە وتارێکی نەتەوەیی روکەشیان هەیە لەسەر ئەرزی واقیع جیاوازە، وەرە با لە ماوەی پێنج ساڵی رابردودا حەق و حسابێك لەگەڵ ئەو سەرکردایەتیانە بکەین، حسابێك لەگەڵ ئەو برادەرانە بکەین بزانین ئەوان چیان کردوە بۆ جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ بۆ گێڕانەوەی ناوچە دابڕاوەکان چیان کردوە، بۆ ئەوەی کە بەشی کورد لە وەزارەتی دەرەوە و لە سەفارەتەکانی عێراقدا نوێنەرایەتی هەرێمی کوردستانی

هەبێ چیان کردوە، بۆ ئەوەی کە هێزی پێشمەرگە لە هێزێکی وەکو ئەوەی ئێستا هەیە لە ملیشیای حیزبی و هێزێکی سەر بەحیزبەوە بکرێت بە هێزێکی نیزامی ئەسلی، لەڕوی چەك و لەڕوی تەدریب و لەڕوی ڕێکخستنەوە چیان کردوە بۆ جێبەجێکردنی مافەکانی کورد کە لە دەستوری عێراقدا، با بێین حەق و حیساب بکەین ئەگەر ئەمانە بەڕاستی لە پێنج سالی رابردودا توانیویانە ئیشی بۆ بکەن بۆ جێبەجێنەکراوە، بەڵام ئەوان ئەوەیان بە لاوە گرنگە کە لە بەغدا کێ پلەوپایە وەردەگرێت چ پلەوپایەك وەردەگرێت، دەسکەوتی مادەی حیزبەکانیان چەندە، ئەتوانن لە ڕێگەی ئەوەوە چەند خزمەت بە حیزبەکانی خۆیان بکەن.

Knn: باشە ببورە تۆ باسی ئەوەت کرد لە بەغدا چیان کردوە با من پرسیارەکە بە درێژتریش دەستنیشان بکەم، وەك ڕۆژنامەنوسێك ئەپرسم یەعنی لە ئاستی کوردستاندا چیان کردوە لانی کەم بۆ بەیەکەوە بەستنەوەی سلێمانی و هەولێر و دهۆك، یەعنی هەست ناکەیت هەمان ئیشکال لێرەشدا ئامادەیی هەیە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ ئێستاش جارێکیکەش باسی ئەوەم کرد کە تۆ ئەگر بتەوێت نەتەوە وەکو نەتەوەیەك پیشان بدەیت، ئەبێت بەجۆرێك هەولدەیت ئینـدماج لـە بـەینی ناوچـە جیاوازەکانـدا دروسـت ببێـت، مەسـەلەن ئـەبێت هەولبـدەین جۆرێـك لـە تێکـەڵاوبونی ئـابوری لەبـەینی سـلێمانی و هـەولێر و دهۆکـدا دروسـت ببێـت، جۆرێـك لـە ئینـدماجی سـەقافی رۆشـنبیری لەبـەینی سلێمانی و هەولێر و دهۆکدا دروست ببێت، جارەکەی تریش باسم کرد، چی ڕێگە لەوە ئەگرێت کە بەڵێندەر و رجال ئەعمالی دهۆکی بێنە سلێمانی ئیش بکەن، هی سلێمانی بڕۆن لە دهۆك و هەولێر ئیش بکەن چی ڕێگە لەوە دەگرێت کە چەند هەزار خوێندکارێکی دهۆکی و هەولێری بێن لە زانکۆکانی سلێمانی بخوێنن و چەند هەزار خوێندکاری سلێمانی و هەولێر لە دهۆك و لە زانکۆکانی تر بن، بۆ ئەوەی تێکەڵاوی دروست بێت چی ڕێگە لەوە دەگرێت، مەسەلەن ئەوان کارێکی وایان کردوە ڕۆژنامەکانی کە لە سلێمانی دەردەچێت لە سنوری

سلێمانی دەربچێت ژمارەیەکی زۆر کەمی لێ بلاودەبێتەوە هی هەولێر بە زەحمەت دەگاتە سلێمانی و دەرور و پشتی سلێمانی هی دهۆك هەر ناگاتە سلێمانی هی سلێمانی ناگاتە دهۆك ئەمە کارێکی وای کردوە کە بوە بەچەند زۆنێك، کە سلێمانی بۆ خۆی شتێکە هەولێر بۆخۆی شتێکە دهۆك بۆ خۆی شتێکە، ئەمە ئێچەوانەی مەسلەحەتی قەومیە، مەسلەحەتی قەومی لەوەدایە کە جۆرێك لە ئیندماج لە بەینی ئەماندا بێت تێکەلاوبون لە بەینی ئەم ناوچانەدا دروست ببێت، بۆ ئەوەی هەندێك لەو سنورانە بسڕێتەوە کە هەست بەناوچەگەرێتی و هەست بە شتێك لەو بابەتانە دەکرێت.

Knn: گەڕانەوەمان بۆ دۆخی هەڵبژاردنەکان، لە قسەکانتانەوە وادەخوێنمەوە کە تۆ کێشەت لەگەڵ ئیتفاق یاخود رێککەوتنی پێش هەڵبژاردن هەیە، یەعنی ممکنە لە داوی هەڵبژاردن بتوانرێت شتێك بکرێت؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ ئێمە خۆمان لە هیچ کەسێك بە کەمتر نازانین، لەڕوی داکۆکی کردن لە مافە نەتەوەیەتیەکانی میللەتەکەمان، لە ئێستا و لە پاشەڕۆژیشدا، ئێمە ئەبینە ئەو هێزەی کە دیفاعێکی سەرسەخت لە حقوقی قەومی میللەتی کورد دەکەین، پێمانوایە لەو بوارە رێگە بە کەس نادەین موزایەدەمان بەسەرا بکات، ئەوان زیاتر لەبەرەو ژوری پێنج ساڵە دەسەلاتیان بە دەستەوەیە لە بەغدا چییان کردوە بۆ ئەو مافە دەستوریانەی کە کورد لەدەستوری هەمیشەیی عێراقدا بە دەستیهێناوە، بۆ جێبەجێکردنی ئەوە مەسەلەن بۆ نمونە ئەتوانین ئێمە لە کتلەی پەرلەمانی خۆمان لە بەغدا بپرسین بزانین ئایا ئەوان بۆ بە رەسمی ناسینی زمانی کوردی بۆ دابینکردنی نوێنەرایەتی هەرێمی کوردستان لە ٧٥ سەفارەتدا ئێستا لە دنیا بلاوبۆتەوە سەفارەتی عێراقی، بۆ رێکخستنی هێزی پێشمەرگە بەشێوەیەکی عەسری لە جەیشێکی نیزامیدا، بۆ گەڕانەوەی ناوچە دابڕاوەکان چەند پڕۆژەی قانونیان تەسلیمی پەرلەمانی عێراقی و ئەنجومەنی وەزیران کردوە و ئەوان رەتیانکردبێتەوە، ئەگەر کردویانە و رەتکرابێتەوە با بۆمان باسکەن ئەگەر

نەشیان کردوە بۆ نەیان کردوە، ئێمە پێمان وایە زۆرتر ئەوانە ئیهتمامیان بە دەستکەوتی حیزبیداوە، وەك لە دەستکەوتی نەتەوەیی.

Knn: کاك نەوشیروان هەمیشە کە باس لەو رەخنانە دەکەیت یاخود کە رەخنەدەگریت قسەیەك لەسەر تۆ هەیە و بەبەردەوامی ئەم پرسیارە ئەکرێت لە ناو خەڵکیشدا هەیە، کە بەرێز نەوشیروان مستەفا تاماوەیەکی زۆر لە سەرکردایەتی سیاسەتی کورد بوە و یەکێك بوە لە دەست رۆیشتوەکان، بەلآم بۆچی لە رابردودا کاری بۆ ئەمانە نەکردوە، یان ئەم شتانەی چاك نەکردوە یاخود هەوڵی بۆ نەداوە؟

نەوشیروان مستەفا: لەهەر قۆناغێکدا منیش و هاورێکانیشم ئەولەویەتمان بە لاوە گرنگە، ئێمە لە دوای ساڵی ١٩٩٢ەوە پڕکردنەوەی ئەو فەراغە ئەمنی و ئیداری و ئابورییەی کە لە کوردستاندا هەبوە و دروستکردن و دامەزراندنی دامودەزگاکانی هەرێمی کوردستان چ پەرلەمان چ حکومەت چ دامودەزگای ئاسایش و پێشمەرگە و. . . ئەوانەمان زۆر بەلاوە گرنگ بو، بۆ ئەوەی ئەو بۆشاییەی کە لە ئەنجامی دەرکرنی دەسەلآتی بەعسدا لە کوردستاندا دروست ببو پڕ بکرێتەوە، بێگومان ئەوە کرا، هەرچەندە بۆ بەدبەختی کورد شەڕی ناوخۆی بەسەرداهات، بەلآم ئەوە جێبەجێکرا لە قۆناغی دوهەمدا قۆناغی ئەوەبو کە لە دەستوری عێراقیدا چۆن ئەتوانین مافەکانی کورد جێبەجێ بکەین و چۆن ئەتوانین هەوڵبدەین کە مافە نەتەوایەتیەکانی گەلی کورد لە عێراقدا لەناو دەستوری دایمی عێراقدا جێگە بکرێتەوە، لەوەشدا تا ئەندازەیەکی باش ئێمە بەشداریمان کردوە، منیش و هاورێکانیشم بەوپەڕی توانامانەوە ئێمە بەشداریمان کردوە لەکاتی نوسینی دەستوردا، توانیومانە کۆمەڵێك لە مافەکانی کورد کەم و زۆر بخەینە ناو دەستوری عێراقەوە لە دوای روخانی رژێمی بەعسی و لە دوای ئەوەی کە بڵێین دەستوری عێراقی نوسراوە، ئێمە پێمان وایە قۆناغێکی تر لە کوردستانی عێراقدا هاتۆتە پێشەوە، ئەویش رێکخستنەوەی ناو ماڵی کوردە، کە ئەو کەموکوڕیانەی لە ئیدارەی کوردیدا لە

کارگێڕی و بەڕێوەبەردنی کوردستانی عێراقدا هەیە ئەوانە چارەسەر بکرێن، سەرلەنوێ ئێمە هەوڵبدەین ناوماڵێکی ڕێکوپێک کە جێگەی ڕەزامەندی زۆرایەتی میللەتەکمان بێت دابمەزرێنین، لەوەو پێشیش ئەنوەندەی من و هاوڕێکانم پێمان کرابێت، پرۆژەمان تەقدیم کردوە و ئقتراحمان کردوە، ماوەیەکی زۆر بە ئومێدی ئەوە بوین کە لەناو حیزبەوە بتوانین گۆڕین لەناو دەسەلاّتیشدا بکەین، ئەگەر گۆڕین لەناو حیزبدا بکرایە ئەوا سەرەتایەك دەبو بۆ گۆڕان لەناو دەسەلاّتدا، بەلاّم بەداخەوە ئێمە نەمانتوانی ئیرادەی گۆڕان لەناو یەکێتیدا نەبو لەبەرئەوە هاتینە دەرەوە لە دەرەوە لەم بزوتنەوەیەدا خۆمان ڕێکخستوە، کە ئێستا بە ناوی بزوتنەوەی گۆڕانەوە کاردەکەین.

Knn: بەلاّم کاك نەوشیروان پرسیارێك هەیە یاخود قسەیەك هەیە بەوەی کە کاك نەوشیروان ڕێگەی زۆری لە بەردەمدا بو کە بیکات یەعنی جیاواز لە بزوتەنەوەی گۆڕان؟

نەوشیروان مستەفا: ڕێگەی تر وەکو چی مەسەلەن؟

Knn: بۆ نمونە باس لەوە دەکرێت کە تۆ لەگەڵ شەخسی بەکەمی یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا کە بەڕێز مام جەلالە پەیوەندیەکی یاخود هاوڕێیەتیەکی دورو درێژتان هەبوە، دەکرا لە ڕێگەی ئەم هاورێیەتیەوە جۆرێك لە چارەسەر بۆ زۆرلە کێشەکان بدۆزرێتەوە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ ئەوە راستە ئێمە ساڵانێکی دورودرێژی تەمەنمان بەیەکەوە لەکاری سیاسیدا بەسەربردوە، بەلاّم لە راستیدا ئێمە کیشەکانمان کێشەی ئاشتبونەوە و زیزبون نیە، یەعنی من لە یەکێك عاجز بوبم بچین ئاشتی بکەینەوە، ئەوە کارێکی زۆر چەوتە ئێمە بمانەوێت کەساندنی کێشەکان بکەین و شەخسەنەی موشکیلەکان بکەین، من پێم وایە ئێمە لەم قۆناغەدا کە باسم کرد لە دوای ساڵی ٢٠٠٥ەوە جۆری فەلسەفەی سیاسیمان بۆ بەڕێوەبردنی

ولآت و جۆری ستراتیجی ئیشکردنەکەمان لە بەغدا جیاوازە، نەمانتوانی جۆرێك لە تێگەیشتنی هاوبەش بۆ ئەو مەسەلانە بدۆزینەوە، بۆیە بەجێمان هێشت، ئەگینا وەکو تر ئێمە کێشەکانمان شەخسی نیە، کێشەکانمان کێشەیەکی سیاسی قانونی و ئیداریە.

Knn: ئەو جیاوازییانە چییە؟

نەوشیروان مستەفا: لە کوردستاندا ئێمە جیاوازین لەسەر جۆری بەڕێوەبردنی ئیدارەی هەرێمی کوردستان، ئەوان ئەیانەوێت دامودەزگاکان بە حیزبی بکەن ئێمە ئەمانەوێت چەمکی هاولآتیبون جێگیر بکەین لە کوردستانی عێراقدا، لە بەغداش ستراتیجی ئێمە وەکو باسم کرد بۆ جێبەجێکردنی مافە دەستوریەکانی گەلی کوردە، جیاوازە لەگەڵ شێوەی کارکردنی ئەواندا، ئەوان زۆر بەلایانەوە گرنگە چ پلەوپایەیەك لە حکومەتدا وەردەگرن شتی تریان بەلاوە گرنگ نیە، یان کارێکی جدیان بۆ نەکردوە، ئێمە لە لای خۆمانەوە ئەبێت هەوڵبدەین لە بەغدا ستراتیجی کردنی ئێمە بریتی بێت لە جێبەجێکردنی مافە دەستوریەکانمان کە لە دەستوردا دیاریکراوە، من بەلامەوە گرنگ نیە کێ پلەیەك وەردەگرێت لە بەغدا عەرەب دەبێت یاخود کورد بە قەدەر ئەوەی کە بە لامەوە گرنگە تا چ حەدێك دیفاع لە حقوقی قەومی کورد دەکات لەناو دەزگای بڕیاردانی سیاسی حکومەتی عێراقیدا.

Knn: باشە لێرەدا کێشەکە لای تۆ کێشەیەکی شەخسی نیە یاخود بە کەسی کردن نیە، ئێستا پرسیارێك زۆر دوبارە دەکرێتەوە ئەگەر ئێوە چون بۆ بەغدا، ئایا ئێوە وەك بزوتنەوە دەنگ دەدەنەوە بە بەڕێز مام جەلال بۆ پۆستی سەرۆك کۆمار؟

نەوشیروان مستەفا: پێموایە جارێ هێشتا زوە وەلآمی ئەو پرسیارە بدەینەوە وەکو باسیشم کرد ئێمە زۆر بە لامانەوە گرنگ نیە کێ چ پلەو پۆستێك لە بەغدا وەردەگرێت بە قەدەر ئەوەی کە بزانین ئەو کەسە دیفاع لە حقوقی قەومی کورد دەکات هەوڵدەدات بۆ جێبەجێکردنی مافە نەتەواتیەکانی کورد.

Knn: دوا پرسیارم کە دیسان پرسیارەکە زۆر هاتوە بۆمان باس لەوە دەکات کە لەم هەڵمەتی هەڵبژاردنەی دواییدا کاك نەوشیروان تێکەڵ بە خەڵك دەبێت و دێتە خوارەوە بۆ ناو خەڵك؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ ئەوە زۆرجار لە خۆشم ئەپرسن ئسلوبی راگەیاندنی ئێمە شێوازی کارکردنی ئێمە لە راگەیاندندا جیاوازە لەگەڵ لایەنەکانی تردا، وەکو لە لایەنەکانی تردا بوە بە عادەت ئەو کاربەدەستانەی کە خەڵك ئەبینن ئەیکەن بە هەواڵی یەکەم، لە تەلەفزیۆن و لە رادیۆ و لە لا پەڕەی یەکەمی رۆژنامەکاندا، ئێمە رۆژی وا هەیە بە دەیان کەس ئەبینین رۆژ هەیە بە سەدان کەس ئەبینین، بەلآم لە لای ئێمە ئەو جۆرە بینینانە قیمەیەکی خەبەری نیە، بۆ گوێگر و بۆ تەماشاکەری ئاسایی لەبەرئەوە ئێمە نایکەین بە خەبەر، ئەگینا ئێمە رۆژانە وەکو باسمکرد بە دەیان بگرە بەسەدان لە چینوتوێژی جیاوازی کۆمەلآیەتی لە سەرانسەری کوردستانەوە ئەبینین تێکەلآویان ئەبین و گوێ لە قسەکانیان دەگرین و موناقەشەیان لەگەڵدا دەکەین، بەلآم خۆ ناکرێت وەك زەمانی قەدیم ئێمە جەولە بکەین.

Knn: ببورە رەنگە زیاتر پرسیارەکە ئەوە بێت کە لە کاتی بانگەشەی هەڵبژاردنەکاندا تێکەڵی کۆڕوکۆبونەوە جەماوەرییەکان دەبیت یاخودنا، یان

ئایا ئەمە پەیوەستە بەخودی خۆتەوە یان بەو ستراتیژەی کە لەلایەن لیستی گۆڕانەوە دادەنرێت.

نەوشیروان مستەفا: ئێمە کۆمەڵێك خەڵکی کە بەراویژ لەگەڵ یەکتردا کار دەکەین، حەزدەکەم ئەوە لێرەدا بەخەڵك رابگەیەنم من بەشێکی زۆری تەمەنم لە خزمەتی میللەتەکەم بەسەربردوە ئێستاش خۆم بە خزمەتکاری میللەتەکەم دەزانم، خزمەتی میللەتەکەم لەچیدا بێت لە تێکەڵاوبونی رۆژانەی مندا بێت کە بچم بۆناو بازاڕ و دوکان بە دوکان بگەڕێم ئەچم ئەیکەم، ئەگەر لەشێوەیەکی تریشدا بێت ئەیکەم، بەڵام ئەمە ئەو کەسانەی بەرنامەی کاری بزوتنەوەی گۆڕان دادەنێن بۆ هەڵبژاردنی داهاتو ئەوان هەرچی بڕیارێکیاندا من جێبەجێی دەکەم

# ئەزمونی حیزبە ستالینییەکان دوبارە ناکەینەوە

سازدانی: هۆشیار عەبدولا

## نەوشیروان مستەفا لەوەلامی پرسیاری هاولاتیاندا:
## زۆرینەی زۆری ئەوانەی لەبزوتنەوەی گۆڕانن خەلکانی دەرەوەی یەکێتین

نەوشیروان مەستەفا، لە دوەم ئەلقەی بەرنامەیەکی کەنالی تەلەفزیۆنی (کەی. ئێن. ئێن)دا بە ناوی (روبەڕو لەگەڵ نەوشیروان مستەفادا) وەلامی ئەو پرسیارانەی دایەوە کە لەلایەن هاولاتییانەوە ئاراستەی کرابون، بەشێکی ئەو پرسیارانە پەیوەستبون بە مەسەلەی هەلوێستی بزوتنەوەی گۆڕانو فراکسیۆنی گۆڕان لە بەرامبەر مەسەلەی نانبڕینی موچەخۆرانی حکومەتی هەرێم بە تۆمەتی دەنگدانیان بە لیستی گۆڕان لە هەلبژاردنەکانی (٢٥)ی تەمموزی ئەمسالدا، یان کارکردنیان بۆ لیستی گۆڕانو ئەو میکانیزمو رێگایانەی دەگیرێنەبەر بۆ چارەسەرکردنی گرفتی ئەو کەسانە بەشێکی دیکەی پرسیارەکانیش پەیوەستن بەوەی بزوتنەوەی گۆڕان بەرەو کوێ؟ بەو مانایەی دوای سەرکەوتنی لە هەلبژاردنی پەرلەمانی کوردستاندا، بۆ لەمەودوا شکلو شێوەی بزوتنەوەکە چۆن دەبێتو چی دەکات.

KNN: ئێوە چ رێوشوێنێك دەگرنەبەر بۆ چارەسەرکردنی گرفتی ئەو کەسانەی لەسەر بزوتنەوەی گۆڕان نانبڕاو کراون؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە هەمو رێوشوێنێکی یاساییو مەدەنی دەگرینەبەر، بێگومان نانبڕینی خەلك کە دەچێتە خانەی سزادانەوە لەسەر بیروباوەڕی سیاسیی ئەمە شتێکە پێچەوانەی مافی مرۆڤە، پێچەوانەی هەمو ئەو یاسایانەیە

که ئێستا له هەرێمی کوردستاندا پەیڕەودەکرێن. لەبەرئەوە ئێمە بە ڕێگەی یاسایی بە ڕێگەی مەدەنی، هەر کارێك پێمانبکرێت دەیگرینەبەر، بەتایبەت فراکسیۆنەکەی ئێمە لە پەرلەمان چالاکییان دەستپێکردوە کە هەوڵبدەن بە ڕێگەی یاسایی ماف ئەو کەسانە بگەڕێننەوە، ئێمە واز لە ماف ئەو کەسانە ناهێنین.

KNN: دەسەلاتیش بڕیاریداوە بەدواداچون بۆ ئەو مەسەلەیە بکات، بەلام ئەگەر دەسەلات بە دەم ئەو داواکارییەی بزوتنەوەی گۆڕانەوە نەچو، ئێوە چی دەکەن؟

نەوشیروان مستەفا: ئەگەر بە دەنگییەوە نەچو دیسانەوە ئێمە بەردەوامدەبین لەسەر هەوڵدانی یاسایی لەسەر گرتنەبەری ڕێگەی مەدەنی، بێگومان ئەوە بە تاوان حیسابدەکرێت نەتیجەکانیشی دەسەلاتدارانی ئێستا تەحەمولی دەکەن.

KNN: ئەمە بۆخۆی جۆرێك نییە لە سزادانی سیاسیی وە ئێوە کاردەکەن بۆ نەهێشتنی هەمو جۆرەکانی سزادانی سیاسیی لە کوردستاندا؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ ئەمە جۆرێکە لە سزادان لەسەر بیروبۆچونی سیاسیی، ئێمە وەکو مەبدەئی دژی ئەوەین هیچ کەسێك لەسەر بیروباوەڕی سیاسیی لە دایرەکانی حکومەتدا سزابدرێت، چونکە حکومەت بە تەنیا موڵکی یەك حیزب نییە، موڵکی یەك لایەن نییە، موڵکی یەك کەس نییە، بەڵکو حکومەت هی هەمو میللەتەکەمانە، بە پارەی هەمو میللەتەکەمان بەڕێوە دەچێت بۆ خزمەتی هەمو میللەتەکەمانە، لەبەرئەوە پێویستە حکومەت جێگەی هەمو کەسێکی تێداببێتەوە سەرەڕای جیاوازی بیرو بۆچونەکانیان بەو شەرتەی لە قانون نەچوبێتە دەرەوە.

KNN: پرسیارێکی دیکە ئەوەیە، ئێوە وەك لیستی گۆڕان لەناو پەرلەماندا دەتوانن چی بکەن، یان چی بگۆڕن لە سیستمی حوکمڕانیدا؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە وەختی خۆی کە بەشداریمان کردوە لە هەڵبژاردندا لەسەر بنەمای موناقەسەی سیاسیی بەشداریمان کردوە لەسەر بنچینەی

دوژمانەیەتی سیاسیی بەشداریمان نەکردوە ئێمە خۆمان بە مونافیس دەزانین، خۆمان بە دوژمن نازانین، بەلام ئەوان بە چاوی دوژمن تەماشای ئێمە دەکەن. لە ڕێگەی پەرلەمانەوە ئێمە کۆمەلێك پرۆژەمان ئامادەکردوە کە وەختی خۆی لە ڕێگەی پەیامەکانماندا بە خەلکمان ڕاگەیاندوە هەر بۆ نمونە لە ماوەی ڕابردودا دو پـرۆژە یاسـای گرنگیـان پێـشکەش بـە پەرلـەمان کـردوە کـە یـەکێکیان پەیوەندی بە بێلایەنکردنی هێزە چەکدارەکانی هـەرێمی کوردستانەوە هەیە، واتا قەدەغەکردنی کاری حیزبایەتی، ڕێکخستنی حیزبایەتی لەناو هێزەکانی ئاسایش و پێشمەرگەو پۆلیسدا، ئەوەی دیکەشیان ڕێکخستنی یارمەتی دارایی بۆ هـەردو حیزبی دەسـەلاتدارو هـەمو حیـزب و قـەوارە سیاسـییەکانی دیکـە لـە هەرێمی کوردستاندا بۆ ئەوەی جۆرێك لە ڕۆشنی بخرێتە ناو بودجەی هـەرێمی کوردسـتانەوە، لەسـەر ئەمـە بەردەوامـدەبن بـەردەوام ئەمانـە پێشکەشدەکرێن، بێگومـان فراکسیۆنەکەی ئێمـە لـە پەرلەمانـدا زۆرایەتییـەکی ئـەوتۆی نییـە کـە بتوانێت بە دەنگدان ئەو پرۆژانە جێبەجێبکات، ئەو پرۆژانە هەموی لە خزمەتی خەلکدایە، لە قازانجی میللەتەکەمانە، بۆ پێشکەوتنی ولاتەکەمانە، بۆ ئەوەیە کە عەدالەتی کۆمەلایەتی لە ولاتەکەماندا جێگیرببێت، بۆ ئەوەیە کە خـەلك لـەم ولاتەدا هەست بەوە بکات کە خاوەنی ولاتەکەی خۆیەتی، هەست بەوە بکات کە هاولاتییـەکی ڕاسـتەقینەیەو خـاوەن ئـەرك و مافـە لـەم ولاتـە. لەبەرئـەوە مـن ئومێدموایە کە هەمو ئەو شتە باشانەی لەلایەن فراکسیۆنی گۆڕانەوە دەخرێتـە بەردەم ئەوانەی دیکە کە بە چاکیانزانی دژایەتی نەکەن، نەك دژایەتی نەکەن، بـەلکو پشتیوانی بکـەن، لـە بەرامبـەر ئەوەشـدا هەرچی پرۆژەیاسـایەك یـاخود هەرچی بەرنامەیەك کە لیستەکانی دیکە هـەیانبێت وە لـە پەرلـەماندا بیهێننـە پێـشەوە کـــە خێـــرو خۆشـــی میللەتـــەمانی تێـــدابێت بێگومـــان لەلایـــەن فراکسیۆنەکەی ئێمەو لەلایەن فراکسیۆنەکەی دیکەشەوە پشتیوانی لێدەکرێت لەبەرئەوە لەو ڕێگەیەوە ئەوەندەی قابیلی جێبەجێکردن بێت جێبەجێی بکەین.

KNN: بەلام هەستناکەیت کە سەرەتاکان دلخۆشکەرنین، بەو پێیەی کە پرۆژەکانی ئێوە هەرچەندە لە بەرژەوەندیی خەلکیش بێت، دواجار زۆرینە رەتیدەکاتەوە؟

نەوشیروان مستەفا: بەلێ ئائێستا وایە، من ئومێدموایە کە وانەبێت وەکو باسمکرد ئێمە لەسەر بنەمای موناقەسەی سیاسیی چوینەتە ناوەوە، بەلام ئائێستا ئەوان وەکو دوژمن تەماشای ئێمە دەکەن هەرچی کەسێك گومانی لێبکەن کە لە دائیرەکانی حکومەت دەنگی بە ئێمە داوە یان پشیوانی لە ئێمە دەکات هەولدەدەن کە تەسفیەی بکەن، کە تەسفیەکردنی سیاسیی لایەنگرەکانی ئێمەیە لەناو دامودەزگاکانی حکومەتی هەرێمی کوردستانو لەناو دامودەزگای پێشمەرگەو پۆلیسو ئاسایش، بەراستی ئەمە پێچەوانەی یاسایەو ئەمە کارێکی زۆر خراپە، سەرەرای ئەوە، ئەوان بەردەوام بوختانو درۆ بۆ ئێمە هەلدەبەستن، جارێك پێمان دەلێن ئەمانە ئینقیلابچین، جارێك پێمان دەلێن ئەمانە دەستی بەغدایان لە پشتە، جارێك دەلێن ئەمانە لەگەل موخابەراتی سوریا دانیشتون کە لە راستیدا ئەمە هەموی بوختانە بۆ چەواشەکردنی بیروڕای گشتیی، ئێمە ئومێدمانوایە کە ئەوان بە چاوی موناقیسی سیاسیی تەماشای فراکسیۆنی گۆڕانو بزوتنەوەی گۆڕان بکەن، نەك بە چاوی دوژمنێکی سیاسیی.

KNN: باشە ئێوە پرۆژەکانی خۆتان تەنیا لە رێگەی فراکسیۆنەکەتان لە پەرلەماندا بەرجەستە دەکەن، یان میکانیزمی دیکەتان هەیە بۆ خستنەڕوی پرۆژەکانتان؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە لە قۆناغی داهاتودا هەولدەدەین کە جۆرێك لە ئەریتی سیاسیی لە کوردستاندا بهێنینەکایەوە کە ئەویش گرێدانی هەولدانی فراکسیۆنی پەرلەمان لەگەل راگەیاندن هەولدانی ناو راگەیاندن ناو میدیای ئازاد لەگەل هەولەکانی سەر شەقامی کوردی واتا هەولدەدەین شەقامو میدیاو

پەرلەمان پێکەوە گرێبدەین‌و بەیەکەوە بتوانن فشارێکی سیاسیی وەها دروستبکەن هەندێك لەو بەرنامانە جێبەجێبکرێت.

KNN: واتا دەتانەوێت ئەوەی پێی دەوترێت شەڕی دیموکراسی یان شەڕی پەرلەمانی ئەو شەڕە بگوازنەوە بۆ شەقام‌و بۆ ناو میدیاش؟

نەوشیروان مستەفا: من ئومێدموایە وشەی شەڕ بەکارنەهێنین جۆرێکە لە ململانێ‌و زۆرانبازی.

KNN: پرسیارێکی دیکە کە ئاراستەتان کراوە لەلایەن ئەو کەسانەوە کە پرسیاریان ناردوە بۆ تۆ لەڕێی ئیمەیلی ئەم بەرنامەیەی کەناڵی (کەی. ئێن. ئێن)ەوە ئەوەیە کە لەسەر چ بنەمایەك نوێنەرەکانتان دەستنیشان دەکەن بۆ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق؟ ئێوە لەسەر چ بنەمایەك کاندیدەکانتان دەستنیشان دەکەن؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە پێمانوایە هەڵبژاردنی کاندید بۆ ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقی وردبینییەکی زۆر زیاتری دەوێت لەوەی بۆ پەرلەمانی کوردستان کراوە، لەبەرئەوەی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقی پەرلەمانێکی تێکەڵ‌و پێکەڵە، کەسانێکی تێدایە کە دۆستی کوردن پشتیوانی لە مافەکانی گەلی کورد دەکەن لەهەمانکاتدا کەس‌و کیتلەی وەهای تێدابێت کە حەزیان لەوە نییە کورد بە مافەکانی خۆی بگات رەنگە دژی زۆر لە بەرنامەکانی کورد بوەستنەوە لەبەرئەوە هەڵبژاردنی پاڵێوراوەکان بۆ ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق وردبینییەکی وەهای دەوێت لەپێش هەمو شتێکەوە دەبێت بە باشی شارەزایی زمانی عەرەبی بێت، دەبێت مرۆڤێکی ئازاو بوێربێت، دەبێت خاوەنی رابردویەکی پاکبێت، دەبێت لە بوارێکی دیاریکراودا شارەزاییەکی باشی هەبێت، دەبێت لەو کەسانەبێت کە سورە لەسەر بەدەستهێنانی مافەکانی میللەتی کورد لەسەر مەسەلەی دیموکراسی لەسەر مەسەلەی فیدرالیزم، واتا پابەندبێت بە مافەکانی گەلی کوردەوە لەهەمانکاتدا بتوانێت زۆر بە ئازایانەو

زۆر بە مەنتقو بەپێی یاسا بەرگریی لە مافە نەتەوەییەکانی میللەتەکەمان بکات لەناو پەرلەماندا.

KNN: بەشی دوەمی پرسیارەکە باس لەوە دەکات، ئێوە بۆ دیاریکردنی کاندیدەکانتان بۆ پەرلەمانی کوردستان زۆر وردنەبون بەتایبەتی لە عادالەتی لەبەرچاوگرتنی ناوچە جیاوازەکان؟

نەوشیروان مستەفا: رەنگە لە هەندێك ناوچەی بچوکدا ئەوە رویدابێت، بەلاّم ئەو بیستو پێنج کەسەی کە چونەتە ناو پەرلەمانەوە پێموایە نوێنەرایەتی بەشی زۆری هەرێمی کوردستان دەکەن، رەنگە ئەو ناعەدالەتییە کە رویداوە هۆکارەکەی بە پلەی یەکەم بگەڕێتەوە بۆ یاسای هەڵبژاردن لە کوردستاندا کە کوردستانی کردوە بە یەکبازنە، وە لەهەمانکاتدا کردوشیەتی بە لیستی داخراو، رەنگە ئەگەر ئێمە لە پاشەڕۆژدا لە ئایندەدا بتوانین بە هاوکاری لەگەڵ فراکسیۆنەکانی دیکەی ناو پەرلەمان گۆڕانکارییەك لە یاسای هەڵبژاردندا جێبەجێبکەین بە قازانجی ئەوەی کە کوردستان چەند بازنەیەك بێت یان لیستەکە لیستێکی کراوەبێت، رەنگە ئەو کاتە بتوانین زۆرتر عەدالەت لەو مەسەلەیەدا جێبەجێبکەین. ناوچەی وەها هەیە ئێمە نازانین چەند دەنگ دەهێنین هەتاوەکو بزانین چەند کەسی بۆ دابنێین، بەلاّم رەنگە بۆ هەڵبژاردنێکی دیکە ئێستا بەرچاومان رۆشنەو لە هەڵبژادنی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقدا باشتر دەزانین لە چ ناوچەیەکدا نفوزی ئێمەی تێدا بەهێزترە لە چاو چ ناوچەیەکی دیکەدا، لەهەمانکاتیشدا پێموایە هەمو ئەوانەی چونەتە ناو پەرلەمانەوە خەڵکی شایستەو لێوەشاوەنو دەتوانن نوێنەرایەتی نەك هەر ناوچەکەی خۆیان، بەڵکو نوێنەرایەتی هەمو هەرێمی کوردستانو خەڵکی کوردستان بکەن.

KNN: باشە، بەشێکیشی پەیوەندی بە کاری سیستماتیزەکراوەوە نییە، بەو پێیەی کە ئێوە بیرتان لەوە نەکردوەتەوە کە لەم هەڵبژاردنانە دەزگایەك یاخود ئۆرگانێکتان هەبێت ئەم شتانە رێکبخات؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ لە هەڵبژاردنی پێشودا ئێمە نە حیزببوین، نە دامودەزگایەکی وەهامان هەبو کە بتوانین بەشێوەیەکی رێکخراو بچینە ناو هەڵبژاردنەکەوە، ئێستا ئێمە چەند دەرسێکمان لە هەڵبژاردنی رابردو وەرگرتوە، هەوڵدەدەین لەم هەڵبژاردنەی عێراقدا سود لەو دەرسانە وەربگرین، یەکێك لەوانە ئێمە پێشتر دەزگایەك یان دامەزراوەیەکمان نەبو بە ناوی دامەزراوەی هەڵبژاردن، ئەمجارە ئێمە دامەزراوەیەکمان پێکهێناوە لە سلێمانیو لە هەولێرو لە کەرکوك بەناوی دامەزراوەی هەڵبژرادنی گۆڕان کە ئەوان لایەنی تەکنیکیو یاسایی پرۆسەکە دەگرنە ئەستۆی خۆیان، رەنگە بەو هۆیەوە ئەرکی سەرشانی ئێمە زۆر ئاسانتر بێت لەچاو جاری پێشو بەتایبەتی ئێوە خۆتان ئاگادارنو دەزانن جاری پێشو ئێمە کە چوینە هەڵبژاردنەوە هەتا ئەو کاتەی کە لیست دروستکراوە ئێمە لە هیچ جیگەیەك بارەگامان نەبوە لە هیچ جێگەیەك نوێنەرمان نەبوە لە هیچ جێگەیەك لیژنەو کۆمیتەو دامودەزگامان نەبوە، خەڵك پشتیوانی لێکردینو بزوتنەوەیەکی خۆإسکی جەماوەری بوە بزوتنەوەیەکی عەفەوی بو کە پشتیوانیان لە بەرنامەکەی ئێمەکرد لەم هەڵبژاردنەدا ئێمە هەوڵدەدەین خۆمان رێکبخەین سەرەتایی رێکخستنەکەشمان بەوە دەستپێکردوە کە دەزگایەکی یان دامەزراوەیەکی پرۆفیشناڵمان بۆ کاروباری هەڵبژاردن دروستکردوە.

KNN: پرسیارێکی دیکە کە بۆ ئێوە هاتوە ئەوەیە کە بیرتان لەوە نەکردوەتەوە لەگەڵ سەرکردەی باڵای پارتە سیاسییەکانی کوردستان دابنیشنو گفتوگۆ بکەن بۆ ئەوەی کە ستراتیژی کاری سیاسیی خۆتانی بۆ رونبکەنەوە تۆ لە دیداریی پێشودا وتت: "ئێمە هێزێکین بە تەنیشت ئەوانەوەو بەدیلی ئەوان نین"، پرسیارەکە ئەوەیە کە ئێوە بیرتان لە گفتوگۆکردن لەگەڵ ئەوان نەکردوەتەوە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ بیرمان لێکردوەتەوە، بەڵام هەتاکو ئێستا ئەوان هەڵوێستیان وەکو باسمکرد هەڵوێستێکی دوژمنانەیە، هەتا ئێستا بەردەوامن

لەسەر نانبڕینی خەڵك تائێستا بەردەوامن لەسەر هەڕەشەکردن لە خەڵك تائێستا بەردەوامن لەسەر ئەوەی کە سزای سیاسیی خەڵك بدەن لەهەمانکاتدا بەردەوامن لەسەر بلاوکردنەوەی پڕوپاگەندەی ناڕاست دژی ئەم بزوتنەوەیەی ئێمە هەر وەختێك ئەوان هەڵوێستیان لفەو مەسەلانە گۆڕا ئێمە لەم وڵاتەدا دەژین لەگەڵ دەسەڵاتدارانیشدا گفتوگۆ دەکەینو قسەدەکەینو هەوڵدەدەین زمانێکی هاوبەش بدۆزینەوە.

KNN: واتا هەڵوێستی ئێوە پەیوەستە بە سیاسەتەکانی ئەوانەوە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ بەندە بە هەڵوێستی ئەوانەوە بەرامبەر بە ئێمە ئەگەر هەڵوێستیان لە ئێمە هەڵوێستی گفتوگۆکردنو زمانی هاوبەشو لەیەکگەیشتن بێت بێگومان ئێمە ئەو ڕێگەیەمان پێ پەسەندە، خۆ ئەگەر لەسەر دوژمنایەتی بەردەوامبن ئەوان چاوەڕێی ئێمە نەکەن ئێمە هەرچییەکیان کرد باشیانکردو خراپیانکرد ئێمە لە پەرلەمان یان لە دەرەوەی پەرلەماندا چەپڵەیان بۆ لێبدەینو دەستخۆشیان لێبکەین، بێگومان ئەگەر شتی خراپیانکرد دەچینەوە بە گژیاندا، بە ڕێگەی دیموکراتیی.

KNN: بزوتنەوەی گۆڕان چی بەسەر دێت؟

نەوشیروان مستەفا: ئەوە پرسیارێکی زۆر بە جێیە، لەلایەن زۆر زۆر خەڵکیشەوە ئەو پرسیارەمان لێدەکرێت، بزوتنەوەی گۆڕان وەکو قەوارەیەکی سیاسیی لەلایەن کۆمسیۆنی باڵای هەڵبژاردنەکانەوە جارێك پەسەندکراوە ئەمجارەش پەسەندکردنەکەی تازەکراوەتەوە، ئێمە بۆمان هەیە لە ڕوی یاساییەوە وەکو قەوارەیەکی سیاسیی کاربکەین، وەکو قەوارەیەکی سیاسیی لە چەند هەفتەی داهاتودا خۆمان ڕێکدەخەین، هەوڵدەدەین چەندین ڕایەڵەو تۆڕی جیاجیا بۆ پەیوەندیکردن لەگەڵ چینو توێژە کۆمەڵایەتییەکانی ناو کۆمەڵی کوردەواری کوردستانی عێراقو ڕەوەندی کوردی لە دەرەوەی وڵات دروستبکەین، بۆ ئەوەی ئەمجارە وەکو قەوارەیەکی وەکو هێزێکی سیاسیی ڕێکخراو بچینە ناو ململانێی هەڵبژاردنەوە.

KNN: بەشی دوەمی پرسیارەکە دەڵێت دەبنە فۆڕمی پارتێکی سیاسیی دیاریکراو؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە بە هیچ جۆرێك ئەزمونی حیزبە ستالینییەکان دوبارە ناکەینەوە حیزبی هەرەمی دروستناکەینو بە نیازنین لاسایی ئەو حیزبە تەقلیدیانە بکەینەوە کە لە کوردستاندا حیزبایەتیانکردوە بە سەرچاوەی ژیان بۆ موچەخۆرو کردویانە بە ئامرازێك بۆ ئەوەی خەڵك ناچاربکەن لەگەڵیاندابێت لە کوردستاندا حیزبە سیاسییەکان ئێستا لەم زەمانەدا تەجنیدی ئیجباری عەسکەری نەماوە جاران هەرچی تەمەنی بگەیشتایەتە (١٨) ساڵ ناچاربو ببێتە سەرباز، ئێستا لە جیاتی تەجنیدی ئیجباری عەسکەری، تەجنیدی ئیجباری سیاسیی هەیە. ئێمە دژی ئەو سەرەتایەینو پێمانوایە سەردەمی حیزبە ستالینییەکان بەسەرچوە. ئەو سەردەمە بەسەرچوە کە تۆ هەوڵبدەیت لەسەر شێوەی سوپایەك حیزبێکی سیاسیی دروستبکەیت لە هەمو کونو قوژبنو کۆڵانێکدا بارەگات هەبێت بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی کۆمەڵگە بکەیو لەو رێگەیەوە لەشکرێك لە موچەخۆری بێئیش لەناو بارەگاکانی خۆتدا کۆبکەیتەوە ئێمە ئەو ئەزمونە دوبارە ناکەینەوە، ئێمە ئومێدمانوایە کە ئەزمونێکی تازە بهێنینەناو کوردستانی عێراقەوە کە ببێت بە جێگەی پەسەندکردنی کۆمەڵانی خەڵك. خەڵك کاری سیاسیش بکاتو لەهەمانکاتدا پیشەی تایبەتی خۆیشی هەبێت سەرچاوەی ژیانی تایبەتی خۆی هەبێت.

KNN: بەشێکی دیکەی پرسیارەکە باس لە پەیوەندی نێوان ئێوەو یەکێتی دەکات، بەوەی کە ئێوە جیادەبنەوە لە یەکێتی یان جیانابنەوە، یان بەشێکن لە یەکێتی، یان بەشێك نین لە یەکێتی؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە لە یەکێتی جیانەبوینەتەوە، بەشی هەرە زۆری ئەو کەسانەی لە بزوتنەوەی گۆڕاندا کۆبونەتەوە ئەسڵەن یەکێتی نەبون، ئەگەر لە یەکێتیش بون لە یەکێتی هاتونەتە دەرەوە ئەوە موشکیلەی خۆیانە ئێمە خۆمان بە مونشەقو بە جیابوەوە نازانین بزوتنەوەیەکی جەماوەریی فراوان کە

پایەگایەکی فراوانی هەیە لە کوردستاندا، خەڵکی تێدایە کە کاتی خۆی کادیربوە لەناو ریزەکانی یەکێتیدا یان ئەندامبوە لەناو ریزەکانی یەکێتیدا، بەڵام ئێستا هاتوەتە دەرەوە هەروەها لەناو حیزبەکاتی دیکەش خەڵك هەبون هاتونەتە دەرەوە، بەڵام بەشی زۆری هێزەکەی ئێمە کە لێمانکۆبوەتەوە لەو کەسانەن کە پێشتر یان لە هیچ حیزبێکدا نەبوە، یان بێلایەن بوە، یان تازە هاتوەتە ناو ریزی جوڵانەکەوە لەبەرئەوە یەکێتیمان بۆ خاوەنەکانی خۆی بەجێهێشتوە.

KNN: دوابەشی پرسیارەکە ئەوەیە: دواجار پێویستییەکی حەتمی نییە ئێوە لە چوارچێوەی پەیکەرێکدا خۆتان رێکبخەنەوە، بۆ ئەوەی بزوتنەوەی گۆڕان پەرش‌و بڵاونەبێت؟

نەوشیروان مستەفا: من باسمکرد، وتم ئێمە وەکو قەوارەیەکی سیاسیی حەقی کارکردنمان هەیەو خۆمان رێکدەخەین‌و بەم نزیکانە لە شارە سەرەکییەکانی کوردستانی عێراقدا بارەگا دەکەینەوەو دەستدەکەین بە کاری رێکخستنی خۆمان، لە رێگەی کۆمەڵێك لە شەبەکەی پەیوەندییەوە.

KNN: پرسیارێکی دیکە ئەوەیە، بۆچی نەوشیروان مستەفا کۆمەڵەی رەنجدەران زیندوناکاتەوە لەبری ئەوەی بەدیلێکی دیکە دابنێت؟

نەوشیروان مستەفا: وابزانم هەر قۆناغێك‌و هەر سەردەمێك پێویستی بە شێوەیەکی دیاریکراوی رێکخراوەیی هەیە، پێموایە کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان لە قۆناغی خۆیدا دەورێکی گرنگ‌و سەرەکیی‌و کاریگەریی لە مێژوی میللەتەکەماندا بینی ئەو قۆناغە تێپەڕی ئێستا قۆناغێکی تازەیە، پێویستیمان بە فۆرمێکی نوێ بە ناوەرۆکێکی نوێ، بە بەرنامەیەکی نوێ، بە سەرکردایەتییەکی نوێ، بە شێوەیەکی ئیشکردنی نوێ هەیە، من ئومێدموایە، ئەو کەلێنەی کە ئێستا لە کوردستانی عێراقدا هەیەو زۆر لە دڵسۆزەکان‌و لەو ئەندامە کۆنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەران باسی ئەوە دەکەن کە کۆمەڵە

زیندوبکرێتەوە، من پێموایە ئەو قۆناغە بە سەربەرزییەوە ئەرکەکانی خۆی بەجێهێناوە، ئێستا قۆناغێکی تازەیەو ئەرکی تازەمان لە ئەستۆدایە.

KNN: بەشێکی زۆر لەو پرسیارانەی نێردراون بۆ ئەم بەرنامەو دیدارەیە پەیوەستن بە مەسەلەی نانبڕینو ئەو سزا سیاسییەی کە تۆ باستکرد، تۆ خۆت پەیامت چییە بۆ ئەو نانبڕاوانە، یان ئەوانەی کە لەسەر بزوتنەوەکەی ئێوە سزایەکی سیاسیی دراون کە دەتوانرێت بوترێت مۆدێلێکی تازەی سزادانە؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە ئەو بەرنامەیەی کە هەمانبوە بەرنامەی گۆڕان بوە، بەرنامەی گۆڕانێکی سیاسیی بنەڕەتی بوە لە کۆمەڵی کوردەوارییدا، ئێمە بەڵێنمان بە میللەتەکەمانداوە کە ئیشبکەین بۆ ئەوەی سیستمی حوکمڕانی لە کوردستانی عێراقدا بگۆڕین، ئیشبکەین بۆ ئەوەی شێوەی بەڕێوەبردنی وڵات بگۆڕین، ئیشبکەین بۆ ئەوەی کە ئەدائی حکومەت بگۆڕین، ئیشبکەین بۆ ئەوەی کە ئەدائی پەرلەمان بگۆڕین، ئیشبکەین بۆ ئەوەی کە وڵاتەکەمان لە قۆناغێکەوە بچێتە قۆناغێکی خۆشترو باشترو پێشکەوتوتر لەوە هەمو گۆڕانێك لە دنیادا نرخی خۆی هەیە هەمو هەوڵو تێکۆشانێك باجی خۆی هەیە، پێموایە ئەو سزا سیاسییەی کە ئێستا دەسەڵاتداران دەیسەپێنن بەسەر چاکەکانو بەسەر لایەنگرەکانی ئێمەدا، لە راستیدا ئەوە بەشێکە لەو نرخەی کە تێکۆشەرەکانی میللەتەکەی ئێمە ئەمڕۆ لە نرخی گۆڕینی سیستمی سیاسیی، سیستمی ئابوریو سیستمی کۆمەڵایەتی دەیدەن وە من بە شانازییەوە باسی ئەوە دەکەم چالاکەکانی میللەتەکەمان بەرگەی ئەوەیانگرتوەو خۆڕاگرییەکی بێوێنەیان پێشانداوە کە ئامادەنەبون لەپێناوی موچەیەکی بچوکدا تەنازول لە بیروباوەڕی سیاسییو لە مەبدەئی خۆیان بکەن، بێگومان ئەم عەقڵییەتەی کە ئێستا عەقڵییەتی سزادانی سیاسییە، ئەمە پاشەڕۆژی نییە، ئێستاشی نییە، نەك ئایندە، ئەمە وەکو پەلەقاژەوایە پێشموایە ئەم پەلەقاژەیەش دادەمرکێتەوە چ زو بێت چ درەنگ بێت.

KNN: دەتەوێت بڵێی ئەو ئامانجەی کە لەپشت سزای سیاسییەوەیە کە ترساندنی لایەنگرانی بزوتنەوەی گۆڕانە سەرناگرێت؟

نەوشیروان مستەفا: بێگومان سەرناگرێت، سەدان هەزار کەس لەم بزوتنەوەیە کۆبوەتەوە نانبڕینی چەند هەزار کەسێك ناتوانێت میللەتێك چاوترسێن بکات. میللەتەکەی ئێمە گۆڕینی دەوێت، لەبەرئەوە بە سزادانی چەند هەزار کەسێك میللەت چاوترسێن نابێت، ئێمە لە سەردەمێکدا هەفتەی وا هەبوە سەدان کەسیان لێ ئیعدامکردوینو هەڵیانواسیوەو لەسێدارەیانداوە لەسەر جادەی شارەکان خەڵکیان بە ریز گوللەباران کردوە میللەتەکەمان چاوترساو نەبوە ئێستا بە نانبڕینو بە دەرکردنو بەوانە چۆن چاوترسێن دەبێت.

KNN: واتا ئەو بۆچونەی کە پێیوایە، ئەمارەی کە گۆڕان هات مۆدێلێکبو، بەڵام ئەمجارە کە دێت رەنگە بەم حەماسەوە نەبێتو لەلایەن تۆوە رەتدەکرێتەوە یان راتچییە؟

من پێموایە هەڵبژاردنی داهاتو ئێمە سەرکەوتنی سیاسیی گەورەتر بەدەست دەهێنین، پێموایە گەلەکەمان پەشیمان نەبوەتەوە لەوەی کە دەنگی بە ئێمەداوە، بەپێچەوانەوە بەشێك لەوانەی کە دەنگیان بە ئێمە نەداوە پاش ئەوەی کە ئەو روداوانەی کوردستانی عێراقیان بینیوە ئێمە لایەنگرمان زۆرتربوە، دەیشیبینین ئەوە لەبە

# لایەنگری حوکمی لامەرکەزیم لە کوردستاندا

سازدانی: ئارام سەعید

نەوشیروان مستەفا بڕوای وایە لەلایەن خەڵکی سلێمانیەوە گلەییان لێدەکەن کە ماوەیەکی زۆر زیاتر لە (١٠) ساڵ حوکمڕانی ئیدارەی یەکێتی هەموی لە سلێمانی بوەو بەشێك لەوانەی کە کاربەدەست بون دەسەڵاتداربون لە دامودەزگا حکومەتی و حیزبیەکاندا ئیستغلالی پلەو پایەی سیاسی خۆیانیان کردوە بۆ هەندێك مەبەست.

ئەوەش ڕەتدەکاتەوە کە سلێمانچێتی کردبێتو دەڵێت: ئەگەر لە هەولێریش بومایە لەوانەبو هەر بەو تەریقەیە پێم بڵێن کە هەولێرچییایەتی دەکات و لە دهۆکیش بومایە پێم بڵێن دهۆکچییەتی دەکات.

لەم چاوپێکەوتنەدا تەئکید دەکاتەوە کە لایەنگری حوکمی لامەرکەزییە لە کوردستانداو دەڵێت: باوەڕم وایە دەبێت هەمو پارێزگایەکیش مافی بڕیاردانی چارەنوسی خۆی هەبێت، بەڵام لە کوردستاندا ئێمە لایەنگری ئەوەین کە هەرێمی کوردستان هەبێتو یەك یەکەی فیدراڵی بێت.

KNN: چ جۆرە شێوازێکی حکومڕانی لە کوردستاندا بە پەسەند دەزانن، واتە شێوازی مەرکەزی یا لامەرکەزی؟

نەوشیروان مستەفا: پێموایە جارێکیکەش ئەم مەسەلەیەم باسکردوە لە ئیداردا دو جۆرە شێوەی بەڕێوەبردن هەیە شێوەی بەڕێوەبردنی ستونی یا عەمودی ئەوەی تریش پێی دەوترێت شێوەی بەڕێوەبردنی ئوفوقی یا خود ئاسۆیی لە شێوەی بەڕێوەبردنی عەمودیدا، ئەوە جۆرێکە لە حوکمڕانیی مەرکەزی، لە حکومڕانیی مەرکەزیدا هەمو دەسەڵاتەکان کۆدەکرێنەوە لە مەرکەزدا، لەوێوە هەمو لاکان بەڕێوەئەبرێنو ئەوانی تر هەمو تابعی ئەون، لە بەڕێوەبردنی

ئاسـۆیی دا دەسـەڵاتەکان دابـەش دەکـرێن لـە بـەینی ناوەنـدو لـە بـەینی شوێنەکانی تردا لە بەینی جێگایەك‌و جێگایەکیتردا، بەڵام من خۆم لەگەڵ ئەوەم کـە لامەرکەزیـەت هـەبێت لەگـەڵ ئـەوەدام کـە دەسـەڵاتەکان بـە ئاسـۆیی دابـەش بکرێن بەسەر جێگای جیا جیاو دەسەڵاتی جیاجیاو ناوەندی جیاجیا، نـەك لـە یـەك ناوەندێکـەوە بێگومـان ناوەنـدێك هـەموی بـەڕێوەدەبات ئیـداری هـەموی دەکات، بەڵام من لایەنگری حوکمی لامەرکەزیم لە کوردستاندا.

KNN: کاك نەوشیروان کورد لە بەغدا زۆرکات بەرگری لە فیدراڵیەت دەکات بۆ عێراق کە ئەویش پێویستی بە شێوازێکی حکومڕانی لامەرکەزی هەیە، بەڵام لـە کوردستان پیادەی مەرکەزیەت دەکات؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، جا ئەوە ئێستاش کورد موتەهەمـە بەوە کـە شتێك هەیـە لـە ژیـانی سیاسـی و لـە پەیوەنـدی نـاو دەوڵەتانـدا کـە پێـی دەڵـێن دو پێوانـەیی یـاخود بـە ئینگلیـزی پێـی دەڵـێن دەبڵـستاندارد ئـەوەی کـە عـەرەب تەرجومەی کردوە بە ئیزدواجیەتی مەعایر یا ئیزدواجیەتی مقاییس، بێگومان ئـەوە لـە شەخـسیەتی عێراقیـدا عـەلی وەردی باسـی کـردوە، کـە شەخـسیەتی ئینـسانی عێراقـی جۆرێـك لـە ئیزدیواجیـەتی تێدایـە، دوانـەیی تێدایـە، ئـەو دوانەییـە عـەلی وەردی باسـی کۆمـەڵگای عـەرەبی تێدایە دەیگێڕێتـەوە بۆ ئـەو ئیزدواجیەتییە لایەکی ژیانی بەدەوییە لایەکەی تری ژیانی حەزارییە، ئەوەش وایکـردوە لـە دەرونـی ئینـسانی عێراقیـدا جۆریـك لـە ئیزدواجیـەت هـەبێت، بەداخـەوە حکـومڕانی سـەردەمی بەعـسیش کـارێکی وایکـردوە لای تـاکی کوردیش جۆرێك لە ئیزدواجیەتی کە من نـاوم نـاوە ئیجدواجیـەتی شەخسیەتی یەعنی دو شەخسیەتی دو کەسیەتییە لە زەمانێکدا وابوە وشەکانی وەکو کە بە کەسـێکت بکوتبایـە ئـەوە کەسـێکی دو روە یـا کەسـێکی دو زمانـە یـا ئەمـە کابرایـەکی دوسـەرە بـە دو سـەر ئـەڕوات ئەمـە جنێـوێکی قـورس بـو، بـەڵام لـە ڕژێمی بەعسیدا کە بەعس غەدری لە خەڵك دەکردو زوڵمی لە خەڵك دەکردو خـەڵکی دەکوشـت و ئیجبـاری دەکـرد بـڕوات لەگـەڵ ڕژێمـی بەعـسی بێـت و

مەجبوربو بە رو لەگەڵ بەعسیەکاندا ستایش بکات و لەگەڵیاندا بڕوات بەڕێگاداو پێیان بڵێت باشەو بەسەرچاو بڵێت هەمو قسەکانی تۆ باشەو لە پاشملەش جنێوی پێدەدان و لە هەندێك حاڵەتیشدا دەچو ڕێکخستنی نهێنی دەکرد ئەمەش کارێکی وایکردوە فیعلەن دو رویی ببێت بە بەشێك لە ژیانی ڕۆژانەی خەڵك و دو زمانی، لەوێ بە جۆرێك قسە بکات و بە نهێنی بە شێوەیەکی تر قسە بکات لەدوای ڕاپەڕینەوە حیزبە کوردیەکان لە ڕاستیدا لەباتی ئەوەی هەوڵ بدەن کە ئەمە نەمێنێت ئەمەیان قوڵ کردەوە کە ئێستا دەیبینن جۆرێکە لە نیفاقی سیاسی مونافقین لە دین دا تەنیا بۆ نەفسی زەلامەکە خۆی زەرەری هەیە بۆ نمونە ئینسانێکی مونافیق دینی پکەوێتە خەتەرەوە باوەری بکەوێتە خەتەرەوە لە ڕۆژی قیامەتدا خودا سزای دەدات، بەڵام مونافقی سیاسی لەم دونیایە زەرەری بۆ هەمو خەڵك هەیە، ئیجدواجیەتی مەعایر ئەوەی کە تۆ بۆ شوێنی شتێك داوابکەیت، بەڵام بۆ خۆت شتێکیکە داوابکەیت، بێگومان ئەوە جۆرێکە لە ئیجدواجیەتی مەعایر کە لە وڵاتەکەی ئێمەدا هەیە، بەڵێ ئێمە لە بەغدا داوا دەکەین کە لامەرکەزیەت هەبێت، بەڵام لە کوردستاندا داوا دەکەین مەرکەزیەت هەبێت، لەوێ داوا دەکەین تەعەدودیەت هەبێت لێرە نیزامی حیزبی واحد هەبێت بۆ خەڵکی تر کۆمەڵێك شت داوایان لێدەکەین لای خۆمان ئەوە جێبەجێ ناکەین یانی هەتا ئەگەر ئێوە سەرنجی خێزانی کورد بدەن بەشێك لەو پیاوانەی کە لەناو خێزانی کورددا دەژین خۆیان بە پێشکەوتوخوازو لایەنگری ماف ئافرەت و ئەو جۆرە شتانە دەزانن، بەڵام کە دێتە ناو خێزانەکەی خۆیدا ڕەفتارێکی جیاواز ئەکات بێگومان ئەمە ئەو دو کەسیەتەیە کە لە یەك کەسدا ئەبینرێت بۆیە ئەوە لە سیاسەتی کوردیشدا پەیڕەوی دەکرێت ئیزدواجیەتی مەعایر لە سیاسەتی کوردیش دایە پێموایە ڕەگەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە.

KNN: ئەو شێوازەی لامەرکەزیەت باسی دەکەیت ئەو دەسەڵاتانە چین کە پێویستە لە دەستی مەرکەزدا نەبێت؟

نەوشیروان مستەفا: باسی تەجروبەی کوردستانی عێراقی خۆمان دەکەم، نامەوێت ئەمە تەعمیم کەم بۆ وڵاتانی تر، بەڵام ئەمە بێگومان لە نەتیجەی لێکۆڵینەوەی چەندین تەجروبەی میللەتانی دونیا بوە ئەمە بەشێکە لەو فەلسەفەی سیاسییە لە حکومڕانی ئێمە باوەڕمان پێیەتی ئەمەش ئەوەیە ئێمە لە هەرێمی کوردستاندا سێ دەسەڵاتمان هەیە، لە پال ئەو سێ دەسەڵاتەدا هێزی چەکداریشمان هەیە مەسەلەن سێ دەسەڵاتەکە یەکیان دەسەڵاتی تەشریعییە، یەکیان دەسەڵاتی تەنفیزییە، یەکیان دەسەڵاتی قەزاییە لە هەرێمی کوردستاندا کاتێك ئێمە باسی لامەرکەزیەت دەکەین باسی ئەوە ناکەین لە دەسەڵاتی قەزایی دا لامەرکەزیەت هەبێت‌و هەر محافزەیەك دادگاو مەحکەمەو سوڵتەی قەزایی خۆی هەبێت، بێگومان نا، بۆ هەرێمی کوردستان پێویستە یەك دەسەڵاتی قەزایی هەبێت کە لە هەمو هەرێمی کوردستاندا دەسەڵاتداربێت یەك مەحکەمەی تەمیز هەبێت‌و یەك مەجلیسی قەزا هەبێت و یەك وەزارەتی عەدل هەبێت، مەفروزە سوڵتەی قەزایی لە هەرێمی کوردستاندا یەك سوڵتە بێت، وەرە سەر سوڵتەی تەشریعی لە سوڵتەی تەشریعیش دا پێویستە لە هەرێمی کوردستاندا یەك ئەنجومەن یەك پەرلەمان هەبێت بۆ ئەوەی تەشریعات بۆ هەموی کوردستان دەربکات یەعنی ئەو تەشریعانەی ئەو قانونانەی لە پەرلەمانی کوردستاندا دەردەچێت لە سەرتاسەری کوردستاندا جێبەجێ بکرێت‌و نابێت هیچ محافزەیەك خۆی بە تەنیا دەسەڵاتی ئەوەی هەبێت کە تەشریعاتی جیاواز دەربکات جیاواز بێت لەو تەشریعاتە هەرێم بەڵکو تەنیا دەسەڵات لە هەرێمی کوردستان دەبێت قانون دەربکات و قانونەکەی جێبەجێ بکرێت لە سەرتاسەری کوردستان سوڵتەی تەشریعییە کە پارلەمانی کوردستانە.

دێینە سەر سوڵتەی تەنفیزی سوڵتەی تەنفیزی کە خۆی لە کۆمەڵێك دام و دەزگا ئەنوێنێت لەوانە ئەنجومەنی وەزیران، سەرۆکایەتی هەرێم سەرۆکایەتی هەرێمیش بێگومان ئەبێت بۆ هەموی هەرێمی کوردستان بێت، بەڵام کە باسی

سوڵتەی تەنفیزی دەکرێت سولتەی تەنفیزی ئەنجومەنی وەزیرانە، ئەنجومەنی وەزیران مەفرووزە ئەو دەزگایە بێت کە پەیوەندی لە بەینی هەرێمی کوردستان و لە بەینی عێراق و شوێنەکانی تردا رێك دەخات و ئەو جیهەتە بێت کە تەختیتی لەسەر ئاستی هەرێمی کوردستان پلان دادەنێت بۆ رێگاو بان بۆ کارەبا بۆ ئاوی خواردنەوە بۆ کشتوکاڵ بۆ ئابوری بۆ کاروبار بۆ زانکۆکان، نەخشە یاخود پلانی هەرێم لە لایەن ئەوەوە دائەنرێت و جێبەجێ کردنەکە ئەسپێرێت بە ئەنجومەنی محافەزەکان یەعنی لەمە جۆرێك لە دابەش کردنی دەسەڵات دێتە پێشەوە دابەشکردنی دەسەڵات لە نێوان ئەنجومەنی وەزیران و لەنێوان ئەنجومەنی پارێزگاکان، ئەوەی کە ئێمە داوای دەکەین ئەوەیە کە لە هەرێمی کوردستاندا جۆرێك لە لامەرکەزیەت لە مەسەلەی جێبەجێ کردنی کارگێڕیدا لە مەسەلەی جێبەجێ کردنی ئابوریدا لە مەسەلەی جێبەجێ کردنی ئاوەدانکردنەوەدا لەوانە جۆرێك لە دابەشکردنی دەسەڵات لە بەینی هەرێمی کوردستان لە هەولێرو لە بەینی محافزەکانی هەولێرو دهۆك و سلێمانیدا هەبێت ئەوەیە کە ئێمە باسی دەکەین، بێگومان هێزی چەکدار بە دەرەجەی ئەساسی پێشمەرگەیەو ئەویش کە دەبێت دیسان ناوەندی بێتو سەر بە هەرێمی نەبێت لەبەر ئەوە ئێمە ئەگەر باسی لامەرکەزیەت دەکەین باسی ئەو لامەرکەزیەتە دەکەیت کە لە بواری بەڕێوەبردنی کارگێری و ئاوەدانی دەکەین نەك لە بواری سولتەی تەشریعی و سولتەی قەزایی دەکەین.

KNN: هەندێك ئێوە بە سلێمانچی تاوانبار دەکەن؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، زۆر پرسیارێکی بەجێیە من لە چیدا سلێمانچێتیم کردوە پێم بڵێن تاوەکو پێتان بڵێم سلێمانچیم کردوە یان نەمکردوە.

KNN: مەسەلەن بۆ نمونە دەڵێن ئەگەر دەسەڵاتتان هەبێت فەزلی سلێمانی دەدەن بەسەر شارەکانی تردا؟

نەوشیروان مستەفا: زۆرجار دەسەڵاتیشم بوە لە چیدا فەزلم پێداون؟ ئەتوانن هەر هیچ نەبێت ئەو فەترەیە بۆ نمونە بێننەوە کە هەمو دامودەزگاکانی یەکێتی

و هەمو دامودەزگاکانی ئیداری مەنتقەی سلێمانی کە سەر بە یەکێتی بون لە ناوچەی سلێمانی و لە شاری سلێمانی بون ئەتوانن بچن پرسیار بکەن بزانن مەسئولی چەند مەکتەبی یەکێتی خەڵکی شاری سلێمانی بون مەسئولی چەند مەکتەبی یەکێتی خەڵکی شارەکانی تر بون لەناو وەزیرەکاندا بە ژمارە وەریبگرن (٢٠) وەزیر بوبێت (١٥) وەزیر بوبێت (٣٠) وەزیر بوبێت چەندانەی خەڵکی سلێمانی بون و چەندیان خەڵکی شارەکانی تر بون بە عەکسەوە ئێمە لەلایەن خەڵکی سلێمانیەوە گلەییمان لێدەکەن کە ماوەیەکی زۆر زیاتر لە (١٠) ساڵ حوکمرانی ئیدارەی یەکێتی هەموی لە سلێمانی بوەو بەشێك لەوانەی کە کاربەدەست بون دەسەڵاتداربون لە دامودەزگا حکومەتی و حیزبییەکاندا ئیستغلالی پلەو پایەی سیاسی خۆیانیان کردوە بۆ هەندێك مەبەست بۆ دەوڵەمەندبون بۆ داگیرکردنی ئەرز بۆ مقاوەلات بۆ فلان و بۆ فیساری بۆ شتی وا زۆرجار خەڵکی سلێمانی تاجیرەکانی سلێمانی مقاویلەکانی سلێمانی کارمەندەکانی سلێمانی هاتون گلەییان لە ئێمە کردوە کە ئێمە بۆچی دیفاعیان لێناکەین لەسەر ئەوەی کە ئەرزی سلێمانی دەدرێت بە خەڵکی زۆر شوێنیتر کە دابەش دەکرێت بەسەر خەڵکی زۆر شوێنی دور دێن لەبەر چاوی خەڵکی سلێمانیدا ئەیفرۆشن، بۆچی لە سلێمانی یەکێتی حکوم دەکات و کەچی زۆری وەزیرەکانی کە کاروبارەکانیان بەندە بەم ناوچەیەوە کە پێویستە بە شارەزایی و ناسینی خەڵکەکەوە هەیە، خەڵکی شارێکی کە بۆ ببێتە وەزیر رۆژێك لە رۆژان ئێمە گلەییمان نەکردوەو قسەمان نەکردوە.

من ئەگەر لە هەولێریش بومایە لەوانەبو هەر بەو تەریقەیە پێم بڵێن کە هەولێرچییەتی دەکات و لە دهۆکیش بومایە پێم بڵێن دهۆکچییەتی دەکات چونکە من دژی ئیستغلالی دەسەڵاتی سیاسی دەسەڵاتی حکومرانی و دەسەڵاتی حیزبی بوم بۆ مەنفەعەتی تایبەتی بەداخەوە ئەوە بەو نەوعە شکاوەتەوە لەبەر ئەوەی کە ئەو کەسانەی کە دەسەڵاتدار بون لە سلێمانی خەڵکی سلێمانی نەبون پێیان وابوە کە ئەگەر ئەو رەخنەیەی کە دەیگرین ئەو

گلەییەی کە ئەیکەین ئەچێتە قاڵبی ئەوەی کە ئەگەر سلێمانیش بونایە هەر عەینی گلەییمان لێدەکردن.

KNN: لە گەڕانەوە بۆ سیستمی لامەرکەزی کە باسمانکرد ئایا ئەم سیستمە بۆ هەولێرو دهۆکیش بەهەمان شێوە هەر دەسەڵات رازی نییە کە سیستمێکی لامەرکەزی بێت؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، ئەو سیستمی لامەرکەزییەی کە ئێمە باسیدەکەین بۆ هەولێرو دهۆکیشە، ئەگەر رۆژێك لە رۆژان کەرکوك‌و ناوچە دابڕاوەکانیش هاتنە سەر کوردستان ئێمە هەمان سیستم داوا دەکەینەوە چونکە تازەترین سیستمی بەڕێوەبردنی دنیایە، ئەم دنیایە دنیای زەمانی مەرکەزییەت نییە، ئەوەی کە پێی دەوترێت لامەرکەزییەت یان (دیسێنترالیزەیشن) کە بە کوردی ناومان ناوە (نەناوەندێتی) شێوەیەکی بەڕێوەبردنی هاوچەرخە بۆ بەڕێوەبردنی دامودەزگاکانی حکومەت لە سەرتاسەری دنیادا پەیرەوی دەکرێت.

KNN: بەڵام ئایا حکومڕانی ئێستا ئەم کارەی کردوە؟

نەوشیروان مستەفا: نەخێر نەیکردوە، ئەنجومەنی وەزیرانو وەزیرەکان هەوڵدەدەن بۆئەوەی دەسەڵات لە دەستی خۆیاندا کۆببێتەوە هەمو شتێك لە رێگەی ئەوانەوە بێت، تەنانەت دامەزراندنی کارمەندێکی ئاسایی، مجێوری مزگەوتێك، فەڕاشی مەکتەبێك یان دائیرەیەك، کرێکارێکی ئاسایی، دەیانەوێت لە دەستی خۆیاندا بێت، یان جێبەجێکردنی پرۆژەیەکی بچوك لە دواکەوتوترین یان دورترین دێهات دەبێت بەدەست خۆیانەوە بێت، دەیانەوێت لەو رێگەیەوە خۆیان بەسەر خەڵکدا بسەپێنن.

KNN: ئەمە تاچەند دەتوانین بڵێین یەك ئیدارەییە لە کوردستان، یان دابەشکردنی ئیدارەیە لە کوردستان؟

نەوشیروان مستەفا: تائێستا یەکئیدارەیی لە کوردستاندا نییە، تائێستاش دو ئیدارەیە، لەسەرەوە بەناو وەزارەتێکی یەکگرتو هەیە بەڵام بۆ هەندێك وەزارەت

دو وەزیر هەیە، واتە دەتوانین بڵێین لە روی عەمەلییەوە دو ئیدارەیە، ئیدارەی سلێمانی وەکو خۆیەتیو هەولێرو دهۆکیش وەکو خۆیەتی.

KNN: هەندێ جار دەڵێن ئەگەر نەوشیروان مستەفا دەسەڵاتی هەبێت لەوانەیە سلێمانی جیابکاتەوەو بیکات بە هەرێمێکی سەربەخۆ؟.

نەوشیروان مستەفا: بێگومان لە دەستوری عێراقیدا مادەیەکی تیایە کە هەمو پارێزگایەك بە تەنیا یان لەگەڵ چەند پارێزگایەکی تردا ئەتوانێت هەرێمێکی سەربەخۆ دروستبکات. وەکو مەبدەئ من لەگەڵ ئەوەم و پێشموایە ئەمە مافێکی رەوای هەمو پارێزگایەکە وەکو چۆن ئێمە باوەڕمان وایە هەمو میللەتێك لە دنیادا دەبێت مافی چارەنوسی هەبێت، من باوەڕم وایە دەبێت هەمو پارێزگایەکیش دەبێت مافی بڕیاردانی چارەنوسی خۆی هەبێت، بەڵام لە کوردستاندا ئێمە لایەنگری ئەوەین کە هەرێمی کوردستان هەبێتو یەك یەکەی فیدراڵی بێت، سلێمانیو هەولێرو دهۆك بەیەکەوە بن، لە پاشەڕۆژدا ناوچە دابڕاوەکان کەرکوكو سنجارو خانەقینو مەخموریش بگەڕێنەوە سەر هەرێمی کوردستان.

دێمە سەر ئەوەی کە حکومەتی هەرێمی کوردستانو سەرکردایەتی ئەم دو حیزبە چیان کردوە بۆئەوەی جۆرێك لە ئینديماج لەنێوان بادینانو سۆران لەنێوان هەولێرو سلێمانی، لەنێوان دهۆكو هەولێرو سلێمانیدا دروستببێت. بۆنمونە چەند رۆژنامەی سلێمانی دەگاتە دهۆك، چەند رۆژنامەی دهۆك دەگاتە سلێمانی، چەند کۆڕی ئەدەبی، سیاسی، رۆشنبیری، لەلایەن دهۆکییەکانەوە لە سلێمانی ئەنجامدەدرێتو لەلایەن سلێمانیەکانەوە لە دهۆك ئەنجامدەدرێت. چی کراوە بۆئەوەی کە ئەوەی لە زمانی تازەی ئەم چەرخەدا پێی دەوترێت (ئینتیگرەیشن) جۆرێك لە ئینديماج، جۆرێك لە تێکەڵاوبون، کە لە یەکتردا بتوێنەوە، چی کراوە تاکو من دژی راوەستابم تا ئەوان وامان پێ بڵێن؟ بە پێچەوانەوە من زۆر بەلامەوە باشە کە نەخشەیەك دابنێین بۆئەوەی تێکەڵاوبونێکی ئابوری، سیاسی، کۆمەڵایەتی، رۆشنبیری، زانکۆیی لەنێوان

پارێزگاکانی کوردستاندا بە سلێمانیو هەولێرو دهۆکو کەرکوکیشی بخەینە سەر، سنجارو خانەقینیشی بخەینەسەر، توزخورماتوی بخەینە سەر، گوێری بخەینەسەر، واتە کارێکی وابکەین تێکەڵاوبونێك لە میللەتەکەماندا دروستبێت، لە سلێمانی رێگە بدەین با بەڵێندەرەکانی دهۆك بێن لێرە ئیش بکەن، ئەو کۆمپانیایانەی لە دهۆك هاوردەو هەناردە دەکەن بێن لە سلێمانیش لقی خۆیان بکەنەوەو بە پێچەوانەشەوە. با سلێمانی چەند هەزار خوێندکارێکی هەولێرو دهۆك وەربگرێتو ئەوانیش چەند هەزار خوێندکارێکی سلێمانی وەربگرن بۆئەوەی تێکەڵاویی دروستببێت. لەنێوان نوسەرانو ئەدیبانو رۆشنبیرانو شانۆکارو ئەوانی تردا تێکەڵاویی دروستببێت ئەوە مەرجی پێکەوەژیانە. لەسەرو هەموشیەوە دەبێت ئێمە ئازادی بۆ میللەتەکەمان مسۆگەر بکەین، سیستمێکی دیموکراتی کراوەمان هەبێت، تایبەتمەندێتی یەکتری قبوڵ بکەین، بۆنمونە ئەوان تایبەتمەندێتی سلێمانی قبوڵ بکەن، سلێمانی تایبەتمەندێتی هەولێر قبوڵ بکات، بەوجۆرە ئێمە دەتوانین بەیەکەوە بژین ئەگینا لەرێگەی سەرکەوتکردنو هەرەشەلێکردنەوە پێموانییە بەهیچ جۆرێك ئینتیگرەیشن یان تێکەڵاوبون دروستبکات.

KNN: دەستورێك کە رەزامەندی هەمولایەکی لەسەربێت ناتوانێت ئەمە دروستبکات؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ بێگومان دەتوانێت، بەڵام بەداخەوە ئەم دەستورەی کە ئێستا هەیە ئەو رەزامەندییە بەکۆمەڵەی تیا نییە ئێمە ئومێدمان وابو لە کوردستاندا دەستورێکمان هەبێت هەمومان پشتیوانی لێبکەین هەمومان دەنگی بۆ بدەینو بە دەستوری خۆمانی بزانین، بەڵام ئەو دەستورەی کە هێنایانە پێشەوە جێگەی داخە بەشی زۆری رۆشنبیرانو خەڵکی ئەم ناوچەیە دژی راوەستان، ئومێدم وایە جارێکی دیکە چاو بەوەدا بخشێننەوە کە دەستورێك لە کوردستاندا بێتە پێشەوە جێگەی ئیجماعی کورد بێت یان هیچ

نەبێت جێگەی زۆربەی زۆری کورد بێت کە هەمو بە دەستوری خۆیانی بزانن‌و پەیڕەوی بکەن‌و لەگەڵی بژین.

KNN: کەواتە ئەگەر ئەمانە هەر لە دروشمدا بمێننەوە، پێکەوە ژیان بەبێ کرانەوەو دادپەروەری کارێکی ئاسان نابێت؟

نەوشیروان مستەفا: پرسیارەکەم کە لە تۆم کرد جارێکی تر دوبارەی دەکەمەوە، بۆئەوەی ئێمە وەکو یەك نەتەوە ئیش بکەین بۆئەوەی وەکو یەك هەرێمی کوردستان ئیش بکەین، بۆئەوەی وەکو یەك حکومەت یەك دەوڵەت یەك وڵات ئیش بکەین، من لە تۆ دەپرسم: لە ١٨ ساڵی رابردودا چی کراوە بۆ دروستکردنی شتی هاوبەش لەنێوان کفری‌و زاخۆ، لەنێوان کەلارو ئامێدی، لەنێوان ئاکری‌و هەڵەبجە، چ شتێکی هاوبەش دروستکراوە لە روی ئابوری، سیاسی، کۆمەڵایەتی‌و رۆشنبیرییەوە، کردویەتی بە بەرنامەی خۆی بۆئەوەی ئەم میللەتە هەست بەوە بکات کە یەك میللەتە، یەك وڵاتی هەیە، وە ئەمە لە شیعر دەربێنینە دەرەوە، واتە لە نوسین‌و دروشمی سیاسی دەریبێنینە دەرەوە بیکەین بە بەرنامەیەکی ئیشکردن بۆ ئێستاو بۆ پاشەڕۆژ بۆئەوەی ئێمە خۆمان بە یەك نەتەوەو بە یەك میللەت بزانین، بۆیە من لە تۆ ئەپرسم چی کراوە؟ ئەگەر نەکراوە پێویستە بیکەین. ئەگەر کراویشە بۆئەوەی درێژەی پێبدەین.

KNN: ئەگەر ئەمانە نەکران ئەوکاتە هەڵوێستت چۆن دەبێت؟

نەوشیروان مستەفا: ئەگەر نەکران، رۆژبەڕۆژ ئەو درزانەی لەنێوان ئەم ناوچانەدا هەیە قوڵتر دەبێتەوە.

KNN: لە یەکەم پرسیاردا باس لە مەسەلەی ئیزدیواجیەت کرا، ئەمەوێ بگەڕێمەوە سەر بەشێکی ئەو پرسیارە، ئەم ئیزدیواجیەتە چ وێنەیەکی کوردی دروستکردوە لە دەرەوە؟ ئایا زیانی لێ نەداوە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، رەنگە بۆ ئەمریکا ئیزدیواجیەتی مەعایر بچێتە سەر، یان بۆ دەوڵەتانی گەورە بچێتە سەر، ئەوانە هێزی گەورەیان هەیە، بەلأم بۆ میللەتێکی بچوکی وەکو کوردو هێزێکی بچوکی وەکو کورد، بێگومان ئەمە ناچێتە سەر. ئیزدیواجیەتی مەعایر لە سیاسەتی کوردیدا لە عێراقدا زەرەری لە کورد داوە، واتە ئەگەر ئێستا وەزعی سیاسی کورد لەعێراقدا بەراورد بکەین لەگەڵ پێنج ساڵ لەمەوپێش یان دە ساڵ لەمەوپێش، پێموایە زۆر دابەزیوەتە خوارەوە، پێنج ساڵ لەمەوپێش شوێنی کورد لەلای عەرەبی عێراق زۆر لە ئێستا باشتر بو، دە ساڵ لەمەوپێش زۆر لە ئێستا باشتر بو، بەهۆی ئەو سیاسەتە ئیزدیواجیەی کە لە بەغدا پەیرەوی دەکرێت، ئەوەی کە بۆ خۆمانمان ئەوێت بۆ ئەوانمان ناوێت، بۆنمونە داوای دیموکراتی لەوان دەکەین داوای تەوافوق دەکەین داوای ئازادی زیاتر دەکەین داوای لامەرکەزیەت دەکەین، داوای ئازادی حیزبەکان دەکەین، هەندێك لەمانە لەناو سیاسەتی کوردیی ناوخۆی هەرێمی کوردستاندا رەنگی نەداوەتەوە، لەبەرئەوە ئێمەش تۆمەتبارین بەوەی کە ئیزدیواجیەتی مەعایرمان هەیە، بەوەی جۆرێك رەفتار دەکەین لە کوردستانو لەوێ جۆرێکی دیکە رەفتار دەکەین، ئەمە بوەتە هۆی ئەوەی کە وەکو وتم لەناو عەرەبی عێراقدا رێزگرتنی کورد دابەزیوەتە خوارەوە. بۆنمونە کورد پێش پێنج ساڵ یان دە ساڵ ئەیتوانی بە ئازادی بڕوات بۆ نەجەفو کەربەلاو حللەو عەمارەو بەسرەو تەنانەت لە رومادیو شوێنەکانی تردا ئیش بکاتو زۆر رێزی دەگیرا، بەلأم لەماوەی ئەم پێنج ساڵەدا ئەو رێزگرتنە دابەزیوەتە خوارەوە.

KNN: دوا پرسیارم ئەوەیە، ئێوە هیچ پلانێکتان هەیە بۆ نەهێشتنی ئەم ئیزدیواجیەتە لە کارکردندا؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە هەوڵدەدەین لەڕێگەی ئەو پرۆژانەوە کە پێشکەشی پەرلەمان دەکرێت، لەڕێگەی ئەو بەرنامەیەوە کە وەکو بزوتنەوەی گۆڕان تەرحی دەکەین، لەڕێگەی ئەو رەخنانەوە ئێمە لە حکومەتی هەرێمی دەگرین، لە سیاسەتی حیزبەکانی هەرێمی دەگرین، وە لەڕێگەی بەرنامەی بەدیلەوە هەوڵدەدەین کە ئە

# گەندەڵیی بەرهەمی شێوەی حوکمڕانیی دەسەڵاتە

سازدانی: هوشیار عەبدولاّ

نەوشیروان مستەفا ئامارژە بۆ ئەوە دەکات، کە دیاردەی گەندەڵیی بەرهەمی جۆری حوکمڕانیی دەسەڵاتی سیاسییە لە کوردستان نەك دیاردەیەکی کەسیی بێت.

ئەم وتانەش وەك بۆچونێك لە بەرامبەر ئەو هەوڵانەی کە ماوەیەکە دەسەڵات لە کوردستان لە هەوڵی ئەوەدایە، کە لێپێچینەوە لە چەند کەسێك بە تۆمەتی گەندەڵیی وەك موزایەدەی سیاسیی بەکاردێنێت.

لەم چاوپێکەوتنەدا، کە کەناڵی knn لەگەڵ نەوشیروان مستەفا سازیداوە، ناوبراو لەسەر چەند پرسێکی دیکە دەدوێت.

Knn: ماوەیەکە راگەیاندنەکانی دەسەڵاتو بەتایبەت راگەیاندنی (ی. ن. ك) خۆیان وەکو هێزێك دەردەخەن، کە ئەوان دژایەتی گەندەڵیی دەکەن، زۆرجار باس لەوە دەکەن، کە هۆکاری گەندەڵیی ئەو کادیرانە بون، کە ئێستا لە لیستی گۆڕان دانو ئەوان بونەتە هۆکاری گەندەڵیی لە کوردستاندا.

نەوشیروان مستەفا: من وەڵامی پرسیارەکەت بە پرسیارێکی بەرامبەر دەدەمەوەو هەر خۆشم وەڵامی پرسیارەکە دەدەمەوە، ئەویش ئەوەیە" ئایا گەندەڵیی دیاردەیە؟، گەندەڵیی شتێکە هی تاکە یاخود گەندەڵیی شتێکی سیستماتیکەو بەرهەمی شێوەی بەڕێوەبردنو جۆری حوکمڕانییە.

ئەو کەسانەی کە ئێستا ئەو فایلەیان هێناوەتە پێشەوەو بێگومان هەرکاتێك بەرەنگاریی‌و روبەڕوبونەوەو بە گژاچونەوەی گەندەڵیی هەبێت باشەو لەسەر هەر ئاستێك بکرێت کارێکی باشە، بەڵام ئەوان دەیانەوێت دیاردەی گەندەڵیی لە کوردستاندا وەکو دیاردە نیشان نەدەن، بەڵکو بیکەن بە دیاردەیەکی

کەسیی، یانی شەخسەنەی کارەکە بکەن، بەڵام ئێمە بە پێچەوانەی ئەوەوە پێمانوایە" لە کوردستاندا شێوەی بەڕێوەبردنی سیستمی سیاسیی لە کوردستاندا سیستمی ئیداریی‌و سیستمی مالیی، ئەمە ژینگەیەکی دروست کردوە بۆ لە دایکبون‌و خولقاندنی دیاردەی گەندەڵیی، من هەرگیز باسی ئەوە ناکەم ئەو کەسانەی کە لای ئێمە کۆبونەتەوە هەموی فریشتەیەو هەرچی لە لاکانی دیکەیە شەیتانە، بێگومان لە هەمو لاکاندا خەڵکی تیادایە، کە ئینسانی کامڵ نین‌و کەموکوڕییان تێدایە لەلای ئێمە ئینسانی باشی تیایەو لە لاکانی دیکەیش ئینسانی باشی تێدایە، رەنگە کەسانێك هەبوبن لەلای ئێمە لە جارێك لە جارەکاندا لە گەندەڵیی تێوەگلابن، بەڵام بەداخەوە شێوەی بەڕێوەبردنی حوکم لەو وڵاتەی ئێمە سیستمی سیاسیی سیستمی ئیداریی‌و سیستمی مالیی لەم وڵاتە کارێکی وایکردوە، کە گەندەڵیی بوەتە بەشێك لەو سیستمە، سیستمەکە خۆی بوە بە ژینگەیەکی لەبار بۆ هەڵهاتنی گەرای گەندەڵیی‌و ئەمانەش بەجۆرێك گەندەڵییان باراندوە بەسەر وڵاتەکەدا وەکو خۆڵبارانی لێهاتوە، چۆن تۆ بە هیچ جۆرێك پێتخۆش نییە کە خۆڵ هەڵبمژیت، بەڵام مەجبوریشی کە ئەگەر خۆڵباران بێت خۆڵ هەڵدەمژیت هەر بەو جۆرەش گەندەڵیش لەو وڵاتە وای لێهاتوە ئەگەر پێتخۆش بێت‌و نەبێت بە جۆرێك لە جۆرەکان تێوەی دەگلێیت.

Knn: ئایا پێتوایە، کە کۆمەڵە کەسانێك کە ئەگەر جۆرێك تێوەگلانیان هەبێت ئیتر مانای ئەوەیە، کە دەخرێنە دەرەوەی کۆمەڵگەوە جارێکی دیکە ناکرێت ئەوانە بخرێنە پرۆسەیەکەوە کە کادیرێکی باشیان لێ دەربچێت؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ بێگومان، بە بۆچونی ئێمە پێمانوایە سیستمێکی بەڕێوەبردنی باش لەناو ئەو سیستمەدا ئینسانی خراپی تیادابێت یان جێی نابێتەوە یا چاك دەبێت، یا دەچێتە زیندانەوە یا بەشێك دەبێت لە سیستمە باشەکە، لە سیستمێکدا کە گەندەڵیی تیا ببێت بە سیستمێکی سیستماتێك پیاوی باشیشی تیادا بێت یا دەبێت لەگەڵ شەپۆلی گەندەڵییەکە بڕوات یا

دەچێتە دەرەوەی سیستمەکە لەبەر ئەوەی سەرچاوەی وەکو باسمکرد ژینگەکە کاتێك کە سیستمی سیاسیی ژینگەی گەندەڵیی دروست دەکات شتێکی ئیعتیادییە.

Knn: زۆرباشە لەسەر ژینگەکە دەمەوێت تۆزێك رونکردنەوەی زیاترم پێبدەیت کاتێك دەڵێیت ژینگەکە یاخود تاکەکانیش بە شێوەیەکی گشتیی یا بە ناچاری گەندەڵ دەکات ئێمە خاوەنیی ژینگەیەك بین، کە تاکەکان بە ناچاریی گەندەڵ بن ئەمە تاکەکانن یاخود سیستمەکەیە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، تۆ لە ولاتێکدا کاتێك بتەوێت تەعین بیت پێویستی بەوە بێت کە واسیتەیەك بکەیت یا ئەوەی کە پشتگیریی حیزبیت پێ بێت بتەوێت خانو بکەیت، بۆ قەرز وەرگرتنو زەوی وەرگرتن پێویستیت بە واستەبێت، بتەوێت پەساپۆرتو جنسیەی عێراقی دەربێنی پێویستی بە واسیتە هەبێت، بتەوێت لە جامیعەو خوێندنی بالا بخوێنیت پێویستی بە واسیتە هەبێت، بێگومان ئەمە بەشێکە لە گەندەڵیی ئەمەش سیستمەکە وای لێکردوە ئەگەر ئەو سیستمە قانون سەروەر بوایەو دەزگای لێپرسینەوە هەبوبایە بۆ ئەمجۆرە کارانەو ئەگەر شان بەشانی هەبونی گەندەڵییەك لێپرسینەوەش بوبایە، بێگومان ئەو تەشەنەی نەدەکرد لە ولاتێکدا کە لێپرسینەوە نەبوبێت لە ولاتێکدا کە سەرچاوەکانی دارایی هەموی بەدەست حیزبەوە بێت، یان بەدەست حکومەتەوە بێت کەس نەزانێت کە چۆن پارە پەیدا دەکرێتو چۆن سەرف دەکرێت لە ولاتێکدا کە هێزە چەکدارەکان هەموی بەدەست خۆتەو بە ئارەزوی خۆت بە قازانجی خۆت بەکاری بێنیت لە ولاتێکدا، کە هەمو سەرچاوەکانو زانیاری لەسەر گەندەڵییو لەسەر داهاتو لەسەر خەرجو لەسەر جۆری تەعینبونی کاربەدەستە گەورەکان بەدەست حیزبەکانەوە بێت، لە ولاتێکدا کە ناڕۆشنیی هەبێت لە ولاتێکدا کە تاریکی هەبێت لە دابەشکردنی سامانی ولاتو لە دابەشکردنی دەسەلاتو لە تەعیناتو لە هەمو ئەو شتانە، بێگومان ئەوە ژینگەیەکی لەبارە بۆ لەدایکبونی گەندەڵیی.

Knn: باشە ئەمە وایکردوە کە ئەم ژینگەیە فاسدکەر یاخود ژینگەیەك بێت، کە وایکردوە زۆرێك لە تاکەکان فاسد بن بەتایبەت قسەیەك هەیە لەسەر ئەوەی، کە هەتا لەسەر ئاستی تاکەکان بۆ ئەوەی کە زۆر جار ئەو ئیجرائاتانەی کە کراوە لە کوردستاندا تا رادەیەك هەمان ئەو گوزارشتە بوە، کە وەکو تۆڕێکی ماسی ماسییە گەورەکانی لێ رزگار بونو بچوکەکانی گرتوە. رای بەڕێزت؟

نەوشیروان مستەفا: من خۆم لەو باوەڕەدا نیم، کە گەندەڵیی بەو شکڵە هەمو کۆمەڵگەی کوردی گرتبێتەوە هەمو تاکەکانی گرتبێتەوە ئێستاش باوەڕم وایە کە بەشی هەرەزۆری تاکەکانی کورد کەسانێکی پاکن دژی گەندەڵین ئەوانەی، کە لە گەندەڵیی تێوەگلاون ژمارەیەکی زۆر کەمن ئەوانەن، کە دەتوانین بڵێین لە ریزی یەکەمی دەسەڵاتو لە ریزی دوەمدانو وەگەرنا خەڵکەکەی دیکە خەڵکی پاکنو دژی گەندەڵین.

Knn: ئەم مەسەلەیە زۆرجار وەکو دیاردە دەبەسترێتەوە بە وەلائی سیاسییەوە، کەسێك کە وەلائێکی سیاسیی دیاریکراوی هەبێت ئیتیهام دەکرێت، کەسێك کە وەلائی سیاسیی هەبێت، ئەگەر بۆ دەسەڵات بێت پەردەپۆش دەکرێت.

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ دەقاودەق وایە، هەتا ئەو زەمانەی تۆ لەگەڵیانبیتو هەرچییەك بکەیت بەو شەرتەی دڵسۆز بیت لە روی سیاسییەوە بۆ ئەوان بیتو وەلائی سیاسیت بۆ ئەوان هەبێتو ئیتاعەتت هەبێت بۆ ئەوانو گوێڕایەڵ بیت، بەڵێ هەموت بۆ پەردەپۆش دەکەن، کاتێك کە تۆ لەوان جیا دەبیتەوەو لەوان دادەبڕێیت، ئینجا وەکو چەکێکی سیاسیی بەکاردەهێنرێیت بۆ مەرامێکی سیاسییو بۆ شکاندنو ناو زڕاندنی ئەو کەسانە.

Knn: مەبەستت ئەوەیە، کە مەلەفەکانی گەندەڵیی دەشارنەوە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، بێگومان دەیشارنەوە.

Knn: قسەیەك لەسەر تۆ هەیە لە رۆژنامەی هاولاّتی باس لەوە دەکریّت، کە تۆ بایی ئەوەی کە حکومەتی هەریّمی پیّ بڕوخیّت دیکۆمیّنتت لایە، بەلاّم کەشفت نەکردوە بۆ؟

نەوشیروان مستەفا: جاریّ یەکەم سەرچاوەی ئەو هەواڵە من نیم، حەز دەکەم دڵنیابن لەوە، وە ئەوەش بۆ پاکانە نایلّیم، بەلاّم من نەبوم، من کابرایەکم پیّموایە هەمو میهنەیەك پیّویستی بەوەیە جۆریّك لە ئەخلاقو ئیتیکی خۆی هەبیّت.

بە نمونە باسی بکەین کابرایەك سەرتاشە، یان ژنیّك سالۆنی حەلاقەی هەیە، ژنیّك دەچیّتە لای ئەو سەری چاك بکات، کاتیّك دەبینیّت کە سەری کەچەڵە یا سەری پڕە لە برین، ئەو کەسەی کە سەری ئەو کەسە چاك دەکات ئەخلاقی میهنەکەی وای داوا لیّدەکات کە نابیّت بڕوات لەملاولا باسی ئەوە بکات ئەها فلان کەس فلان عەیبی هەیە، منیش بە حوکمی ئەوەی کە لە مەوقعیّکی مەسئولیەتیّکی بەرزدابوم بە سەدان مەلەف جیاجیا نەك هەر مەلەف گەندەڵیی، مەلەف ئەخلاقی زۆرەها خیّزان کەوتوەتە بەردەستم هی ژن هی پیاو هی کوڕ هی کچ، مەلەف دزی کەوتوەتە بەردەستم مەلەف جاسوسیی کەوتوەتە بەردەستم مەلەف شتی خراپ کەوتوەتە بەردەستم، بەلاّم ئەخلاقی سیاسیی من ریّگەی بە من نەداوە، کە تەشهیر بە هیچ کەسیّك بکەمو ناوی هیچ کەسیّك بەرم، لە کاتی پیّویستدا ئەگەر پیّویستی کردبیّت باسمان کردوە، کە فلاّن کەس شتی لەسەرەو لە هەندیّك مناسەبەتدا باسمان کردوە، بەلاّم من ئەو جیهەتە نەبوم، کە بە تایبەتی ئیّمە ئەو دەسەلاّتە نەبوین کە بتوانین هەمو ئەوانەی کە لە گەندەڵییەوە گلاون بدەین بە دادگا تاوەکو هینی بکەن، من کابرایەکی سیاسیم وەکو سیاسیی هاتوەتە بەردەستم دەمتوانی بەکاری بیّنم وەکو چەکی سیاسیی بۆ تەشهیرو ناوزڕاندن، بەلاّم ئەخلاقی سیاسیم ریّگەی بەوە نەداوە.

Knn: کاك نەوشیروان ئەوەی کە سەرنجی لە گوزارشت، یاخود لە وتاری تۆ دابیّت هەمیشە کە باس لە گەندەڵیی یا کۆمەڵیّك چەکمی دیکەیش دەکریّت لە

شەخسەنە لای دەبەیت، دەیخەیتە سەر سیستمەکە دەتوانیت پێم بڵێیت کاتێك دەڵێیت پێویستە ئەم سیستمە بگۆڕێت بۆ ئەوەی کە دژایەتی گەندەڵیی راستەقینە بکرێت مەبەستت کام سیستمی حوکمەیە؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، لە سیستمێکدا کە بودجەی گشتیی ئاشکرابێت چۆن سەرف دەکرێتو چۆن بێت، لە سیستمێکدا، کە یاسا سەروەر بێت ئەگەر یەکێك کەموکوڕی هەبو مخالفەی هەبو بەبێ جیاوازی پلەو پایەی سیاسییو کۆمەڵایەتیو دەسەڵاتەکانەوە بدرێت بە دادگا، لە سیستمێکدا، کە سەرچاوەکانی زانیاری تا ئەندازەی ئەوەی کە هەڕەشە لە ئاسایشی نەتەوەکەت نەکات لە بەردەستی رۆژنامەنوسو لە بەردەستی ئیدیعای گشتییو لە بەردەستی ئەوانەدا بێت، بەڵێ لەو سیستمە گەندەڵیی کەم دەبێتەوەو ئەگەریش ببێت گەندەڵیی دەبێتە زاهیرەیەکی فەردی نابێتە زاهیرەیەکی نیزامیی، بۆ نمونە فەرقی بەینی بەغداو کوردستان بکە، لە کوردستاندا تەنیا یەك دەزگا هەیە پێی دەوترێت دیوانی چاودێری دارایی، ئێستا حاڵی حازر دو دیوانی چاودێری هەیە یەکێکیان لە هەولێرو یەکێکیان لە سلێمانی، یەکێکیان یەکێتیی دایناوەو یەکێکیشیان پارتیی دایناوە لە هەمان کاتدا لە بەغدا چەندین دەزگا هەیە بۆ لێپێچینەوەی زاهیرەی گەندەڵیی لە سەروی هەمویانەوە هەیئەتی نەزاهە هەیە، کە هەیئەتێکی سەربەخۆیە لەلایەن پەرلەمانی عێراقییەوە دیاری دەکرێتو باوەڕیان پێ دەدرێت، لە پەنای ئەواندا دیوانی چاودێری دارایی هەیە لە پەنای ئەواندا موفەتیشیەتی عام لە هەمو وەزارەتێکدا هەیە، کە ئەویش دیسان ئیشەکەی لێپێچینەوەیە، لە پەنای ئەواندا بە تەنیشت ئەوانەوە لیژنەیەك هەیە بۆ نەزاهەت لە پەرلەمانی عێراقیدا، کە تەعقیبی هەمو ئەو شتانە دەکاتو دەتوانێت هەر وەزیرێكو هەر کەسێکی بوێت بانگی کات بۆ لێپرسینەوە لە کوردستانەکەی ئێمەدا تەنیا یەك دەزگا هەیە، ئەو دەزگایەش لەژێر کۆنترۆڵی حیزبدایە.

Knn: پێتوانییه دروستکردنی دەستەیەکی نەزاهە لە کوردستانو لە شێوەی ئەوەی بەغدا بەشێك لەو كێشانە چارەسەر دەكات، كە ئێستا بەڕێزت باست كرد؟

نەوشیروان مستەفا: نەخێر من پێموانییە، لەبەر ئەوەی کە تائێستا هەمو دامودەزگاکانی حکومەت هەمو ئەو دەزگایانەی کە لە کوردستاندا دروست دەکرێت، هەموی لەژێر دەسەڵاتی حیزبدایە لە ڕێگەی حیزبەوە دروست دەکرێن بە تەزکییەی حیزب دروست دەکرێن، لەبەر ئەوەی ئەو دەزگایانە بێ لایەن نین، دەزگای نەزاهە یان دەزگای دیوانی چاودێری دارایی پێویستە لەسەر بنچینەی پیشەیی لەسەر بنچینەی عەدالەت لەسەر بنچینەی جۆرێك لە بێ لایەنی لە کاروبارەکانی وڵاتدا دروست بکرێت، من گومانم هەیە لەوەی کە ئێستا حاڵی حازر هەرچی دەستەیەکی نەزاهە لە کوردستاندا دروست بکرێت بتوانێت بێ لایەنی خۆی بپارێزێت بتوانێت لە هەیمەنەی حیزب لە دەسەڵاتی حیزب لە ئامۆژگاری حیزب لە فەرمانی حیزب دەرچێتە دەرەوە.

Knn: باشە لەو کاتەدا دەبێت پەنابەرێت بۆ نەزاهەی عێراقی یەعنی تۆ پەنابردن بۆ نەزاهەی عێراقی چۆن دەبینیت؟

نەوشیروان مستەفا: من پێموایە پەنابردن بۆ هەیئەتی نەزاهەی عێراقی یان هەر دەزگایەکی دیکەی فیدراڵی لە کوردستاندا عەیب نییە، ئێمە بە گوێرەی دەستوری عێراقی تائێستا بەشێکین لە عێراق، میزانییەی ئێمە بودجەی ئێمە بودجەی هەرێمی کوردستان لە بەغداوە دێت ئازوقەی هەرێمی کوردستان لە بەغداوە دێت سوتەمەنی هەرێمی کوردستان لە بەغداوە دێت، تەنانەت داو دەرمانیش بەشێکی زۆری لە بەغداوە دێت، لەبەر ئەوەش عەیبێکی تیانییە دوای ئەوە بە گوێرەی دەستوری عێراقی بەرەو ژوری (١٠) هەیئەتی موستەقیل هەیە بۆ بەڕێوەبردنی هەندێك لەو جومگە گرنگانەی دەوڵەت، کە لە عێراقدا هەیە لەوانە بۆ نمونە، کومسیۆنی باڵای هەڵبژاردنەکان لەوانە هەیئەتی نەزاهە کۆمەڵێك دامودەزگای دیکە هەیە، کە ئەمانە دەزگای فیدراڵین هیچ عەیبێکی

تيانييه، كه ئه‌مانه بێن بۆ كوردستان له كاتێكدا تۆ ڕێگه ده‌ده‌يت به ڕێكخراوه نێوده‌وڵه‌تييه‌كان، عێراق ڕێگه ده‌دات به مونه‌زه‌مه‌ی شه‌فافيه‌تی عالـه‌می بێت ته‌ماشـای ئه‌مانـه بكـات، خـۆی چـه‌ندين كۆمپانيـای لێكۆڵينـه‌وه‌ی ماليـيان لـه ئه‌مريكاو له شوێنه‌كانی ديكه‌وه بانگ كردوه، چ عه‌يبێكی تيايه ئه‌گه‌ر ده‌سته‌ی نه‌زاهـه‌ی ئێمـه به جۆرێـك لـه جۆره‌كـان لـه ژێـر ده‌سـه‌ڵاتی فيدراڵيـدابێت، مـن نمونه‌يه‌كی بچوكت بۆ باسكه‌م لـه‌م هه‌ڵبژاردنـه‌ی دواييدا تـۆ وه‌ك ده‌نگده‌رێكی كورد يا هه‌ر ده‌نگده‌رێكی كورد من له ويژدانی ده‌نگده‌رێكی كورد ده‌پرسم، ئه‌و پێيوابـو موچـه‌خۆرێكی حيزبـی كـه پـشتيوانی لـه حيزبێـك ده‌كـات له‌سـه‌ر سـندوقه‌كه دابنيـشێت بـۆ موراقبـه يـاخود عێراقييـه‌كی بـێ لايـه‌ن بـێنی لـه شاره‌كانی ديكـه‌ی عێراقه‌وه سه‌رپه‌رشتی سندوقه‌كه بكات به‌بێ لايـه‌نی به‌بێ ئه‌وه‌ی كه پشتيوانی له هيچ حيزبێك بكات، كاميان باشتره؟ بێگومـان ده‌ڵێيت بێ لايه‌نه‌كه باشتره له‌به‌ر ئه‌وه له حاڵه‌تێكی واشدا په‌نا بردن بۆ هه‌يئـه‌تێكی نه‌زاهه‌ی بێ لايه‌ن باشتره لـه‌وه‌ی كه هه‌يئـه‌تێكی نه‌زاهـه‌ی لايه‌ندارت هـه‌بێت لـه كوردستاندا.

Knn: زۆرجار نه‌ياره‌كانت بۆ ئه‌مه ڕه‌نگه تاوانبار ياخود تۆمه‌تبارت بكه‌ن، بۆ ئه‌وه‌ی كه ئێوه په‌نا ده‌به‌ن بۆ عێراقی عه‌ره‌بی‌و زۆرجاريش به تايبه‌ت باس لـه كۆنه به‌عسييه‌كان يا شۆڤينيه‌تی عه‌ره‌بی ده‌كرێت له به‌رامبه‌ردا؟

نه‌وشيروان مسته‌فا: پێموايه ئه‌وه به‌شێكی بوختانـه، قسه‌يه‌كی ڕاسـت نييـه كـه ئێمـه پـه‌نامان بـۆ شـۆڤينيه‌تی عـه‌ره‌بی بـردوه، وابـزانم كه‌سـيش ناتوانێـت موزايه‌ده به‌سه‌ر ئێمه‌دا بكات، هه‌رچی ئێمه بناسێت ده‌زانێت ئێمـه ده‌يان سـاڵ له ململانێ دابوين له‌گه‌ڵ شۆڤينيزمی عه‌ره‌بی له‌پێناوی مافه نه‌ته‌وه‌يه‌تييه‌كـانی گـه‌لی كوردا، مـن نـه‌بوم ئـه‌و كه‌سـه‌ی كـه ده‌سـتم تێكـه‌ڵاوكردوه له‌گـه‌ڵ به‌عـسدا، ئێمه شه‌ڕی به‌عسمان كردوه شه‌ڕی شۆڤينيزممان كردوه‌و لـه هـه‌مو قۆناغـه‌كانی كه ئێمه به‌شداريمان كردوه له ژيانی سياسيی كوردستان‌و عێراقدا ئه‌وه‌نده‌ی توانيومانـه هـه‌وڵمان داوه كـه مافـه‌كانی گـه‌لی كـورد جێبـه‌جێ بكرێـت، مـن پێشموايه كه ده‌وڵـه‌تی عێراق دوژمـنی ئێمـه نييـه نابێـت به چاوی دوژمنـه‌وه

سەیری دەوڵەتی عێراق بکەین دەوڵەتی عێراق سەرۆکی کۆماری کوردە، جێگری سەرۆك وەزیرانی کوردە، وەزیری دەرەوەی کوردە، وەزیری سەرچاوەکانی ئاو کوردە، وەزیری پیشەسازی کوردە، وەزیری ژینگە کوردە، سەرۆکی ئەرکانی جەیش کوردە جیاواز لە پەرلەمان، کە (٥٨) نوێنەری کورد لە پەرلەمانی عێراقی هەیە من بە چاوی دوژمن تەماشای پایتەختی عێراق ناکام تەماشای دەوڵەتی عێراق ناکەم، بەڵکو وەکو بەشدار وەکو هاوبەش چاو لە دەوڵەتی عێراق دەکەم بۆ ئەوەش هیچی تیانییە ئێمە لە هەندێ حاڵەتدا پەنا بەرینەبەر مەرکەز بەتایبەت ئەو مەرکەزەی کە ئێمە خۆمان شەریکین تیایدا.

Knn: ئەمە دژاو دژییەکی تیایە لەگەڵ دەستوردا یا پێچەوانەی دەستوری عێراقی دەبێتەوە، کە لەم حاڵەتانەدا هەرێم پەنابەرێتە بەر دەستە قانونییەکانی مەرکەز؟

نەوشیروان مستەفا: بە گوێرەی جۆرەی تێگەیشتنی من نەك پێچەوانە نییە، بەڵکو دەقاودەق لەگەڵ دەستوردا دەگونجێت.

Knn: با بگەڕێینەوە سەر دۆخە ناوخۆییەکەی گەندەڵیی، پێتواییە کە ئەو کادیرانە یاخود ئەو کۆمەڵگەیەی کە نیزامێکی گەندەڵ یاخود گەندەڵکەر کاری تێدا کردبێت یەعنی کادیرە کۆنەکان دەتوانن سەر لەنوێ لە سیستمێکی ڕێکوپێکدا ڕێك بخەینەوە بۆ ئەوەی لە کۆمەڵگەیەکی تەندروستدا ئاراستە بکرێن؟

نەوشیروان مستەفا: لەپێشەوە حەز دەکەم ئەوە بڵێم" بە شانازییەکی گەورەوە دەڵێم بەشێکی هەرە زۆری هاوڕێ ناسراوەکانی ئێمە ئەوانەی کە لەم جوڵانەوەیەدا هاوکاری من بونو تەنانەت ئەوانەی کە دەرچون بۆ پەرلەمانی کوردستان لەوانە نین، کە بە هیچ جۆرێك لە گەندەڵیی تێوەگلابن، من شانازی دەکەم لە لایەکەوە بەوان لە لایەکی دیکەیش ئەوەیە، کە ئەو کادیرانەی کە لە حیزبەکاندا بون یەکێتیی سۆڤیەت کێ ڕاستی کردەوە هەر کادیرەکانی حیزبی شیوعی سۆڤیەتی پۆڵۆنیاو بولغاریاو هەنگاریاو چیکۆسۆڤاکیاو ئەڵمانیای شەرقیو ئەمانە ڕۆمانیا کێ گۆڕینی بنەڕەتی سیاسیی کرد لە وڵاتدا هەر کادیرو ئەندامانی ئەو حیزبانەی کە لە حکومەتدابون یەعنی چ عەیبێکی تیایە ئەگەر کادیری حیزبە دەسەڵاتدارەکانی کوردستان پاش ئەوەی کە نائومێد دەبن لەوەی کە گۆڕان لەناو داخیلی حیزبەکاندا ناکرێت لە ڕێگەی گۆڕینی

حیزبەوە ناتوانن گۆڕین لە پەیکەرەی دەوڵەتو حکومەتی هەرێمی کوردستاندا بکەن، چ عەیبێکی تیایە ئەگەر بێن لە جولآنەوەیەکی وەکو گۆڕاندا بەشداریی بکەن بۆ ئەوەی کە بەشداربن لە گۆڕینو لە چاککردنی باری سیاسیی ولآتەکەو سیستمی سیاسیی ولآتەکە، پێموایە هیچ عەیبێکی تیانییە بە تەجروبەی میللەتان بە عەکسەوە دەوڵەمەندە بەوە.

Knn: یەعنی ئەم خیتابەی تۆ بۆ دەرەوەی ئەو کەسانەشە، کە لە دەرەوەی بزوتنەوەکەی ئێوەن کە گۆڕانە؟، مەبەستم ئەوەیە کە زۆرجار لەلایەن دەسەلآتەوە دنیا بە رەشو سپی دەبیندرێت ئەوەی ئێوە یان ئێوە بە زەرورەت دنیا بە رەشو سپی نابینن؟

نەوشیروان مستەفا: من حەز دەکەم لێرەدا یەك خاڵ رون بکەمەوە ئەویش ئەوەیە: ئێمە ئەم بزوتنەوەی ئێمە بزوتنەوەی گۆڕان خۆمان بە جێگرەوەی یەکێتیی یان بە جێگرەوەی پارتیی نازانین، ئێمە پێمانوایە پارتیی وەکو حیزبێك مێژویی هەیەو دەمێنێتو یەکێتیش وەکو حیزبێکی مێژویی هەیەو دەمێنێت، ئێمە بزوتنەوەیەکی تازەین دەنگێکی تازەین رێبازێکی تازەین بە شێوەیەکی ئیشکردنی تازە هاتوینەتە مەیدانو لە تەنیشت ئەوانەوە دانیشتوین ئێمە خۆمان بە بەدیلێکی ئەوان نازانین ئێمە بەشی خۆمان هەیە لەو ولآتە دەتوانین کاری تیابکەینو ئیشی تیابکەین ئەوانیش مەجالی ئیشکردنیان هەیەو ئێمەش مەجالی ئیشکردنمان هەیە، ئێستا بۆچونی سیاسیمان بۆ جۆری بەڕێوەبردنی ولآتەکە جیاوازە ئێمە بەو رێگەیە دەیکەینو بێگومان ئەوەی کە دێت لە بزوتنەوەی گۆڕاندا بەشداریی بکات هەندێك لەوانەن، کە وەختی خۆی لە حیزبەکاندا بەشدارییان کردوەو بەلآم بەشێکیشی لەوانەن، کە هەرگیز حیزبایەتیان نەکردوەو خەڵکی بێ لایەنن خەڵکی ئەوانەن کە قازانجیان هەیە لە چاککردنی باری ژیانی سیاسیی ئێستای کوردستانی عێراقدا.

Knn: تۆ پێشتر لەناو حیزبداو دواتر کە وازتەێناوە، ئێستا کە گۆڕان سەرکەوتوە لە خیتابی خۆتدا زۆر دژایەتی گەندەڵیت راگەیاندوە، ئێستا کە بونەتە قەوارەیەکی بەهێز یاخود کوتلەیەکی پەرلەمانیی لە پەرلەمانی کوردستاندا بە هەمان ئاراستەو بە هەمان حەماس درێژە دەدەن بە دژایەتی کردنی گەندەڵیی؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، بێگومان

# ئێمە لایەنگری ئەوەین کە پارێزگاکان چەندین دەسەڵاتی یاسایی و ئیداریی و داراییان هەبێت

سازدانی: knn

لەهەمو دنیادا لەکاتی هەڵمەتی هەڵبژاردندا جۆرێك لە ململانێو رکابەری لە نێوان هەمو هێزو حیزبو ئەولایەنانەدا دروستدەبێت، کە ململانێ دەکەن لەسەر دەسەلآت، ئەم حاڵەتەش لەهەرێمی کوردستان بەدور نییەو لەنێو لیستەکاندا جۆرێك لە پڕوپاگەندەی دژ بەیەك هەیە، بەتایبەت هەڵبژاردنی ئەمجارە کە جۆرێك لە ململانێی توندی بەخۆوە بینیوە، چونکە لیستی جیاواز لە هەڵبژاردنەکەدا ململانێدەکەن، یەکێك لەو لیستانەش گۆڕانە کە جەماوەرێکی بەرفراوانی لەدەورکۆبوەتەوە، لەبەر ئەوە کۆمەڵێك پڕوپاگەندە لەدژی بلآوکراوەتەوە، لەو پڕوپاگەندانەش ١-(لیستی گۆڕان دژبە ئاینە)٢-(دژ بەهەولێرو بادینانە)٣نەوشیروان مستەفا: (ناوچەگەری دەکات، بەتایبەت سلێمانی)٤-(ئەگەر لیستی گۆڕان دەسەلآت بگرێتەدەست، ئەوا هەرچی فەرمانبەری سەر بە یەکێتیو پارتییە دەریدەکات).

بۆ وەلآمدانەوەی ئەم پڕوپاگەندانە (knn)بەپێویستمانزانی ئەم دیدارە لەگەڵ بەڕێز (نەوشیروان مستەفا) سەرۆکی لیستی گۆڕان ئەنجامبدەین.

Knn: سەرەتا دەپرسین تێڕوانینی ئێوە سەبارەت بەئایین چۆنە؟

نەوشیروان مستەفا: دیارە کوردستان لە کۆنەوە ئاوەدانبوەو مرۆڤی لێژیاوە، کۆمەڵێك ئاینی جیاجیاو مەزهەبی جیاجیای تێداژیاوە، بەلآم زۆرینەی خەڵکی کوردستان موسوڵمانن، زۆرینەی خەڵکی کوردستانی عێراقیش نەك هەر موسوڵمانن، سوننەشن.

ئەوەی بۆ ئێمە جێگەی شانازییە لەمێژوی هاوچەرخی کوردا، لەماوەی سەد ساڵی رابردوا بەهیچ جۆرێك لە کوردستانی عێراقدا ئاژاوەی ئاینی لەنێوان ئاین‌و ئاینێکی دیکەدا، ئاژاوەی تائیفی روی نەداوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە هەمو ئەو ئاینانەی لەکوردستاندا پێکەوە دەژین، ئاینی ئیسلام، مەسیحی، کاکەیی، یەزیدی، لەمەزەبەکانیشدا مەزەبی سوننە، شیعە، شەبەك، هەمو ئەوانە بەتەبایی پێکەوە ژیاون بێئەوەی دوچاری شەڕی ئاینی یان تائیفی ببنەوە. دیارە فەزلێکی گەورەی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ پێشەوا ئاینییەکانی ئاینی ئیسلام کە لەکۆمەڵگەی کوردستانیدا خەڵکیان راهێناوە بەگیانی لێبوردن‌و گیانی یەکتر قبوڵکردنی ئاینیی.

ئەوەی پەیوەندی بە ئێمەوە هەبێت، ئەم جوڵانەوەیەی ئێمە جوڵانەوەیەکی بەرفراوانە، ئەم جوڵانەوەیەی ئێمە ئاین‌و مەزەبی جیاوازی تێدایە، لەناو ریزەکانی ئێمەدا خەڵکێکی زۆرهەیە کە موسوڵمانن‌و ژمارەیەکی زۆریشیان (موتەدەیینن) نەك هەر ئەوەی بە شوناسنامە موسوڵمانن، بەڵکو (مولتەزیمن) نوێژەکەن‌و هەمو فەرزەکانی ئاینی ئیسلام جێبەجێدەکەن، لەهەمانکاتدا لەریزەکانی ئێمەدا مەسیحی‌و یەزیدی‌و کاکەییش هەیە، لەناو موسوڵمانەکاندا شیعەمان تێدایە، سوننەمان تێدایە، شەبەکمان تێدایە.

ئەم جوڵانەوەیەی ئێمە جوڵانەوەیەك نییە لەسەر بنچینەی ئاین دامەزرابێت، وەك هەندێك لە رێکخراوو حیزبە سیاسییەکان، بەڵکو ئەم جوڵانەوەیەی ئێمە جوڵانەوەیەکە لەسەر بنچینەی (نیشتمان)دامەزراوە.

پێمانوایە لەم نیشتمانەدا هەمومان یەکشت کۆماندەکاتەوە، ئەویش برایەتییە لەنیشتماندا، هەروەکو چۆن برایەتی هەیە لەخوێندا، ئەوانەی خزمی یەکترن، برایەتی هەیە لەئایندا، برایەتی هەیە لە مەزەبدا، برایەتی هەیە لەبیرو باوەڕی سیاسیدا، ئەوی ئێمە کۆدەکاتەوە برایەتییە لە نیشتماندا، لەم نیشتمانەدا هەمو ئەوانەی سەر بە ئاین‌و مەزەبی جیاوازن دەتوانن پێکەوە بژین‌و هەمو مافەکانی هاوڵاتیبونیان هەبێت، لەهەمانکاتدا ئێمە وەکو کۆمەڵگەیەك کە

بەشـی زۆری کۆمەڵگەکـەمان موسـوڵمانە بێگومـان ئێمـە حورمـەتو ڕێـزی بێئەنـدازە لـە عەقیـدەی کۆمەڵگەکـەی خۆمـان دەگـرین، پـەیڕەوی دەکـەین، پیرۆزییەکانی ئـاینی ئیسلام هـەموی لـەلای ئێمـەش پـیرۆزن، ئەوکەسانەشـی ئەوجۆرە پڕوپاگەندانە بـۆ ئێمـە دەکـەن ڕاسـت ناکـەنو بۆ شـکاندنی ئێمەیە، بۆنمونە ئەوەندەی پەیوەنـدی بەخۆمـەوە هـەبێت، یەکێك لـە کۆنە هاوڕێکانمان لەڕۆژنامەیەکدا گلـەیی ئـەوەی لـە من کردبو کە من بەدرێژایی ژیانم دژی ئاین شتم نەنوسیوە، لەوە دەچێت ئەمەش یەکێك لەو ڕەخنانەبێت کە من پشتڕاستی بکەمەوەو بڵێم "من بەدرێژایی تەمەنم شتێکم دژی ئاین نەنوسیوە"، چونکە من خۆم باوەڕم وایە عەقیدەی ئاینیو هەستی نەتەوایەتی لە دەرونی مرۆڤدا بەهیچ شێوەیەك نامرێت، ئەزمونی یەکێتیی سۆڤییەت سەلماندی بۆ دنیا کە نە دین لەناودەبرێت، نە هەستی نەتەوایەتی، لەبەرئەوە ئێمە بێجگە لەوەی کە خۆمان وەکـو بەشـێك لـە کۆمەڵگـەی ئیـسلامی کوردسـتان دادەنـێین ڕێـزی ئیحتیرامـی عەقیـدەی دینیـی هاونیـشتمانیانی خۆمـان دەگـرین، لـەناو مـاڵو کەسـوکاری خۆشماندا پـەیڕەوی لەهـەمو ڕێوشـوێنەکانی ئیسلام دەکـەین، ئەوانـەی کە ئەو پڕوپاگەندانە بۆئێمە دروستدەکەن، بێگومان لەبەرئەوەیە ناتوانن تۆمەتبارمان بکـەن بەگەنـدەڵی، مەلـەفێکی ئەوەنـدە ڕەشمـان نییـەو لەسـەر شـتی دیکـە عەیبـدارمان دەکـەن، لەبەرئـەوە ئـەو جـۆرە قـسانەمان بۆهەڵدەبەسـن، بـەڵام یەکشتی تـر هەیـە، ئـەویش ئەوەیـە کـە پێمانخۆشـە پێـشەواو زانایـانی ئـاینی پێـشەوای هـەمو لایـەك بـن، بێگومـان ئـەوانیش وەکـو هـەمو هاوڵاتییـەکی کوردستان ئازادن لەوەی کە دەنگ بە چ حیزبێك یان بە چ لیستێك دەدەن، بەڵام ناشـێت مزگـەوتو مینبـەری پـیرۆزی مزگـەوت بـەکاربهێنن بـۆ پڕوپاگەنـدەی حیزبیی، ئێمە هەروەك چۆن لایەنگری ئەوەین زانکۆ سەربەخۆ بێت، لایـەنگری ئەوەین پەروەردە سەربەخۆ بێت، لایەنگری ئەوەین قوتابخانەکان سـەربەخۆبن، لایـەنگری ئەوەشـین کـە هـەمو مزگەوتـەکان، ئـەوقاف، مامۆسـتایانی ئـاینی، یەکێتیی زانایان، ئەمانە هەمو سەربەخۆبنو دوربن لەدەستتێوەردانی حیزبی،

وەك ئێستا هەندێك لایەن دەیکەن، مەلاكان بەكاردێنن بەداخەوە، بەدرێژایی مێژو ژمارەیەكی زۆری پیاوانی ئاینی پێشەواو پێشڕەوی كۆمەڵ بون، لەهەمانكاتدا بەدرێژایی زەمەنیش دەسەلاَت توانیویەتی لەناو زانایانی ئاینیدا هەندێك كەس بكڕێت بۆئەوەی ریكلامیان بۆبكەن، بەكورتی ئەوانەی ناویان ناون (وعاج السلاگین).

Knn: بۆچونتان چۆنە سەبارەت بە پەیوەندیی سیاسەتو ئاین؟

نەوشیروان مستەفا: پێمانوایە ئاین رۆڵێكی گرنگی هەیە لەروی كۆمەلاَیەتییەوە بەتایبەت لە پەروەردەكردنی مرۆڤدا، هەروەك ئاین رۆڵێكی گەورەی هەیە لەكاروباری سیاسیدا(نەك بەمانای حیزایەتی)، بەڵكو مەلای مزگەوت، زانای ئاینیی بەشێكن لەكۆمەڵ، هەمو ئەو گیروگرفتانەی لە كۆمەڵدا دێتە پێشەوە، هەمو ئەو قەیرانە ئابوریو كۆمەلاَیەتیو رۆشنبیرییانەی كە دێنە پێشەوە، ئەوانیش دەگرێتەوە لەبەر ئەوە دەزگای ئاینیی، مزگەوت دەبێت شوێنی كۆبونەوەی هەمومان بێت، نابێت وای لێبكرێت تەنیا بۆ لایەنێكی سیاسی دیاریكراوبێت، چونكە ئەوە لەباتی ئەوەی خەڵك كۆبكاتەوە دەبێتە هۆی دروستبونی ناكۆكی لەناو خەڵكدا، پێمانوایە كە دەبێت مزگەوت رۆڵی گرنگی هەبێت لەپەروەردەكردنی كۆمەلاَیەتیو سیاسیی خەڵكدا، بەلاَم بە لای حیزبایەتیدا نا، یاخود تەرخانكردنی مزگەوت بۆلایەنێكی دیاریكراو، بەڵكو مزگەوت دەبێت شوێنی كۆبونەوەی هەموان بێت، نەك یەك لایەن.

Knn: رۆژانە گوێبیستی ئەوە دەبین كە بزوتنەوەی گۆڕان دەیەوێت كودەتا بەسەر حكومەتدا بكات، وەلاَمی ئێوە بۆ ئەوە چییە؟

نەوشیروان مستەفا: بەبۆچونی من ئەوەی ئەم قسەیەدەكات لەزانستی سیاسیدا هیچ شارەزاییەكی نییە، چونكە كودەتا بە سوپادەكرێت، دەبێت سوپا بڕوات لەشەوێكی تاریكدا دەستبگرێت بەسەر كۆشكی كۆماریو دەزگای راگەیاندندا، بەلاَم ئێمە نەسوپامان هەیەو نە هێزی چەكدارمان هەیە.

ئێمە نامانەوێت کودەتا بکەین، ئێمە دەمانەوێت گۆڕین بکەین‌و گۆڕینیش بەهیچ جۆرێك مانای روخاندن‌و کودەتا نییە، ئێمە دەمانەوێت گۆڕین بکەین لەشێوەی بەڕێوەبردنی حوکمڕانیدا، دەمانەوێت گۆڕین بکەین لە پەرلەمانداو گۆڕین بکەین لە ئەنجومەنی وەزیراندا، دەمانەوێت گۆڕین بکەین لەدادگاو لەهەمو دامودەزگاکانی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا بەرەو باشتر، ئێمە هەرگیز بیر لەروخاندن ناکەینەوە بیر لەتێکدان ناکەینەوە، ئەوەی بیری لێدەکەینەوە گۆڕینە بەرەو باشتر، هەروەك باسمکرد ئەوانەی ئێمە تۆمەتبارەکان بە کودەتا دیارە شارەزای کاروباری سیاسی نین.

Knn: پڕوپاگەندەی ئەوە دەخرێتە پاڵ ئێوە کە گۆڕان ناوچەگەرێتی‌و سلێمانیچێتی دەکات، وەڵامی ئێوە چییە؟

نەوشیروان مستەفا: ئەم پرسیارە شتێکی بیرخستمەوە، بەداخەوە ئەمە جاری دوهەمە ئەم قسەو باسە لەگەڵ من دەکرێت، جاری یەکەم کە ئەم پرسیارە لەمنکراوە، لەگەرمەی خولی دوهەمی شەڕی ناوخۆدا بو، ئەوکاتە کاك(کەریم عوسمان)ی رەحمەتی سەرپەرشتیار یان بێژەربو لە تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان کە لەهەولێرەوە پەخشی دەکرد، ئەو هات بۆلای من‌و هەمان پرسیاری لێکردم کە گوایە من وتبێتم (کوێی موقەدەسە) ئەو قسەیەی من لەگەلی کوردستان بلاّوبوەوە لە کوردستانی نوێش، بۆیە بەلامەوە سەیرە لەدوای ئەم هەمو ساڵەمان قسە دوبارە دەکەنەوە.

ئێمە نەك ناوچەگەرێتی ناکەین، بەڵکو ئێمە جولاّنەوەیەکی سیاسین، ئێستاو دواڕۆژیش، کۆمەڵێك شت هەیە تێمانپەڕاندوە، هەرکەس لە ئێمە سنوری ناوچەو بنەماڵەو قەبیلەمان تێپەڕاندوە، سنورێکی زۆر فراوانتر کە پێیدەوترێت نەتەوەی کورد، کۆماندەکاتەوە، هەربۆیە هیچ کەسێك لەئێمە لەقەبی عەشیرتمان هەڵنەگرتوە، ئەگەر نا ئێمە دەمانتوانی لەقەبی بنەماڵەکەی خۆمان یان ئەو عەشیرەتەی لەبنجوبنەواندا هەمان بوە هەڵبگرین، وەك هەندێك کەس کە شانازی دەکات بەلەقەبی عەشیرەتەکەیەوە، ئێمە لەناوچەگەریشدا لەگوند

تێپەڕیوین بۆ شار لەشاریشەوە تێپەڕیوین بۆ سنورێکی فراوانتر کە پێیدەوترێت نیشتیمان، ئەویش کوردستانە، ئێمە خۆمان بە کوردستانی دەزانین نەك ناوچەگەر، کەسانێك کە گلەیی لەئێمە دەکەن لەسەر ناوچەگەریی بابڕۆن کە تاوەکو ئێستە لەقەبەکانیان بەناوی دێیەکی بچوکەوەیە، یاخود بەناوی شارێکەوەیەو شانازی پێوەدەکەن، ئێمە نەك هەر بنەماڵەو قەبیلەو عەشیرەتمان تێپەڕاندوە بۆ سنوری نەتەوایەتی کورد، نەك هەر سنوری گوندو شارۆچکەو شارمانکردوە، بۆنیشتمانێکی گەورەتر کە ناوی کوردستانە، بەڵکو جیاوازیو ململانێی ناوخۆیی حیزبییشمان تێپەڕاندوە، ئەو ململانێیەی ئێمە هەمانە لەگەڵ تێکڕای سیستمی سیاسییە لەکوردستاندا، کەواتە ئێمە بەهەمو شێوەیەك لە سنوری ناوچەگەری دەرچوینەتە دەرەوە، چوینەتە ناو سنورێکەو کە ناوی نەتەوەی کوردوونیشتمانی کوردستانە. سنورێك کەناوی هەرێمی کوردستانە.

Knn: ئەگەر ئەمە بیروبۆچونی ئێوەیە، بۆچی ئەوەندە بەناوچەگەرێتی تۆمەتبار دەکرێن؟

نەوشیروان مستەفا: ئەوە بەشێکە لەفەلسەفەی سیاسیی حوکم، ئێمە باوەڕمان بەوە نییە کە هەمو دەسەڵاتەکان کۆبکرێنەوە لەدەستی ئەنجومەنی وەزیراندا، یان لەدەستی چەند کەسێکدا، ئێمە باوەڕمان بەوە نییە کە هەمو یەکە ئیدارییەکانی سەرتاسەری کوردستان چاوەڕوانی دەستی چەند کەسێکبن لە هەولێر.

لە بەڕێوەبردندا دو جۆرە بەڕێوبردن هەیە یەکەم: بەڕێوەبردنێك کە پێیدەوترێت ستونی یاخود (ئیدارەی عەمودی) بەڕێوەبردنێکیش هەیە پێیدەوترێت بەڕێوەبردنی ئاسۆیی واتە (ئیدارەی ئوفوقی) لە ئیدارەی ستونیدا هەمو دەسەڵاتەکان بەلای مەرکەزییەتدا دەڕۆن، واتە بەرەو ناوەند، بۆنمونە ئەگەر بەڕێوەبەری گشتیی قوتابخانەیەك ویستی تەوالێتێکی کچان یان کوڕان دروستبکات دەبێت بنوسێت بۆ بەڕێوەبەری گشتیی لە پارێزگاکەی خۆیو

لەوێوە بچێت بۆ ئەنجومەنی وەزیرانو لە ئەنجومەنی وەزیرانیشەوە بڕوات بۆ چەند شوێنێکی تر تا بڕیاری لەسەر دەدرێت، ئەمە نمونەیەکی زۆر سادەی بەڕێوەبردنی ئیدارەی عەمودیە لەولاتدا کەهەمو دەسەلاتەکانو دابەشکردنی سامانو دەسەلات لەدەستی چەند کەسێکی کەمدا یان لەدەستی کەسێکدا کۆبکرێتەوەو بەپێچەوانەی ئەمەوە، ئیدارەی ئاسۆیی دابەشکردنی سامانو دەسەلاتە بەسەر پارێزگاکاندا، ئێمە لەکۆنەوە لایەنگری ئەوە بوین کە پارێزگاکانی کوردستان، سلێمانی، دهۆك، هەولێر، هەمو ئەمانە چەندین دەسەلاتی یاسایی‌و ئیداری‌و داراییان هەبێت بۆئەوەی بتوانن ئیشەکانی خۆیان بە شکلێکی لامەرکەزیی بەڕێوەبەرن، ئەوەی کە باسمکرد پەیوەندی بە فەلسەفەی حوکمڕانیی‌و فەلسەفەی لامەرکەزییەوە هەیە.

ئێمە لایەنگری ئەوەین کە پەرلەمانێکمان هەبێت یاساو تەشریعات بۆ سەرتاسەری کوردستانی عێراق دابنێت‌و هەمو ناوچەکانی کوردستانی عێراق هەر لە زاخۆوە هەتاوەکو کفری پابەندبن بە جێبەجێکردنی ئەو یاسایانەوە، لایەنگری ئەوەین ئەنجومەنێکی وەزیرانمان هەبێت پلانی ئابوری، سیاسی، کۆمەلایەتی‌و فەرهەنگی لەسەر ئاستی هەمو کوردستانی عێراق پلانی پێنج ساڵەو دەساڵەو پانزە ساڵە، دابنێت. لەهەمانکاتدا ئەنجومەنی وەزیران ئەو لایەنەبێت کە پەیوەندی لە نێوان هەرێمو ناوەنددا ڕێکبخات، هەروها لەنێوان هەرێمو دەوڵەتانی دونیا ڕێکبخات، بەلام ئێمە لایەنگری ئەوە نین هەمو دەسەلاتەکان لە ئەنجومەنی پارێزگاکانو لە قایمقامەکانو بەڕێوەبەری ناحیەکان بسەنرێنەوەو بدرێن بەئەوان، ئەمە لەبەرئەوەیە پێماندەلێن ئەمانە سلێمانیچێتی دەکەن، بەلێ من لایەنگری ئەوەم کە ئەنجومەنی پارێزگای سلێمانی هەمو دەسەلاتێکی هەبێت، بەلام لەهەمانکاتیشدا لایەنگری ئەوەم ئەنجومەنی پارێزگای دهۆكو هەولێریش(ئومێدموایە لەپاشەڕۆژیشدا کەرکوکیش)ئەمانە دەسەلاتی جێبەجێکردن، دەسەلاتی کارگێڕی، دەسەلاتی دارایی‌و کۆمەلێك دەسەلاتی وایان هەبێت کە لەسنوری ناوچەکەی خۆیاندا

بەڕێوەیبەرن‌و وایان لێنەکرێت بۆ هەمو شتێك موحتاجی دەستی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران بن، ئەم بیرکردنەوەیەی ئێمە بەشێکە لەفەلسەفەی سیاسیی بەڕێوەبردنی ولآت، پەیوەندی بە ناوچەگەرێتییەوە نییە.

Knn: یەکێك لەو پڕوپاگەندانەی بەرامبەر لیستی گۆڕان دەکرێت ئەوەیە کە دەڵێن "ئەگەر ئێوە دەسەلآت بگرنەدەست‌و هەڵبژاردنەکان ببەنەوە، ئەو لەشکرە گەورەیەی دەزگاکانی حوکمڕانی پێشو دایمەزراندون هەمویان دەردەکەن‌و موچەکانیان دەبڕن!؟" قسەی ئێوە چییە؟

نەوشیروان مستەفا: بێگومان ئەوە درۆیەکی شاخدارە، دەیکەن بۆئەوەی ئەو لەشکرە گەورەیە بکەن بەگژماندا، ئێمە نەك موچەی هیچ کەسێك نابڕین، بەڵکو تەنانەت بیرمان لەوە کردوەتەوە ئەوانەش کە موچەیان نییە جۆرێك لە سەرچاوەی ژیانیان بۆدابین بکرێت، بۆنمونە (ژنی ماڵ) کە ژمارەیەکی زۆر زۆرن لە کوردستاندا، ئێمە داوای ئەوە دەکەین حسابێکیان بۆبکرێت، چونکە ئەو ئیشەی لەماڵدا دەیکات کە بەخێوکردنی منداڵ‌و بەڕێوەبردنی ناو ماڵەکەیەتی وەك ئیشی کارمەندانی حکومەتەو پێویستە حسابیان بۆبکرێت‌و لەبەرامبەردا پارە وەربگرن‌و پاشەڕۆژیان مسۆگەر بێت، لایەنگری ئەوەین‌و داوای ئەوە دەکەین بیمەی کۆمەڵایتی هەبێت، لایەنگری ئەوەین بانکێکی تایبەتی هەبێت بۆ یارمەتیدانی گەنجەکان، بۆئەوەی بتوانن ژن بهێنن خانو بکڕن، ئۆتۆمبێل بکڕن، درێژە بەخوێندن بدەن، پرۆژەی بچوك‌و ناوەندی دروستبکەن.

ئێمە لەهەمانکاتدا لایەنگری ئەوەین ئاوەدانی بخرێتە دێهاتەکانەوەو (ئێمە باوەڕمان بەوە نییە بەتەنیا بڕۆی چەند شەقام‌و قوتابخانەو مزگەوت‌و بنکەیەکی تەندروستی بکەیتەوە) ئێمەباوەڕمان بەوە هەیە کە دەبێت چۆنایەتیی ژیانی جوتیاری کورد بگۆڕین.

دەوڵەمەندو هەژار سود لە بەرنامەکەی ئێمە دەبینن، بەڵام بەڕێژەی جیاواز، ئەوەی زۆرترین سودی لێدەبینێت گەنجەکانن کەبەشی زۆری کۆمەڵگەی ئێمەن،

فەقیرو هەژاری لادێو شارە لەگەڵ ژنی ناوماڵدا کە ئەمانە زۆرینەی کۆمەڵگەی کوردین، ئێمە بەهیچ جۆرێك لەم قۆناغەو دوای ئەم قۆناغەش دەستکاری هەندێك سیستم هەیە نایکەین لەوانە سیستمی موچە، سیستمی تەندروستی، سیستمی پەروەردە، ئەو سیستمانەی کە تائێستا دەقیانگرتوە بەبێ لێکۆڵینەوەیەکی قوڵو بەبێ دڵنیابون لەوەی بتوانین (بەدیل)ێکی زۆر باشتری بۆبدۆزینەوە بەهیچ جۆرێك دەستکاری ناکەین، بۆیە ئەو پڕوپاگەندانە راست نین.

Knn: پڕوپاگەندەی ئەوەش دەکەن کە لیستی گۆڕان هیچ جۆرە پەیوەندییەکی دیبلۆماسی لەگەڵ هیچ وڵاتێکدا نییە، بەتایبەت ئەمریکاو بەریتانیا، ئەمە تاچەند راستە؟

نەوشیروان مستەفا: ئەگەر ئەوان پەیوەندیی دیبلۆماسییان هەبێت ئەمە هیچ هونەرێکی تیانییە، ئەوان لەبەرزترین پلەی حوکمڕانیدان لەکوردستانو لە عێراقیشدا، شتێکی ئاسائییە کە لەگەڵ دەوڵەتانی دونیا پەیوەندیی دیبلۆماسی دروستدەکەن، لەگەڵ کاربەدەستانی حکومەتدا دروستی دەکەن، ئەوانە پلەی زۆر بەرزیان هەیە، سەرکۆماری عێراقە، سەرۆکی هەرێمی کوردستانە، سەرۆك وەزیرانە، وەزیری دەرەوەیە، شتێکی ئاساییە دەبێت پەیوەندیی دیبلۆماسی فراوانیان هەیە، بەڵام لەهەمانکاتدا، ئێمە کە وەکو لیستێك هاتوینەتە مەیدانەوە پێشتریش وەکو دەزگایەکی راگەیاندنی گەورە پەیوەندیی دۆستایەتی فراوانمان هەیە لەگەڵ زۆر دامودەزگای دەرەوەو سەردان لەنێوانماندا هەیە، هەواڵگۆڕینەوە لەنێوانماندا هەیە، پەیوەندییەکی باشمان هەیە لەگەڵ ئەوانەدا، بۆ مەسەلەی ئەم هەڵبژاردنەش ئەوان بێلایەن دەبنو لەدواییشدا مامەڵە لەگەڵ براوەو ئەمری واقیعدا دەکەن.

Knn: باس لەوە دەکەن کە نەوشیروان مستەفا مامەڵەیەکی توندوتیژی لەگەڵ ژندا هەیە، بۆ ئەمە چی دەڵێیت؟

نەوشیروان مستەفا: من لەم شەوانەدا لە تەلەفزیۆنەوە پەیامێکی تایبەتم هەبو بۆپرسی ژنان، هیوادارم زۆربەی ژنان گوێیان لێ بوبێت، ئەوە دیسانەوە هەر دەچێتە خانەی ئەو قسە بێبنەمایانەوە کە دەیکەن، بڕواناکەم پیاوێك مەگەر نەخۆش بێت ئەگینا هەرگیز دژی ڕەگەزی مێ نابێت، ئەو بەرنامەیەش کە ئێمە هەمانە بۆژنان، پێموابێت بۆیەکەمجارە لەدەرگای هەندێك بابەتماندواە کە لە پەرلەمانی داهاتودا هەوڵدەدەین هەموی بکەین بە یاسا، لەناو ئەو یاسایانەدا بۆنمونە دابینکردنی ئەو موچە تایبەتەیە کە بۆ ژنی ماڵ داوای دەکەین، ئەمەش لەپێناو ئەوەدا تا ژنی ماڵیش جۆرێك لەسەربەخۆیی ئابوری هەبێت، پێویستە ئەو کارەی لەناوماڵدا دەیکات چ بەخێوکردن بێت یان ئیدارەکردن وەکو کاری کارمەندانی تری حکومەت بۆی حساب بکرێت، جگە لەوە چەند یاسایەکی دیکەمان بەدەستەوەیە کە لەئێستاشەوە هەندێك لەشارەزایانمان لەیاسا ئامادەی دەکەنو زۆر بەلامانەوە گرنگەو بۆ پاراستنی ژنانە، بابەتی یاسای (مەنعی تەحەڕوشی جنسییە) کە ئێمە زۆر بەلامانەوە گرنگە، یاسایەکی تریان یاسای قەدەغەکردنی جیاوازی ڕەگەزییە (جێندەر) کە نابێت جیاوازی لە نێوان نێرو مێدا بکرێت لەسەر بنەمای ڕەگەز، چ لەماڵدا چ لەناو فەرمانگەکانو شوێنە گشتییەکاندا، یاسایەکی دیکەیان ئەوەیە کە لەباتی ئەوەی جیاکاری ڕەگەزیی نەگەتیڤ هەبێت جیاوازی ڕەگەزیی پۆزەتیڤ هەبێت، بۆئەوەی ئەگەر ژنو پیاوێك پێکەوە هەمان مەرجیان تیابوو داوای کارێکیانکرد، ژنەکە پێشبخرێت، بەکورتی کۆمەڵێك شتمان بەدەستەوەیە کە بەڵگەی ئەوەیە من ژنم خۆشدەوێت.

Knn: پڕوپاگەند کراوە کە لەکاتی دەنگداندا کامێراهەیەو ئەگەر دەنگ بە لیستی دەسەلات نەدەن موچەکەیان دەبڕێت، لەم بارەیەوە قسەتان چییەو تاچەند لیستی گۆڕان ئیشی بۆ ئەوە کردوە کە کامێری چاودێریی نەبێت؟

نەوشیروان مستەفا: ئەم جۆرە پڕوپاگەندانە بەشێکە لەو جەنگە دەروونییەی کە ئەو لایەنانەی ترسی دۆڕانیان هەیە بلاویدەکەنەوە، من دەمەوێت لێرەوە

هاونیشتمانیانی کوردستان دڵنیابکەم کە ئێمە پێیانوتوین "ئەگەر هەڵبژاردن لە کوردستانی عێراقدا باشتر نەبێت لەهەڵبژاردنی پارێزگاکانی عێراق (کە پێش ماوەیەك ئەنجامدرا) ئیعتیراف پێناکەین. " بێجگەلەوە مەسەلەی بونی کامێرا لە بنچینەوە درۆیەو مەسەلەی قەڵەم ومرەکەبو ئەوشتانەی کە باسی دەکەن هەموی درۆیە، ئەوە تەنیا بۆ ئەوەیە کە خەڵك وا لێبکەن بڵێت "ئەگەر بچم بۆهەڵبژاردن یان نەچم لە ئێستاوە ئاکامی هەڵبژاردن دیاریکراوە لەبەرئەوە بۆچی بچم بۆدەنگدان"، ئەمە هەموی جەنگی دەرونییە لەگەڵ خەڵك ئەگەرنا مەسەلەی مۆبایل بۆ وێنەگرتن یان ئەوەی کە قەڵەمەکە ئەسڕێتەوە، ئەوە هەموی درۆیەو باوەڕموایە ئەمجارە کەمترین ڕێژەی ساختەکاریی لەکوردستاندا دەکرێت، بەتایبەت کە ئێمەش لەسەروی سێهەزارچاودێرەوە چاودێرمان داناوە بۆ چاودێریی سندوقەکانی دەنگدانو هەریەك لەئەوان بەدوچاو چاودێری دەنگدانەکە دەکەنو نایەڵن ساختەکاریی بکەن.

Knn: سەبارەت بەسوێندانی کارمەندانو ئەوانەی پۆلیس یان ئاسایشنو لەدامودەزگاکاندا کاردەکەن، سوێندیان دەدەن کە دەنگبدەن بە لیستی کوردستانی، سەبارەت بەوە چی دەڵێن، ئێوە چیتانکردوە بۆچ رسەری ئەمە؟

نەوشیروان مستەفا: بۆ ئەم حاڵەتە پرسیارمان لە کۆمەڵێك زانای ئاینیی کردوە، لەم رۆژانەشدا رەنگە بڵاوبکرێتەوەو وەك فەتوا بڵاویدەکەنەوە، کە هەمو ئەو سوێندانەی لەژێر فشارو گوشاردا دەدرێن، هەمو ئەوسوێندانەی کە خەڵك لەترسا ناچاردەکرێن بیخوات، هەمو ئەوسوێندانە(باتیلە)و ئەو کەسە نە تەڵاقی دەکەوێتو نە گوناهی دەگات ئەگەر سوێندەکە بشکێنێت، بەڵکو دەتوانێت ویژدانی خۆی ئاسودە بکاتو دەنگ بەو لیستە بدات کە خۆی دەیەوێتو باوەڕی پێیەتی، (فشارو نانبڕینو سوێندانو تەڵاق پێخواردن) ئەمانە هەمو پێچەوانەی ئەخلاقە.

Knn: لەگەڵ ئەوەی خەڵكێكی زۆر چاوەڕوانی (٢٥-٧)ن بۆدەنگدان، لەبەرامبەریشدا خەڵكێكی زۆر هەیە كە رەشبینن‌و دەنگ بەهیچ قەوارەیەك نادەن، قسەی تۆ لەمبارەیەوە چییە؟

نەوشیروان مستەفا: سەرەتا لەهیچ جێگایەكی دونیادا لەسەداسەدی ئەوانەی مافی دەنگدانیان هەیە ناچن بۆ دەنگدان، بەلاَم ئەوەی كە تۆ باسی دەكەیت خەڵك رەشبینە یان نائومێدە لەراستیدا خەڵك ناهەقی نییە، من خۆم یەكێك بوم لەوانەی كە لەهەڵبژاردنی پێشودا هەم بانگەشەمكردوە هەم دەنگمداوە، لە راستیدا من پەشیمانم كە دەنگم بەم كۆمەڵە داوە، بەلاَم ئومێدموایە كە خەڵك نائومێد نەبێت، چونكە ئێمە لەبەردەم قۆناغێكی نوێداین كە دەتوانین ناوی بنێین قۆناغی وەرچەرخانێكی سیاسی لە مێژوی سیاسیی میللەتەكەماندا، ئەمجارە وەكو جارەكانی ترنییە، ئەمجارە لیستی جیاواز هەیە، بە بەرنامەی جیاوازەوە موناف‌ەسەیەكی توندوتۆڵ هەیە، من ئومێدموایە هەمو ئەو كەسانەی كە نائومێدبون وەك دەوترێت (وتفائلوا بالخير تجدوه)، ئومێدموایە هەمو گەشبینبن‌و هیوایان هەبێت، مرۆڤ كە هیوابڕاوبو بەڕاستی دونیا زۆر تاریك دێتە بەرچاوی، دنیای ئێستای كوردستان بۆ خۆشبەختی زۆر روناكە، هەمو نیشانەكان ئاماژەی ئەوەیان تێدایە كە ئێمە بۆ پێشەوە دەچین، پاشەڕۆژێكی روناكمان هەیە، ئاسۆیەكی روناكمان لەبەردەمدایە، ئێمە رەنگە لەچەند رۆژی داهاتودا لیستێك بەناوی ئەو یاسایانەی بەقازانجی خەڵكەو بەنیازین لە پارلەماندا تێیپەڕێنین، بلاَوبكەینەوە، لەبوارەكانی چاكسازیی ئابوری‌و كۆمەلاَیەتی‌و لەقازانجی گوزەرانی خەڵك‌و گەنجانی ولاَتەكەماندایە. ئومێدیشموایە ئێمە بتوانین كارێكی وا بكەین ئەوەی توشی نائومێدی بوە جارێكی تر ئومێدی بەژیان بۆ دروست بێتەوە، هەرخۆی ناوی گۆڕان جۆرێك لە ئومێدو هیوا دەبەخشێت بەخەڵك.

Knn: کەواتە تاچەند پابەنددەبن بەجێبەجێکردنی ئەوبەڵێنانەوە کە بەخەڵکی دەدەن؟

نەوشیروان مستەفا: ئومێدموایە کە هەمو هاوکارەکانمو هەمو ئەوانەی کە کاندیدکراون پابەندبن (وەکو بەڵێنو پەیمانیانداوە)، پابەندبن بەجێبەجێکردنی بەرنامەکەوە، بەڵام بەداخەوە لەبەرئەوەی لەم وڵاتەی ئێمەدا ئەو دامودەزگایانە چاوی میللەتیان بەسەرەوە نەبوەو دادگایەکی باڵای وەك دادگای دەستوری نییە کە رێگیری لەو شتانە بکات، لەبەرئەوەی لێرە گوشاری جەماوەریی لەسەر حکومەت زۆر کەمبوە رێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی لاوازنو دەسەڵاتی چوارەم یاخود میدیای ئازادیش هەندێك قسەی کردوە، بەڵام ئەویش نەیتوانیوە رایەکی گشتیی وا دروستبکات کە چاودێربێت بەسەر حکومەتەوە.

لەم دەزگایانەی ئێمەدا چ وەزیرەکان یان ئەندام پارلەمانەکان ئەوەندە ئیمتیازاتیان هەیە کە لەناو ئەم هەمو ئیمتیازاتانەدا خەمەکانی خەڵکیان بیردەچێتەوە، وەك یەکێك کە چۆن یەکەمجار تۆزێك حەشیشە دەخوات دوایی دەبێتە مودمینی تەواو، بەڵام ئومێدموایە ئەم دەستە نوێیەی پەرلەمان زۆر چالاكو کارا بنو هەوڵبدەن ئەو ئیمتیازاتانەی پەرلەمان وا کەمکەنەوە کە خەڵك ئەندامێتی پارلەمان وەك ئیمتیازو دەسکەوت تەماشا نەکات، بەڵکو بەخزمەتکردنی نیشتمانو ئەرکێکی بزانێت.

Knn: لەکۆتاییدا دەمەوێت بەشێوەیەکی رونتر لەسەر ئەو پڕوپاگەندەیە قسەم بۆ بکەیت کە گوایە ئەگەر ئێوە بێنە سەر دەسەڵات موچەی کادیرانی یەکێتیو پارتی دەبڕن؟

نەوشیروان مستەفا: بێگومان ئێمە موچەی هیچ کەسێك نابڕین، بەڵکو موچەبڕینی هەرکەسێك لای ئێمە وەکو تاوانێك وایە کە بەرامبەر خێزانێکی کورد دەکرێت، ئێمە هەمو ئەوانەی کە کادیری یەکێتیو پارتین بەهاوسەنگەرو بە براو بەخۆشەویستی خۆمان دەزانین لەهەمو ئاستەکاندا، ئێستا ململانێیەکی دیموکراسی هەیە، ئێمە کە دواتر دەسەلاتمان گرتەدەست بەهیچ جۆرێك هیچ جۆرە حسابو کیتابێکمان لەگەڵ کادیرەکانی پارتیو یەکێتیو حیزبەکانی تردا نییە، بەپێچەوانەوە وەکو باسمکرد ئەو سیستمی موچەیەی کە ئێستا هەیە هەتاوەکو بەدیلێکی باشتری بۆنەدۆزینەوە دەستکاریی ناکەین، ئێمە بەچاوی ڕێزو پێزانینو خۆشەویستییەوە تەماشای هەمو ئەو تێکۆشە

# یەك ریزی ناو ماڵی کورد بە کێبڕکێی دیموکراتی دەبێت

سازدانی: سایتی سبەی

لەم چاوپێکەوتنەدا نەوشیروان مستەفا سەرۆکی لیستی (گۆڕان) تیشك دەخاتە سەر چەند لایەنێکی بارودۆخی هەرێمی کوردستانو ئاماژەش بەچەند لایەنێکی پرۆگرامی لیستەکە دەکات.
هەروەها باس لە پێویستیی سەربەخۆ بونی دامودەزگا جیاوازەکانی وەك (قەزاو زانکۆو پارلەمانو بازاڕ) لەهەرێمی کوردستاندا دەکاتو ئاماژەش بەگرنگی پرۆسەی گەشەپێدانی مرۆڤی کوردو تێگەیشتنی ئەوان وەك لیستی گۆڕان بۆ ئەم بابەتە دەکاتو دەڵێت" ئێمە پێمان وایە تەنمیەی بەشەر لەپێش هەمو شتێکدایە، چۆن دەتوانیت چۆنایەتی ژیانو گوزەرانی هاوڵاتی ئاسایی کوردستانی عێراق بگۆڕیت، چۆن دەتوانی لەبوارەکانی پەروەردەو تەندروستیو فەرهەنگیو بوارەکانی تری ژیاندا گەشە بە مرۆڤی کورد بدەیت، مەسەلەی ژێرخانی ئابوری زۆرگرنگە مەسەلەی ئاوەدانکردنەوەی وڵات گرنگە، بە لاّم ئاوەدانکردنەوەی کەسێتی ئینسانی کوردو گێڕانەوەی کەسایەتی بۆ ئینسانی کورد گێڕانەوەی ماف هاوڵاتی بون بەجۆرێك کە ئینسانی کورد شعور بە عیزەتی نەفسو بەسەربەرزیو بەکەرامەت بکات لەو لاّتەکەی خۆیدا".
Knn: سەرەتا بابپرسین ئێوە چۆن ئەم قۆناغەی بارودۆخی سیاسی هەرێمی کوردستان لێکدەدەنەوەو هەڵیدەسەنگێنن؟
نەوشیروان مستەفا: لەمێژوی هەمو گەلێکدا چەند وێستگەیەکی سەرەکیو گرنگی تێدایە، لەپەنجا ساڵی رابردوشدا مێژوی گەلەکەی ئێمە لەکوردستانی عێراقدا چەند وێستگەیەکی هەیە کە هەندێکیان نیشانەن بۆ کۆتایی هاتنی

قۆناغێكو دەستپێكردنی قۆناغێكی تر، بۆنمونە ساڵی پەنجاو هەشت كە رژێمی پاشایەتی گۆڕا بە رژێمی كۆماری بۆیەكەمینجار لەدەستوری عێراقدا شەریكایەتی كوردو عەرەب سەلمێنرا، ئەمە یەكێكە لە وێستگە گرنگەكانی مێژوی نوێی میللەتەكەمان، ساڵی شەستو یەك شۆڕشی كوردستانی عێراق دەستی پێكرد كە دەتوانین بڵێین یەكێك لەدرێژترینو جەماوەریترین شۆڕشەكانی مێژوی گەلەكەمان بوە، ئەویش وێستگەیەكی ترە، بە لاَم لە بەرامبەر ساڵی شەست ویەك ساڵی حەفتاو پێنج هەیە، كەساڵی هەرەسهێنانی شۆڕشەكەیە، ئەویش وێستگەیەكی ترە.

ساڵی حەفتاو شەش دەستپێكردنەوەی بەرەنگاری سیاسیو چەكداری رژێمی بەعس لەكوردستانی عێراقدا ئەویش وێستگەیەكی ترە، ساڵی ١٩٨٨ رژێمی بەعس توانی بە چەكی كیمیاویو لەئەنجامی عەمەلیاتی ئەنفالدا جوڵانەوەی كورد بەتایبەتی جوڵانەوەی سیاسیو چەكداری كورد تێكبشكێت، ئەویش یەكێكی ترە لە وێستگە سەرەكیو گرنگەكانی مێژوی گەلەكەمان كە كۆتایی قۆناغێكو سەرەتای دەستپێكردنی قۆناغێكی ترە لەژیانی گەلەكەماندا. ساڵی ١٩٩١كە راپەرین رویدا دوای راپەرین كۆڕەو دوای كۆڕەو هەڵبژاردنو پێكهێنانی حكومەتی هەرێمی كوردستان، ئەمانە هەمو ئەو وێستگە سەرەكیو گرنگانەن لە مێژوی گەلەكەماندا كە لەلایەكەوە لەهەندێ قۆناغدا كۆتایی قۆناغێكو سەرەتای قۆناغێكی تربوە لەلایەكی تریشەوە بەڵگەی ئەوەیە كە گەلەكەی ئێمە زیندوە لەدوای تێكشكان هەمیشە هەستاوەتەوە بەرەنگاری دەستپێكردوەتەوە هەتاوەكو لەدوای راپەرین توانی سەركەوتنێكی گەورە بەدەستبهێنێتو دامو دەزگای حكومەتی هەرێم دروستبكات، ئەوەی ئێستە ئێمە ئەیبینین ئێستا وێستگەیەكی تری ژیانی سیاسی میللەتەكەمان دەستپێدەكات لە دوای راپەرینەوە تا ساڵی ٢٠٠٣كە ساڵی روخانی رژێمی بەعسە لە ٢٠٠٣وە تا ساڵی ٢٠٠٥، دەستوری عێراقی نوسراو لە دەستوری عێراقیدا مەسەلەی فیدرالیزم جێگیركرا.

ئێستە وێستگەیەکی تازە لە ژیانی سیاسی میللەتەکەمان دەستی پێکردوە، کە دەتوانین ناوی بنێین وێستگەی گۆڕان، وێستگەی ڕێکخستنەوەی ناومالّی خۆمان وێستگەی ئەوەی کە سەرلەنوێ چاو بخشێنینەوە بە هەمو دامو دەزگاکانی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا بۆ ئەوەی سەرلەنوێ بینای بکەینەوە بە شکڵێکی وا کە جێگەی ڕەزامەندی میللەتەکەمان بێت.

Knn: لەم ماوەیەدا زۆرباسی گۆڕان دەکرێتو ئێوەش لیستەکەتان ناو ناوە (گۆڕان)پێتوایە ئەم گۆڕانە لەئێستادا پێویست بێت؟ ئایا بۆچی لەمەو پێش کە بەرێزتان کەسایەتیەکی دیار بونو لەناویەکێتی نیشتمانی کوردستاندا خاوەن دەسە لاّتبون، لەو کاتانەدا بەقەد ئێستا باستان لە گۆڕان نەدەکرد؟

نەوشیروان مستەفا: بەلّیْ لە ئێستادا گۆڕان پێویستە، چونکە لە هەر قۆناغێکدا ئەولەویەتو ئەرکی سەرەکیو یەکەم هەیە، لە قۆناغێکدا کە هێشتا ڕژێمی بەعس لەسەر کار بو ئەولەویەتی هەمومان لە کوردستانی عێراقدا ئەوەبو هەولّبدەین حکومەتی هەرێمی کوردستانو دام ودەزگاکانی جێگیرببێتو وابێت کە بتوانین بیپارێزین لەهەمو ئەو هەڕەشەو پیلانانەی کە لەسەری بو بۆ تێکدانو روخاندنی، لەو قۆناغەدا بەلای ئێمەوە گرنگترین ئەرکی سەرشانی هەمو ئەوانەی بەشداربون لەحیزبە سیاسیەکانو لە جولاّنەوەی کورددا ئەوەبو هەولّبدەن قەوارەی سیاسیو قانونیو ئابوریو پێشمەرگەیی هەرێمی کوردستان جێگیر ببێت. بۆخۆشبەختی سالّی ٢٠٠٣پاش ئەوەی ڕژێمی بەعس روخاو سالّی ٢٠٠٥ کە دەستوری عێراقی نوسراوە، ئیدی ئێمە دەتوانین بلّێین قەوارەی قانونیو دەستوری هەرێمی کوردستان جێگیربو، لەو سەردەمەدا ئێمە دیسان هەولّمانداوە گۆڕان بکەین بەتایبەتی لەناوخۆی حیزبەوە، بەلاّم تیایدا سەرکەوتو نەبوین، واتە ئێمە بەدو ئەرکی سەرەکی هەستاوین، یەکێکیان ئەوە بوە کە هەولّبەین قەوارەکە جێگیرببێت لەروی دەستوریو قانونیو سیاسیەوە، بیپارێزین لەهەڕەشەی دەرەکیو ناوەکیو بیپارێزین لە روخانو تێکدان، لەهەمانکاتدا هەولّبدەین گۆڕانیش لەناو ئەو دامو دەزگایانەدا بکەین، بە لاّم

لەبەرئەوەی نەمانتوانی گۆڕان لە دامو دەزگاکانی حیزبدا بکەین، لەبەرئەوە هاتینە دەرەوە، واتە ئێستا ئەولەویەتی قۆناغەکان گۆڕاوە، لەسەردەمێکدا ئەولەویەت پاراستنی قەوارەی هەرێمی کوردستان بو، رەنگە لەکاتی شەڕی ناوخۆدا بەنیسبەت پارتییەوە پاراستنی قەوارەی پارتی دیموکراتی کوردستان بو بێت، بەنیسبەت یەکێتیەوە پاراستنی قەوارەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوە، ئێستە قۆناغەکە گۆڕاوە، ساڵی ٢٠٠٩وێستگەیەکی تر دەستپێدەکات ئەولەویەتی ئێمە لەم قۆناغەدا گۆڕانە، ئەولەویەتی ئێمە لەم قۆناغەدا رێکخستنەوەی ناو ماڵی کوردە.

Knn: بەوردی مەبەستان لە گۆڕان چیە، زۆر بەورد تریش چ گۆڕانێکتان دەوێت؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە مەبەستمان لە گۆڕان بەدیهێنانی هەڵگێڕانەوەیەکی کتوپڕنیە لە ژیانی سیاسی میللەتەکەماندا، بەڵکو دەمانەوێت گەشەکردنێکی شێنەیی هەنگاو بەهەنگاو قۆناغ بەقۆناغ لە بارودۆخی سیاسیو ئابوریو بارودۆخی کۆمەڵایەتیو رۆشنبیری گەلەکەماندا بەدیبهێنین، مەسەلەی گۆڕان لەلای ئێمە گۆڕانی دەمو چاو نیە، گۆڕانی روخسار نیە، گۆڕانی کەس نیە، بەڵکو لەلای ئێمە (گۆڕان) گۆڕانی سیستەمی سیاسیو کارگێڕییە، ئێمە دەمانەوێت دەسەڵات لەمەکتەبی سیاسی حیزبەکانەوە بگوێزینەوە بۆ دامو دەزگا هەڵبژێردراوەکان، دەمانەوێت ئەو گۆڕانەی کە دێتە پێشەوە تەنها گۆڕان نەبێت لە دەمو چاوی خەڵکدا، بەڵکو گۆڕان بێت لە سیستەمی سیاسیدا، بەمانایەکی تر دەسەڵاتێکی تەشریعیمان هەبێت کەئەویش پارلەمان بێت، پارلەمان ببێت بەمەرجەعی سیاسی لەباتی ئەوەی مەکتەبی سیاسی مەرجەعی سیاسیو جێگەی بڕیاردانی سیاسی بێت، پارلەمان ببێت بەمەرجەعی سیاسی، پارلەمانێکی کارامەمان هەبێت ئەو پارلەمانە جگە لەدانانی قانون بتوانێت متمانە ببەخشێت بەوەزیرەکانو متمانەیان لێبسەنێتەوە، بتوانێت لێپرسینەوە لەگەڵ وەزیرەکاندا بکات، بتوانێت بودجە ئاشکرا بکات، داهاتو

خــەرجی هــەرێمی کوردســتان چــەندە بۆمیللەتەکــەمانی رون بکاتــەوە، دەسـەڵاتێکی قەزاییمان هەبێت کە دوربێـت لـە دەستێوەردانی کـەس‌و لایـەنی سیاســی، لەســەر بنــچینەی پیــشەیی لەســەر بنــچینەی ســەربەخۆیی ئــەو بنچینانەی کە پێی دەوترێت پێوەری یاسایی، لەسەر بنەمای ئەوە دەسەڵاتی قـەزاییمان چـاوی پیـا بگێڕینـەوە، بـۆ ئـەوەی دەسـتوەردانی کـەس‌و لایـەنی سیاسی بەهیچ جۆرێك لە دەسەڵاتی قەزاییدا نەمێنێت‌و دەسەڵاتی قەزایی ببێت بەدەسەڵاتێکی باڵا لەهەرێمی کوردستاندا.

دەمانەوێت حکومەتێکمان هەبێت حکومەتی حیزب نەبێت، بەڵکو حکومەتی هـەمو کۆمـەڵانی خـەڵك بێـت، بـەبێ جیـاوازی بیرو بـاوەڕی سیاسـیان، بە بـێ جیاوازی رەگـەزو نەتـەوەکانیان، ئەو حکومەتـە حکومـەتی هـەمو میللەتەکەمان بێـت، بـەبێ جیـاوازی، کارمەنـدەکانی لـە سەر بنـچینەی لێوەشـاوەیی لەسـەر بنچینەی کەفائـەتی شەخسی دابمـەزرێنێت، نـەك لەسـەر بنـەمای دڵسۆزیی بۆ حیـزب‌و لایـەنی سیاسـی، لەهەمانکاتـدا زانکـۆو پـەیمانگاکانی خوێنـدنی بـاڵا جیابکەینـەوە لەدەسـەڵاتی حیزبی، حیـزب دەسـە ڵاتـی نـەمێنێت لەزانکۆکانـدا، بۆئەوەی ئەو زانکۆو پەیمانگایانـەی لـە کوردسـتاندا هـەن سەربەخۆبن‌و بتـوانن کادری لێوەشاوە بۆ پاشـەرۆژی میللەتەکـەیان پێبگەیـەنن، هـەروەها ئەمانـەوێت بـازاڕ ئـازاد بکرێـت لەدەسـتتێوەردانی کەسـانی دەسـەڵاتدارو لایـەنی سیاسـی بازرگانەکان بتوانن بەئازادی کاربکەن‌و یاسا بیـان پارێزێت لـە تـەدەخولی ئـەو ئەو، بەگشتی ئێمە ئەمانەوێت و لاتێکمان هەبێت میزانییەکەی شەفاف بێت، و لاتێکمـان هـەبێت لەسـەر بنچینەی دادی کۆمـە لایـەتی دامـەزرابێت، ولاتێکمـان هـەبێت کـە هـاولاتی کوردسـتانی شـانازی بکـات بـەوەی خـەڵکی کوردسـتانی عێراقـە، نـەك گەنجـەکانمان سـەری خۆیـان هـەڵگرن بۆهەنـدەران، وابکـەین کـە کوردستان ببێـت بەنمونەیـەك بۆ دەورو پـشتمان نـەك ببێـت بـە نمونەیـەکی وا خەڵك لێی رابکات.

مەبەستمان لە گۆڕان ئەوەیە دەسەڵات لە حیزبو لایەنی سیاسییەوە بگوازینەوە بۆ حکومەت، هێزەکانی ئاسایشو پێشمەرگەو پۆلیس بچنە ژێر دەسەڵاتی حکومەتەوە، ئەم هێزانە وابن لەهەمو ناکۆکییەکی سیاسی ناوخۆدا بێلایەن بنو بەرگری لەهەرێمی کوردستان بکەن، بەرگری لە دەستکەوتەکانی راپەرین بکەن، بەهیچ جۆرێك تێکەڵاو نەکرێن لە ناکۆکیی سیاسیدا، دیارە ئەوەش بەوە دەکرێت وەك باسمکرد دەسەڵات بەسەر ئەم هێزانا بگوازینەوە لەلایەنی سیاسییەوە بۆحکومەت، ئەم هێزانە ببن بەبازوی بەهێزی میللەتەکەمانو هێزی هەمو میللەتەکەمان نەك هێزی حیزبێکی دیاری کراو، ئەوە یەکێکە لەو شتانەی کەئێمە زۆربەلامانەوە گرنگە.

Knn: لێرەدا پرسیارێکی زۆر گرنگ دێتە پێشەوە پێشتریش کەمێك ئاماژەمان پێدا ئەویش ئەوەیە ئێوە کەسایەتییەکی خاوەن دەسەڵات بون لەناو حیزبدا نەدەکرا ئەم گۆڕانکاریانە لەناو خۆی حیزبدا بکرێت؟

نەوشیروان مستەفا: نەخێر نەدەکرا. ئێمە لەناو خۆی حیزب واتە لەناو یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا چەندین پرۆژەمان پێشکەشکرد، ئەم مەسەلەی (جیاکردنەوەی حیزب لەحکومەت) لەساڵانی یەکەمی دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە ئەو مەسەلەیەمان هێناوەتە کایەوە، ئەگەر کەسێك بەڵگەنامەکان بخوێنێتەوە، کەسێك پرۆژەکان بخوێنێتەوە، دەزانێ کە لەکەیەوە ئێمە خەریکی ئەوە بوین هەوڵبدەین ئەو گۆڕینەی دەمانەوێت لەناو هەرێمی کوردستاندا بکرێت لە پێشەوە لەناو حیزبەکەدا بیکەین، بۆئەوەی حیزب ببێت بە ئاڵاهەڵگری گۆڕانو چاکسازی لەکاروباری کارگێڕیو سیاسیو دامو دەزگاکانی حکومەتدا، لەبەر ئەوەی نەمانتوانی سەرکەوتو نەبوینو لەناو حیزبەکەدا ئیرادەیەکی گۆڕین نەبو، ئێستا لە رێگەی کۆمەڵگەوە پەنادەبەین بۆ سندوقەکانی دەنگدان، بۆئەوەی لەو رێگایەوە گۆڕین لەناو کۆمەڵەکەماندا دروستبکەین.

Knn: زۆرجار باس لە ناسکی بارودۆخی هەرێمی کوردستان دەکرێت، پێت وانیە راگەیاندنی لیستێکی سەربەخۆ ببێتە هۆی تێکدانی یەک ریزی ناو ماڵی کوردی؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە بۆچونمان جیاوازە لەسەر یەکریزی ناو ماڵی کوردی، ئێمە پێمان وانیە یەکریزی ناو ماڵی کوردی بەو مانایە بێت هەمومان لە ناو یەک حیزبدا بین، یاخود هەمومان لەناو یەک لیستدا کۆببینەوە. یەک ریزی ناو ماڵی کورد بە کێبرکێی دیموکراتی دەبێت، بەقبوڵکردنی یەکتری ئەبێت سەرەرای هەمو جیاوازیەکانمان، هەمو و لاَتە گەورەکانی دونیاو ولاَتە پێشکەوتوەکانی دونیا کێبرکێی دیموکراتیان هەیە، حیزبەکان ناچن بەیەک لیست دابەزنە خوارەوە، بەڵکو موناف‌سەی یەکتری دەکەن، بەلاَم هەوڵیانداوە هەمویان لە بەرامبەر خواستەکانی میلەتەکەیاندا گوتارێکی سیاسی یەکگرتویان هەبێت. یەک ریزی میللەتەکەی ئێمە لەپێش هەمو شتێکدا پێویستی بەوە هەیە کە ئێمە بەرەی ناوخۆی خۆمان سەرلەنوێ بینا بکەینەوە، ئەو متمانەیەی کە دۆراوە لەنێوان حکومەتو لەنێوان کۆمەلاَنی خەڵکدا جارێکی تر دروستی بکەینەوە، وابکەین خەڵك متمانەی بە حکومەتەکەی هەبێت پشتی حکومەتەکەی بگرێت باوەر بەحکومەتەکەی ببەخشێت، پشتیوانی بکات لەهەمو تەنگو چەڵمەکاندا، ئەوەش بەوە دەکرێت کە ئەبێت ئێمە دادی کۆمەلاَیەتی بۆ میللەتەکەمان جێبەجێبکەین، ئەبێت خزمەتگوزاریان پێشکەش بکەین، ئەبێت یەکسانی بۆ هاولاَتیانی کوردستان دابین بکەین، بەوە دەتوانین یەک ریزی گەلەکەمان دابین بکەین، نەک بەوەی هەمومان لە لیستێکدا کۆببینەوە، ئەو لیستانە موناف‌سەی دیموکراتی لەگەڵ یەکتری ئەکەن خۆ ئەو لیستانە دوژمنی یەکتری نین، هەمو ولاَتە پێشکەوتوەکانی دونیا لەکاتی هەڵبژاردندا بەلیستی جیاواز بەشداری هەڵبژاردن دەکەن، ئەمەش ئەبێت بەهۆی ئەوەی کەموکورییەکانی یەکتری ئاشکرابکەن، ئەبێتە هۆی دروستبونی گفتوگۆ، ئەبێتە هۆی دەستاو دەستکردنی دەسەلاَت لە نێوان هێزە

جیاوازەکاندا، لەو لاتەکەی ئێمەدا چونکە ئەو مونافەسە دیموکراتییە لەسالانی رابردودا نەبوەو بەهۆی ئەو هەلومەرجەوە کەلە کوردستان لەئارادابو زۆرجار لەبەر مەترسی دەرەکیو بەبیانوی جیاوازەوە بەیەك لیست دابەزیون، ئەوە بوە بەهۆی ئەوەی کەموکورپییەکان پەردەپۆش بکرێن، چاوپۆشی لەهەلەی یەکتری بکرێت، چاوپۆشی لەزۆر شت بکرێت کە ئەبوایە باس بکرێت هەروەك دەستاو دەستی دەسەلاتیش لە کوردستاندا روی نەداوە، بۆیە ئێمە ئومێدمان وایە ئەمە وەك باسمانکرد سەرەتای قۆناغێکی نویێ بێت، ئەو قۆناغەی کە قۆناغی گۆڕانە لەهەمو بوارەکاندا.

Knn: کەواتە بەرێزتان مەترسیو تەحەداکانی ئەم قۆناغە لەچیدا دەبینن؟

نەوشیروان مستەفا: ئەگەر بلێین کورد هیچ مەترسییەکی لەسەر نەماوە بێگومان ئەوە راست نیە، مەسەلەی کورد لەکوردستانی عێراقدا بەشێکە لە هاوکێشەیەکی زۆر زەحمەت لە رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، بەهۆی ئەوەی کورد دابەشبوە بەسەر چەند دەولەتێکداو هەردەولەتەش جۆرێك لە بەرژەوەندی نەتەوەیی هەیە، جۆرێك لە ئاسایشی نەتەوەیی تایبەت بەخۆی هەیە، لەبەر ئەوە کێشەی کورد بوەتە کێشەیەکی زۆر سەخت لەو هاوکێشەیەدا، لەبەر ئەوە بەلێ ئێمەش روبەروی گەلێك تەحەددای دەرەکیو ناوەکی ئەبینەوە، لەناوخۆی عێراقدا ئێمە کۆمەلێك کێشەمان هەیە لەگەلێ ناوەندا، کێشەمان هەیە لەسەر ناوچە دابڕاوەکان، چونکە تا ئێستاش زیاتر لە چواریەکی سەرزەمینی کوردستان لەدەرەوەی هەرێمی کوردستانە، کێشەمان هەیە لەسەر مەسەلەی هێزی چەکدارو پێشمەرگە، کێشەمان هەیە لەسەر مەسەلەی نەوت لەسەر بەکارهێنانی سامانی سروشتی لەکوردستاندا، کێشەمان هەیە لەسەر جۆری بەشداربونی کورد لە بڕیاردانی سیاسی لەحکومەتی عێراقیدا، کێشەمان هەیە لەسەر گەلێك مەسەلەی تر کە ئەمانە هەمو تەحەددانو ئەبێت هەولبدەین بەعەقلێکی هاوچەرخو عەقلێکی ستراتیجی کە بەقازانجی گەلەکەی ئێمە بێتو بە رێگەیەکی هێمنانەو بە رێگەی گفتوگۆ هەمو ئەم تەحەددایانە چارەسەریان

بۆبدۆزینەوەو نەخشەو پلانیان بۆدابنێین کە چۆن دەتوانین ئێمە روبەروی ئەم تەحەددایانە ببینەوە، سەرەرای ئەوەی کە ئێوە خۆشتان دەزانن ئێمە لەلایەن دەوڵەتانی دراوسێوە زۆرجار ئەکەوینە ژێر گوشاری سیاسییەوە، ئەکەوینە ژێر گوشــاری ئابورییــەوە جاروبــار ســنورەکان دادەخــرێن، جاروبــار ناوچــە سنورییەکان بۆردومـان دەکرێن، ئەمانـەش هـەموی تەحـەددای گـەورە گـەورەن‌و پێویستی بەوە هەیە کە ئەبێ خۆمانی بۆئامادە بکـەین‌و ئەکرێت بەشێك بێت لـەو گوتـارە سیاسییەی هـەمومان ئـەتوانین لەسـەری تێگەیـشتنێکی هاوبـەش پەیدا بکەین.

Knn: ئێستا با بپرسین خەڵك چۆن متمانەو باوەڕتان پێبکات خەڵك چۆن دڵنیا بێت لەوەی کە ئێوە هاتنە سەر حوکم وەك ئەوانی دیکە ناکەن؟

نەوشـیروان مـستەفا: ئێمـە بەرنامەیـەکی تێـرو تەسـەلمان دانـاوە بـۆ هـەرێمی کوردستان، ئەو بەرنامە گشتگیرە، هەمو بوارەکانی ژیانی گرتوەتەوە، لە ماوەی رابردودا گوێمان لە گلەیی‌و رەخنەو ناڕەزایەتیەکانی خەڵك گرتوە، هەوڵمانـداوە ئەوەنـدەی مـومکین بێـت ئـەو ناڕەزایەتیانـەی لـەناو خەڵکـدا هەیـە لـە قاڵبێکی بەرنامەییدا سەرلەنوێ دایبڕێژینەوە، بۆ ئەوەی ئەو کەموکوڕیانـە لـەناو خەڵکدا نەمێنێت، هەوڵ دەدەین ئەو بەحیزبی کردنەی لە کۆمەڵگەدا هەیە سنورێکی بـۆ دابنێین، تەزکیەی حیزبی ئەسڵەن نەمێنێت، هەوڵ دەدەین سەروەت‌و سامانی و لاتەکە بە عەدالەتی دابەشبکرێت بەسەر خەڵك‌و ناوچەکانداو سنورێك دابنرێت بۆ بەفیڕۆدانی سامانی گشتی.

حیـزب بـە شـێوەیەکی گـشتی ئـامرازی خـەبات‌و تێکۆشـان‌و ئـامرازی گـۆڕانـە، حیـزب دروست دەبێت بـۆ ئـەوەی کـە کێشە چارەسـەر بکـات بـۆ ئـەوەی کێشەی سیاسی‌و کۆمە لایەتی‌و ئابوری‌و کێشە فیکرییەکانی کۆمـەڵ چارەسـەر بکـات، بەداخـەوە لـە ولاتـەکـەی ئێمـەدا حیـزب خـۆی بـوە بـە کێشە، بـوە بـە بـار بەسـەر کۆمەڵگەوە، بۆ نمونە چەند رۆژێك لەمەوپێش یەکێك لە کاربەدەستانی یـەکێتی خـۆی دانـی پێـدانا کـە مانگانـە کـەمتر لـە (٣٠) ملیـۆن دۆلار وەرنـاگرن لـە

حکومەتی هەرێم، واتە بەرەو زۆرتریش لە (٣٠) ملیۆن دۆلار وەردەگرن، کە (٣٠) ملیۆن دۆلار دەیتوانی بەشێك لە کێشەی هەمو قوتابخانەکانی ئیدارەی سلێمانی چارەسەر بکات، یانی بە دوسەد هەزار دۆلار دەتوانی قوتابخانەیەك ئاوەدان بکەیتەوە، بە دو (٣٠) ملیۆن کە لە مانگێکدا ئەوان وەریدەگرن‌و بەفیڕۆ کەس نازانێ چۆنی خەرج دەکەن دەمانتوانی کێشەی ئەو قوتابخانانەی کە سێ دەوام‌و چوار دەوامی تێدایە چارەسەر بکەین، ئێمە جیاوازیەکانمان لەگەڵ لایەنەکانی دیکەدا لەو شتە گرنگانەدا دەبێت، جگە لەوەش ئێمە هەوڵ دەدەین پشتیوانی لە میدیای ئازاد بکەین‌و لە روی یاساییەوە ئازادییەکانیان فراوانتر بکەین.

ئێمە هەوڵ دەدەین هەیئەتێکی نەزاهەی سەربەخۆ دروست ببێ کە بێلایەن بێت، هەوڵ دەدەین یاسایەك دابنرێت بۆ یارمەتیدانی حیزبەکان، بەپێی قورسایی خۆیان‌و بەپێی ئەو دەنگانەی لە پارلەماندا بەدەستی دێنن، بۆ ئەوەی نەتوانن بە ئارەزوی خۆیان یاری بە سەروەت‌و سامانی وڵاتەکە بکەن، وەك باسمکرد هەوڵ دەدەین بە هیچ جۆرێك تەزکیەی حیزبی‌و پێبەخشینی پلەو پایە لەسەر ئەساسی حیزبی نەمێنێت. ئەوە جیاوازییەکانی ئێمەیە لەگەڵ لایەنەکانی دیکەدا، ئومێدم وایە لەپاش ئەوەی کە دەسەڵاتیشمان گرتە دەست ئەوە پەیڕەو بکەین.

ئەگەر نەمانکرد خەڵك دەتوانێ خۆپیشاندان‌و مانگرتن‌و رێگەکانی دیکەی دیموکراتی بگرێتەبەر بۆ بەرەنگاربونەوە، ئەگەر بەڵێنەکانیان جێبەجێ نەکرد.

Knn: ئەی خەڵك چۆن لەوانی دیکەتان جیا بکاتەوە؟

نەوشیروان مستەفا: لەوانی دیکەمان جیابکەنەوە بەو بەرنامەیەی کە ئامادەمان کردوە، وە بەو کەسانەی ئەمجارە بەشداریان کردوە لە لیستەکەدا، ئێمە گوێمان نەداوەتە ئینتیمای حیزبی، گوێمان نەداوەتە بیروباوەڕی سیاسی، ئێمە حیزبی نین‌و نوێنەرایەتی هیچ حیزبێك ناکەین، ئێمە هەوڵمان داوە کە بیروباوەڕی سیاسی بە نەزەری ئیعتیبار وەرنەگرین، بەڵکو شتی هاوبەش‌و

قاسمی موشتەرەکی میللەتەکەمان، کە خۆی دەبینێت لە خواستە سەرەکیەکاندا لە مەسەلەی دادی کۆمەڵایەتی لە شەفافیەتی میزانییە، لە دانانی نەخشەو پرۆژەی ئاوەدانکردنەوەی کوردستاندا، لە چارەسەر کردنی کێشەی گەنجەکاندا ئێمە بەوە لە خەڵکی دیکە جیا دەکرێینەوە.

جیاوازییەکانمان لەگەڵ ئەو لایەنانەی دیکە لەوەدایە، یەکێك لەوانە مەسەلەی پەیوەندی حیزبو کۆمەڵگەیە، ئەم لایەنانەی تائێستا کاریانکردوە لە ماوەی هەژدە ساڵی رابردودا، هەوڵیان داوە هەمو کۆمەڵگەو هەمو دامودەزگاکانی حکومەت بکەن بە حیزبی، یانی زۆر بەداخەوە ئەگەر یەکێك حیزبی نەبێت دەرفەتی کار لە بەردەمیدا داخراو دەبێت، ئەگەر یەکێك حیزبی نەبێت ناتوانێ ببێت بە وەزیر، ناتوانێ ببێت بە وەکیل وەزیر ناتوانێت ببێت بە مودیری عام، ناتوانێ ببێت بە ئەندامی پەرلەمان ناتوانێ پلەیەکی گەورە لەناو پێشمەرگەو پۆلیسو ئاسایشدا وەربگرێت، وە ئەمەش بوەتە هۆی ئەوەی ژمارەیەکی زۆر زۆری خەڵك لە ناچاریدا بون بە حیزبی، ئێمە دەمانەوێت دەسەڵاتی بە حیزبیکردنی کۆمەڵگە بە هیچ جۆرێك نەمێنێت، خەڵك لەسەر بنچینەی هاوڵاتی بون مامەڵەی لەگەڵ بکرێت، نەك لەسەر بنچینەی ئینتیما بۆ حیزب، وە ئەمەش بوە بەهۆی ئەوەی میللەتەکەمان بێبەش بێت لە ژمارەیەکی زۆر کەفائەتی گەورە گەورە لە بواری جیا جیای ژیاندا، کە دەمانتوانی ئیستیفادەیان لێبکەین، لە هەمانکاتدا بە هۆی حیزبی بونەوە پلەو پایە بەخشراوە بە کۆمەڵێك خەڵك کە لە راستیدا شایستەی ئەو شوێنانە نین کە وەریانگرتون، واتە خەڵکی نەشیاو خراوەتە شوێنی گرنگەوە لەبەر ئەوەی ئینتیمای حیزبییان هەبوە.

یەکێکی دیکە لە جیاوازییەکانی ئێمە لەگەڵ ئەو لایەنانەی دەسەڵاتداربون تائێستا ئەوەیە ئێمە باوەڕمان بە بڕیارەکانی ژوری داخراو نییە، ئێمە باوەڕمان بەوە هەیە کە دەبێ هەمو ئەو عەقدو گرێبەستانەی کە دەکرێت هەمو ئەو قۆنتەراتو موقاوەلاتانەی دەدرێ بەموبەو ئەمانە ئاشکرا بکرێن بۆ خەڵكو لە

بەردەمی پەرلەماندا ئەوەی کە پێویستە ئاشکرا بکرێت، بۆ نمونە ئەو هەمو گرێبەستانەی نەوت کراوە هەتا ئێستا کەس نازانێ ناوەڕۆکەکەی چییە، هێڵە گشتییەکانی دەزانن، بەلام نازانن ناوەڕۆکەکەی چییە، ئێمە باوەڕمان بەوە هەیە تەنانەت لە پەیوەندییە سیاسییەکاندا پەیوەندی هەرێمی کوردستان لەگەڵ بەغدا پەیوەندی هەرێمی کوردستان لەگەڵ ئەمەریکاو لەگەڵ ئێرانو تورکیادا، دەبێ ئەمانە شەفافیەتی تەواوی تێدابێت بۆ خەڵك رونبکرێتەوە، واتە دەبێ شتەکان لە ژوری تاریكو داخراوەوە دەربهێنینە دەرەوە بۆ ژوری ئاشکرا، بۆ ئەوەی پشتیوانی میللەتەکەمان بەدی بهێنین.

ئێمە بیرو بۆچونمان جیاوازە لە مەسەلەی گەشەسەندن (تەنمیە)، ئێمە پێمانوانیە، گەشەسەندن ( تەنمیە) بریتی بێت لەوەی کە بینای بەرز دروست بکەیتو هەندێك زانکۆ بکەیتەوە بەبێ ئەوەی هیچ بنەمایەکی زانستی هەبێت ئێمە پێمانوایە، لەپێش هەمو شتێکدا مەسەلەی تەنمیە تەنمیەی مرۆڤە (گەشەپێدانی مرۆیی)، چۆن دەتوانیت چۆنایەتی ژیانو گوزەرانی هاولاتی ئاسایی کوردستانی عێراق بگۆڕیت؟ چۆن دەتوانی لە بواری پەروەردەو لە بواری تەندروستیو لە بواری فەرهەنگیو بوارەکانی دیکەی ژیاندا تەنمیەی ئینسانی کورد بکەیت؟ راستە گەشەپێدانی ئابوری، مەسەلەی ژێرخانی ئابوری زۆر گرنگە مەسەلەی ئاوەدانکردنەوەی ولات گرنگە، بەلام ئاوەدانکردنەوەی کەسێتی ئینسانی کوردو گێڕانەوەی کەسایەتی بۆ ئینسانی کورد، گێڕانەوەی مافی هاولاتی بون، بەجۆرێك کە ئینسانی کورد شعور بە عیززەتی نەفسو بە سەربەرزیو بە کەرامەت بکات لە ولاتەکەی خۆیدا، ئەمە یەکێکی دیکەیە لە جیاوازییەکانی ئێمە کە بەداخەوە لە هەندێ جاردا ئینسانیان وا لێکردوە بە هۆی نانبڕینو بە هۆی مل پێکەچکردنەوە بۆ موچەو بۆ هەندێك ئیمتیازاتی حیزبی ئینسانیان کردوە بە عەبد، لەباتی ئەوەی کە ببێت بە ئینسانی ئازاد، بۆچونی ئێمە لە مەسەلەی ئاوەدانکردنەوەی کوردستاندا جیاوازە لەگەڵ ئەوانی دیکەدا، ئێمە لەباتی ئەوەی پرۆژەی بچوكو بێ بایەخ بکرێت ئێمە

باوەڕمان وایە کە دەبێت پلانێکی گشتی (کورتماوەو ناوەنجی ماوەو درێژ ماوە)مان هەبێت بۆ ئاوەدانکردنەوەی سەرلەنوێی ژێرخانی ئابوری کوردستانی عێراق، بۆ ئەوەی چیتر ئێمە لە هەموو شتێکدا ئیعتیماد نەکەینە سەر بەغدا، ڕەنگە خەڵك نەزانێت ئێستا بێجگە لەوەی کە مانگانە لە ١٧٪ ی میزانیەی حکومەتی ناوەندی دێت بۆ ئێرەو وەکو موچە دابەش دەکرێت بەسەر خەڵکداو بەشێکیشی بۆ پرۆژە تەرخانکراوە، ئێمە هەتا ئێستاش ئازوقەو خواردەمەنیمان لە بەغداوە بۆ دێ، سوتەمەنیمان لە بەغداوە بۆ دێت، هەتا ئێستا ئێمە نەمانتوانیوە ئابوریەك، ژێرخانێکی ئابوری وا دروستبکەین لە بوارە گرنگەکانی ژیاندا بتوانین ئیعتیماد بکەینە سەر وڵاتەکەی خۆمان، بە مەرجێك وڵاتەکەی ئێمە وڵاتێکی زۆر دەوڵەمەندە هەم لە سامانی مرۆییدا، هەم لە پارەدا، هەم لە سامانی سروشتیدا.

Knn: ئێوە زۆر باسی گەندەڵیو دادپەروەری کۆمەڵایەتی دەکەن، پێتوایە ئەمە تەوەرێکی هێندە گرنگ بێت بۆ بانگەشەی هەڵبژاردن.

نەوشیروان مستەفا: بەڵی تەوەرێکی گرنگە ئێمە باوەڕمان و یە، من جارێکی دیکەیش پێش چوار پێنج ساڵ لەمەوبەر کە چوار پێنج کەسی ڕۆژنامەنوس بەشدار بونو هەندێك کار بەدەستیشی تیا بەشداربون باسمکرد، کە گەندەڵی وەکو (گانگرین) چوتە ناو هەمو جومگەکانی حیزبو حکومەتەوە، گەندەڵی یەك دیمەنی نییە، گەندەڵی لە بوارە جیا جیاکانی ژیاندا لە بواری داراییدا لە بواری سیاسیدا لە بواری کارگێڕیدا تەنانەت لە بواری ڕەوشتو خودا پەرەی سەندوە، بۆیە ئێمە دەبێ هەوڵ بدەین گەندەڵی بنبڕ بکەین ئەگەر بنبڕیشی نەکەین بتوانین جۆرێك لە سنوری بۆ دابنێین، بەداخەوە لە وڵاتی ئێمەدا لەبەر ئەوەی هەڵبژاردنی نۆرەیی نەبوە یانی بڵێین هەر سێ ساڵ جارێك، هەر چوار ساڵ جارێك هەڵبژاردنەکان دوبارە ببێتەوە، لە کاتی خۆیدا هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکان هەڵبژاردنی ناو داخلی حیزبەکان هەڵبژاردنەکانی ناو ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی، ئەم

هەڵبژاردنانە بە دەوریو بە شکڵێکی پاكو پوخت دوبارە ببوایەتەوە، باوەڕم وایە گەندەڵی بەمرادەیە پەرەی نەدەسەند، بەلاّم مانەوەی بۆ نمونە ئەنجومەنی شارەوانیەکان بۆ ماوەی چەندەها ساڵ بەبێ نوێبونەوەی هەڵبژاردن، ئەنجومەنی پارێزگاو بە هەمان شێوە، پەرلەمانەکەی ئێمە دەورەی یەکەمیان چەندین ساڵی خایاند، واتە نەبونی ئەوەی کە پێی دەوترێت (ئینتیخاباتی دەوری) یا هەڵبژاردنی نۆرەیی یەکێك بوە لەو هۆیانەی کە وایکردوە گۆڕان لە دەسەلاّتدا نەبێت دەستاو دەستکردنی دەسەلاّت لە بەینی ئەو لایەنە جیاوازانەدا نەبێت، ئەمە بوەتە هۆی ئەوەی گەندەڵی بوە بە گانگرینێك وەك باسمکرد چوەتە هەمو جومگەکانی لەشی حکومەتەوەو پێویستی بەوە هەیە، کە ئێمە چارەسەرێکی بۆ بدۆزینەوە.

Knn: بەڕێز کاك نەوشیروان ئەگەر کەمێك بگەڕێینەوە بۆ دواوە دەبینین بەڕێزتان سەرکردەیەکی گەورە بون لە یەکێك لەو هێزانە لە کوردستاندا پێتوانییە بەشێك لەو بەرپرسیارێتی گەندەڵیە بکەوێتە سەرشانی ئێوە؟

نەوشیروان مستەفا: من بەش بەحاڵی خۆم شانازی دەکەم بەوەوە کەوا لە ماوەی هەژدە ساڵی رابردودا ئەگەر بەشداریەکم کردبێت بەشداریەکی کەمیش بێت لە دامەزراندنو جێگیرکردنی داموەزگاکانی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا، بێگومان ئەوە پرۆسەیەکی زۆر زۆر ئاڵۆزبوە کە لە ماوەی هەژدە ساڵی رابردودا بۆ یەکەمجار لە مێژوی میللەتەکەماندا چانسێکمان بۆ هاتە پێشەوە کە بتوانین حوکمی خۆماڵی دابمەزرێنین، بێگومان ئەمە سلبیاتی زۆری هەبوە وەکو باسمکرد لە هەر قۆناغێکدا ئەرکی سەرەکی (ئەولەویات) جیاواز بوە، لە قۆناغێکدا ئەولەویات بۆ جێگیرکردنو پاراستنی هەرێمی کوردستانو حکومەتی هەرێمی کوردستان بوە، هەرچەندە لەو قۆناغەشدا تەنانەت ئێمە هەوڵمانداوە– ئەوەنەی پێمان بکرێت– رێگە لە گەندەڵی بگرین، بەلاّم بنبڕکردنی گەندەڵی ئەرکی سەرەکیمان نەبوە لەو قۆناغەدا، بەڵکو جێگیرکردنی قەوارەی سیاسیو قانونی هەرێمی کوردستان ئەرکی سەرەکیمان

بوه، بەڵێ لە هەمو ئەوانەی لە هەژدە ساڵی رابردودا رویداوە منیش وەکو هەمو خەڵکەکانی دیکە کەمو زۆر بەڵێ بەشدارم.

Knn: کەواتە ئێستا لە سەروبەندی هەڵبژاردنەکاندا چاوەڕوانیو هیواتان چییە؟

نەوشیروان مستەفا: من هیوام وایە کە کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان هەمو ئەوانەی ماف دەنگدانیان هەیە زۆر بە گەرمی بەشداری بکەن لەم هەڵبژاردنەدا، هیوام وایە گەنجەکان ئەم لیستە بەلیستی خۆیان بزانن، هیوام وایە ژنان ئەم لیستە بەلیستی خۆیان بزانن، هیوادارم جوتیاران ئەم لیستە بەلیستی خۆیان بزانن کرێکارو ئەوانەی کەوتونەتە ژێر خەتی هەژارییەوە ئەم لیستە بەلیستی خۆیان بزانن، هیوادارم مامۆستای ئاینی مامۆستای سەرەتایی مامۆستای زانکۆ ئەم لیستە بەلیستی خۆیان بزانن، هیوادارم هەمو چینو توێژەکانی گەلەکەمان ئەم لیستە بەلیستی خۆیان بزانن، ئێمە هەوڵماندا وە بەرنامەیەک دابنێین هەمو چینەکانی گەلی ئێمە جگە لە یەک چینی گەندەڵ کە سودمەندن لە بارودۆخی ئێستا بە دەوڵەمەندو فەقیرەوە کەڵك لەم بەرنامەیە ى ئێمە وەربگرن، دیارە بە رێژەی جیاواز دەوڵەمەنەکە رەنگە کەمتر قازانجی لێبکات، بەڵام هەژارەکە رەنگە زیاتر قازانجی لێبکات لەبەر ئەوە هیوادارم هەم دەوڵەمەند بەشداری تیادا بکات، هەم فەقیر بەشداری تیادا بکات هەم گەنج بەشداری تیادا بکات هەم پیر بەشداری تیادا بکات هەم ژن بەشداری تیادا بکات هەم پیاو بەشداری تیادا بکات، یانی بەمانایەکی دیکە هەمو توێژەکانی کۆمەڵی ئێمە ئەوەی کە قازانجی لەگەڵ گۆڕاندا هەیە ئەوەی کە قازانجی لە باشکردنی ژیاندا هەیە ئەوەی کە قازانجی لەوەدا هەیە کۆمەڵەکەی ئێمە ببێت بە کۆمەڵێکی نمونەیی ئومێدم وایە بێت بۆ دەنگدانو دەنگ بۆ لیستەکەی ئێمە بدەن، لە هەمانکاتدا چاوەڕێییشم ئەوەیە لە حیزبەکانی تر، بە تایبەتی هەردو حیزبی دەسەڵاتدار، کە ئەوان بەرپرسن لە ئاسایشی هەرێمی کوردستان، ئەوان کاروباری وڵاتەکە بەڕێوە دەبەنو دامودەزگاکانی حکومەت بەدەست ئەوانەوەیە

هـــەمو فەرمانگـــەکان بەدەســـت ئەوانەوەیـــە، ئاســـایش‌و پـــۆلیس‌و پێـــشمەرگە بەدەست ئەوانەوەیە، ئومێدم وایە هەوڵ بدەن هەڵبژاردنێکی پاک‌و ئازادو هێمن بەڕێوە بچێت‌و دور بێت لە گزی‌و فڕوفێڵ‌و هەڕەشەو ئەو

# ئێستا ئەولەویەت بۆ گۆڕانە

**سازدانی: سبەی**

**نەشیروان مستەفا لەوبڕوایەدایە، ناوەڕۆکی رەشنوسی دەستوری هەرێمی کوردستان ناوەڕۆکێکی زۆر زۆر کۆنەپەرستانەیە، ناوەڕۆکێکە کوردستان دەگەڕێنێتەوە بۆ دواوە، ئێمە دەمانەوێت ولاتێکی دیموکراتی دابمەزرێنین، بەلام ناوەرۆکی ئەم دەستورە پەرلەمانی کوردستانو ئەنجومەنی پارێزگاکانی کوردستان دەکات بەدو دەزگای کارتۆنی لاوازی بێ دەسەلات، لە بەرامبەردا، دەسەلاتەکانی سەرۆکی هەرێم زۆر بەهێزو زیاد دەبێت، کە ئەمە پێچەوانەی مەنتقی گەشەکردنی روداوەکانی ناوچەی خۆرهەلاتی ناوەڕاستە.**

**لەوچاوپێکەوتنەدا کە تەلەفزیۆنی KNN لەگەلیدا ئەنجامیدا نەوشیروان تیشکی خستە سەر رەشنوسی دەستورو بارودۆخی ئێستای هەرێمی کوردستانو مەسەلەی هەلبژاردن لە هەرێمی کوردستاندا، هەروەك وتی: ئەو لەویەتی ئێستا چاکسازیی نییە، بەلکو گۆڕانە. قۆناغێك چاکسازیی بو، لەئێستادا ئەولەویەت گۆڕانە لەشێوەی بەڕێوەبردنی ولاتەکەماندا، گۆڕین نییە لەدەمو چاو و کەسەکاندا، گۆڕینە لەشێوەی بەڕێوەبردنی ولاتدا، ئەم ولاتەی ئێمە هەتا ئێستاش مەکتەبی سیاسییەکان بەڕێوەی دەبەن، ئیتر کاتی ئەوەهاتوە کە پەرلەمان ببێت بەمەرجەعێکی سیاسی، کاتی ئەوە هاتوە کە ئەنجومەنی وەزیران بەبێ تەدەخولی رۆژانەی سەرکردایەتی حیزبەکان، بتوانێت کاروباری دائیرەکانی بەرێوەبەرێت.**

**KNN: دەستور وەك یەکێك لە هەرە مەسەلە زیندوەکانی سەر گۆڕەپانی سیاسی ئەمڕۆ قسەو باسی لێ دەکرێت، رای ئێوە لەوبارەیەوە چییە؟**

نەوشیروان مستەفا: بێگومان دەستور لە هەمو ولاَتێکدا شتێکی زۆر گرنگەو ناودەبرێت بە دایکی یاساکان، هەمو یاسایەك لەسەر بنەمای دەستور دادەنرێت، مێژوی داواکردنی نوسینی دەستور لە هەرێمی کوردستاندا دەگەڕێتەوە بۆ دوای راپەڕین، کاتێك کە یەکەم هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان کرا، ئەو سەردەمە یەکێك لەو مەسەلانەی کە دەهاتە کایەوەو بە درێژایی مفاوەزاتەکانی سەردەمی شۆڕشو حکومەتی عێراقی یەکێك لەو پرسانەی کە هەمیشە بە گرنگی باسی لێوە دەکرا، جۆری رێکخستنی پەیوەندی حکومەتی هەرێمو حکومەتی بەغدا بو، ئەوساکە ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان وا رێکەوتن لەسەر ئەوەی کە سیفەی فیدراڵی، شێوەی فیدراڵی، پەیوەندی فیدراڵی لەنێوان هەرێمو حکومەتی بەغدا بکرێت بە بنچینەی رێکخستنی پەیوەندییەکان، لەسەر ئەو بنچینەیەش دانرا کە دەستورێکی فیدراڵی بۆ هەرێمی کوردستان بنوسرێت، ئەو سەردەمە چەند کەسێکی یاسایی، چەند کەسێکی پسپۆڕ، شارەزا، سیاسی، پڕۆژەی دەستوریان نوسی، ئەوەندەی من لەبیرم بێت، رەنگە ئێستا لە ئەرشیفی پەرلەمانی کوردستانیشدا بۆی بگەڕێین هەبێت. بەلایەنی کەمەوە پڕۆژەی سێ دەستوری هەرێم نوسراوە لەلایەن سێ گروپو کەسی جیاوازەوە لەو سەردەمانەدا نوسیویانە، ئەو سەردەمانە، دەستورەکەیان رەتکردەوەو نەیانویست بنوسرێت، بەبیانوی ئەوەی کەرکوکو ناوچە دابڕاوەکان، کە لەسەر هەرێمی کوردستان نین، بێبەشدەبن، هەم نوێنەریان نییە لە پەرلەمانی کوردستان، لەکاتی راپرسیشدا ناتوانن، دەنگی لەسەر بدەنو ئەو دەستورە قبوڵ بکەن یان قبوڵی نەکەن.

ئەمە بیانوی ئەو سەردەمە بو، بێگومان بیانوی سیاسی لەپشتەوە بو، بەلاَم ئەوەیان کردبو بەبیانوە ئاشکراکەی، ئێستاش ئەگەر بەهەمان مەنتقی ئەو زەمانە تەماشا بکەی هەمان بیانومان هەیە بۆ ئەوەی کە دەستورەکە تێنەپەڕێت، لەبەر ئەوەی کە بەلایەنی کەمەوە چواریەکی زەوی کوردستان

لەدەرەوەی هەرێمی کوردستانە، ئەوانە لەم دەستورەدا ناتوانن دەنگی لەسەر بدەن، بێبەش دەبن، لە پەرلەمانی کوردستانیشدا نوێنەریان نییە، جگە لەوە جالییەی کوردیی کە ئێستا سەدان هەزار کەسن، لە دەرەوەی هەرێمی کوردستان، چ لە ئەوروپا، چ لە ئوسترالیا، چ لە ئەمەریکا، چ لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ئەوانەش بێبەش دەبن، لەبەر ئەوەی لەم دەنگدانەدا دەگیان نییە، ناتوانن دەنگ بدەن.

جگە لەوە ئێمە دەستور لە سێ لاوە تەماشا دەکەین، یەکێکیان لایەنی ناوەڕۆکەکەیەتی، کەمن پێموایە، ناوەڕۆکی ئەم دەستورە ناوەڕۆکێکی زۆر زۆر کۆنەپەرستانەیە، ناوەڕۆکێکە کوردستان دەگەڕێنێتەوە بۆ دواوە، ناوەڕۆکێکە کە ئێمە دەمانەوێت وڵاتێکی دیموکراتی دابمەزرێنین، ئەم دەستورەی ئێستا کاری بۆ دەکرێت پەرلەمانی کوردستانو ئەنجومەنی پارێزگاکانی کوردستان دەکات بەدو دەزگای کارتۆنی لاوازی بێ دەسەڵات، لە بەرامبەردا، دەسەڵاتەکانی سەرۆکی هەرێم زۆر بەهێزو زیاد دەبێت، کە ئەمە پێچەوانەی مەنتقی گەشەکردنی روداوەکانی ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستە، جگە لە مەسەلەی ناوەڕۆکی دەستورەکە، مەسەلەی ئەوەی ئەم دەستورە نەخراوەتە بەرچاوی خەڵك، وا ئیدیعا دەکەن کە دوساڵ لەمەوپێش خستویانەتە بەردەمی خەڵك، من تەحەدای ئەوانە دەکەم بەشی زۆری ئەندامەکانی پەرلەمان خۆشیان ناوەڕۆکی دەستورەکەیان نەخوێندوەتەوە، نەخراوەتە بەر گفتوگۆیەکی جدی لە تەلەفزیۆنو رادیۆو ئامرازەکانی راگەیاندن، تەنانەت لە پەرلەمانەکەی خۆشیاندا، بێجگە لەو لیژنە دەستورییەی کە دایاننناوەو لیژنە دەستورییەکە گوێڕایەڵی سەرکردایەتی سیاسی حیزبەکانە، ئەوان پێیان دەڵێن چی بکەن و چی نەکەن، بێجگە لەوە نەخراوەتە گفتوگۆیەکی جدییەوە، تا لێی بزانن.

وڵاتی واهەیە دەستوری نییە، بۆ نمونە وڵاتێکی وەك بەریتانیا کە یەکێکە لە کۆنترین وڵاتە دیموکراتییەکانی دنیا، تائێستا دەستورێکی نییە، پەرلەمانە کە یاسا دەردەکەنو دەستکاری دەکەن، بە گوێرەی پێداویستییەکانی رۆژ. ئەمانە

دەستورێکیان نوسیوە، شەش حەوت لاپەڕە هەر پێشەکییەکەیەتی، لەکاتێکدا دەستوری ئەمەریکا کە یەکێکە لە گەورەترین وڵاتەکانی دنیا، پێشەکییەکەی بریتییە، لە دو رستە، بریتییە لەوەی کە دەڵێت: «ئێمە میللەتی ئەمەریکا بڕیارماندا»: مادەی یەك، دو، سێ. . . ئەمانە حیکایەتێکیان کردوە لە زەمانی ئادەمو حەواوە هێناویانەتە خوارەوە تا ئێستا.

جارێکی دیکەیش دەگەڕێمەوە سەر ناوەڕۆکی دەستورەکە، ناوەڕۆکێکە کە دەبێت میللەتەکەی ئێمە بەهیچ جۆرێك قبوڵی نەکات، لەلایەکی دیکەشەوە ئەم پەرلەمانە تەمەنی بەسەرچوە. لە حەقیقەتا ئەم پەرلەمانە فێڵمان لێدەکەن، وەختی خۆی من خۆم سەرپەرشتی بەشێك لە لیستەکانی یەکێتیم کردوە، من وەکیلی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوم لە کۆمسیۆنی باڵا.

KNN: ببورە مەبەستت چییە لەوەی کە دەڵێیت فێڵمان لێدەکەن؟

نەوشیروان مستەفا: کاتی خۆی ئەم پەرلەمانەمان کە هەڵبژارد، لەگەڵ پەرلەمانی عێراقیدا هەڵمانبژاردن بۆ ماوەی یەك ساڵ، ئەوان یەك ساڵەکەیان کرد بە چوار ساڵ، ئێستاش تەمەنیان تەواو بوە، بە بێئەوەی هیچ کارەساتێکی سروشتی بوبێت، بێ ئەوەی جەنگی ئەهلی بوبێت، بەبێ ئەوەی هەرێمی کوردستان هێرشی کرابێتە سەر، دەیانتوانی دوساڵ لەمەوپێش ئەم دەستورە بێننە پێشەوەو گفتوگۆی لەسەر بکەن، دەیانتوانی یاسای هەڵبژاردن دو ساڵ لەمەوپێش بێنن قسەی لەسەر بکەن، چونکە دەیانزانی هەڵبژاردن کەی دەکرێت. بەڵام ئەمانە بەشێوازی موئامەرە هەمو شتەکانیان دواخست بۆ ئەوکاتەی کە تەمەنیان بەسەرچوە، بۆ ئەوەی بکەوێتە ژێر فشاری کاتەوەو لەژێر فشاری کاتدا بڕیار بدات، بۆیە بەڕاستی دەبێت میللەتەکەمان ئەمە رەفز بکات.

KNN: ئەگەر بارودۆخی دەستورەکە بەم شێوەیە بێتو پەرلەمانیش لەڕوی یاساییەوە شەرعییەتی نەمابێت، تێپەڕاندنی دەستور بۆ؟

نەوشیروان مستەفا: لەبەر ئەوەی دڵنیانین کە پەرلەمانی داهاتو زۆرایەتییەکی مسۆگەری ئەوتۆیان هەبێت، چیان بوێت بیکەن، بۆیە دەیانەوێت بەو ماوە کورتە ئەوەی بیانەوێت بیسەپێنن، کە میللەتەکەی ئێمە نابێت قبوڵی بکات.
KNN: ئەگەر بگوازینەوە بۆ بارودۆخی هەڵبژاردنەکان، خۆت دەزانیت یەکێکی دیکە لە دۆسییە گەرمەکان باسوخواسی هەڵبژاردنە کە خەڵك چاوەڕێی دەکەن، ئێوە تێڕوانینتان بۆ بارودۆخی هەڵبژاردن چۆنە؟
نەوشیروان مستەفا: من ئومێدم وایە پرۆسەی هەڵبژاردن لە کوردستانی عێراقدا بەوپەڕی هێمنی، بەوپەڕی دیموکراتی، بەوپەڕی مونافەسەیەکی شەریفانە لەنێوان نوێنەرەکانو لەنێوان لیستەکاندا تێبپەڕێت، ئەگەر هەمو لایەك ئامانجی ئەوەبێت کە خزمەتی میللەتەکەی خۆمان بکات، خزمەتی میللەتەکەی ئێمە لەپاراستنی ئەمنو ئاسایشی هەرێمدایە، خزمەتی میللەتەکەمان لەوەدایە کە هەوڵبدەین پەرلەمانێکی فرە رەنگو فرە دەنگی وابێتە پێشەوە کە مەجالی ئۆپۆزسیۆنی تیابێت، چونکە هیچ وڵاتێك لە دنیا ناتوانێت ئیدیعا بکات بڵێت من وڵاتیکی دیموکراتیم ئەگەر ئۆپۆزسیۆنی تیا نەبێت، لەبەر ئەوە دەبێت پێمان خۆشبێت کە رکەبەری لەنێوان لیستەکاندا هەبێت، رکەبەری لەنێوانی لیستەکاندا هەبێت لەسەرئەوەی کە باشترین کەس هەڵبژێرن بۆ پەرلەمان کێبڕکێیان لەنێواندا هەبێت کە باشترین بەرنامە دابنێن، رکەبەری لەسەر ئەوە هەبێت کە کامیان بە سەردەمیی ترینو بە دیموکراتیی ترین شێوە داخڵی پەرلەمان دەبن، نەك لەسەر بنچینەی دیکە.
KNN: تۆ پێتوایە ئەم بارودۆخەی ئێستا لە هەرێمی کوردستان دروستبوە، (بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی ئەم چەمکە زۆر بەکاردەهێنرێت) وەرچەرخانێکە لەڕوی دیموکراسییەوەو دیسانەوە مۆدێلێکی نوێمان نیشاندەدات؟
نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، ئومێدم وایە، کە پرۆسەی هەڵبژاردن بەشێوەیەکی هێمنو دیموکراتی بەرەوپێشەوە بچێت ئەو لیستانەی کە ئێستا رکەبەری لەگەڵ یەکتریدا دەکەن، نوێنەرەکانیان بچنە پەرلەمانەوە. بێگومان بەرنامەو

بۆچونی جیاوازیان هەیە، ئەو بۆچونو بەرنامە جیاوازانە لە ناو پەرلەماندا وابێت کە رکابەری یەکتریی بکەن بۆ ئەوەی کە کامیان بتوانن، زۆرترین خزمەت بە میللەتەکەمان بکەنو زۆرترین خەڵك بەلای خۆیاندا رابکێشن.

KNN: بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی لە رابردودا کەمتر هۆشیاری تاکی کورد لەبەرچاو گیراوە، لەم جارەیاندا بەشێوەیەکی گشتی لیستو قەوارە سیاسییەکان بەرنامە دەکەنە فەلسەفەی کاری خۆیانو دەیخەنە بەردەمی جەماوەر؟

نەوشیروان مستەفا: پێموایە لەدوای تێپەربونی (١٨) ساڵ لە حوکمڕانی کوردیی بەڵێ، ئێستا بەرنامە وەك لە چەند جارێکی دیکەدا باسمکردوە، لەدوای راپەڕین بۆ ماوەی دەساڵ زیاتریش ئێمە لەبەر ئەوەی لەبەغدا حکومەتی بەعس لەسەر کاربو، ئەولەویەتی هەمو هێزە سیاسییەکان لە کوردستانی عێراقدا ئەوەبو، کە تەسبیتی حکومەتی هەرێمی کوردستانو پەرلەمانی کوردستان بکەن، لەدوای روخانی سەدام ئەولەوییەتی هەرێمی کوردستان ئەوەبو کە مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد لە دەستوری عێراقدا بچەسپێنن، بەڵێ ئێستا ئەولەوییەتی خەڵك بۆ ئەوەیە تەرکیز بخرێتە سەر بەرنامە، ئایا بەرنامەکەی تۆ چ خزمەتگوزارییەکی گشتی پێشکەش بەخەڵك دەکات؟ چ گۆڕینێك لە چۆنایەتی ژیانی خەڵکدا دەکەیت؟ چۆن عەدالەتی کۆمەڵایەتی جێبەجێ دەکەیت؟ ئەمانە بەرنامەن، تەنیا دروشمی سیاسی نین، خەڵك ئێستا بەلایەوە گرنگە رۆژی چەند سەعات کارەبای هەیە؟ رۆژی چەند سەعات ئاوی خواردنەوەی هەیە؟ چەند کیلۆمەتر رێگاوبانی هەیە؟ چەند بنکەی تەندروستی هەیە؟ چەند بینای قوتابخانە هەیە؟ ئەمانەی زۆر زۆر بەلاوە گرنگەو بەشێکە لە بەرنامەی سیاسی.

KNN: ئەمە لەو قەناعەتەوەیە لە یەکێك لە چاوپێکەوتنەکانتدا باس لەوە دەکەیت کە ئەولەویەتی ئێستا چاکسازیی ناوخۆیمانە؟

نەوشیروان مستەفا: ئەولەویەتی ئێستا چاکسازیی نییە، بەڵکو گۆڕانە، قۆناغێك چاکسازیی بو، ئێستا ئەولەویەت گۆڕانە لەشێوەی بەڕێوەبردنی ولاتەکەماندا، گۆڕین نییە لە دەموچاو کەسەکاندا، گۆڕینە لەشێوەی بەڕێوەبردنی ولاتدا، ئەم ولاتەی ئێمە هەتا ئێستاش مەکتەبی سیاسییەکان بەڕێوەی دەبەن، ئیتر کاتی ئەوەهاتوە کە پەرلەمان ببێت بە مەرجەعێکی سیاسی، کاتی ئەوە هاتوە کە ئەنجومەنی وەزیران بەبێ تەدەخولی رۆژانەی سەرکردایەتی حیزبەکان، بتوانێت کاروباری دائیرەکانی بەڕێوەبەرێت، ، قایمقامو بەڕێوەبەری ناحیەو موحافیزەکانو سەرۆکی شارەوانیو سەرۆکی دائیرەکان لەسەر بنچینەی لێوەشاوەییو شارەزاییو زانایی ئیشەکانیان بەڕێوەبەرن، بەبێ تەدەخولی حیزبی، دادگاکانمان سەربەخۆبنو هیچ لایەنێك نەتوانێت دەستوەربداتە کاروبارەکانیان، زانکۆکانمان سەربەخۆبن، رێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی لەژێر هەیمەنەی حیزب بێنە دەرەوە بۆ ئەوەی بتوانن بەرگری لە توێژەکانی خۆیان بکەن. بەرپرسانی حیزب نەتوانن دەست لە بازاڕو سەرمایەگوزاریی وەربدەن، ئەمە لەو جۆرە شتانەیە کە ئێستا بوەتە داخوازی خەڵك، ئەمانە هەموی بەرنامەی سیاسییەو هیچ پەیوەندییەکی بەوەوە نییە کە ئەمە فلانە کەس دەیکات یان کامە حیزب بیکات، هەرلایەنێك بیکات پێموایە خەڵك لە دەوری کۆدەبێتەوە.

KNN: بەڕای ئێوە ئەمە بوەتە داخوازی خەڵك؟

نەوشیروان مستەفا: پێموایە بوەتە خواستێکی جەماوەری.

KNN: جۆرێك لە جیاوازی لەم هەڵبژاردنەدا بەدیدەکرێت بەهۆی بونی لیستی جیاوازەوە، ئەگەر هاتو بەشێوەیەکی دیموکراسیانە هەڵبژاردنەکە تێنەپەڕێت، هەنگاوە مەدەنییەکانو ئەو رێوشوێنانەی کە پێویستە هێزە سیاسییەکان بیگرنەبەر بەڕای ئێوە چییە؟

نەوشیروان مستەفا: پێموایە نابێت هیچ لایەنێك بەهیچ جۆرێك بیر لە بەکارهێنانی توندوتیژیی بکاتەوە، ئەمە وەکو مەبدەئێك دەبێت قبوڵی بکەین، مەبدەئی دوەم، ئەوەیە ئێستا ئاسایشی پرۆسەی هەڵبژاردنو سەلامەتی پرۆسەی هەڵبژاردن بەدەست حکومەتی هەرێمی کوردستانەوەیە، دەبێت ئەوان بیپارێزنو مەسئولی یەکەمن لە پاراستنی ئاسایشی پرۆسەی هەڵبژاردن. لە کوردستانی عێراقدا، ئەوەی جێگای داخە ئێستا لە کوردستانی عێراقدا چوار دەزگای گرنگ کە دەتوانن عامیلی کاریگەربن لە هەڵبژاردندا ئەمانە بێلایەن نین، یەکەمیان هێزەچەکدارەکانە کە بریتین لە هێزەکانی ئاسایش، هێزی پێشمەرگە، پۆلیس، ئەمانە لە سلێمانی بەدەست یەکێتییەوەیەو لە هەولێریش بەدەست پارتییەوەیە، دامودەزگای حکومەت بەهەمانشێوە لە ئیدارەی سلێمانی بەدەست لایەنێکی سیاسییەوەیەو لە هەولێریش بەدەست لایەنێکی دیکەی سیاسییەوەیە، سەرچاوەکانی دارایی حکومەت کە موڵکی هەموانە ئەویش دیسانەوە بەدەست دولایەنی سیاسییەوەیە، دەزگاکانی راگەیاندن کە ئەوانیش کاریگەرن بەشی هەرەزۆری کەناڵە ئاسمانییەکانو رادیۆکانو رۆژنامەکان بەدەست ئەم دولایەنە سیاسییەوەیە، بە مانایەکی دیکە، نەهێزی چەکدار، نەپارەو پولی گشتی، نەبیرۆکراسی دەوڵەت نەڕاگەیاندن بێلایەن نییە، لە وڵاتانی سەرتاسەری دنیا تەنانەت ئەگەر ئێرانو تورکیا بەنمونە بهێنینەوە کە لە تەنیشتمانەوەن، لە هەمو هەڵبژاردنەکاندا ئەم چوار رەگەزە کە باسمکرد بێلایەنن لە هەڵبژاردندا، بێگومان لە هەڵبژاردندا هەریەکێك کە لەم دامودەزگایانەی باسمکرد، لە رۆژی هەڵبژاردندا وەکو تاك دەنگدەدەن بەلایەنێکی سیاسی، بەڵام لە پرۆسەی هەڵبژاردنەکاندا ئەمانە بێلایەن دەبن،

بەلام لە ولاتی ئێمەدا بێلایەن نین، ئێمە ئومێدمان وایە، ئەم دولایەنە دەسەلاتدارە پرۆسەی هەلبژاردن بە سەلامەتی بەرێوەبەرن، خۆ ئەگەر وانەبێت ئێمە پەنا دەبەین بۆ دادگاکانی کوردستان، ئەگەر لە کوردستانیش دادیان نەپرسین، ئەوا پەنا دەبەین بۆ بەغداو رێکخراوە نێودەولەتییەکانو ئاخیر شتیش پەنا دەبەینە بەرمیللەتی خۆمان، بەرێگەی مەدەنیانەو خۆپیشاندانو مانگرتنو ئەو رێگایانە دەگرینە بەر.

KNN: ئەگەر بارودۆخەکە بەمشێوەیە حیزبی بێت وەك باسکرا، بەرای تۆ رۆلی خەلکانی سەربەخۆ لە هاوکێشەکەدا چۆن دەبینیت؟

نەوشیروان مستەفا: ئەوەی جێگەی داخە پێموایە تائێستا نەیانهێشتوە رۆلەکانیان کاریگەر بێت، ئەویش لەبەر کۆمەلێك هۆ بوە، وەکو باسمکرد مەسەلەی ئەولەویەت زۆر گرنگ بوە لەهەر قۆناغێکدا، ئێستا ئەولەویەتەکان گۆراوە، سەردەمێك ئەگەر ئەولەویەت بۆ ئەوە بوبێت کە حکومەتی هەرێمی کوردستانو پەرلەمانەکەی جێگیر بکەین، سەردەمێك بۆ ئەوە بوبێت کە سەقامگیری لە کوردستاندا هەبێتو شەری ناوخۆ نەمێنێت، سەردەمێك ئەگەر بۆ ئەوە بوبێت کە مافەکانی کورد لەدەستوری عێراقدا جێگیر بکرێت، ئێستا قۆناغی ئەوە هاتوەتە پێش، کە گۆران لە چۆنایەتی ژیانی خەلکدا بکرێت، ئەمەش بوە بەخواستی خەلك، تەنانەت بوە بەخواستی حیزبەکانو حیزبە دەسەلاتدارەکانیش، من پێموایە قۆناغێك دەستیپێکردوە کە حیزبەکانیش دەبێت بەخۆیاندا بچنەوە، ئێستا دەلاقەیەکی گەورە دروستبوە لەبەینی حیزبەکانو لەبەینی کۆمەلانی خەلکدا، لەبەینی قاعیدەی حیزبەکانو سەرکردایەتی حیزبەکاندا، تەنانەت لەبەینی ئەندامانی سەرکردایەتی

حیزبەکانیشدا جۆرێك لە بێ متمانەیی دروستبوە، ئەمە دەمانخاتە سەر قۆناغێکی تازە، کە قۆناغی بەخۆداچونەوەیە کە قۆناغی گۆڕانە، قۆناغی چاکسازییە لەبواری ئابوری‌و کۆمەڵایەتی‌و رۆشنبیری‌و سیاسی، رەنگە هەندێك کەس ئەو وشەیە بەجۆرێکی دیکە لێکبداتەوە، کە من پێموایە قازانجی هەمو کەسێکی تیایەو زەرەری کەسی تیانییە، هەمو کەسێك قازانج لەوە دەکات زانکۆو پەیمانگاکانمان ئاستێکی زانستی بەرزیان هەبێت‌و بەبن بەشوێنی داهێنان‌و پێگەیاندنی کادیری پاشەڕۆژ، هەمو کەسێك قازانج لەوەدەکات کە بازاڕی ئێمە ئازادبێت گرانی نەمێنێت‌و منافەسە لەناو بازاڕدا هەبێت‌و ئیحتیکار نەمێنێت، هەمو کەسێك قازانج لەوە دەکات کە قانون سەروەر بێت‌و دادگاکان دەسەڵاتیان هەبێت‌و هەرکەسێك شکاتێکی هەبێت‌و بتوانێت پەنای بۆبەرێت، یاخود پەرلەمانێکمان هەبێت ببێتە مەرجەعی سیاسی، ئەمە ئەوەیە کە تاکی کورد بە فەقیرو دەوڵەمەندەوە دەسەڵاتدارو بێدەسەڵاتەوە قازانجی لێدەکەن‌و پێموانییە کەس دژی ئەوەبێت.

KNN: زۆرجار بەناوی ئێوەوە بەشێوەیەکی گشتی قسەو لێدوان بۆ راگەیاندنەکان دەدرێت، قسەکردن بەناوی ئێوەوە چۆنە؟

نەوشیروان مستەفا: بەنیسبەت لیستی گۆڕانەوە، ئێمە لەناوخۆماندا رێککەوتوین کەسێکمان کردوە بەوتەبێژی رەسمیی لیستەکەمان ناوی د. شاهۆ سەعیدە، د. شاهۆ کەسێکی دەسەڵاتدارە کە دەوتوانێت بەناوی لیستەکەوە بۆ هەمو لایەك قسە بکات، لەمەولا هەرکەسێك یان هەر کەناڵێکی راگەیاندن قسەیەکی گوێزایەوە بەناوی سەرچاوەیەکی نزیك لەمن یان لە کۆمپانیای وشە، یان لە لیستی گۆڕان، بێجگە لە قسەی د. شاهۆ سەعید هیچ ئیعتیبارێکی نییە،

بەنیسبەت کۆمپانیای وشەشەوە، کۆمپانیای وشە حیزبی سیاسی نییە، لەناو کۆمپانیاکەماندا بیروبۆچونی جیاواز هەیە خەڵك هەیە سەر بەفیکری جیاوازەو خەڵکیش هەیە بێلایەنە، ئێمە کۆمەڵێك دەزگای راگەیاندنی وەك کەناڵێکی ئاسمانی تەلەفزیۆن‌و رۆژنامەیەکی رۆژانەو رادیۆو سایتمان هەیە، کە دەتوانین بیروبۆچونەکانی خۆمانی تێدا بڵاوبکەینەوە، بۆیە هەرچی بیروبۆچونێکمان هەیە دەتوانین بەبێ شەرم بڵاوی بکەینەوە، بۆیە ئەو قسانەی کە لە راگەیاندنەکانەوە بەناوی سەرچاوەیەکی نزیك لە فلأنەکەس‌و فیسارەکەس بڵاو دەکرێتەوە هیچ ئیعتیبارێکی نییەو ئەو دەزگایانە خۆیان ئەو شتانە بڵاو دەکەنەوە.

KNN: دواپرسیارمان ئەوەیە کە چەند رۆژێکی دیکە لە هەڵمەتی هەڵبژاردنەکان نزیکدەبینەوە، ئێوە لەم هەڵمەتەدا دەتانەوێت مۆدێلێکی تازە بێننە ناو ئەو کێبڕکێ‌و ململانێ دیموکراسیەوە، ئایا دەتانەوێت لەڕوی کەمپەین‌و بانگەشەی هەڵبژاردنیشەوە جیاوازبن؟

نەوشیروان مستەفا: کەمپەینی هەڵبژاردن چەند جۆرێکی هەیە" دو جۆری سەرەکیان، یەکێکیان ئەوەیە کە لایەنێك لە پڕوپاگەندەکە تەرکیز دەکاتە سەرشکاندن‌و سوککردنی لایەنەکەی دیکەو هەوڵدەدات شەخسەکانی بشکێنێت‌و هێرش بکاتە سەر کەسایەتی پاڵێوراوەکان‌و ناوەڕۆکی بەرنامەکەی پوچەڵ بکاتەوەو سوك‌و سەلیمی بکات‌و لە ڕێگەی شکاندنی پاڵێوراوەکانیەوە بەرنامەکەی سوك بکات، یەکێکی دیکەیان ئەوەیە کە لایەنەکانی دیکە فەرامۆش دەکات‌و تەرکیز دەخاتە سەر رونکردنەوەی بەندەکانی بەرنامەکەی‌و رونکردنەوەی کەسایەتی پاڵێوراوەکانی‌و ئەوانەی کە نوێنەرایەتی لیستەکەی

دەکەن، ئێمە هەوڵدەدەین رێگەی دوەم بگرین‌و لەباتی ئەوەی کە هێرش بکەینە سەر ئەم‌و ئەو، هەوڵدەدەین ئەو کەسانەی کە پاڵێوراوی ئێمەن بە خەڵکیان بناسێنین‌و خۆیان بێنە سەر تەلەفزیۆن‌و بیروبۆچونی خۆیان بۆ خەڵك بلاّو بکەنەوەو لە هەمانکاتیشدا هەوڵدەدەین بەرنامەکەی خۆمان بەچاکترین شێوە بۆ خەڵك رۆشن بکەینەوە، بۆ ئەوەی خەڵك خۆی قەزاوەت بکات لەسەر ئەوەی کە ئایا بەرنامەکەی ئێمەو ئەو کەسایەتیانەی ئێمە پاڵاوتومانن جیاوازە.

# ئێستا ئەولەویەت بۆ چاکسازییە

**سازدانی: ئەحمەد زاویتی (کەناڵی ئاسمانی ئەلجەزیرە)**
**لە عەرەبیەوە: مەجید ساڵح**

بینەرانی بەڕێز سلاوی خواتان لێبێت، لە بەرنامەی "دیداری ئەمڕۆ"ی کەناڵی ئاسمانی ئەلجەزیرە لە گەڵتانداین و میوانداری نەوشیروان مستەفا سەرۆکی لیستی "گۆڕان"مان کردوە.

ئەلجەزیرە: ئێوە وەك رەوتێك لە سەرکردایەتی (ی. ن. ك) بەرنامەی "گۆڕان"تان لە کوردستانی عێراق راگەیاندوە، لە پشتی ئەو بەرنامەوە چیتان دەوێت؟

نەوشیروان مستەفا: حاڵی حازر ئێمە رەوتێك نین لە ناو (ی. ن. ك)، بەڵکو رەوتێکین لە دەرەوەی (ی. ن. ك) بەرنامەی لیستی گۆڕان لەوەدا کورت دەکرێتەوە دەسەڵاتی حیزب لە دەسەڵاتی حکومەت جیا دەکرێتەوە. بەمانایەکی تر هەوڵدەدەین پەرلەمانێك دروست بکەین لە ژێر دەسەلات و بڕیارەکانی مەکتەبی سیاسی حیزبەکانی کوردستاندا نەبێت. هەروەها بنیادنانەوەی دەسەڵاتێکی دادوەری سەربەخۆ و نەزیهی و سەربەخۆ و دادپەروەر، سنوردانان بۆ دەستێوەردانی حیزب لە زانکۆکان و ئابوری واتە جیاکردنەوەی دەسەڵاتی حیزب لە حکومەت و بونی شەفافیەتی زیاتر لە بودجەی هەرێمی کوردستان و دادپەروەری کۆمەڵایەتی زیاتر.

ئەلجەزیرە: بۆ پێشتر ئەو داخوازیانەتان نەبوە و ئێستا هەتانە؟

نەوشیروان مستەفا: تەمەنی ئەزمونی کوردستان نزیکەی ١٨ ساڵ دەبێت، لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٢ کاری سەرەکیمان بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە بو کە لە ئەنجامی کشانەوەی ئیدارات لە لایەن حکومەتی مەرکەزیەوە هاتبوە ئاراوە،

لەو هەڵبژاردنەدا دەبو دامودەزگاکانی حکومەت دروست بکرێنەوە، دەزگا دەستوری و حکومیەکان. واتە پڕکردنەوەی بۆشایی ئیداری و سیاسی و ئەمنی هەرێمی کوردستان، لە هەڵبژاردنەکانی ٢٠٠٥ قۆناغەکە گۆڕا، لەو کاتەدا هەرێمی کوردستان لە روەکانی سیاسی و ئەمنی و تەنانەت ئابوریش، سەقامگیر بو.

کاری سەرەکی بریتی بو لە نوسینەوەی دەستوری عێراق، بۆیە دەبوایە خیتابی کورد خیتابێکی یەکگرتو بوایە بۆ چەسپاندنی بەشداریکردنی کورد لە دەزگاکانی دروستکردنی بڕیاری سیاسی لە عێراق. بە شێوەیەکی سەرکەوتو ئەو قۆناغەمان تێپەڕاند.

ئێستا کاری سەرەکی بریتییە لە چاکسازی لە ناوخۆدا، چاکسازی سیاسی، چاکسازی کۆمەلأیەتی، چاکسازی ئابوری و کلتوری.

ئەلجەزیرە: هەندێك چاودێری سیاسی دەڵێن ئەم هەولأنەی ئێوە لەوانەیە ببێتە هۆی کەرتبونی هەڵوێستی کورد لە بەغدا لە ئایندەدا؟ وەلأمی ئێوە چیە بۆیان؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە پێمان وانییە یەکگرتویی کورد لە بونی یەك لیستی دایە، بەڵکو پێمان وایە یەك هەڵوێستی کورد لە بونی یەك خیتابی کورددایە. دەکرێت لەگەڵ هەمو حیزبەکانی هەرێمی کوردستاندا یەك خیتابیمان هەبێت و لەهەمان کاتیشدا ململانێ بکەین بۆ بە دەستهێنانی کورسی زیاتر لە پەرلەمانی کوردستان.

ئەلجەزیرە: سەبارەت بە بەشداریکردنتان لە هەڵبژاردنەکانی ئایندەی پەرلەمانی لە لیستی "گۆڕان" کە سەربەخۆیە لە لیستی "کوردستانی" کە هی هەردو حیزبە کوردیەکەیە، خۆ ئامادەکردنتان بۆ ئەو هەڵبژاردنە چۆنە، بەرنامەی هەڵبژاردنتان چیە؟

نەوشیروان مستەفا: وەك لە سەرەتادا باسم کرد بە کورتی بەرنامەی ئێمە پێکدێت لە چەند تەوەرێکی سەرەکی. خاڵی سەرەکی بریتییە لە جیاکردنەوەی دەسەلأتی حیزب لە حکومەت. پەرلەمانێك دور لە بالأدەستی حیزبەکان.

دەسەلاّتێکی تەنفیزی کارا، دەسەلاّتێکی قەزایی سەربەخۆ لە دەسەلاّتی حیزبەکان و زانکۆکان لە دەرەوەی دەسەلاّتی حیزب بن و بازاڕ و ئابوری دوربێت لە دەست تێوەردانی حیزب.

ئەلجەزیرە: چەندین مانگە باس لەو شتانە دەکەن، کاردانەوەی شەقامی کوردی بۆ ئەو پەیامانەتان چۆن دەبینن، بە دڵنیاییەوە ئەو پەیامە لە کوردستاندا شتێکی نوێیە؟

نەوشیروان مستەفا: کاردانەوەیەکی زۆر باشی هەبوەو خەڵك ئیستیجابەیان زۆر زۆر باش بوە بۆی، چونکە قۆناغی مەترسیمان تێپەڕاندوە و ئێستا باری سیاسی و ئەمنی و ئابوری سەقامگیرەو پەیوەندی نێوان ناوەندو هەرێم باشە و لەسەر بنەمای دەستورو تێگەیشتنی هاوبەش و دیالۆگ بونیادنراوە، بۆیە کاتی ئەوە هاتوە گرنگی بە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاریە سەرەکیەکانی هاولاّتیانی کورد بدەین، بۆ نمونە دابینکردنی کارەباو ئاوی خواردنەوە و دروستکردنی قوتابخانەو نەخۆشخانەو کەمکردنەوەی جیاوازی لە نێوان بەرزترین ئاستی موچەو نزمترین ئاستی موچەی فەرمانبەرانی حکومەت.

ئەلجەزیرە: چۆن خۆتان ئامادە دەکەن بۆ قۆناغی پاش هەڵبژاردن ئایا ئەگەر داواتان لێکرا، بەشداری لە حکومەتدا دەکەن یان وەك ئۆپۆزسیۆن دەمێننەوە؟

نەوشیروان مستەفا: زوە وەلاّمی ئەو پرسیارە بدەینەوە، با چاوەڕێی دەرئەنجامی هەڵبژاردنەکە بین.

ئەلجەزیرە: سەبارەت بە هاوپەیمانێتی لەگەڵ هێزە سیاسیەکان پێش و پاشی هەڵبژاردن، ئایا لە دەرەوەی یەکێتی و پارتی هیچ لایەنێك داوای هاوپەیمانی لێنەکردون بۆ بەشداریکردن لەو بەرنامەیەی کە هەتانە؟

نەوشیروان مستەفا: کەس داوای هاوپەیمانی لێمان نەکردوە، بەلاّم لە هەمانکاتدا ئێمە هەوڵ دەدەین تەنسیق بکەین لەگەڵ هەمو لیستەکاندا، تەنسیق لە بواری چاودێری و راگەیاندن و سیاسەت، تەنسیق، نەك

هاوپەیمانێتی. تەنسیق یان هاوپەیمانی پاش هەڵبژاردنەکان، بەستراوەتەوە بە دەرئەنجامی هەڵبژاردنەکانەوە.

ئەلجەزیرە: سەبارەت بە هەڵوێستی کورد لە بەغدا لە شەش ساڵی رابردودا، پەیوەندیەکی ئاشکرا هەبوە لە نێوان کورد بە هەردو حیزبەکەیەوە لەگەڵ بەغدا و هێشتا هەندێك گرفتی هەڵپەسێراو ماوەتەوە، ئێوە بەرنامەیەکی ئاشکراتان هەیە بۆ چارەسەرکردنی ئەو مەسەلە هەڵپەسێراوانە، وەك کێشەی کەرکوك و ناوچە دابڕاوەکان و جۆری پەیوەندیتان لە گەڵ بەغدا؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ لە بەرنامەکەماندا هەیە و نامەوێ بڕۆمە وردەکاری بەرنامەکەوە، بەڵام لە روی مەبدەئیەوە پەنا بۆ دیالۆگ دەبەین نەك زمانی هەڕەشەو گورەشە. دیالۆگێك لەسەربناغەی دەستوری عێراق بونیادنرابێت.

ئەلجەزیرە: ئێوە وەك لیستی گۆڕان یان رەوتی ریفۆڕم لە کوردستانی عێراق، چۆن دەڕواننە پەیوەندی نێوان بەغدا و کوردستان، ئایا ئەو پەیوەندییە لە رێگەی دەسەلاتی کوردیەوە دەبێت یان وەك رەوتێك ئەو پەیوەندییە دەبەستن، ئایا ئێستا پەیوەندیتان هەیە بە حکومەتی بەغداو رەوت و حیزبەکانی دیکەی عێراق؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە حیزب نین تاوەکو پەیوەندی دو قۆڵی و سێ قۆڵی ببەستین، بەلام مەرجەعی سیاسی بۆ چارەسەرکردنی هەمو ئەو کێشانە پەرلەمانی کوردستانەو هەروەها هەوڵدەدەین، دەزگایەکی دەستوری تایبەت بۆ لێپرسینەوە لەگەڵ نوێنەرانی کورد لە بەغداو جۆری ئەدائیان دروست بکەین، حاڵی حازر دەزگایەکی بەرپرس نییە بۆ لێپرسینەوە لەگەڵ ئەو بەرپرسە کوردانەی لە بەغدان. ئێمە شەریکی حکومەتی عێراقین و لە ئۆپۆزسیۆندا نین، شەریکین لە دروستکردنی بڕیاری سیاسی و لە وەزارەتەکاندا شەریکین لە پەرلەمانی عێراقدا شەریکین، بۆیە مەبدەئی دیالۆگ باشترین مەبدەئە بۆ چارەسەرکردنی کێشە هەڵپەساوەکان.

ئەلجەزیرە: پەیوەندی لیستەکەتان یان رەوتی ریفۆرم یان نەوشیروان مستەفا وەك سیاسەتمەدارێکی ناودار لە کوردستان پەیوەندتان لەگەڵ ئەمەریکا وەك زلهێزێکی جیهانی چۆنە و کە لە عێراقدا پێگەیان بەهێزە، ئایا جۆرێك لە پەیوەندیتان لەگەڵ ئەمەریکادا هەیە، یان ئایا ئەمەریکا پەیوەندی پێتانەوە کردوە بۆ دروستکردنی جۆرێك لە پەیوەندی؟

نەوشیروان مستەفا: پەیوەندی سیاسی دیبلۆماسی لە ئەستۆی حکومەتی عێراقدایەو لەسەر شانی حکومەتی فیدراڵە کاروباری سیاسەتی دەرەوە لە ئەستۆ بگرێت، بۆیە پەیوەندیی لەگەڵ ئەمەریکا لە کارە سەرەکییەکانی حکومەتی عێراقە، ئەوە لەلایەك، لە لایەکی دیکەوە ٢٠ ساڵ زیاترە بزوتنەوەی کوردی جۆرێك لە پەیوەندی لەگەڵ ئیدارەی ئەمەریکادا هەیە. بە تایبەتی پاش کۆڕەوەکە و هێرشکردنی سوپای عێراق بۆ سەر کوردو دروستکردنی "ناوچەی ئارام"، لەو کاتەوە تاوەکو ئێستا پەیوەندی هەیە لە نێوان سەرکردایەتی کوردو بەرپرسەکانی ئەمەریکا. ئەمەریکییەکان بەرژەوەندییان هەیە لە ناوچەکەدا، بەرژەوەندییان هەیە لە دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ گەلانی ناوچەکەدا. بەرژەوەندییان هەیە لە سەقامگیری سیاسی لە ناوچەکەو رێگە نەدان بە هاتنی تیرۆریستان بۆ ناوچەکە. پەیوەندییەکان لەسەر ئەو بنەمایانەن و پێموانییە پەیوەندییەك هەبێت لە دەرەوەی حکومەتی عێراقی.

ئەلجەزیرە: ئێران ئێستا رۆڵێکی گەورەی هەیە لە عێراقدا. بەپێی قسەی چاودێران ئێران بە شێوەی جۆراوجۆر بونی لە عێراقدا هەیە، پەیوەندی ئاشکرای هەیە لەگەڵ حکومەتی هەرێم و هەردو حیزبەکەو هێزە عێراقییەکانی دیکەدا لە باشورو ناوەڕاستی عێراق، بەو پێیەی شاری سلێمانی هاوسنورە لەگەڵ ئێران، ئایا ئێران هەوڵی نەداوە پەیوەندیتان پێوە بکات و جۆرێك پەیوەندیتان لەگەڵ دروست بکات؟

نەوشیروان مستەفا: ئێران وڵاتێکی گرنگەو هێزێکی گەورەی ناوچەکەیە. عێراق زیاتر لە هەزار کیلۆمەتر سنوری هاوبەشی لەگەڵدا هەیە. نەك هەر

سنوری هاوبەش، بەڵکو پەیوەندی مەزەەبی و نەتەوەیی و کلتوری و ئابوری لەگەڵ هەردولادا هەیە، بۆیە گرنگە پەیوەندییەکی هاوسەنگ هەبێت، چی لە لایەن حکومەتی مەرکەزی چی لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستان زیاتر لە ٦٠٠ کیلۆمەتر سنوری هاوبەشی هەیە لەگەڵ ئێران، بۆیە پێویستە پەیوەندیمان لەگەڵ ئێراندا باش بێت و لەسەر بەرژەوەندی هاوبەش و پەیوەندی حکومەتی مەرکەزی و حکومەتی هەرێم لەگەڵ ئێران باشەو کۆنسوڵی ئێران لە سلێمانی و هەولێر هەیە و مەرکەزی بازرگانی و کۆمپانیای ئێرانی لە کوردستاندا بە ئازادی کار دەکەن.

ئەلجەزیرە: بەڵام وەك رەوتێك، پەیوەندیتان لەگەڵ ئێراندا هەیە؟

نەوشیروان: نەخێر

ئەلجەزیرە: وەك سیاسەتمەدارێکی ناوداری کورد چۆن پەیوەندی کوردو ئێران لەلایەك و کوردو تورکیا لەلایەکی تر هەڵدەسەنگێنن؟

نەوشیروان مستەفا: ئەوە بابەتێکی زۆر ئاڵۆز، چونکە گەلی کورد بەسەر چەند وڵاتێکی وەك ئێران و تورکیاو عێراقدا دابەشکراوە. لەودیو سنورەکانەوە پەیوەندی نەتەوەیی هەیە لە نێوان کوردەکاندا، لە هەمانکاتدا کێشە هەیە لە نێوان هەرێمی کوردستان و وڵاتانی دراوسێ بە تایبەتی تورکیا ئەویش بەهۆی بونی هێزی چەکدار لەسەر سنورەکان، لەبەر بەربڵاوی سنورەکەش، حکومەتی هەرێم ناتوانێت کۆنترۆڵی هەمو ناوچەکە بکات، کێشەی کوردەکانی تورکیا، کێشەی تورکیایە و کێشەی عێراق نییە. ناتوانرێت لە رێگەی هێزی چەکداری کوردی عێراقەوە کێشەی کوردی تورکیا لە ناو ببرێت، بەڵکو دەکرێت کێشەکە سیاسیانە چارەسەر بکرێت کێشەکە لە خاکی عێراق چارەسەر ناکرێت چارەسەرەکەی لە خاکی تورکیایە.

ئەلجەزیرە: باستان لە کێشەی کورد کرد لە تورکیاو ئێران، کێشەی کورد لە عێراق لە رێگەی فیدرالیەتەوە چارەسەرکراو پرۆژەی دیکە هەیە بۆ

چارەسەرکردنی کێشەی کورد، ئایا فیدرالّیەت چارەسەری کێشەکە دەکات، یان ئێوە پرۆژەی ترتان هەیە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە عێراق؟

نەوشیروان مستەفا: لەم قۆناغەدا چارەسەری فیدرالّی چارەسەرێکی زۆر چاکە بۆ کێشەی کورد لە عێراق، مانەوەی کورد لە ناو عێراقدا، هێزە بۆ کورد، نەك لاوازی. بۆیە من لایەنگری فیدرالّیم و لە نوسینەوەی دەستوری عێراقدا لە بەغدا بوم و بەشداریم کرد لە نوسینەوەی دەستوری عێراقی و پەیوەندی فیدرالّی لە نێوان بەغداو حکومەتی هەرێم.

ئەلجەزیرە: سیاسەتمەدارانی کورد بەردەوام باس لە مانەوەیان لە چوارچێوەی عێراقدا دەکەن، هەندێ لایەنی عەرەبی پێیان وایە ئەو هەلّوێستە لە ئایندەدا گۆڕانی بەسەردا دێت و ئەو هەلّوێستە هەلّوێستێکی تاکتیکییە و لەوانەیە لە ئایندەدا بگۆڕێت؟.

نەوشیروان مستەفا: لە ئایندەیەکی نزیکدا پێموایە لە چوارچێوەی عێراقدا دەمێنێتەوە، بەلاّم ناتوانم پێشبینی ئایندە بکەم، چونکە پێش ٢٠ سالّ ئەوروپا شێوەیەکی دیکەی بو ٢٠ سالّ دوای ئەوەش شێوەیەکی دیکەی هەیە. هەروەها بە نسبەت رۆژهەلاّتی ناوەڕاستیشەوە وایە. من ناتوانم پێش بینی ئەوە بکەم ٢٠ سالّی دیکە چی رودەدات.

ئەلجەزیرە: لە شەقامی کوردستاندا ترس لەوە هەیە پەیوەندی ئێوەو سەرکردایەتی یەکێتی بگاتە ئاستی شەڕی سارد و نهێنیەکانی رابردو ئاشکرا بکرێت؟

نەوشیروان مستەفا: من لەگەلّ ئەوەدام لاپەڕەکانی رابردو دابخرێت، وەك دەزانن شەڕی ناوخۆ هەبوە لە کوردستانداو دواتر ئاشت بونەوە رویدا لە نێوان هەمو لایەنەکاندا. من لەگەلّ ئاشت بونەوە و هەلّنەدانەوەی لاپەڕەکانی رابردوم، و نامەوێت بچینە ناو پێچ و لۆکانی مێژوەوە تا ئەو رادەیە نەبێت کە خزمەتی ئایندە بکات، بەلاّم گەر بگەڕێینەوە بۆ دواوە، ترسمان لە باسکردنی روداوەکان نییە. ئەوە لە لایەك، لە لایەکی ترەوە هیوادارم کار نەگاتە هیچ جۆرە ئالۆزیەکی

سیاسی و ناسیاسی لە کوردستانی عێراقدا. چونکە لای خۆمانەوە، هێزی چەکدار و سەربازیمان نییەو مەسەلەی ئەمنی سیاسی و پاراستنی هەڵبژاردنەکان لە ئەرکە سەرەکییەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستانەو دەکرێت لەم بارودۆخەدا لە ڕێگەی یاساوە ڕێگە بگرن لە هەمو جۆرە گرژی و ئاڵۆزییەك.

ئەلجەزیرە: ئایا مەترسی ئەوەتان نییە ئەم دۆخەی ئێستا لە چوارچێوەی کرژی ڕاگەیاندن دەرچێت و بگاتە ئاستی ڕوبەڕوبونەوەی چەکداری لە نێوان ئێوە و دەسەڵاتی کوردی یان (ی. ن. ك)؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە بزوتنەوەیەکی سیاسین و هێزی چەکدارمان نییە، ئێمە پەنا بۆ دادگا و یاسا دەبەین، ئەگەر لە سلێمانی ڕێگەمان پێ نەدەن، پەنا بۆ دادگای فیدراڵی دەبەین لە بەغدا یان ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان، ئێمە پەنا بۆ چەك نابەین.

ئەلجەزیرە: لە میدیا لۆکاڵیەکان باس لە گوشار دەکرێت بۆ سەر کادرو لایەنگرەکانتان، ئایا هەڵوێستان وەرنەگرتوە لەو گوشارانە بە ڕێگەی دادگا بۆ نەهێشتنی ئەو گوشارانە لەسەر کادرەکانتان؟

نەوشیروان مستەفا: ئێمە ئەوە بە پێشێلکردنی ماڵ مرۆڤ و ماڵ هاوڵاتیبون دەزانین و ئەرکی حکومەت دۆزینەوەی کارو موچەیە بۆ هاوڵاتیان، لە ڕێگەی دادگاوە بەرگری لە هاوڕێکانمان دەکەین.

ئەلجەزیرە: دوایین پرسیارمان ئەوەیە، ئێستا پەیوەندیتان لەگەڵ جەلال تاڵەبانیدا چۆنە؟ ئێوە کەسی یەکەم و دوەم بون لە ناو (ی. ن. ك)دا؟.

نەوشیروان مستەفا: لەسەر ئاستی شەخصی پەیوەندیمان ئاساییە.

الجزیرە: بەڕێز نەوشیروان مستەفا سەرۆکی لیستی گۆڕان، سوپاستان دەکەین بۆ ڕەخساندنی ئەو

# ناکۆکییەکانم لەگەڵ یەکێتی نیشتیمانی گەیشتۆتە خاڵی نەگەڕانەوەو لە هەڵبژاردنەکانی داهاتوشدا بە لیستی جیاواز دادەبەزین

***لە چاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ رۆژنامەی (الشرق الاوسط)دا، (نەوشیروان مستەفا) رایگەیاند: لەگەڵ تاڵەبانی لەسەر ئاڕاستەو فیکرە سیاسییەکان جیاوازین نەك سەرۆکایەتی حیزب***

**سازدانی: هیوا عەزیز (الشرق الاوسط)**
**لە عەرەبییەوە: یادگار فایەق**

**لەسەر لوتکەی بەرزترین گرد، کە بنکەی سەرەکییەتی لە شاری سلێمانی لە هەرێمی کوردستان، ئەمجارەیان (نەوشیروان مستەفا)، کە سیاسەتمەدارێکی خاوەن ناوبانگی کوردەو پێشتر کەسی دوهەم بوە لەناو یەکێتی نیشتیمانی کوردستاندا، کە (جەلال تاڵەبانی) رابەرایەتی دەکات، بە شێوازێکی ناتەقلیدی بەنیازە کۆمەڵێك ریفۆرمی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و کلتوری لە کۆمەڵگای کوردیدا ئەنجام بدات. ئەمەش لەڕێگای ئەو هەڵمەت و شەڕەی هەڵبژاردن کە بەڕێوەیەو چاودێران پێیان وایە پێشهات و روداوێکی ئێجگار شەڕانی و مشتومڕ ئامێز دەبێت، ئەمەش لەسێبەری ئەو بارودۆخەی کە ئێستا کوردستان تیایدایە. ئەم هەڵوێستەی ئێستای (نەوشیروان مستەفا)ش دوای ئەوە دێت کە هەوڵەکانی بۆ گۆڕانکاری دروستکردن لە سیاسەت و بەرنامەی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان نەگەیشتنە هیچ وێستگەیەك کە هیوابەخش بێت و رێگای بۆ خۆش نەکرا تا بتوانێت ئەو ریفۆرمە ناوخۆییانەی بە تەمای بو لەناو ریزەکانی یەکێتی ئەنجامی بدات، یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ئەو**

حیزبەیە کە (نەوشیروان مستەفا) بە یەکێك لە سەرکردە دیارو سەرەتاییەکانی و دامەزرێنـەرانی دادەنرێـت، هاوکـات یەکێکـە لـە دیـارترین هزرمەنـد و روناکبیرانی ئەم حیزبە ئەمە ئەگەر بێتو تەنها کەس نەبێت.

(نەوشـیروان مـستەفا) لەئێـستادا دەیـەی شەشـەمی تەمـەنی تێپەڕانـدوە، لـە کۆتایی ساڵی (٢٠٠٦)دا دەست لەکار کێشانەوەی خۆی لە پۆستەکەی وەکو جێگـری سـکرتێری گـشتی (ی ن ك) ڕاگەیانـدو خـۆی تـەرخان کـرد بـۆ بەڕێوەبردنی دامەزراوەیەکی راگەیاندی بەرفراوان، کە ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانە و پێگەیـەکی ئـەلکترۆنی و کـەناڵێکی ئاسمـانی و سـەنتەرێکی ڕاپرسـی لـەخۆ دەگرێت. ئەم دامەزراوەیـەی (مـستەفا) هـەڵگری نـاوی (وشـە)یەو ژمارەیـەکی ئێجگـار زۆر لـە ڕونـاکبیرو خـەڵکی نوخبـە و ژمارەیـەك لـە کـادرو ئەنـدامانی پێشوی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانی لە خۆی کۆکردۆتـەوە، ئەمە سـەرەڕای ژمارەیەك لە ئەندامانی پارتە سیاسییەکانی دیکەی کوردستان.

لەدوای جیابونەوەی لە یەکێتی، (نەوشیروان مستەفا) بە هەمو شێوەیەك خۆی بەدور گرتوە لە لێدواندان بۆ کەناڵەکانی ڕاگەیانـدن، تەنانـەت لـەکاتی قـەیران و کێشە سیاسییەکانیشدا ئەم هەر بێدەنگی هەڵبژاردوە، تەنها بە دەگمەن نـەبێت، بەڵام لەگـەڵ ئەوەشدا ڕۆژنامـەی (الـشرق الاوسـگ) چانـسی ئـەوەی هـەبوە ئـەم پیاوە بدوێنێت و لە چاوپێکەوتنێکی کەم وێنەدا لەسـەر ئاسـتی ڕۆژنامەنوسـی و ناوخۆو عەرەبی و جیهانی لـە مـاوەی ساڵێکدا، (نەوشیروان مـستەفا)، تیشك دەخاتەسـەر سروشـتی نـاکۆکی و کێـشەکانی لەگـەڵ سـەرکردایەتی یـەکێتی نیشتیمانی و دەرەنجامەکانی ئەو ناکۆکییە. بفەرمون لەگەڵ دەقی چاوپێکەوتن و گفتوگۆکەمان لەگەڵ جەنابیان:

* سـەرەتا ئەمـەوێت بـزانم ناکۆکییـەکانتان لەگـەڵ یـەکێتی نیـشتیمانی گەیـشتونەتە کـوێ و ئایـا هـیچ هیوایـەك هەیـە بـە گەیـشتن بـە چارەسـەرێکی کۆتایی و یەکلاکەرەوە بۆ ئەو ناکۆکیانە؟

نەوشیروان مستەفا: ناکۆکییەکانمان گەیشتونەتە ڕێگایەك کە گەڕانەوەی بۆ نییە، جەوهەری ناکۆکییەکانیشمان خۆی لە چۆنێتی بەڕێوەبردنی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەبینێتەوە، خاڵی سەرەکی ئەو مەسەلەیەش جەخت لەسەر چۆنێتی جیاکردنەوەی دەسەڵاتی حیزب لە دەسەڵاتی حکومەت دەکاتەوە. ئەمە لەکاتێکدا کە تێکەڵی و چونەناویەکێك هەیە لەنێوان هەر سێ دەسەڵاتی یاسادانان و جێبەجێکردن و قەزائی (السلگە التشریعیە و التنفیژیە و القچائیە) لەلایەکەوەو دەسەڵاتی حیزبیش لەلایەکی ترەوە، هاوکات دەستێوەردانێکی ئێجگار دیارو زۆر هەیە لەلایەن حیزبەوە لە کاروباری زانکۆکان، ئێمەش بە ڕۆڵی خۆمان دەمانەوێت دەسەڵاتی حیزب لە دەسەڵاتی دەوڵەت جیا بکەینەوەو هەوڵ دەدەین دامەزراوەکانی دەوڵەت یان حکومەت بێلایەن بکەین و وایان لێبکەین بەلای خەڵك و هاوڵاتیانی کوردستاندا بڕوانن نەك حیزب یان کەسەکان.

* کەواتە لە قسەکانتاندا وا تێدەگەین کە ئێوە تێبینی و تەحەفوزاتتان هەیە لەسەر توانا و سیستمی جێبەجێکاری حکومەت؟

نەوشیروان مستەفا: ناتوانم ناوی بنێم تەحەفوزات یان دورەپەرێزی، وەك چۆن پێشتر ئاماژەم پێکرد، لێرەدا تێکەڵاوی و لێکئالآنێك هەیە لەنێوان دەسەڵاتە حیزبی و حکومییەکان، ئێستا مەکتەبی سیاسی حیزب وەکو ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی (مجلس قیادە الپورە)ی سەردەمی پێشوی لێهاتوەو هەمان ڕۆڵ پیادە دەکات، هەر لەبەر ئەمەش هەوڵ دەدەین پەرلەمانی کوردستان بکەین بە دامەزراوەیەکی سەربەخۆو خاوەن ئیرادەیەکی تۆکمەو سەربەخۆ، ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی ترەوە وابکەین دەسەڵاتی دادوەری دامەزراوەیەکی سەربەخۆ و ناحیزبی نەزیهو دیار بێت، هاوکات دەسەڵاتی تەنفیزیش وەکو چەترێك بێت کە هەمو ڕۆڵەکانی گەلی کوردی لەژێردا کۆببێتەوە نەك موڵکی حیزبێك یان دوان بێت یان هاوپەیمانی کۆمەڵێك حیزب و لایەن بەڕێوەی ببات و قۆرخی بکات.

* لەم جەژنی نەورۆزەدا نامەیەکتان لە سەرۆک تاڵەبانییەوە بەدەست گەیشت، ئەکرێت بزانین ناوەڕۆکی ئەو نامە دەستنوسە چی بو و وەڵامی ئێوەش چی بو؟
نەوشیروان مستەفا: بمبەخشە نامەوێت هیچ قسە و لێدوانێک لەو بارەیەوە بدەم.

* بڕیار وابو واچاوەڕوان دەکرا لە نەورۆزدا دانیشتنێک، کە بە یەکلاکەرەوە ناوزەد کرا، لەگەڵ تاڵەبانیدا ئەنجام بدەن، بەڵام نەکرا. . . بۆ؟
نەوشیروان مستەفا: پەیوەندییەکی کۆن و خەباتئامێز و کەسی من بە (جەلال تاڵەبانی)ی سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانەوە دەبەستێتەوە و تەمەنی ئەو پەیوەندییە خۆی لە (٤٠) ساڵ دەدات، هەر بۆیە شتێکی سروشتییە گەر چاومان بە یەکتر بکەوێت و لەیەک تێبگەین و ئەنانەت ناکۆکیش بین.

* ئایا لە هەڵبژاردنە پارلەمانییەکەی داهاتو بە لیستی جیاواز لە لیستی یەکێتی نیشتیمانی دادەبەزن و بەشدار دەبن، وەک چۆن بەم دواییانە بڵاو بویەوە، ئەگەر وایە سروشتی بەشداریکردنتان چۆن دەبێت و ناسنامەی کەسە پاڵێوراوەکان بۆ لیستەکەت کێن؟
نەوشیروان مستەفا: سەبارەت بە قسەکردن لەسەر لیستی داخراو یان کراوە ئەوا پارلەمانی کوردستان دوا قسەی خۆی لەوبارەیەوە کردوەو بڕیاریدا لەسەر بنچینەی لیستی داخراو بێت، کەواتە بێ لەوە هیچ هەڵبژاردنێکی ترمان لەبەردەستدا نییە، بەڵام سەبارەت بە بەشداریکردنمان، بەڵێ بەشداری دەکەین لە هەڵبژاردنەکانی داهاتو و بە لیستی سەربەخۆ و جیاواز لە تەواری حیزبەکانی ئێستای هەرێمی کوردستان دادەبەزین، هاوکات کار دەکەین بۆ هێنانی کەسانی سەربەخۆ و دەموچاوی نوێ، لەسەر کۆمەڵێک بنچینەی ڕێکخراو لەڕوی جیۆگراف و پیشەیی و تەمەن، ئەمەش بەو مانایە دێت کە ئێمە کۆمەڵێک گەنجی خاوەن پیشەو پسپۆڕی و تەمەنی جیاجیا دەهێنینە بوارەکەوە، بۆ ئەوەی دەرگای حکومەتی هەرێم بەڕوی ئەوەی نوێی خاوەن

توانـاو بـەهرەدا بکەینـەوە، واتـا دەموچـاوی نـوێ و خـوێن گـەرم و هـەڵگری بیرۆکەو بەرنامەی نوێ.

* باشە لەڕوی یاسایەوە ڕێگاتان پێدراوە کە بە لیستێکی سەربەخۆ لە یەکێتی نیشتیمانی بەشداری بکەن لەکاتێدا کە هێشتا یەکێکن لە ئەندامە دیارەکانی ئەو حیزبە، ئایا ئەمە لەگەڵ پەیڕەوی ناوخۆی حیزبدا یەك دەگرێتەوە؟

نەوشیروان مستەفا: لـەڕوی یاسابییەوە مـافی خۆمانـە بە لیستێکی جیاواز لـە یـەکێتی نیـشتیمانی بەشـداری بکـەین، هاوکـات مـافی ئەنـدامی حیزبەکانیـشە لیستی هەڵبژاردنی جیاواز لە لیستی حیزبەکانیان دروست بکەن.

* لەڕوی ستراتیژییەوە، ئایا پێتـان وانییـە، ئێوە بەم کردەوەیەتان ریـزی کورد بۆ زیاد لە ریزو بەرەیەك دابەش دەکەن؟

نەوشیروان مستەفا: ئەمـەی ئێمـە دەیکـەین بریتییە لـە ململانـێ و پێـشبڕکێ و بەربەرەکانییـەکی هەڵبـژاردنی پارلـەمانی نـەك داواکـردن بـۆ ئینـشیقاق دروسـتکردن، ئێمـە نـە داوامـان کـردوەو نـە داوا دەکـەین لـە هـیچ ئەنـدامێکی حیزبەکانی ئێستای گۆڕەپانی کوردستان کە لە حیزبەکانیان جیاببنەوە یاخود دەسـت لـەکار بکێـشنەوە، بـەڵکو ئێمـە داوایـان لێدەکـەین کـە لـە بەرژەوەنـدی لیستەکەی ئێمـەدا دەنـگ بدەن و بەکورتی ئێمـە نامانـەوێت کـەلێن و بەشـبەش بون بخەینە ریزی هیچ کام لە حیزبەکانی کوردستانەوە.

* بە چاوپۆشین لە ئەنجامەکانی هەڵبژاردنەکانی داهاتو، ئایا رێـی تێدەچێت، لە داهاتودا، قەوارەکەتان بچێتەپاڵ یەکێتی نیشتیمانی؟

نەوشـیروان مـستەفا: نـەخێر بـە هـیچ شـێوەیەك، ئێمـە نـاکۆکی و جیاوازییـە ناوەکییـەکانی یـەکێتیمان تێپەڕانـدوە، لەئێـستاو داهـاتودا کـار دەکـەین بـۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەکانی ناو کۆمەڵگای کوردی، نەك کێشە ناوخۆییەکانی یەکێتی یان هیچ حیزبێکی دیکە.

* رای گـشتی شـەقامی کـوردی وای دەبینێـت هەڵوێـستە هەنوکەییـەکانتان نـاکۆکی و ململانێـی کەسـییە لەگـەڵ خـودی جـەلال تاڵـەبانی و لەسـەر

سەرۆکایەتی یەکێتییە، ئایا تۆ وای دەبینێت کە تۆ ئەداو توانات باشتر بێت لە خودی تاڵەبانی لە سەرۆکایەتی کردنی یەکێتی؟

نەوشیروان مستەفا: ئەمە تێڕوانینێکی تەواو هەڵەیە، ئێمە لە ئاراستە و تێڕوانینی سیاسیمان ناکۆکین نەك مەسەلەی سەرۆکایەتی حیزب.

* ئەگەر وای دابنێین تاڵەبانی دەستبەرداری ئەمینداریتی گشتی یەکێتی دەبێت، ئایا تۆ ئامادەیت جێگای ئەو بگریتەوەو ئایا لە پشت پەردەوە هیچ پرۆژەیەکی هاوشێوە بونی هەیە؟

نەوشیروان مستەفا: بەپێی پێڕەو پرۆگرامی ناوخۆی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، ئەوا سکرتێری گشتی دەبێت لەڕێگای کۆنگرەیەکی بەرفراوانی حیزبەوە هەڵببژێرێت نەك لەڕێگای لیژنەیەکی ناوەندییەوە یان کۆمەڵێك کەس، لەبەر ئەمە مەسەلەکە بۆ کۆنگرەی داهاتو جێدەهێڵین.

* کەواتە بە نیازیت بەشداری بکەیت لە کۆنگرەی داهاتو و بۆ سەرۆکایەتی یەکێتی خۆت کاندید بکەیت؟

نەوشیروان مستەفا: نەخێر، بەهیچ شێوەیەك نە بەشداری دەکەم و نەخۆشم دەپاڵێوم.

* دەوترێت کە ئەو چوار ئەندامی مەکتەبی سیاسییەی دەست لەکارکێشانەوەی خۆیان راگەیاندو لەسەر باڵی ریفۆرم هەژمار دەکرێن، لەسەر داوای جەنابتان دەستیان لەکارکێشاوەتەوەو پێدەچێت لەدوایدا پەیوەندیتان پێوە بکەن، ئایا ئەم قسەو واتەواتانە تا چەند راستن؟

نەوشیروان مستەفا: ئێوە دەتوانن روی پرسیارەکانتان لە خۆیان بکەن و وەڵامتان دەست بکەوێتەوە. من هیچ داواکارییەکی هاوشێوەم ئاراستەی هیچ کەسێك نەکردوە، ئەو چوار سەرکردە دەستلەکارکێشاوەش ئازادن لە هەڵوێست وەرگرتنی سیاسی خۆیان، من وەکو خۆم دەستوەرنادەم لە ناکۆکییە ناوەکییەکانی یەکێتی نیشتیمانی.

* لەئێستادا، کەسانێك هەن بە ئەندازیاری لێکهەڵوەشاندنی یەکێتی ناوتان دەبەن، بەتایبەتی دوای ئەوەی لە چاوپێکەوتنێکی پێشتردا لەگەڵ ئەلشەرقو ئەوسەتدا دانت بەوەدا نا کە سەرکەوتو نەبوی لە بە دامەزراوەکردنی یەکێتی، تۆ چی لەوبارەیەوە دەڵێی؟

نەوشیروان مستەفا: لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی رابردودا، بێ ماندوبون هەوڵم داوە کۆمەڵێك ریفۆرمی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی و کلتوری لەناو کۆمەڵگای کوردیدا بەدی بهێنم، لەرێگای چاکسازی کردن لەناو ریزەکانی ناوخۆی یەکێتیدا، بەڵام سەرەکەوتو نەبوم، هەربۆیە ئێستا هەوڵی ئەوە دەدەم ئەو چاکسازییانە ئەنجام بدەم لەرێگای هەڵبژاردنە پارلەمانییەکانەوە، نەك لەرێگای ریفۆرمی حیزبی.

* وای بۆ دەچیت هەڵبژاردنەکانی داهاتو بێغەش بێت، ئایا بەرنامەی هەڵبژاردنتان چی دەبێت؟

نەوشیروان مستەفا: هیوادارم کە بێغەش بێت و شەفافییەتی تیادا بەدی بکرێت. وەکو خۆم ناتوانم نەزاهەت و پاکی هیچ هەڵبژاردنێك، نە لە کوردستان و نە لە هیچ ناوچەیەکی عێراق گەرەنتی و مسۆگەر بکەم. بەڵام بەنیسبەت بەرنامەی هەڵبژاردنی ئێمەوە، ئەوا بە تەواوی بڵاوی دەکەینەوەو رایدەگەیەنین هەرکات کات و رۆژی ئەنجامدانی هەڵبژاردنەکان دیاری و یەکلاکرایەوە.

* چۆن دەڕواننە ئەو رێککەوتنامە ستراتیژییەی نێوان دو حیزبە سەرکییەکە، یەکێتی نیشتیمانی و پارتی دیموکرات، بڕیاری بەشداریکردنیان بە یەك لیستی داخراو لە هەڵبژاردنەکاندا؟

نەوشیروان مستەفا: من پێموایە دەکرێت ریزەکانی گەلی کورد یەك بخرێن لەرێگای پەرلەمانی کوردستان و هەمەچەشنی و پلورالیزمی سیاسی و رێککەوتن لەسەر گوتارێکی سیاسی هاوبەش، نەك لەرێگای هاوپەیمانێتی دوقۆڵی نێوان دو حیزب، بێگومان ئەم مەسەلەیەش بۆ هەردو حیزبەکە و

سەرکردایەتییان جێهێڵراوە و کە بڕیار لە سروشتی گوتارە سیاسییەکەیان دەدەن.

* باشە تۆ پێت وایە ئەم دو حیزبە بەردەوام دەبن لە کارکردن بەو ڕێککەوتننامەیەی نێوانیان بۆ ماوەیەکی درێژ، یان وای بۆ دەچیت کاریگەری ئەم ڕێککەوتننامەیە تا دوای هەڵبژاردنەکان بەردەوام دەبێت و پاشان بەسەر دەچێت؟

نەوشیروان مستەفا: من نامەوێت پێش ڕوداوەکان بکەوم، وەکو وتراوە هەر سەردەم و بارودۆخە گوتاری خۆی هەیە.

* نوخبەی ڕوناکبیرانی کوردستان فشاریان خستۆتە سەر بەرپرسە حیزبی و حکومییەکان تا سامان و موڵك و داهاتی خۆیان دەربخەن بۆ ڕای گشتی، چۆن ئەو مەسەلەیە هەڵدەسەنگێنیت و ئایا تۆ ئامادەیت سامانی خۆت دەربخەیت؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ، من ئامادەی ئەو کارەم. بەڵام من پێموایە هەڵسان بە کردەوەی دەرخستنی سامان و داهات کارێکی عەمەلی نییە، چونکە عێراق بەشێوەیەکی گشتی و هەرێمی کوردستان بە تایبەتی خاوەنی سیستمێکی بانکی یان حسابی ئاشکرا نییە، ئەمەش وا دەکات چاودێری کردنی حسابی بانکی و دارایی کەسەکان کارێکی قورس یاخود مەحاڵ بێت. بەڵام دەکرێت و ڕێی تێدەچێت مەبدەئی "ئەمەت لە کوێ بو؟" کاری پێبکرێت و زیندو بکرێتەوە، کە لە ڕێگایەوە دەتوانین داهات و موڵکی کەسەکان بزانین.

* ئەی ئەگەر وەڵامی کەسەکان "ئەمە لە بەخشندەیی خوای گەورەوەیە" بو؟

نەوشیروان مستەفا: ئەگەر هاتو خاوەنی پارلەمانێك بین کە ئەرکەکانی بەشێوەیەکی چالاك و تەواو جێبەجێ بکات، مەبەستم لە بە تەواوی جێبەجێکردن ئەوەیە کە توانای هەبێت ئەدا و توانای وەزیرەکان بخاتە ژێر پرسیارەوەو بەدواداچون بکات، بۆ ئەرك و خاوەندارێتی و کەسایەتی و حساب و سامانەکانیان، مەبەستم ئەوەیە پارلەمان چالاك و کاریگەر بێت لە بەخشین و لێسەندنەوەی بڕوا لە وەزیرەکان، ئەمە سەرەڕای ئاشکراکردن و ڕاگەیاندنی

میزانییەی دارایی ساڵانەی حکومەتی هەرێم بەشێوەیەکی شەفاف و ڕون، لەگەڵ دروستکردنی دەسەڵاتێکی دادوەری کارا و سەربەخۆ، بەمشێوەیەو لەڕێگای ئەم لایەنانەی کە کۆبونەتەوە دەتوانین بگەین بە ڕاستییەکان وەك ئەوەی کە هەن.

* بەزۆری باس لە گەندەڵی دارایی و ئیداری دەکرێت لەناو حکومەتی هەرێمی کوردستان، ئایا لەگەڵ ئەو بۆچونەی؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵی پشتڕاستی دەکەمەوە، بەڵام چارەسەرکردن و ڕێگرتن لە گەندەڵی تەنها لەڕێگای پارلەمانەوە ناکرێت، بەڵکو لەڕێگای کۆمەڵێك دامەزراوەو ئالییەتی وەکو دەسەڵاتێکی دادوەری سەربەخۆ و دیوانێکی چاودێری و لیژنەیەکی نەزاهە، کە تا حاڵی حازر بونی نییە لە کوردستان، جێبەجێ دەکرێت. گومان لەوەشدا نییە کە ئەو لیژنەی نەزاهەیەی باسی لێوە دەکرێت چالاك دەبێت ئەگەر سەر بە وەزارەت بێت لە بەغدا، نەك سەر بە هەرێم بێت، ئەمە سەرەڕای پێکهێنانی پشکنیاری گشتی لە وەزارەتەکان وەك چۆن لە بەغداد هەن. لێرەدا ڕۆڵی ئامرازەکانی ڕاگەیاندن و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنیش ڕۆڵێکی گرنگ و پێویستە، چونکە بە هەوڵی ئەو دامەزراوەو لایەنانە دەکرێت بگەینە دەرەنجامی پۆزەتیڤ لە مەیدانی ڕێگرتن لە گەندەڵی دارایی و ئیداری.

* چۆن دەڕوانیتە داهاتوی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان دوای ڕۆیشتنی تاڵەبانی لەدوای تەمەنێکی درێژ، لە سێبەری بەردەوامبونی ململانێی جەمسەرو باڵەکانی ناوخۆی یەکێتی لەلایەك و ململانێی ئەو جەمسەرانە لەگەڵ ئێوەدا لەلایەکی ترەوە؟

نەوشیروان مستەفا: شەخسی خۆم پێم وانییە یەکێتی نیشتیمانی بە نەمانی هیچ کەسێك کۆتای بێت یان لەناو بچێت، پێشموایە وەکو پارتێکی سیاسی لە گۆڕەپانەکە دەمێنێتەوە، ڕەنگە هەندێکجار لاواز ببێت و هەندێکجاری تریش هێزی وەبەر بێت، بەڵام لێك هەڵناوەشێت و نافەوتێت.

* بەم دواییانە داوایەکتان پێشکەش بە سەرۆکایەتی هەرێم کردبو بۆ پێدانی بڕی (٢٠) ملیۆن دۆلار وەکو قەرز، بەلاّم حکومەتی هەرێم مەرجی خستنە بەردەم تالەبانی بۆ ئەو داوایە دانا، ئایا ئەو قەرزەتان پێ بەخشرا؟
نەوشیروان مستەفا: بەڵی داوایەکی لەو جۆرەمان ئاراستەی حکومەتی هەرێم کرد، بەلاّم بەم دواییانە نەبو، بەڵکو زیاد لە ساڵێك بەسەر ئەو داوایەمان تێپەڕ دەبێت. داواکەشمان لەڕێگای کەناڵە یاساییەکانی حکومەتەوە بوە و تا حاڵی حازریش ڕەزامەندی لەسەر داواکەمان پیشان نەدراوە.
* ئەی بارودۆخی دارایی ئێستاتان لە دامەزراوەی (وشە) چۆنە؟
نەوشیروان مستەفا: سوپاس بۆ خوا، بارودۆخمان باشە.

# به تەمای پرۆسەیەکی زۆر هێمن و دیموکراتین

**دیمانە: گۆڤاری گولان**

نەوشیروان مستەفا کەسایەتییەکی ناسراوی ناو بزاڤی رزگاریخوازی نیشتمانی کوردستانە، بەلاّم رەنگە لە هەموو سەرکردەیەکی سیاسی کوردستانی زیاتر بۆچوونی جودا جودای لەسەر بونیاد بنریێ، ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ ئەو سەردەمە ئاڵۆزو تێکچرژاوەی کە بزووتنەوەی کوردی پێیدا تێپەر دەبوو، نەوشیروانیش لە نێو ئەم بزووتنەوەیەدا هەمیشە ناوێك، هێزێك، بیروباوەرێك بووە، بۆیە لە هەموو کاتەکانی شەرو ئاشتیدا، تۆپەکە لە لای نەوشیروان دوور نەکەوتۆتەوە، ئەم دوورنەکەوتنەوەیەی تۆپەکە بەشێك بووە لە ستراتیژییەتی نەوشیروان، باشترین نموونەش دابرانی ئێستای نەوشیروانە لە یەکێتی نیشتمانی، بەلاّم دابرانێك دوور لەو ئەندام مەکتەب سیاسیانەی تری ناو حزبە کوردستانییەکانە کە لە حزب دووردەکەونەوە، بۆ خۆیان خەریکی ژیانی تایبەتی خۆیان دەبن، نەوشیروان دەیەوێ بڵێت راستە من لە سیاسەتی ئێستای یەکێتی دوورکەوتوومەتەوە، بەلاّم نە لە سیاسەت دابراوم، نە پیاوێکی دەستکورت و هەژاریشم لە سیاسەت تا بۆخۆم رێگای ژیانی تایبەتی بۆخۆم هەڵبژێرم، دەیەوێ بڵێت من هەمیشە لە ناو خەڵکم، بۆیە تا ئێستاش کەس نازانێ ئایندەی نەوشیروان چۆن دەبێت، چونکە نایەوێ تۆپەکە لەو دوورکەوێتەوە، بەمەش کۆمەڵێك پرسیاری ئاڵۆز لای هەر خوێنەر و سیاسییەکی ئەم ولاّتە دروستدەبێت، ئەوەیە لوغزەکە، نەوشیروان لە سالاّنی خەباتی حەفتاکان و بەتایبەت هەشتاکانیشیدا، جار جار دەیەویست موفاجەئە دروست بکات، هەر چەندە موفاجەئەی ئەمجارەی ئەگەر بتوانێ دوا مەفاجەئەو

سەرکەوتووترینیان دەبێت، کە دەتوانێت تا رادەیەك ئەو لاپەرە خوێناوییانەشی پێ رەشبکاتەوە، کە زۆرجار لێرەو لەوێ باسیدەکەن، بە تایبەت سەردەمە دژوارەکانی شەڕی ناوخۆ، بەڵام پرسیار ئەوەیە ئایا نەوشیروان بەم تەمەنەی ئێستای دەتوانێ ئەم موفاجەئەیە بکات، بەر لەوەی گوێبیستی خۆی بین بە بەڵێ یا نەخێر، لە ئایندەدا مێژوو وەڵاممان دەداتەوە، تەنها کەمێك چاوەڕوانی دەوێت.

من بەش بەحاڵی خۆم ئەوە یەکەمجارە بە راشکاوی و رووبەڕوو لەگەڵ کاك نەوشیروان گفتوگۆ بکەم، پێشتر زۆر تێبینی و رەخنەم لەسەری هەبوو، چونکە رابردوویەك کە بۆتە بەشێك لە ژیانی ئێمەو بەشێك لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی نیشتمانیشە، زۆر شتمان پێدەڵێت، کە وەك کاك نەوشیروان وتی با گۆڕ هەڵنەدەینەوە، چونکە بۆگەن و ئێسك و پرووسك دێنە دەر.

یەك لەو خاڵەگرنگانەی کە ئەمڕۆ بۆ خەڵك گرنگە ئەوەیە نەوشیروان مستەفا ژیانێکی زۆر سادەی هەیە، وەك دەڵێن لە ساڵانی هەشتاکانیش وابووە، هیچ کاتێك نەیویستووە ژیانی خۆی لە خەڵکی ئاسایی جیا بکاتەوە، وەك کەسێکی خانەدان خۆی دەرگا لە میوان دەکاتەوەو هەر خۆیشی تا بەردەرگای ماڵەکەی بۆ بەڕێکردن لەگەڵی دەچێت و زۆر بەخێرهاتنیشی دەکات، لە خانوویەکی زۆر ئاسایی دەژێت، کە دەچیتە ژوورەوە هەست ناکەی ماڵە بەرپرسەکانی ئەو سەردەمەیە، پێشتر وێنەی کاك نەوشیروان لە زەنی مندا، ئەوەبوو راستییەکان تەنها لەلای خۆیەتی و ئەوەندە بڕوای بە دیالۆگ نییە، پێم وابوو دەمارگرژەو رەفزەوییە، واقیع ناخوێنێتەوەو شت بەسەر خەڵکیدا فەرز دەکات، پێم وابوو زوو لەو قسانە تورە دەبێت کە بە دڵی ئەو نین و هەڵدەچێ، پێم وابوو بۆ کەمکردنەوە یا نەهێشتنی جیاوازییەکان گەر بتوانێ تەسفیەی جەسەدیت دەکات، پێم وابوو نەوشیروان. . . . . ، بەڵام لەگەڵ یەکەم دواندنیدا، هەستم کرد نەوشیروان ئێستا زۆر جەخت لەسەر دیالۆگ و گۆڕینەوەی راو رای بەرامبەر دەکاتەوە، حەز دەکات کێشەکان دوور لە توندوتیژی بەرەو

چارەسەرکردن بچن، نایەوێ بە هیچ جۆرێك جارێکی تر کورد لەنێو خۆیدا خوێن برێژێ، نایەوێ ئەو ئەزموونەی بە خوێن هاتۆتە دی بە هۆی گەندەڵییەوە لە دەستی بدەین، نایەوێ تایبەتمەندی هەر شارێکی کوردستان لەبەرچاو نەگیرێت و لە ناو حوکمڕانی گشتیدا بتوێتەوە، نایەوێ خەڵك بە دروشمی بریقەدار فریو بدرێ، نایەوێ. . .
بەڵام نەوشیروان چەند دەتوانێ ئەو بۆچوونانەی خۆی بهێنێتە دی، ئەمەیان با خوێنەر لە دوای خوێندنەوەی ئەم دیمانەیەی رای خۆی لەسەر بدات.
گولان:بابەتێك هەیە کە جێگەی پرسیارە، لە ساڵی ١٩٧٢ کاتێك کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان دامەزرا، ئەو کاتە پارتی لە هەرەتی بڵاوبوونەوە و پەرەسەندن دا بوو. رۆڵی کاك نەوشیروان لە دامەزراندنی ئەو کۆمەڵەیە دیار نییە، بە تایبەتی کە ئەوکات پێی دەوترا کۆمەڵەی مارکسی لینینی، رۆڵی تۆ چی بوو لەو دامەزراندنەدا، بە تایبەت کە ئەوکاتانە تۆ لە ڤیەنا بوویت؟
نەوشیروان : کۆمەلە ساڵی ١٩٧٠ دامەزراوە. رۆڵی من لە پێشترا ئەوەبوو کە خاوەنی ئیمتیازی گۆڤاری رزگاری بووم. گۆڤاری رزگاری زەمینەی فکریی دروستکردنی کۆمەڵەی خۆشکرد. ئەو زەمانە پارتی دوو کەرت بوو، کەرتێکیان خوالێخۆشبوو مەلا مستەفا سەرکردایەتی دەکرد و کەرتەکەی تریش خوالێخۆشبوو برایم ئەحمەد سەرکردایەتی دەکرد. حزبی شیوعیش ببوون بە دوو کەرتەوە، کەرتێکیان لایەنگیری لە یەکێتی سۆڤیەت دەکرد و کەرتەکەی تریش لایەنگری لە چین دەکرد. لە ناو کورددا بە تایبەتی ئەو چوار باڵە یان چوار حیزبە هەبوون. ئەو کاتە ناکۆکییەکی زۆر قووڵی فکری لە نێوان خەتی یەکێتی سۆڤیەت و خەتی چین هەبوو. چین یەکێك بوو لەو وڵاتانەی کە بیری جۆرێك لە مارکسیزم - لینینیزم و بیروباوەڕی ماوتسیتۆنگ ی بڵاو دەکردەوە، بیروباوەڕی ماوتسیتۆنگ لەسەر بنچینەی ئەوەی کە نەخشەی رێگای رزگاربوونی گەلانی بەو جۆرە دانابوو کە پێویستە میللەتێك کاتێك خەبات دەکات بۆ ئەوەی رزگاری بەدەست بهێنێت دەبێت حزبێکی پێشرەوی هەبێت بە

شێوەیەکی نوێ، دەبێت بەرەیەکی یەکگرتووی گەلیی هەبێت، دەبێت لەشکرێکی رزگاری گەلیی هەبێت، ئێمە پێمان وابوو هیچ لەو (٣) سێ مەرجانە لە هیچ کام لەو حیزبانە نەبوون. لەبەرئەوە ئێمە هەوڵماندا لەسەر ئەو مۆدیلە نوێیە رێکخستنێك دروست بکەین. بەیاننامەی (١١)ی ئادار پەلەی کرد لە پێکهێنانی کۆمەڵە. چونکە بەیاننامەی (١١)ی ئادار بووە هۆی ئەوەی دوو باڵەکەی پارتی سەرلەنوێ یەکبگرنەوە و ئەمیان لەناو ئەوی تردا توایەوە. ئەمە بووە سەبەبی ئەوەش ئەو باڵەی شیوعی کە سەر بە یەکێتی سۆڤیەت بوو وردە وردە زاڵ بێت و لە حکومەت نزیك بێتەوە و ئەوەندەی تر تەسفیە بکات. لەو کاتە ئەو بۆشاییە فکری و سیاسیەی هەبوو کۆمەڵە توانی پڕی بکاتەوە. من ئەو کاتە لە ساڵی ١٩٧٠ حوکمی ئیعدام درابووم لە لایەن مەحکەمەی سەورەوە لەسەر کێشەیەك کە بە راستی دەستی منی تێدا نەبوو، بەڵام وەکو تۆڵە کردنەوە ئەو سزایە لەسەر من داندرابوو، لەبەرئەوە نەمدەتوانی بە ئازادی هاتووچۆ بکەم و بێم و بچم و لەگەڵ خەڵکدا دانیشم و سیمینار و کۆبوونەوە بکەم. بە پێچەوانەوە وەختێك کە برایم ئەحمەد و گروپەکەی هاتن بۆ قەسرو ماکۆسان، من لەگەڵیان هاتم و ماوەیەك لەگەڵیشیان مامەوە هەتاوەکو رێگایەکم دۆزیەوە کە لە رێیەوە سەفەری دەرەوە بکەم. دوای ئەوە ساڵی ١٩٧١ سەفەری دەرەوەم کرد. براکانی تر درێژەیان بە ئیشەکە دا و من یەکێك بووم لەو کەسانەی هاوکاریم کردووە لە دامەزراندنی کۆمەڵە ولە پێکهێنانی گروپەکانی سەرەتاکە. بەڵام ئەو ماوەیە بە حوکمی ئەوەی کە من دوور کەوتمەوە و چووم بۆ ڤیەننا، بەڵام ئاگاشم لێهەبووە کە برادەرانی تر ئیش و کاریان کردووە، هەرچەندە بەهۆی سەفەرکردنەکەم من وەك خۆم نەمدەتوانی بە چالاکی بەشداری تێدا بکەم، ئەو کاتەش کورد لەناو ئەوروپا ئەوەندە زۆر نەبوو تا بڵێین لە ناو کوردەکانی ئەوروپا ئیشم کردووە.

گولاڵ:دەکرێ لە رێگای تۆوە بزانین بیرۆکەی دامەزراندنی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان بۆ یەکەم جار هی کێ بوو؟

نەوشیروان : بیرۆکەکە لە راستیدا وەك گوتم دەگەڕێتەوە بۆ ئەو جیاوازیی چینی سۆڤیەتی. ئەو زەمانە گروپێك هاتبوون بۆ سلێمانی کە جیاببوونەوە لە حیزبی تودەی ئێرانی، ئەو گروپە بە ناوی سازمانی ئینقیلابی ئەو کارەیان دەکرد. ئەوانە کاریگەری زۆریان هەبوو لەسەر ژمارەیەك لە کادیرە گەنجەکانی ئەو کاتەی کە لە باڵی مەکتەبی سیاسی کاریان دەکرد.

گولاّن: واتا تۆ لەو کەسانە نەبووی کە تەئسیرت لێ کرابێ؟

نەوشیروان : نەخێر من یەکێك بووم لەو کەسانە.

گولاّن: لە ساڵی ١٩٧٥ کاتێك ئەو نسکۆیە بەسەر کورد دا هات، تۆ ئەو کاتە پەیوەندی سیاسیت لەگەڵ پارتی بوو یان لەگەڵ کۆمەڵە؟ یان لەگەڵ هەردووکیان بووی؟ چۆن؟

نەوشیروان : من دوای یەکگرتنەوەی پارتی، نەبوومەوە ئەندام لە پارتی، هەر وەك دۆستی پارتی مامەوە. هەتا ئەو کاتەی من سەفەری ڤیەننام دەکرد هاتم سەردانی مەکتەبی سیاسی پارتیم کرد، ئەو کاتە دکتۆر مەحمود لەوێبوو و زۆریان پێ خۆشبوو کە من وەك نیشانەیەك لە یەکگرتنەوەی هەردوو باڵەکە لەوێ ببم بە ئەندامی لقی ئەورووپا. وابزانم کاغەزیشیان نووسی، بەڵام من لەدەرەوەی رێکخستن بووم. بەڵام لەگەڵ برادەرانی کۆمەڵە ئاگاییمان لەیەکتر هەبوو.

گولاّن: کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان دوای ساڵی ١٩٧٥ توانی بە هێزو تین و گوڕێکی ترەوە بکەوێتە شاخ و هەروەها لە کۆتایی حەفتاکان و سەرەتای هەشتاکانیش تا ناوەڕاستی هەشتاکان توانی لە شاریش هاوسەنگیەکی گەورە لە بزوتنەوەی رزگاریخوازی نیشتمانی کوردی درووست بکات. چ پێویستی بەوە بوو بچێتە ناو یەکێتی نیشتمانی کوردستان؟ لە کاتێکدا کۆمەڵە خۆی حزبێکی زۆر فراوان و گەورە بوو بە تایبەتی لەریزی گەنجەکان؟.

نەوشیروان: پێش دەستپێکردنەوەی شۆڕش لە ساڵی ١٩٧٥-٧٦ کۆمەڵە رێکخراوێکی وەها گەورە نەبووە، هەرچەندە پتەوترین رێکخراو بوو لەچاو

هەموو ڕێکخراوەکانی تر و لەرووی ڕێکخستنەوە لە هەموویان کارامەتر بوو، کادیری باشی هەبوو بەڵام بە ژمارە کەم بوون. ئەمە یەکەم. دووەم، بۆ زانیاریت ئەو کاتە مام جەلال سکرتێری کۆمەڵە بوو هەر لە سەرەتای دامەزراندنەوە تا ئەو فەترەیەش.

گوڵان: واتە یەکەم سکرتێری کۆمەڵە مام جەلال بوو؟

نەوشیروان : بەڵێ. درووستکردنی یەکێتی لەراستیدا جۆرێک بوو لە جێبەجێکردنی ئەو بیرەی کە هەم پارتی پێشرەو هەبێت هەم بەرەی یەککگرتوویی گەل هەبێت و لەشکری رزگاریی دروست بکات. ئێمە هەوڵماندا ئەو مۆدیلە لە کوردستان دروست بکەین. واتە بەشداریکردنی کۆمەڵە ئێمە ئەو زەمانە وامان حیساب دەکرد وەك چۆن تۆ بەردێك دەخەیتە ناو ئاوەوە چەند هەڵقەیەك دروست دەکات، هەڵقەی یەکەم زۆر رۆشن و دیارە، هەڵقەی دووەم کەمتر رۆشنە، هەڵقەی سێیەم لەو کەمتر، وامان دانابوو کۆمەڵە ببێت بە نەوات بۆ کۆکردنەوەی ئەو هەڵقە جیاجیایانەی توێژە کۆمەڵاتیەکانی ناو کۆمەڵی کوردەواری.

گوڵان: مام جەلال چۆن وازی لە سکرتێری کۆمەڵە هێنا، با بزانین کاك نەوشیروانیش چەندەمین سکرتێرە؟

نەوشیروان : لەراستیدا رەنگە بە فەرمی من دووەم سکرتێری کۆمەڵە بوویم، ئەو کاتەی کە مام جەلال لە ساڵی ١٩٧٢ چووە دەرەوە، ئەوەی کە بە عەمەلی سەرپەرشتی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی کردووە شەهابی شێخ نوری بووە. دوای ئەوەی کە کاك شەهاب گیرا و ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە تووشی گرتن و راوەدوونان بوون کۆمیتەی هەرێمەکان دروست بوون. کاك ئارام مەسئولی کۆمیتەی هەرێمەکان بووە بەڵام ئەو کاتەش هەر مام جەلال سکرتێری کۆمەڵە بووە. پاش ئەوەی کە یەکێتی نیشتمانی دامەزرا و بێجگە لە کۆمەڵە بزوتنەوەی سۆشیالیستی هاتە ناو یەکێتییەوە و خەتی گشتی دروست بوو، ئیتر ئەوساکە گفتوگۆمان لەگەڵ مام جەلال کرد کە ئایا وەکو سکرتێری کۆمەڵە

ئەمینێتـەوە یـانیش دەبێـت بـە قـاسمی مـشتەرەکی ئـەو (٣) سـێ باڵـەی کـە یەکێتیان دروست کردووە. ئەو (مام جەلال) قاسمە مشتەرەکەکەی هەڵبژارد و ئێمـەش هـەمووومان قـەبوڵمان بـوو کـە ببێ بـە قـاسمی موشـتەرەکی هـەر سـێ باڵەکەی ناو یەکێتی، بەڵام تا ئارام مابوو هەر مام جەلال بە فەرمی سکرتێری کۆمەلە بوو، کاك ئارامیش کارەکانی بەڕێوەدەبرد، واتا بەرپرسی کۆمەلە بوو بەڵام سکرتێر نەبوو، بەڵکو هەر مام جەلال سکرتێر بوو.

گـولاڵ : بـەڕێزت لـە ڕێگـای کـۆنگرە و کـۆنفرانس یـا پلینیۆمـەوە بـووی بـە سکرتێر یان مام جەلال دەستنیشانی کردی بۆ سکرتێری؟

نەوشیروان : نەخێر من دوای ئەوەی کە کاك ئارام شەهید بوو لە بەری قەرەداغ، کۆبوونەوەیـەکی فراوانـی کادیرەکـانی کۆمەڵـەمان لـە شـێنێ کـرد، لـەو کۆبوونەوەدا من هەڵبژێردرام کە سەرپەرشتی کاروبارەکانی کۆمەڵە بکەم. دوای ئـەوە کۆبوونەوەیـەکی فراوانـی ترمـان بەسـت، پاشـان کۆنفرانـسی یەکـەممان بەست و لـەم کۆنفرانـسەدا مـن بـە سـکرتێرری کۆمەڵـە هەڵبـژێردرام. ئێمـە لـە سەردەمی پێشمەرگایەتیدا (٣) سێ جار کۆنفرانسی کۆمەڵەمان بەستووە.

گولاڵ: بەڵام لە هەشتاکان دوایی نەبەسترا؟

نەوشـیروان: لـە هەشـتاکانیش بەسـتمان بـەڵام دوای ئـەوەی لـە ١٩٨٦ شـەڕی سـەخت لـەنێوان کـورد و حزبـی بـەعس درووسـت بـوو، لەراسـتیدا لـە ترسـی بۆردوومانکردن و بەکارهێنانی چەکی کیمیایی نـەمانتوانی کۆنگرەیـەکی وەهـا ببەستین، ئەترساین کە زۆربەی کادیرەکانمان بکوژرێن.

گولاڵ: رەنگە ئەو کاتە حەماسێکیش نەبووبێت بۆ بەستنی کۆنگرە؟

نەوشیروان: شەرەکە ئەوەنـدە سـەخت بـوو، بـوو بـووە ئەولـەویات. ئـەوەی مـن باسی دەکەم دوای ١٩٨٦ ە. هۆکارەکەشی ئەو شەرە سەختە بـوو کـە ئەو کاتـە جێگایەك نەبوو تۆ بتوانی بە دڵنیایی کۆنفرانسی تێدا ببەستی.

گولان: لە ٢١-١١-١٩٧٦ کە شەهابی شێخ نوری و جەعفەر عەبدولواحید لە بەرکردایەتی کۆمەڵە و ئەنوەر زۆراب لە ڕێکخستنی بەغداد لە سێدارە دران. ئایا لەسەر کۆمەڵە لە سێدارە دران یان بەهۆی بیری نەتەوەیی و کوردایەتی بوو؟

نەوشیروان: یەکێك لەو شتانەی کە لەسەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەوە ئێمە گرنگیمان پێ دەدا ئەوە بوو کە کۆمەڵە خۆی بپارێزێ لە لێدان. ساڵی ١٩٧٠ تا ١٩٧٥ ئێمە هێنی ئەوەمان هەبوو کە ئەگەر کەسێك بگیرایە ڕەنگ بوو پارتی بیگرێ بە تۆمەتی ئەوەی کە جاسوسی بەعسیە، حکومەت بیگرێ بە تۆمەتی ئەوەی کە جاسوسی دەزگای پاراستنە. لەبەرئەوە ئەوەندەی بۆمان کرا هەوڵماندا هەڵقەی ڕێکخستنەکانی تا کۆمەڵە زۆر زۆر تەسك بێت و ئێمە کادیری ڕێکخستن دروست بکەین نەك ڕێکخستنی جەماوەری. لەبەرئەوە ئەدەبیاتیشمان نەبوو، یەك دوو بڵاوکراوە وەختی خۆی بە هەلە بڵاوکراوەتەوە، بەڵام دوایی کۆکراوەتەوە. کۆمەڵە تا ساڵی ١٩٧٦ هیچ شتێکی بە ڕەسمی بڵاونەکراوەتەوە بۆ خەڵك. بە شێوەیەکی زۆر نهێنی کاری دەکرد لە ناو نوخبەیەکی هەڵبژێردراودا، بۆ نموونە لە ناو زانکۆی سلێمانیدا وەختێ کە ڕێکخستن دروست دەکەیت تەنها ئەو کەسانەت ڕێکدەخست کە لەکاتی قەیران و تەنگژەکاندا دەتوانێ سەرکردایەتی رای گشتیبکات، ئەتوانێت لە ناو خوێندکاراندا ڕۆڵێکی کاریگەری هەبێت لەناو کرێکاراندا ئەو کەسانە ڕێکبخەیت کە لە کاتی ئەزەماتدا ئەتوانێت لە ناو چینی کرێکاراندا کار بکات، لەناو ڕۆشنبیراندا هەر بەم شێوەیە. واتە هەڵبژاردەی ئەمانە هەوڵدەدرا کۆبکرێتەوە و بە چەندین قۆناغدا تێدەپەڕین و بە هەڵقەی ڕۆشنبیری و ئەمانە تا ئەبن بە ئەندام. ساڵی ١٩٧٥ کاتێ کۆمەڵە هاتە ناو یەکێتییەوە ئیتر ئەو قۆناغە دەستی پێکرد. کاك شەهاب و ئەو برادەرانەی کە حوکمی ئیعدام دران بە تۆمەتی ئەوەبوو کە ئەمانە تەیارێکی مارکسیان درووست کردووە و سەفەری دەرەوەیان کردووە و پەیوەندیان کردووە بە جیهاتی بێگانەوە، چونکە

کاك شەهاب چەند جارێك چووبوو بۆ بەیروت فەڵەستینیەکانی بینیبوو. واتا بەشێکی ئەو برادەرانەی ئیعدام کران لەسەر ئەوە ئیعدام کران.

گولآن: ئێستا یان جارانیش باس لەوە دەکرا کە جیاوازیەك هەبووە لەنێوان شەهید ئارام و شەهید شەهاب. هەریەکە و سەر بە باڵێکی سەربەخۆ بوون و کۆمەڵێك گرووپی دیکەیان لە خوار خۆیان هەبوو. یەعنی کۆمەڵێك پەیرەوی شەهید شەهابی کردووە و کۆمەڵێکیش پەیڕەوی شەهید ئارامی کردووە. ئایا کاك نەوشیروان مستەفا پەیڕەوی کام باڵی دەکرد تا ئەو دوانە مابوون؟

نەوشیروان : ئەوە راست نییە، ئەوە راست نییە، یەك کەرەت ناکۆکی لەناو کۆمەڵە دروست بوو، ئەویش ناکۆکیەکی فکری بووە، دوایی حەسم بوو. ناکۆکیەکە دوای ساڵی ١٩٧٥ و تێکشکانی شۆرشی کوردبوو، لە ناو سەرکردایەتی کۆمەڵە جۆرێك لە بۆچوون دروست بوو بوو کە ئایا ناکۆکی سەرەکی ئێمە لەگەڵ حکومەتی بەعسە یان لەگەڵ ئیمپریالیزمی ئەمریکایە. بەلأم لە دوای فەترەیەکی زۆر کەم ئەو موشکیلەیەش حەل کرا ئەوەی کە پێشبینی شۆرشی کرد و کاك شەهابیش پێشبینی شۆرشی کرد.

گولآن: ئەی بۆ لە سەرکردایەتی کۆمەڵە و سەرکردایەتی ئێستاش هەندێ جاران ئەو شتانە باس دەکرێن. لە سەرکردایەتی یەکێتی ئەوانەی کە پێشان لە مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی کۆمەڵە بوونە باسی ئەو جیاوازیە دەکەن لە نێوان شەهید ئارام و شەهید شەهابدا؟

نەوشیروان: من پێموایە ئەوە راست نییە. رەنگە ئەو برادەرانە لە بێئاگاییەوە قسە دەکەن. تا ئەو زەمانەی کە کاك شەهاب و هاوڕێکانی لە سەرکردایەتی کۆمەڵە بوون کاك ئارام کادیرێکی ئاسایی بووە لە کۆمەڵە، لە سەرکردایەتی نەبووە. دوای ئەوەی کاك شەهاب و هاوڕێکانی کەوتنە بەر گرتن و راونان و کۆمیتەی هەرێمەکان دروست بوو، لەوەیا کاك ئارام هاتە پێشەوە و بووە کەسی یەکەمی ناو کۆمەڵە.

گولآن: باشە کاك نەوشیروان کە باسی شەڕی ناوخۆی هەشتاکان دەکرێت، لەبەرچی هەموو حزبەکانی بەرەی جود ئەوانەی کە ئێستاش ماون و جگە لەمانەش زۆر خەڵکی تەنانەت ناو یەکێتیش ئێستا نەوشیروان بە سەرکردەیەکی کاریگەری ئەو شەڕەی ناوخۆیە دادەنێن. وەك رۆژانە ئەوانەی ناو مەکتەبی سیاسیش ئەوە دەڵێنەوە کە نەوشیروان خەڵکی بە کوشتن داوە. باشە بۆ هەر کاك نەوشیروان سەرکردایەتی یەکێتی دەکرد، یان فیعلەن تۆ رۆڵێکی زۆرت هەبوو، بەکورتی بۆچی ناوی تۆ زیاتر لە هەر ناوێکی دیکە زەق دەکرێتەوە؟یان مەبەستێکی تر هەیە کە ئێمە نایزانین؟

نەوشیروان: رەنگە ئەوە دوو فاکتەری هەبێت. یەکێکیان فاکتەری ناوخۆی یەکێتییە کە ئەوە بەشێکە لەو ململانێیە ناوخۆییەی لە نێوان باڵە جیاجیاکانی ناو یەکێتیدا هەیە. بەشێکی تریشیان ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو توانا میدیاییەی کە کاتی خۆی حزبی شیوعی عێراق هەیبوو، لە راستیدا حزبی شیوعی رۆڵی زۆر گەورەیان هەبوو لەوەی کە ناوی من بە شەڕی ناخۆوە بنووسێنن بە تایبەتی دوای شەڕی (پشتئاشان) و ئەوانە. خۆت ئەزانی کادری راگەیاندن لە حزبی شیوعیدا زیاتر بوو، ئەو زەمانە یەکێتی سۆڤیەت مابوو، حزبی شیوعی لەگەڵ حزبی شیوعی تری دونیا پەیوەندیان هەبوو ئیتر هەڵمەتێکی جیهانییان دژ بە من دەست پێکرد.

گولآن: باشە لەبەرچی ناوی تۆیان دیار خست؟ئایا لەبەرئەوە نەبوو فیعلەن رۆڵێکی باشت نەبینی؟

نەوشیروان :لەبەرئەوەی من سەرکردایەتی هەندێك لە شەرەکانم کردووە.

گولآن: واتا حەقیقەتێکی تێدا هەبووە بەرامبەر بە تۆ؟

نەوشیروان : من حەز ناکەم بگەڕێینەوە بۆ رابردوو گۆڕ هەڵبدەینەوە چونکە کەگۆڕ هەڵدەدەیتەوە عادەتەن بۆگەن و ئێسك و پرووسك دێتە دەرەوە. شەڕی یەکێتی لەگەڵ هەموو لایەنەکانی ترا، لەراستیدا بە پلەی یەك لەگەڵ پارتیدا بوو، چونکە پارتی وەکو تاکە حزب مەبدەئی تەعەدودیەتی قەبوڵ نەدەکرد. ئەو

شەڕانە بەشێك بوو لە چەسپاندنی فکرەی تەعەدودیەت کە بۆ جاری یەکەم بوو یەکێتی هێنایە کوردستانەوە. فرەیی حزبی، فرەیی سیاسی و فرەیی رۆژنامەوانی تا ئەو زەمانە پارتی خۆی بە تاکە حزب دەزانی کە شیعاری ئەوەی هەبووپێشرەوی کورد پارتیە و هیچ حزبێکی تر نییە. ئەمە وەختێك یەکێتی دروست بوو هەڵگەڕانەوە بوو لەو سەرەتایە.

گولاَن: بەس هەست ناکەی لە واقیعی عەمەلیدا یەکێتی نەیتوانی ئیستیعابی ئەو هەموو حزبە کوردستانیانە بکات، کە خەباتی رزگاری نیشتمانیان دەستپێکردبوو؟چونکە یەکێتی بەتەنیا لەبەرەیەك بوو و حزبەکانی تریش هەموویان لە بەرەیەکی تر. خۆی تەعەدودیەت ئەوەیە حزبەکانی تر قەبوڵ بکەی لە کاتێکدا پارتی لەناو زۆرترین حزبەکانی کوردستانیدا بوو، بەرەی جودیان پێکهێنابوو، بەلاَم یەکێتی بە تەنیا بوو و شەڕی دەکرد بۆ ئەوەی هەموو حزبەکانی تری وەکو سۆشیالیست وشیوعی و پاسۆك و. . . . هتد پاکتاو بکات؟

نەوشیروان : من وەك گوتم نامەوێ باسی ئەوە بکەین. بە جێیدەهێلین بۆ مێژوونووسان، با ئەوان هەڵیسەنگێنن.

گولاَن: با بێینە سەر هەڵوەشانەوەی کۆمەڵە. . . خەڵکێکی زۆر چ ئەوانەی ئێستاش هەر خۆیان بە کۆمەڵە دەزانن یان لە رێگای کۆمەڵەوە توانیان ببن بە کادیرێکی کوردستانی و نیشتمانی، قسە ئەوەیە خەڵکی دەرەوەی کۆمەڵەش دەڵێن گورزێکی گورچك بڕ بوو کە درا لە کۆمەڵە و تەنانەت لە بزاڤی نیشتمانیش، باشە کاك نەوشیروان چۆن توانی ئەو بڕیارە بدات کە کۆمەڵە لە ساڵی ١٩٨٨ هەڵبوەشێنێتەوە؟

نەوشیروان: من بە تەنیا ئەو بڕیارەم نەدا، ئەوە ژمارەیەکی زۆر پێش من لە کادیرەکانی کۆمەڵە ئەو گفتوگۆیانەیان دەست پێکردبوو لەگەڵ یەکێتی شۆڕشگێڕاندا، لە قاسمە رەشەوە ئەو گفتوگۆیانەیان دەستپێکردبوو. کە بڕیاری هەڵوەشانەوەی کۆمەڵەشمان دا لە کۆبوونەوەیەکی زۆر فراواندا چەند

سەد کەسێك تێیدا بەشدار بوون کە ئەو بڕیارەمان دا. بەڵام لە بیرت نەچێت وەختێك کە کۆمەڵەمان هەڵوەشاندەوە تەسلیمی دەست سەرکردایەتیەکم کرد کە جگە لە دوو کەسیان ئەوانی تر هەموویان کۆمەڵە بوون.

گولآن: واتا خۆت قەناعەتت بە هەڵوەشاندنەوەکە هەبوو؟

نەوشیروان : بەڵێ ئەو زەمانە قەناعەتم پێ هەبوو. بەڵام ئەزموون دەری خست کە شتێکی هەڵەمان کردووە.

گولآن:هەستت کرد کە غەدرێکت کردووە؟

نەوشیروان : ئێستا واتا ئەو دوو سێ ساڵە هەست دەکەم کە کارێکی هەڵەمان کردووە. لەوەوپێش پێم وابوو وەك بۆم باس کردی کە کۆمەڵەمان هەڵوەشاندەوە و تەسلیمی سەرکردایەتی یەکێتیمان کرد، ئەو کاتە لەناو سەرکردایەتی یەکێتیدا تەنها د. فواد مەعسوم و د. کەمال فواد کۆمەڵە نەبوون ئەوانی تر هەموویان کۆمەڵە بوون و دەیانتوانی هموو یەکێتی بکەن بە کۆمەڵە.

گولآن : بەڵام نەیانکرد؟

نەوشیروان : بەڵێ نەیانکرد. .

گولآن: دەکرێت بزانین کاك نەوشیروان لەبەرئەوەی زۆر جاران هەست دەکرێت لە حزب دادەبڕێت واتا تووڕە دەبێت، وەك ماوەیەك لە زەڵێ دانیشتبووی خەریکی نووسینی یاداشتەکانت بووی و هەندێ جاریش سەفەری دەرەوەت کردووە، هەندێ جاری دیکەش هەست دەکەیت کاك نەوشیروان عادزە، دڵگیرە، تووڕەیە. دەکرێ بزانین ئەو هەموو جارانە کاك نەوشیروان ئیستیقالەی دەدا یان هەر بۆ خۆی تووڕە دەبوو و خۆی دوور دەخستەوە و دەچووە کەنار و لە ناوەند دووردەکەوتەوە؟

نەوشیروان: پێموایە ئێوەو مانان حەقە بە تەقدیرەوە سەیری ئەو هەڵوێستانەی من بکەن. چونکە ئەو کاتانەی من دوور دەکەوتمەوە لە راستیدا لەکاتی شەڕی ناخۆدا بووەو من بۆم بەجێهێشتوون. بۆ نموونە بۆت باس بکەم لە دوای هەڵبژاردنی یەکەمی پەرلەمانەوە من لەگەڵ برادەرەکانی خۆمانا ناکۆك

بووین لەسەر ئەوەی کە ئایا کادیرەکانی یەکێتی بێنین کاروباری حکومەتی پێ بسپێرین یاخود کادیرەکانی یەکێتی چاودێر(مراقب) بن بەسەر حکومەت و، تەکنۆکرات بهێنین. ئەوە یەکێك لەو خالاَنە بووە کە ئەو زەمانە من لایەنگری ئەوە بووم خەڵکی تەکنۆکرات بهێنین با ئەوەشت پێ بڵێم منیان تەرشیح کرد بۆ یەکەم سەرۆکی حکومەت، بەلاَم نەمکرد چونکە باوەڕم پێ نەبوو. برادەرانی تر پێیان وابوو ئەگەر لە دەسەلاَتدا نەبین خەڵکمان لەگەڵ نابێت، لەبەرئەوە دەیانوت ئێمە خۆمان لە شۆڕشدا ماندوو بووین بۆچی تەسلیمی خەڵکی تری بکەین. لە مەوزوعی یەکێتی و پارتیشدا من رەئیم وابوو، بێگومان پێش هەڵبژاردن من لەگەڵ کاك مەسعود قسەم کرد لەسەر ئەساسی ئەوەی لیستێکی هاوبەش دروست بکەین. من باوەرم وابوو لەبەرئەوەی میللەتەکەمان بە قۆناغێکی زۆر سەختدا تێپەڕیوە و تووشی کارەساتی سیاسی، کۆمەلاَیەتی، ئابووری و رۆشنبیری بووە. ئەم قۆناخە میلەتەکەمان پێویستی بە ئیستیقرار هەیە، بۆ ئەوەش چاکترین شت ئەوەیە دوو حزبە سەرەکیەکە لیستی سەرەکیان هەبێت. ئەو زەمانە (١٩٩٢ ) پەرلەمان سەد ئەندامی هەبوو، وتم با پارتی ٣٥ کورسی هەبێت و یەکێتی ٣٥ کورسی هەبێت. ٣٠ یەکەی تر بۆ خەڵکی سەربەخۆ و تەکنۆکرات و حزبەکانی تر دابنێین بۆ ئەوەی ئەگەر لە نێوان یەکێتی و پارتیدا جۆرێك لە ناکۆکی دروستبوو، ئەو کاتە ئەو سی کەسە بتوانێت بالاَنسەکە راست بکاتەوە. بەلاَم فکرەکەی من قەبوڵ نەکرا. من پێشنیارم کرد بۆ برادەرەکانی خۆمان کە ئەگەر لایەك حکومەت وەربگرن و لاکەی تر ببن بە ئۆپۆزیسیۆن. لەگەڵ پارتی قسە بکەین ئەگەر ئەوان حکومەت وەرگرن ئێمە دەبین بە ئۆپۆزیسیۆن، ئەگەر ئێمەش حکومەتمان وەرگرت با ئەوان ببن بە ئۆپۆزیسیۆن. ئەو فکرەیەش لە لای برادەرەکانی ئێمە قەبوڵ نەبوو و پێیان وابوو پێکەوە حکومەتێکی ئیئتیلافی دروست بکەن. لەبەر ئەوە من عەقڵم نەیبڕی و وازم لێ هێنا. وە ئەگەر وازم لێ نەهێنابایە ئیحتیمالی هەبوو ئەو ناکۆکیانە، ئەو زەمانە مومارەسەی

کاری دیموکراسی زۆر کەم بوو، رەنگ بوو ببێتە هۆی هەڵگیرسانی شەڕ لەنێوان ئەو باڵانەی ناو یەکێتیدا. پێموابوو ئەولەویەت بۆ ئەوەیە کە یەکێتی بە ساغ و سەلامەتی بمێنێتەوە لەبەرئەوە من بۆم بەجێهێشتن. هەموو جارەکانیش وابووە کە ناکۆك بوو بووم لەگەڵ رەفیقەکانم لەجیاتی ئەوەی شەڕیان لەگەڵدا بکەم بۆم جێهێشتوون.

گولاّن: هەست ناکەی لە سیاسەتدا ئەوە مەرفوزە؟ ئەو وازهێنان و خۆ دوورخستنەوەیە. سیاسەت وایە تۆ دەبێت ململانێش بکەیت و هەوڵیش بدەیت کەمینەی خۆت بکەیت بە زۆرینە.

نەوشیروان: ئەوە لە وڵاتێکدا کە حزبەکان چەکدار نەبن راستە، بەڵام لە وڵاتێکدا کە حزبەکان چەکدار بن و سەرکردایەتی حزبەکە و سەرکردایەتی سیاسی ئامادە بن بە چەك دیفاع لە مانەوەی خۆی لەو پۆست و پایانەدا بکات پێم وایە ئینسان بکشێتەوە باشترە وەك لەوەی شەڕیان لەگەڵدا بکات. ئەوەی کە تۆ باسی دەکەیت رەنگە لە وڵاتێکدا بێت کە تەقالیدی دیموکراسی رەگداکوتاوی تێدابێت. لە ئەورووپارەنگە وابێت بەڵام لە کوردستانێکدا کە هەموو چەکدارن پێم وایە ئەوە سەر ناگرێ.

گولاّن: لینین کە شۆرشی ئۆکتۆبەری داگیرساند سەرەتا کەمینە بوو دوایی بە گفتوگۆی چڕو بەردەوام بوو بە زۆرینە. عەزیز محەمەدیش جبهەی وەتەنی لەگەڵ بەعس کرد خۆ لە سەرەتا کەمینە بوو، بەڵام بە کۆبوونەوەی بەردەوامی ناو کۆمیتەی ناوەندی بوو بە زۆرینە. واتا لە سیاسەتدا وایە ململانێکە رەنگە هەندێك جار درێژخایەن دەبێت، ناشبێ سارد ببیتەوە. بەڵام کە دوور کەوتیەوە رەنگە ئەوانی تر ئیستیغلالی بکەن و زیاتر ئەو نەهجەی کە دەیانەوێت جێگیری دەکەن. فکرەکەی تۆش لەو کاتە زیاتر بچووك دەبێتەوە چونکە تۆ مەیدانەکەت بۆ جێهێشتوون. پێم وایە ئەوە لە سیاسەتدا زیاتر زیانت پێدەگەیەنێت، بۆیە ئەگەر بەردەوام بیت باشترە و هەوڵیش بدەیت نەگاتە پێکدادانی چەکداری. چونکە هەندێك جاران دەبێتە کۆڵدان، رەنگە تۆ بە

نیشتمانپەروەری بزانی بۆ ئەوەی ئەو کێشەیەی هەیە با کەسی تێدا نەسووتێ بەجێیدەهێلی؟

نەوشیروان :من نموونەیەکت بۆ باسکەم. کاتێك کە شەڕی نێوان پارتی و یەکێتی دەستی پێکرد من زیاتر لە ساڵێك بوو لە لەندەن دانیشتبووم. هیچ دەستێکم لە هەڵگیرسانی شەڕی یەکێتی و پارتی و، یەکێتی و بزوتنەوەدا نەبوو، من بەسەر شەڕەکەدا هاتمەوە. کە هاتیشمەوە لایەنی گفتوگۆکە من دەمکرد. لە گفتوگۆکەشدا یەك خاڵی بنەڕەتی هەبوو بە نسبەت منەوە کە ئەمویست جێبەجێی بکەم ئەویش گێڕانەوەی برایم خەلیل و داهاتی برایم خەلیل بوو. یەعنی هەموو ململانێکەی من کە پێیان دەوتم مەوقیفی موتەشەدیدە لەبەر ئەو هۆکارە بووە. وەختێك کە بینیم هیچ رێگە لە ئاسۆی نزیکدا و هیچ هیوایەکی ئەوە نییە کە لە نێوانی یەکێتی و پارتی دا رێککەوتن ببێت، ئاخر مەرحەلە من خۆم بە شەخسی کاغەزم بۆ کاك مەسعود بارزانی نووسی و کاك مەسعود یش جوابی بۆ نووسیمەوە و گەیشتینە داڕشتنێك (سیغەیەك)کە بگەینە رێککەوتن، بەلاّم کە سەیرم کرد لە ناو پارتی و یەکێتیشدا چەندین گرووپ هەن دژی ئەو رێککەوتنەن و نایانەوێت سەربگرێت. لەبەرئەوە جارێکی دیکەش بەجێمهێشت.

گولاّن: قسەیەکی بەربلاّو هەیە دەڵێت کاك نەوشیروان تەنها سلێمانی پێ شارە. واتە بیرێکی ناوچەگەری بەسەریدا زاڵە. دەکرێ ئەمە لەسەر زاری خۆتەوە راستی ئەمە بزانین؟

نەوشیروان :ئەسلّەن من خۆم بە کوردستانی دەزانم نەك خۆم بە خەڵکی کوردستانی عێراق بزانم. یەك نیشانەم پێ بڵێ دەلیلی ئەوە بێت کە من ناوچەگەرێتی دەکەم.

گولاّن: دەڵێن گوتووتە هەولێر کوێی پیرۆزە تا شەڕی تیا نەکرێ کاتێ ساڵی ١٩٩٤، ١٩٩٥ و ٩٦ و واتە ئەو ساڵانەی کە شەڕی ناوخۆ هەبوو. ئایا فیعلەن تۆ وات گوتووە؟

نەوشیروان :وەکو مەبدەو من هەموو کوردستانم پیّ پیرۆزە نەك هەر شاری هەولیّر. لە زاخۆوە تا خانەقین بە ناوچە دابڕاوەکانیشەوە بە شتێکی پیرۆزی دەزانم، وەختێ خۆیشی کە ئێمە خەباتمان کردووە لە پیّناوی نیشتمانەکەمان خەباتمان کردووە. نیشتمانەکەی ئێمەش بەتەنیا بریتی نییە لە شاری سلیّمانی. ئەوە قسەیەکی ناراستە و من وام نەوتووە، بەلاّم ئەوەش ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو قسەوقسەلۆکانەی کە باڵە ناکۆکەکانی ناو یەکیّتی بۆ یەکتری دروستی دەکەن. ئەگینا ئەوەی کە من پیّم دەلّێن موهەندسی شەڕی براکوژی بووە، من هەموو شەڕەکانی پیّش ڕاپەڕینیش هەر لەسەر هەولیّر کردوومە.

گوڵان: کاك نەوشیروان هەندیّك جار هەلّوێستی زۆر جدیت هەیە وتیّبینی و ڕەئی خۆت هەیە لەسەر ئەو شتانەی کە تۆ بە نانیشتمانی دەزانی و یان ئەو شتانەی کە تۆپێت وایە زیانی هەیە بۆ ئاییندەی کوردستان. دوای ڕووخانی بەعس کە ڕژیّمی بەعس نەما لەسەر حوکم، کۆمەلّێك فایل هاتە گۆڕیّ گوایە لە سەرکردایەتی یەکیّتی و حزبەکانی تریشدا فایلدار هەیە. ئەگەر ئەمە حەقیقەتیّکی تیّدایە بۆچی ئەو کاتە مەوقیفت وەرنەگرت؟خۆ ئەوەش بابەتێکی زۆر جددی بوو؟

نەوشیروان:مەبەستت لە فایلدار چییە؟

گوڵان: ئەوانەی کە یارمەتیدەر بوونە لەگەلّ بەعس جا بە هەر شێوەیەك بیّت، سیخوڕ بووبن یان هەر شتێکی تر، گرنگ ئەوەیە هاوکاری بەعس بووبن؟.

نەوشیروان: من زۆربەی فایلەکانی سەرکردایەتی یەکیّتیم بینیوە، لە ڕاستیدا بە مەعنای سیخوڕ کەسیان سیخوڕ نەبوونە تاوەکو ئینسان ناونووسی بکات.

گوڵان: کاك نەوشیروان دوای ڕووخانی بەعس بەشداری لە بنیادنانەوەی عیّراقی نویّ کرد. ئایا فیعلەن کاك نەوشیروان بڕوای بە عیّراقی نویّ هەبوو کە بەم شێوەیە سەردانی بەغدای کرد و بەشداری ئەنجوومەنی حوکمی کرد بۆ ئەوەی عیّراقیّکی نویّ دروست بکات؟بۆچی خەریکی کوردستان نەبوو و دوای ڕووخانی سەدام کوردستان بکاتە کوردستانیّکی نویّ؟

نەوشیروان :پێموایە بۆ هەردووکیان کارمان کردووە. بە نسبەت کوردستانەوە پێم وایە ئێمە ئیشێکی زۆر گەورەمان کردووە ئێستا لە کوردستان دەتوانیت بڵێیت بە مەعنای وشە بناغەی دەوڵەتی کوردی هەیە. هیچ لایەنێکی عێراقی و ئیقلیمی و نێودەوڵەتیش بەگونجاوی نازانن کە کورد دەوڵەت دروست بکات. بۆ تۆ باشترین رێگا ئەوەیە لە عێراقێکی تازە لە دەزگای بڕیاردانی سیاسیا تۆ بتوانیت دەسەڵاتت هەبێت. تا ئەو کاتەی کە ناتوانیت جیاببیتەوە خۆت حەز بکەیت و حەز نەکەیت بەشێکی لە عێراق. مادام بەشێکیشی لە عێراق، لە عێراقدا دەولەتێکت هەبێت کە دەسەڵاتت هەبێت لە دەزگای بڕیاردانی سیاسیدا. دەولەتێك بێت دیموکراسی بێت، دەولەتێك بێت لە خزمەتی خەڵکەکەدا بێت و دەولەتێکی تازە بێت ئەمە لە قازانجی کوردە. ئەوەی تریش من پێم وایە ئێمە بناغەی دەوڵەتی کوردیمان دامەزراندووە.

گولآن: چوار ساڵی رێك بەر لە ئەمڕۆ بەڕێزت لەگەڵ کۆمەڵێك ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی یاداشتنامەیەکیان بەرز کردەوە کە دەنگی ناڕەزایی لەسەر چەند شتێك تێدا بوو، یەك لەو پرسانە تەمەنی مام جەلال بوو. ئایا مەبەست لەوەبوو کە ئەو تەمەنی گەورەیە و جەنابت ببی بە سکرتێر؟ واتا تۆ واجیبهەیەکی تر بووی لە ناو یەکێتی دوای مام جەلال یان مەبەستێکی ترت هەبوو؟بۆچی تەمەنتان خستە ناو ئەو پرسەوە؟تۆ باسی بەرنامەی سیاسیت دەکرد تەمەن رەنگە هەندێك جار رۆڵی نەبێت؟

نەوشیروان: راستە تەمەن رەنگە هەندێك جار رۆڵی نەبێت، بەڵام لە مەسەلەی سەرکردایەتی یەکێتیدا نوێبوونەوە و تازەگەری شتێکیی زۆر لەسەرەخۆییە. بەشێکیی زۆری ئەنداماني مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی یەکێتی لە تەمەنێکدان کە ئەبێت جێگە بۆ گەنج چۆڵ بکرێت. دوای ئەمە، هەموو کەسێك کە گەیشتە تەمەنێك ئەبێت بیر لەوەی دوای خۆی بکاتەوە. من لە تۆ دەپرسم ئایا دەزانیت دوای مام جەلال چی بەسەر یەکێتی دادێت؟ئایا ئەزانیت دوای مام جەلال چی بەسەر پەیوەندیەکانی نێوان یەکێتی و پارتی دادێت؟ئایا

ئەزانیت دوای مام جەلال چی بەسەر پەیوەندیەکانی نێوان کوردی عێراق و حکومەتی عێراق دێت؟پێویستە هەموو کەسێك پێشبینی ئەوە بکات کە دوای خۆی ئەگەر بە مردنیش نەبێت، بە وازەێنان، نەخشە بۆ ئەوە دابنێت کە دوای خۆی کەسانێك هەبن درێژە بە ئیشەکە بدەن.

گولان: باشە بۆ ئەوەی شتەکە شەرعیەتێکی جوانتری وەربگرتایە باشتر نەبوو دوای بەستنی کۆنگرەتان بکردایە؟چونکە لە کۆنگرە بڕیاری ئەو شتانە دەدرێت. نەوشیروان : ئەوە راستە، بەلام تۆ ئەزانی کۆنگرەی یەکێتی کەی ئەبەسترێ؟ گولان:من نەوەللا، خۆ من لە سەرکردایەتی یەکێتی نیم. .

نەوشیروان: منیش هەرنازانم، منیش ئێستاو ئەو کاتیش نەمدەزانی، چونکە سکرتێری گشتی ئەو بڕیارە دەدات کەی کۆنگرە ببەسترێ و نەبەسترێ. عادەتەن حزبە باشەکانی دونیا پێش کۆنگرە ناکۆکیەکانی ناو خۆیان چارەسەر دەکەن. گەلالەی بەرنامەی تازە ئامادە دەکەن و ئیش دەکەن کە سەرکردایەتی داهاتوو کێ بێت و کێ نەبێت کاتێکیش دەچنە ناو کۆنگرەوە ناکۆکیەکانی ناو خۆیانیان چارەسەر کردووە، بۆ ئەوەی بەڕیزێکی یەکگرتووەوە بچنە ناو کۆنگرە و بەڕیزێکی یەکگرتووەوەش بێنە دەرەوە. نەك بچن لەناو کۆنگرەکە شەڕەکان هەڵبگیرسێنن.

گولان: با ببێینە سەر کاك نەوشیروان خۆی. ئایا کاك نەوشیروان تەنها لە پۆستی جێگری سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان دەستی خۆی کێشاوەتەوە، یان لە سەرکردایەتی و یەکێتیش؟

نەوشیروان: ئەتوانی وەلامی ئەو پرسیارە خۆت بیدەیتەوە. من ئەگەر بلێم یەکێتی نیم بڕوام پێ دەکەیت؟

گولان:نەوەلا

نەوشیروان : دوای ئەوەش، کاکە ئینسان کە تەمەنێکی دوور و درێژی لەناو حزبێکدا بەسەر دەبات، هەموو تەمەنی گەنجێتی خۆی بەسەردەبات و ئەوەی کە پێیدەڵێن(حەنین) نوستالجیا تۆ ناتوانیت ئینسان ڕووت بکەیتەوە لە هەموو

نوستاڵجیای خۆی مەبەستم ئەوەیە من بەدرێژایی سی ساڵ لەگەڵ کۆمەڵێك خەڵك پێکەوە چەندین قۆناغی خۆش و ناخۆشمان بڕیوە چەندین یادگاریمان هەیە ناتوانیت تۆ خۆت یەکجار ڕووت کەیتەوە لەم هەموو شتانە.

گولآن: بەلآم ئێستا هەست ناکەیت لە دووڕیانێکدای؟ نازانیت لە لای یەکێتی بمێنیتەوە یان ئەوەتا ئەو بیر و تەوەجوهاتەی خۆت وردە وردە چڕ دەکەیتەوەو یەکێتیت لەسەر ئاگرێکی نەرم داناوە وەك چۆن بڵێی چایەکەت دیَم بدات، تا ئەو کاتەی سکرتێری یەکێتی نیشتمانی کوردستان بە تەئکید هەر دەبێت بگۆڕێت جا بە هەر شێوەیەك بێت ئیمساڵ نا ساڵێك دوانی تر بەتایبەت بەهۆی تەمەنەکەیەوە، ئەو کاتە تۆ بێیت و بڵێیت بەڵێ من ئێستا سکرتێری یەکێتیم. ئەمە لە کاتێکدا ماوەی ئەم یەك دووساڵەی ڕابردوو و ئێستاو داهاتووش زەمینەیەکی لەبارتری بۆ دەرەخسێنی؟

نەوشیروان: حەز دەکەم ئەوە بزانیت کە من لەسەر تەمەن کێشە بنیادنانێم چونکە لەوانەیە من خۆم پێش هەندێك کەس بمرم، یەعنی کەس نازانێ کەی دەمریت و هەموومان لە تەمەنێکداین کە موعەرەزین بۆ ئەوەی بمرین. ئەوە یەکێکیان. دووەمیان من لە وتارێکدا کە بلآوم کردۆتەوە بە ناونیشانی «دوای ئەو هەموو ڕەخنەیە ئینجا چی» لەوێدا چەندین سیناریۆم هێناوەتە پێشەوە. گۆڕین لە ڕێگەی گۆڕینەوە لەناو حزب، گۆڕین لە ڕێگەی گۆڕینەوە لەناو دەسەلآتدا و گۆڕین لەدەرەوەی دەسەلآت و لە دەرەوەی حزب. من خۆم لە ڕاستیدا هیچ وەلآمێکی دیاریکراوم لەسەر ئەوە نەداوەتەوە، جێمهێشتووە بۆ موناقەشەکردنێکی گشتی. دوای ئەوە کە تێرکرا بە نووسینی گفتوگۆ، بە نووسینی وتار و بە گفتوگۆ ئەو کاتە خۆی ساغ دەکاتەوە لەسەر چی دەبێت.

گولآن: کاك نەوشیروان لە ساڵانی ١٩٨٠ تا ١٩٨٥ و ٨٦ تەقریبەن کاریگەرترین کاراکتەر بووی لە ناو هەناوی یەکێتی. ئایا پێیت وایە دەتوانی بەو تەوەجوهاتەی ئێستا هەتە هەمان ئەو کاراکتەرە ببینیتەوە کە لەو ساڵانەدا دەتبینی؟

نەوشیروان : ئێستا دوو قۆناغی جیاوازە، ئەو زەمانەی تۆ باسی دەکەی قۆناغی شەڕی پێشمەرگایەتی بووە ئێستا قۆناغی هەڵبژاردن و دروستکردنی دامەزراوەیی دەولەت و ئەوانەیە. من تەمەنا دەکەم کە پارتیش و حزبەکانی تریش هەموو لەگەڵ رۆحی سەردەمدا بگونجێن و خۆیان تازە بکەنەوە. تۆ وەختێك کە باسی فرەیی(تعددیە) دەکەیت بەبێ ئەو حزبە مێژووییانە ناتوانیت پلورالیزم لەم ولاتەدا دامەزرێنیت. لەبەر ئەوە ئەوەی کە من بۆ یەکێتی تەمەنا دەکەم چاکبوونەوە و ئیسلاحاتە کە بۆ پارتیش تەمەننای دەکەم.

گولان: بۆچوونێك هەیە دەڵێت کاك نەوشیروان مستەفا رێك واتا مام جەلال تالەبانی. بە مانایەکی تر کاك نەوشیروان ئێستا لە هەموو کاتێکی تر زیاتر خزمەت بە یەکێتی دەکات بەو تەوەجوهاتانەی کە ئێستا هەیەتی و لە بنەرەتدا لەگەڵ مام جەلال هیچ جیاوازییەکی نییە، بەڵام بۆ ئەوەیەتی ئەوانەی کە لە یەکێتی دادەبڕێن کاك نەوشیروان کۆیان بکاتەوە؟

نەوشیروان : ئەوە بیروڕای خۆیانە. بەڵام لە ژیاندا من هەمیشە عەبدی بیروباوەڕی خۆم بووم. عەبدی هیچ کەسێك نەبوویمە.

گولان: یەکێتی بەوە بەناوبانگە لەکاتی هەڵمەت و شەڕدا جیاوازیەکانی بچووك دەبێتەوە، بەلام ئەو کاتانەی شەڕ نییە و دۆخەکە ئارام دەبێت ئیتر جیاوازیەکانیش زەق دەبنەوە. بۆ نموونە ئێستا کە ئاشتیەوسەقامگیری هەیە، کەچی خەریکە کۆنە برینەکان هەڵدەدرێنەوە. ئایا ئەمە تا چەند ڕاستە؟ چونکە تۆ ئەزموونێکی درێژت لەناو یەکێتی هەیە ئایا بەراستی وایە؟

نەوشیروان : پێم وایە لە ئاشتیدا جیاوازیەکانی یەکێتی باشتر دەردەکەوێت لەگەڵ حزبەکانی تردا. بەڵام کام یەکێتی؟ئەم یەکێتیەی ئێستا پێم وایە زۆر جیاوازی نەماوە لەگەڵ پارتی.

گولان: ئیمڕۆ کاك نەوشیروان بەهێزترین ئۆپۆزیسیۆنە کە بە بارودۆخەکە ڕازی نییە، حزبی تریش هەن کە لەناو حکومەتیش بەشداریانکردووە یان نەیانکردووە، بەڵام ئەوان کاریگەرییەکی ئەوتۆیان لە گۆڕەپانەکە نییە. بەڵکو

کاك نەوشیروان کاریگەرترین ئەو ئۆپۆزیسیۆنەیە کە ئەمڕۆ خەڵك چاوەڕێی ئەوەی لیٚ دەکات کاریگەرتریش بێت لە ئێستا. ئایا مانای ئەوە نییە کە ئەو خەڵکەی تووڕە بووە لە ناو یەکێتی کە بە هەمان شێوەی ئێوە بیر دەکەنەوە و ناڕازین بە بارودۆخەکە و هەروەها ئەوانەیش کە سەربەخۆن یا لە نێوحزبەکانی تردان، کە ناڕازین، نەوشیروان بتوانیت سەرکردایەتیان بکات و وەکو ئۆپۆزیسیۆنێکی پلە یەك و سنووریك بۆ حکومەت و ئەو دەسەلاتە دابنێیت کە هەیە، یان هەر مەبەستت ئەوەیە یەکێتی ئیسلاح بکەیت؟

نەوشیروان : من ناتوانم بە خۆم بڵێم ئۆپۆزیسیۆن. من لەگەڵ هاوڕێکانمان کە جۆرێك لە تەیاری سیاسین کۆمەڵێك چەمکی سیاسیمان خستۆتە روو، ئێمە دوژمنایەتیمان لەگەڵ هیچ کەسێك نییە. ناحەزیمان لەگەڵ هیچ کەسێك نییە.

گوڵان: مەبەستم شتی شەخسی نییە، بەڵکو لە جیاوازی بیروڕا؟

نەوشیروان : جیاوازی بیروڕای ئێمە لەسەر جۆری بەڕێوەبردنی دەولەتەکەیە. کە ئێمە پێمان وایە ئەم ئیدارەی کە ئێستا لە سلێمانی هەیە و ئەو ئیدارەی لە هەولێر و دهۆك هەیە لاساییکردنەوەی ئەورووپای شەرقیە کە پاشەڕۆژی نییە. بۆیە ئێمە کۆمەڵێك چەمکی سیاسیمان هێناوەتە ناو گۆرەپانەکەوە و خستمانەتە روو. بۆ نموونە جیاکردنەوەی حزب لە حکومەت، کە وەختێك ئێمە باسی جیاکردنەوەی حزب لە حکومەت دەکەین مەبەستمان ئەوە نییە کە حزب لە حکومەتدا نەبێت یان لە پەرلەمان نەبێت، بێگومان کە هەڵبژاردن دەکرێت حزبەکان بەشداری تێدا دەکەن و ئەوان نوێنەر دەنێرنە ناو پەرلەمان و کابینە و وەزارەت پێکدەهێنن. بە مانای ئەوەی وەختێك کە دەڵێی حزب و حکومەت لەیەك جیابکرێتەوە پاش هەڵبژاردن و پێکهێنانی کابینە ئیتر رۆڵی مەڵبەند و لق و ناوچە و کۆمیتە و مەکتەبی سیاسی لە دەستتێوەردان(تدخل) لە کاروباری ڕۆژانەی حکومەتدا نەمێنێت. وەختێك تۆ نوێنەرەکانی خۆت ئەنێریتە ناو وەزارەت ئەبێت لەڕێگەی ئەوانەوە کارەکانت بکەیت. وەختێك تۆ فراکسیۆنێکت هەیە لە ناو پەرلەماندا ئەتوانیت لەڕێگەی فراکسیۆنەکەی

خۆتەوە کار بکەیت، نەك ئەوەی بەرپرسی مەڵبەند و بەرپرسی لق و ئەمانە ڕۆژانە تەداخول بکەن لە کاروباری حکومەتدا. بەڕێوەبەری قوتابخانەی سەرەتایی ئەوان دای بنێن، سەرۆکی شارەوانی ئەوان دایبنێن، بەرپرسی ئاسیش ئەوان دایبنێن، ئەمە یەکێکە لە خاڵەکان. خاڵێکی دیکە کە ئەوەی ئێمە زۆر بەلامانەوە گرنگە مەسەلەی شەفافیەتە، شەفافیەت لە کاروباری دارایی، لە کاروباری سیاسی، شەفافیەت لە هەموو لایەنەکانی ژیاندا چونکە تۆ ئیتر لە قۆناخی مەترسی و ساوایی دەرچوویتە دەرەوە. ئەزموونی ئێمە ئیتر ئەزموونێکی ساوا نییە. چ ڕێگرێك هەیە لەبەردەم ئەوەی کە هەردوو وەزارەتی مالیە بودجەی حکومەتی هەرێم بەرێتە بەردەمی پەرلەمانی کوردستان بۆ ئەوەی گفتوگۆی لەبارەیەوە بکرێت، چ ڕێگرێك هەیە لەبەردەمی ئەوەی کە پەرلەمانی کوردستان دەسەڵاتی ئەوەی هەبێت وەزیر بانگ بکات و محاکەمەی بکات و ئەگەر زانی کە وەزیرێکی لێوەشاوە نییە متمانەی لیٚ بسەنێتەوە و بیگۆڕێت. ئەو مەسەلەی عەدالەتی کۆمەڵایەتییە کە لە زەمانی یۆنان و ڕۆمانەوە شەڕی لەسەر دەکریٚ، ئێمە ئەو مەسەلانەمان تەرح کردووە نەهاتووین باسی ئەوە بکەین فلان حزب خراپە و ئەمەیان وایە و ئەمەیان وایە. ئێمە پێمان وایە کە گۆڕین لە چەمکە سیاسیەکاندا بکرێت. ئێستا ئیدارەی سلێمانی ئیدارەی تاك حزبیە ئیدارەی فرەیی نیە کە باوەڕمان بە فرەیی هەیە.

گولان: پێت وانیە ئەو قۆناغەی ئێستا قۆناغێکی ئینتیقالیە هەموو قۆناغێکی ئینتیقالیش کاتی پێویستە، بە بڕیارێك هەموو شتێك ناکریٚ، لە ڕوسیاش هەر وابوو بە ئاسانی یەکسەر نەکەوتە سەر ئەو سکەیەی کە ج°نابت باسی دەکەیت، ماوەیەکی دەوێت جا لەوانەیە ماوەکە کورت بێت هەندیٚ جاریش ماوەکە درێژ دەبێت. ئەگەر پۆتین نەبوایە ڕەنگە ئەو قۆناغە دووبارە لە ڕوسیا درێژ دەبۆوە. مەبەست قۆناغە ئینتیقالیەکە. بەلام پۆتین هات توانی ئەو قۆناغە زوو ببڕی، بەلام لە کوردستان بەپێی ئەزموونمان و ئەوەی کە قەد دەولەت نەبووینە ڕەنگە ئەو قۆناغە درێژتر بێتەوە.

نەوشیروان : ئەوە رەنگە، بۆچوونێك وایە. بەڵام بە بۆچوونی من ئەگەر ئیرادەی سیاسی لەلای سەرکردەی هەردوو حزبەکە بێت، کوردستان هێشتا نەبووە بە دەولەتی موئەسەسات لەبەرئەوە بڕیاری سیاسی سەرکردایەتی حزبەکان زۆر گرنگە لە گۆڕینی رەوتی ئەو گۆڕانە.

گوڵان: ئەو سەرکردایەتیەش هێندە ئەزموونی نەبووە، ئەوە ئەو چەند سالەیە سەیری دنیا دەکات. پێشتر ئێمە هەموومان لە شاخ بووین و کەی بیرمان لەوە دەکردەوە دەبین بە دەولەت و بزانین حوکمڕانی چۆن دەبێت. بۆیە ناکرێ ئێستا خۆمان لەگەڵ ولاتێکی ئەوڕووپی بەراورد بکەین، چونکە هەر ئاستی وشیاری کۆمەلآیەتیشمان لەچاو ئەوان زۆری ماوە، وانییە؟

نەوشیروان : ئەتوانیت ئیستیفادە لە تەجروبەی خەڵك بکەیت. واتا تۆ بۆ ئەوەی کۆمپیوتەر دروست بکەیت ئەچیت لە بازاڕ کۆمپیوتەری حازر دەکڕیت یان خۆشت بە هەمان قۆناغدا ئەڕۆیت کە کۆمپیوتەریان درووست کردووە. بێ گومان ئەچیت کۆمپیوتەری حازر دەکرێت.

گوڵان: کاك نەوشیروان تۆ ئێستا لە ناو یەکێتی تۆزێك بە بەرهەڵستکار یان بەهەر شێوەو ناوێك ناودەبرێیت. ئایا ئەوە لادانێك نییە لە پەیرەوی ناخۆی یەکێتی؟ تۆ قاڵبووی ناو ئەو دۆخەی، بۆیە لە خۆت دەپرسم ئەوەی تۆ ئێستا دەیکەیت لادانە لە پەیرەوی ناوخۆ، یان جێبەجێکردنی پەیرەوی ناوخۆیە؟

نەوشیروان : ئەوە ئەگەڕێتەوە بۆ سەرکردایەتی یەکێتی خۆی، ئەوان خۆیان ئەتوانن بڕیاری لێبدەن.

گوڵان : بۆچوونێك هەیە دەڵێت لەوەتەی سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان چۆتە بەغدا و بووەتە سەرۆك کۆمار، بەهۆی سەرقاڵی لە بەغدا ئەوەندە ناپەڕژێتە سەر یەکێتی وەکو جاران، چونکە سەرقاڵی کیشەی سوننە و شیعە و سیاسەتی نێودەولەتی و. . . هتد، بۆیە هەندێ جاران کۆنتڕۆلەکەی لەدەست دەردەچێت. ئایا فیعلەن ئەوە کاریگەری هەبووە کە ئەو ناکۆکیانەی

خەریکە وردە وردە پەرەدەسەنن لە ناو یەکێتی بەهۆی دووری مام جەلالەوە بێت؟

نەوشیروان :رەنگە ئەوە تەئسیرێکی گەورەی هەبێت، چونکە دوو ئەرکی زۆر گەورەیە، لەلایەك تۆ سەرکۆماری دەولەتێکی پڕ لە کێشەی وەك عێراق بیت و لە لایەکی ترەوە تۆ سکرتێری حزبێك بیت کە لە هەلو مەرجێکی وا ئالۆزاوی وەك کوردستانی عێراق دا بیت. بێگومان ڕێکخستن لە نێوان ئەو دوو ئەرکە کارێکی وا ئاسان نییە.

گولاڵ: کاك نەوشیروان زۆر باسی ئەوە دەکات کە گۆڕانێك بکرێت، گۆڕانێك وەك ئەوەی لە نسوسی خالسدا هاتووە. باشە عەلی وەردی کە ئەو کۆمەڵناسە بەناوبانگەیە دەڵێت هەموو ئەو گۆڕانانەی کە لە ڕۆژهەلاتدا دەکرێن و ئەوانەی کە ئیدیعای گۆڕانکاری دەکەن، جگە لە دووبارە کردنەوەی مێژوو شتێکی نوێ نادەن بە دەستەوە. ڕات لەسەر ئەمە چیە؟ئایا فیعلەن ئەو گۆڕانکارییانەی کە دەکرێن دوایی ئەنجامەکەی هەر ئەوەیە کە لە پێشتردا هەبووە یان فیعلەن گۆڕانکاری لە ڕۆژهەلاتیشدا دەکرێ و زۆر جددیشە و جیاوازیشە لەوانی ڕابردوو؟

نەوشیروان :بۆچی بچینە سەر ئەو نموونانەی کە عەلی وەردی هێناویەتەوە، من ئێستا حالّی حازر لە کوردستانی عێراقدا لەو قۆناغەدا دەژیم. پرسیار لە خۆت دەکەم ئایا ئیمکانی چاکسازی لەم ولاتەدا هەیە یان نییە؟ئیمکانی ئەوە هەیە کە عەدالەتێکی کۆمەلایەتی جێبەجێ بکرێت یان نا؟ ئیمکانی ئەوە هەیە کە ئازادی ڕا دەربڕین و کاری سیاسی زۆرتر بێت یان نا؟ هەموو ئیمکانەکانی هەیە، من بۆچی خۆم ببەستمەوە بە قسەیەکی عەلی وەردی دەربارەی کۆمەلگایەکی پێش چل سالّ لەمەوبەر.

گولاڵ:بەلام خۆ عەلی وەردیش هەر وا ئەو قسەیەی نەکردووە، هەموو شۆڕشەکانی هێناوەتە پێش چاوی خۆی ئینجا وای گوتووە، چونکە عەلی

وەردی رەنگە ج°نابت باش شارەزای بیت کە لە ناو واقیعی کۆمەڵایەتی بە تایبەتی عەرەب زۆر قاڵ بۆتەوە.

نەوشیروان : بەڵێ وایە.

گولان:بەر لەوەی بێینە سەر باڵی ریفۆرم کە ج°نابت سەرکردایەتی دەکەیت. ئایا یەکێتی نیشتمانی کوردستان وەك کاك بەرهەم ساڵحیش، وای گوت دەبێت بزانین ئایا حزبی ڕابردووە یان ئایندەیە بە ڕای ج°نابت؟ ئێمە ئەوە دەزانین لە ڕابردوودا شەرعیەتێکی شۆڕشگێڕانەی بەهێزی هەبوو، بەڵام ئایا دەبێت هەر لەسەر ئەو شەرعیەتە شۆڕشگێرانەیە بڕوات بەڕێوە، یان ئێستا تەماشا دەکەین یەکێتی حزبی ئایندەشە؟

نەوشیروان: من ناتوانم ئەو بڕیارە بدەم، وەك بڕیاری مەحکەمە وایە و من ئەو بڕیاری مەحکەمەیە نادەم، بەڵام ئەتوانم نموونەت لەسەر ئەوە بۆ بهێنمەوە. ئەگەر یەکێك سەروەت و سامانێکی زۆری بۆ بەجێ بمێنێت، کۆمەڵێك منداڵ لەو خێزانەدا هەبن و هەموو ڕۆژێك لە سەروەت و سامانە کۆنەکە بخۆن بەبێ ئەوەی شتێکی تازەی بخەنە سەر، ڕۆژێك دێت تەواو ببێت. سەروەریەکانی یەکێتیش بەس نین بۆ ئەوەی کە تۆ گەنج و نەوەی تازە پێگەیشتووی کوردی پێ قانع بکەیت. من هەتا ئێوارە بۆ یەکێکی باس بکەم چەند مانگ و چەند ڕۆژ لە ئەشکەوتێکدا ژیاوم، چەند مانگ و چەند ڕۆژ چووین کەمینمان داناوە و چەند مانگ و چەند ڕۆژ لە شاخ و داخ نووستووین و وامان کردووە، ئەوە هیچ فێری گەنجی ئەوسەردەمە ناکات. ئێمە ئێستا لە شۆڕشدا نەماوین ئێستا لە دەورانی حوکمڕانیاین. لە حوکمڕانیدا خەڵك چاوەڕێ دەکات ژیانی خۆشتر بێت، پاشەڕۆژی مسۆگەر بێت، زانکۆکانی باشتر بێت، ئەدائی حکومەتەکەی باشتر بێت، ئەمن و ئاسایش بەرقەراتر بێت، بازاڕ ببووژێتەوە، کوشتوکاڵ و پیشەسازی ببووژێتەوە. ئەوان ئەوەیان لە ئێمە ئەوێت. حیکایەتی ڕابردوو بە کەڵکی ئەو زەمانە نایێت.

گولآن: وەك خۆت باست كرد چەند جارێكیش لە یەكێتی ناڕازی بووی لە ساڵانی ڕابردوو و سەرەتای نەوەدەكانەوە تا ئێستا چەند جارێك ئاوا بوویت، بەڵام ئایا هەست ناكەیت ئەو جارە لە هەموو جارەكانی تر ناڕازیبوونەكەت بە دەنگێكی بەرزترە؟ دەتەوێ فیعلەن یەكێتی وەك ئەوەی چەنابت پێت وایە لە خەت لای داوە تۆ بیهێنیتەوە سەر خەت و وەكو جارانی لێكەیتەوە و كونجی گۆشەگیری نەگری؟چونكە ئەو جارە خەڵكێكی زۆر پشتگیریت دەكات و دەڵێن ئێمەش هەمان بۆچوونمان یان هەر بە سەراحەت دەنووسن ئێمە لەگەڵ خەتی كاك نەوشیروان داین.

نەوشیروان : ئێستا لەگەڵ جاران فەرقەكەی ئەوەیە كە جاران ئێمە لە خەتەر دابووین. پێش ڕووخانی سەددام حسێن مەترسی دەرەكی هەرەشەی لێ دەكردین. ترسی ئەوەمان هەبوو ئیسلامی سیاسی كە لە هەڵەبجە و تەوێڵە و بیارەدا بوون و لە دواییدا بوون بە نەواتی درووست بوونی ئەلقاعیدە لە هەموو عێراقدا. هەردەم مەترسی ئەوە هەبوو كە بێن شاری سلێمانی و كوردستان داگیر بكەن. خەتەری بەعسیمان لەسەر بوو، خەتەری دەرەوەمان لەسەر بوو، ئێستا ئەو خەتەرەمان لەسەر نەماوە. بە ڕای من ئێستا خەتەر لەناو خۆمانەوەیە. ئێمە لەماوەی ئەو شازدە ساڵەی ڕابردوودا توانیومانە وەكو پێشتر باسم كرد بناغەی دەوڵەتی كوردی دابمەزرێنین. كۆشكێكی گەورەمان درووست كردووە كە پێی دەڵێن حكومەتی كوردی. لەناو ئەم كۆشكە گەورەیە خەڵكی وای تێدایە كە شایستەی ئەو شوێنە نییە. ئیشی ئێمە ئەوە نییە ئەم تەلارە بڕووخێنین یا ئەم كۆشكە بڕووخێنین. ئیشی ئێمە بریتییە لە گۆڕینی سیستەمەكە و لە جۆری بەڕێوەبردنی ناو ماڵەكە. ئێستا قەوارە دەستوورییەكەی كوردستانی عێراق چەسپاوە، خەتەری غەزوی خاریجیمان لەسەر نەماوە. ئەوپەڕی ئێران یا توركیا دێت سنوورەكانمان بۆردومان دەكات. دانیشتوانی هەموو سنوورەكان بەقەدەر دانیشتوانی گەڕەكێكی شاری هەولێر نابێت. لەبەرئەوە خەتەرەكە كە دێت لە جۆری بەڕێوەبردنی وڵاتەكەی

خۆمانەوەیە. ئەو زەمانە من نەمئەویست قسە بکەم لەبەرئەوەی لە لایەکەوە ترسمان هەبوو ئیسلامی سیاسی بێت مەنتیقەکەمان لەدەست دەربێنێت، لە لایەکەوە ئێمە سەد کیلۆمەتر لە مەقەڕی فەیلەقەوە دوور بووین لە کەرکوك بە یەك شەو ئەیانتوانی بێنە کوردستانەوە شوێنەکانمان هەموو لێ تێکبدەن و بگەڕێنەوە. لە لایەکەوە خەتەری تورکی هەبوو، لە لایەکی ترەوە خەتەری پارتی هەبوو لە زەمانی ناکۆکی بەینی یەکێتی و پارتیدا. تۆ مەجبووربوویت و ئەولەویەت بۆ ئەوەیە کە ئەگەر دام و دەزگایەك بە دڵیشیت نەبێت هەر ئەوەت پێ باشترە لەوەی دام و دەزگایەکی غەریب بێت سەیتەرە بکات بەسەرتەوە. ئێستا ئەوە نەماوە یەکێتی و پارتی ئیتیفاقی ستراتیژیان هەیە، خەتەری ئێرانمان بەسەر نەماوە، خەتەری تورکیامان بەسەر نەماوە و خەتەری بەغداشمان بەسەر نەماوە. وەختی ئەوەیە ناو ماڵەکەی خۆمان ڕێکبخەین.

گولآن: باشە کاك نەوشیروان ئەو ڕاستە کە دەڵێیت نامانەوێت ئەو کۆشکە بڕووخێت، بەڵام هەست ناکەیت لە ڕۆژنامەی ڕۆژنامە کە ج٥نابت کۆمپانیای وشە بەڕێوە دەبەیت. بۆ نموونە چاوپێکەوتن لەگەڵ جاشێك دەکرێت کە تا سەر ئێسقانی خیانەتی لێ دەباری، تا بن هەنگڵی بە خوێنی ئەو خەڵکە داماوە سوور بووە کەچی ئەوان دێن و قسە بە حکومەتی هەرێم دەڵێن و قسە بە دەسەڵات دەڵێن. ئایا ئەوە بڕینی خەڵك چارەسەر دەکات یان زیاتر دەیکولێنێتەوە؟

نەوشیروان: تۆ خۆت سەرنووسەری گۆڤارێکی ئەبێت باوەڕت بە ئازادی ڕادەربڕین هەبێت.

گولآن: ئازادی لەگەڵ خەڵکی نیشتمانپەروەر.

نەوشیروان : نەخێر لەگەڵ هەموو کەسێکدا. تۆ دەبێت هەمیشە پەراوێزێك بهێڵیتەوە بۆ ڕای بەرامبەر، بۆ ڕای ناحەز، بۆ ڕای دوژمن. تۆ وەختێك کە ڕای کابرایەك بڵاودەکەیتەوە مانای ئەوە نییە تۆ پشتیوانی لێ ئەکەیت.

گولاَن:بەلاَم خۆ دەزانین پێش وەخت قسەی خێر لە زمانی ئەو کابرایە نایەتە دەر کە تا سەر ئێسقانی خیانەتە.

نەوشیروان: بەلێ ڕاست دەکەیت، بەلاَم ئەوە بەشێك بووە لە کۆمەلگای کوردی. کۆمەلگای کوردی جاشیشی تێدا بووە، لەشفرۆشی تێدا بووە، سیخوڕی تێدا بووە، بەلاَم بەگشتی هەمووی کۆمەلگای کوردیە تۆ مەسئولیەتێکت هەیە بەرامبەری، ناتوانیت و زەمانی ئەوە نەماوە خەلك تەسفیە بکەیت و توێژێکی کۆمەلگا پاکتاو (تەسفیە)ە بکەیت. ئێمە دوای ڕاپەڕین کارێکی زۆر باشمان کرد کە جۆرێك لە ئاشتبوونەوەی نیشتمانیمان لەگەلێ هەموو ئەوانەی کە لەگەلێ حکومەت هاوکاربوون کرد. بوو بە سەبەبی ئەوەی کە ئارامی و ئاسایش تا رادەیەك لە کوردستاندا هەبێت.

گولاَن: زۆر جار باسی ئەوە دەکرێت کاك نەوشیروان خۆی پێشنیاری ئەوەی کرد کە ئامادەسازی بکرێت بۆ کۆنگرە و هەلبژاردن لە کۆمیتە و مەلبەندەکان و هەر جەنابیشت سەرپەرشتیاری ئەو هەلبژاردنانە بووی. هیچ کێشەیەك نەبوو تەنانەت دوو سێ ڕۆژ دوای هەلبژاردنەکان کە هەندێك پێکدادان و توورەیی دروست بوو لە کوردستانی نوێ، لە شوێنێکیش دیمانەیەکت لەگەلێ کرابوو گوتبووت ئەوە شتێکی ئەوتۆ نییە کە شایەنی باس بێت، کەچی دەلێن دوایی ئێوە دەنگتان کەم هێنا بۆیە هەلوێستت وەرگرت. ئایا دەکرێت ئەمە زیاتر ڕوون بکەیتەوە؟

نەوشیروان :ڕاستە وایە ئێمە دەنگمان نەهێنا بۆیە هەلوێستمان وەرگرت و هاتمە دەرەوە. هیچ عەیبی تێدا نییە.

گولاَن: واتا بڕوات بەوە نەبوو کە تۆ کەمینەی خۆت بکەیت بە زۆرینە؟

نەوشیروان: خۆم چۆن بکەم بە زۆرینە. وەختێك تۆ ئەکەویتە ناکۆکیەوە لەگەلێ بالێك .

گولاَن: لە پرۆسەی دیموکراسیدا خۆی هەر وایە.

نەوشیروان: نەخێر لە پرۆسەی دیموکراسیدا ئاسایش بێ لایەنە، هێزی چەکدار بێ لایەنە، دەزگای ڕاگەیاندن بێ لایەنە و پارەوپوول بێ لایەنە. لەم هەڵبژاردنەی ئێمە ئەوانە بێ لایەن نەبوون.

گولآن: یەکێتی هەمیشە و هەر لەگەڵ درووست بوونیەوە باڵی جیاوازی هەبووە. وەك باسمان کرد کۆمەلەی ڕنجدەران و شۆرشگێران و هێڵی پان. بەلآم هەست ناکەیت ئەو یەك دوو سالەی ئێستا جیاوازیەکان وردە وردە بەرتەسکدەبنەوە، بە مانایەکی تر ئەو فەزایە کەم بۆتەوە کە بتوانی لەناو یەکێتیدا جیاوازی نیشان بدرێت؟بە تایبەتی ئەو تەنگپێهەلچنینەی باڵی ریفۆرم کە ئێستا هەر ڕۆژەی چاوەڕوانی بڕیارێك دەکەن کە چیان بەسەر دێت. مەبەستم ئەوەیە پێکەوەژیانی جیاوازی ئاوا ناکرێت، جیاوازی ئەوەیە کابرا دەنگی خۆی بە ئازادانە هەڵبڕێ. ئێستا هەست دەکەیت ئەو جیاوازیە بەرفراوان نییە؟.

نەوشیروان: وایە ئێستا سوڵتە و دەسەلآتیان بە دەستەوەیە.

گولآن: بەشێك لەو بالەی ریفۆرم ئێستا پێیان وایە دەبێت سکرتێر و بەشێکی سەرکردایەتی یەکێتی دەست لەکار بکێشێتەوە. ئایا هەست ناکەیت ئەوە بڕیارێکی زۆر قورسە؟

نەوشیروان: مەسەلەی دەست لەکارکێشانەوە، ئەوە رەنگە بەس لە کۆمەڵگای ڕۆژهەلآتیدا ئەو داوایە بە کفر حیساب بێت، ئەگینا لە هەموو جێگایەك دەبێت بڵێیی بڕۆوە و دەست لەکار هەڵگرە.

گولآن:ئاخر ئێمەش لە کۆمەڵگایەکی ڕۆژهەلآتی کە ئەو قسەیە بکەین هەست ناکەیت قورسە؟

نەوشیروان :بەڵێ قورسە وایە. خۆ باڵی ریفۆرم ئەو داوایەیان نەکردووە رەگ ئەو داوایەی کردووە. بەلآم خۆ کفریان نەکردووە. یەکێکیان نموونەیەکی باشی هێناوە کە وتی ئەگەر راهێنەر (مدرب )ی تیپێکی فوتبۆڵ سێ جار تیپەکەی دۆڕاندی ئەبێت خۆی بڕوات و وازبێنێت. خۆت شارەزای یەکێك لە ناکۆکیە

سەرەکیەکانی نێوان لینین و هەموو حزبە سۆشیال دیموکراتەکانی دونیای وەختی خۆی لەسەر ئەوەبووە کە لینین باوەڕی بەوە بووە شۆڕشی پرۆلیتاری بکات، دکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا دروست بکات، لەڕێگەی توندوتیژییەوە دەست بەسەر دەسەلاَتدا بگرێت. لینین پێی وابووە ململانێی چینایەتی بزوێنەری مێژووە. سۆشیال دیموکراتەکان لایەنگری ئەوەبوون کە ئەبێت سلمی چینایەتی بلاَوبکرێتەوە، جیاوازی چینایەتی لە نێوان هەژار و دەولەمەندا کەم بکرێتەوە و لەڕێگەی ئاشتییەوە کارەکانیان بکەن. ئێستا یەکێك لەو شتانەی کە پێموایە ئەو برادەرانەی لەناو یەکێتی و لەناو کورددا شت دەنووسن لەسەر سۆشیال دیموکرات، باوەڕم وایە لە جەوهەری سۆشیال دیموکرات تێنەگەیشتوون. چونکە بەو کارەی ئێستا کە ئەوان دەیکەن جیاوازە و دەلاقەکەی چینایەتی گەورەتر دەکەن لەجیاتی ئەوەی چینەکان لەیەکتری نزیك ببنەوە. جەوهەری فکری سۆشیال دیموکرات ئەوەیە کە تۆ هەولبدەیت لەرێگەی دیموکراتی و لەڕێگەی هێمنی و پەرلەمان و ئەمانە جیاوازی نێوان چینەکان کەم بکەیتەوە. چینە هەژارەکە ئاستی ژیانیان بەرزبێتەوە و چینە دەولەمەندەکەش لەڕێگەی باج و ئەو شتانەوە سامانەکانیان بێتە خوارەوە و بیکەن بە موڵکی دەولەت. ئێمە لەو قۆناغەداین. بەلاَم بەداخەوە ئەوانەی کە باسی سۆشیال دیموکرات دەکەن وەك شتێك تێیدەگەن، تەنانەت فەهد لە زەمانی خۆیدا کە حزبی شیوعی دروستکردووە وتویەتی باوەڕی بە سۆشیال دیموکرات نییە.

کولاَن: فەهد ستالینی بوو. هەر لە سەردەمی ستالینیشدا دروست بوو. .

نەوشیروان :بەڵێ ستالینی بوو. ئەوەی ئێمەش ئێستا تەقریبەن هەر ستالینیەتە.

گولاَن:ڕاستە کە دەڵێن باڵی ریفۆرم لەبەرئەوەی لە ئیمتیازەکان دوور خرابوونەوە بۆیە ئەو دەنگەیان هەڵبڕی و باڵێکیان دروست کرد بە ناوی ریفۆرم بۆ ئەوەی ئەو ئیمتیازاتانە بێتەوە دەست خۆیان؟ ئەگینا هیچ مەسەلەیەکی

فکری بەو مانای سیاسی نییە کە یەکێتی بەرەو لێکهەڵوەشانەوە یان دابڕین لە میللەت ببات؟ بەڵام ئیمتیازەکانیان لەبەردەست نییە بۆیە وا دەکەن؟

نەوشیروان :هەموو شتێکیان لەبەر دەست بووە تا ئێستاش لەبەر دەستیاندایە.

گولآن:ئەی ئێستا ئەو چوار ئەندامی مەکتەب سیاسیە باسی ئەوە دەکەن کە ئەو پارە و پوولە سەرف دەکرێت کەس نازانێت چۆن سەرف دەکرێت؟.

نەوشیروان: ئەمە مافی سروشتی هەر ئەندام مەکتەبێکی سیاسیە، پەیوەندی بەوە نییە، پەیوەندی بەوەوە هەیە دەبێت بزانیت ئەو حزبەی لەناویدا کاری تێدا دەکەی سەرمایەکەی لە کوێیە بە دەستی کێیە و چی لێ دەکرێت و چەندیشە؟.

گولآن:واتا ئەو پارەو پوولە بەدەست باڵی ریفۆرمەوە نییە؟

نەوشیروان :بەدەست کەسەوە نییە، کەس نازانێت بەدەست کێیەوەیە. ئەگینا ئەوانە هیچ کەسێکیان ئیمتیازاتیان لێ نەسەنراوەتەوە. هەندێکیان وەزیرن و هەندێکیان پلەی زۆر بەرزیان هەیە.

گولآن: ئەوەی وەزیریش بوو ئەو ڕۆژە وتیان تا ئێستا وەزیرە و لاشمان نەداوە، واتا ئەگەر بیرۆکەی لادانی گەڵاڵە کرابێت؟

نەوشیروان :دوور نییە، بەڵام من مەبەستم وەڵامی پرسیارەکەی تۆیە، واتا هیچ کەسێك لەو کەسانەی کە ئەو بیرۆکانەیان هێناوەتە پێش لە ئەنجامی ئەوەوە نەبووە کە ئیمتیازاتیان لێ سەنراوەتەوە، نەخێر وا نییە.

گولآن: ئەو هەڵوێستانەی کاك نەوشیروان لە لایەك و هەڵوێستی هەندێك لە سەرکردایەتی یەکێتی لە لایەکی تر کە خەریکە پێکهەڵدەشاخێن، ئەمە وا دەکات بواری ئەوە زۆر کەم بێتەوە کە کاك نەوشیروان بەردەوام بێت لە ناو یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا؟ ئەگەر وای لێبێت تۆ ئەڵتەرناتیڤت هەیە؟ چونکە بە تەئکید تۆ ناتوانیت وەك هاووڵاتیەکی ئاسایی بژیت، قسەی تۆ جۆرێکە هەموو کوردستان دەبێ موتابەعەی بکات و بزانێت بەرەو کام ئاقار

هەنگاو هەڵدەگری، لەبەرئەوە ئەگەر وای لێهات تۆ لەناو یەکێتی نیشتمانی نەتوانیت بەردەوام بیت و درێژە بەو هەڵوێستانەی خۆت بدەیت؟ ئەڵتەرناتیڤت چییە؟

نەوشیروان :هەروەکو ئێستا چی ئەکەم هەر وەها ئەکەم. گولآن:بەلآم ئێستا لەناو یەکێتیت. نەوشیروان : ئێستا لەناو یەکێتی نیم. لە درەوەی یەکێتی قسە ئەکەم، من نە لە مەکتەبی سیاسیم نە لە سەرکردایەتیم نە لە مەڵبەندم. دوایی ئەوەی کە تۆ باست کرد، رەنگە تۆ پرسیارەکەت زۆر بە دیبلۆماسیانە کرد. من خۆم نە حزبم هەیە، نە دەزگای دیکەم هەیە و نە ڕێکخراوی سیاسیم هەیە. واتا ئەگەر شەڕیش ببێ من لایەنگری شەڕ نیم، ئێمە تازە خەریکین بیر هەڵدەکەنین و خانوو دروست دەکەین، ئێمە بە تەمای پرۆسەیەکی زۆر هێمن و دیموکراتین.

گولآن:هەندێك لەوانەی کە ئێستا لە سەرکردایەتی یەکێتین دەڵێن کاك نەوشیروان هەرەشەیە بۆ سەر یەکێتی؟ واتە تۆ دەتەوێ یەکێتی لەبەریەك هەڵوەشێنیتەوە و فەوزایەك لە ناو یەکێتی دروست بێ و ئەو ئارامی و هێمنییەی لە ناو یەکێتی هەیە نەمینێت. ئەمە تا چەند راستە یان بە پێچەوانەوە تۆ هێزی مانەوەی یەکێتی. کامەیانی؟

نەوشیروان : ئەوە ئەتوانیت لە خۆیان بپرسیت.

گولآن: کاك نەوشیروان دوای چل ساڵ خەبات کە لەگەڵ ئەودۆخە تاڵ و شیرینەی یەکێتی دەڕۆیت و قوربانیت داوە و ماندوو بوویت و هەموو ڕێگایەکی سەختت گرتۆتە بەر بۆ سەرکەوتنی یەکێتی نیشتمانی کوردستان. ئێستا ڕێگا دەدەیت یەکێتی نیشتمانی تووشی کەرت بوون بێت؟

نەوشیروان: من لەوەتی خۆم هاتوومەتە دەرەوە بە یەك کەسم نەوتووە وازبێنێت، هەرچیش پرسی بە من کردبێت وتوومە ئەوە ئارەزووی خۆتە.

گولآن: بەلآم تۆ کاریگەری زۆرت هەیە چونکە تۆ.سی چل ساڵ خەباتت لەم حزبە هەیە. . .

...... دراو

درۆ.........

...ۆ بیستوو[illegible]کەسێک لەناو یەکێتی بووبێت و من پێم وتبێت لەناو

[illegible] ...ـەکێکی [illegible] ...کە؟

...ی وەرە دە[illegible]بە[illegible] کە تۆ دابڕای خەڵکێ[illegible] تۆ [illegible]

[illegible] ـەر خۆیان، مز[illegible]ـهان نەداوە واز لە

گوڵان :ئینجا ئەوە دەکەو[illegible] وتوومە لە شوێنی

یەکێتی بێنێت. بە پێچەوانەوە هەر کەسێک لە منی پرسیبێ وتوومە لە شوێنی

خۆتدا بمێنەرەوە و ئیشی باش بکە. ئێمە بەدیلێکی ترمان نییە تا ئێستا پێی

بڵێم لەوە واز بێنە و وەرە خەریکی ئەمە بە.

گوڵان:کاک نەشیروان وابزانم لەو دواییە مام جەلال بڕیارێکی دا کە تەوافوقێک

دروست بێت لەنێوان ئەوانەی کە لە کۆنفرانسدا بۆهەڵبژاردنەکان دەرنەچوون،

ئەوانیش بێن بۆ کۆنگرە. ئایا ئەو کێشەیە بەوە چارەسەر دەبێت؟ئەگەر

ئەوانەی کە دەریشنەچوون بە دەنگدان کە حەقی خۆیان بوو دەنگ بهێنن بەهەر

هۆکارێک بووبێت دەنگیان نەهێنا، ئەگەر ئەوانە بێنە کۆنگرە دڵی کاک

نەوشیروان چاك دەکاتەوە؟

نەوشیروان: ئێمە موشکیلەکەمان ئەشخاس نییە، واتا ئەوە نییە چەند کەسێ

لابرێت و چەند کەسێك بچێتە شوێنی. ئێمە موشکیلەکەمان ئەوەیە گۆڕ

چۆن لە شێوەی بەڕێوەبردنی ئیشەکاندا ئەکرێت، گۆڕین چۆن لە پەیڕەو

ناوخۆدا ئەکرێت، گۆڕین چۆن لە بەرنامەی حزبەکەدا ئەکرێت ئەگینا ئەگ

هەموو سەرکردایەتی بگۆڕدرێت ئەگەر بە هەمان ئەو سیستەمەی ئێستا ئ

بکەن هەمان بابەت و گرفتە. سیستەمی ئیشی یەکێتی سیستەم

سەرۆکایەتییە، ئەندامانی مەکتەبی سیاسی لەبەردەمی شەخسی سکرت

گشتیدا بەرپرسن، واتا لەبەردەمی یەکتریدا بەرپرس نین، مەبەستم ئەو

دانانیشن لە کۆبوونەوەکاندا پرس و ڕا بە یەکتری بکەن. مەسەلەی تەوافو

تۆ بێیت پێنج کەس لەبەر خاتری من و پێنج کەس لەبەر خاتری سەرکرد

و لەبەر خاتری مەکتەبی سیاسی بهێنی ب...
گرفت و کێشەکان ناکات. چونکە موشکیلەکان، یەک...
گـولاَن:ئـەوە تەوافوقێکـە وە... ـەوەی لـە بەغـدا دەکرێـت. ... ارەکە
چارەسەرێکی کاتی بێت بۆ ئەوەی ... ـوو لا ... بە یەکەوە هەڵبکەن
نەوشیروان :وەك ئێستا عـەرزم کـردی گـ... ـەشخاس نییە، گرفت ئەوەیە
دەلاقەیـەکی گـەورە لـە نێـوان یـەکێتی و خەڵکـدا درووسـت بـووە. دەلاقـە
دروستبووە لەنێوان قاعیدەی یەکێتی و سەرکردایەتیەکەی.
گولاَن:ئەگەر تۆ ببیتە جێگری سکرتێری گشتی کە پێشتریش جێگر بووی، ئەو
هـەموو کـادیر و تەنانـەت هەنـدێك لـە ئەوانـەیش کـە لـە مەکتـەبی سیاسـین و
پەیرەوی تۆ دەکەن، ئایا بەم هێزەوە ناتوانیت ئەو دەلاقەیە بچووك بکەیتەوە و
ئەو فەزا گەورەیـەی لـە نێـوان خـەڵك و یـەکێتی نیـشتمانی هەیـە بە لای کـەمی
سەدا پەنجای کەم بکەیەوە؟
نەوشیروان :بۆم نەکرا بۆیە هاتمە دەرەوە، نەمتوانی.
ـولاَن:باشـە ئـەی ئەگـەر بڕیاریـان دا بـۆ نموونـە بـۆ ئـەوەی لەبـەر یـەکێتی
ـشتمانی کوردستان تووشی وەزعێکی خراپ نەبێت سەرلەنوێ کۆنفرانسەکان
ـست پێبکەنـەوە، واتـە ئـەوەی کـە کـرا قبـوڵ نـەبێت دووبـارە وەك پێـشتر
ـەرپەرشـتیاری هەڵبژاردنـەکانیش هـەر خـۆت بیکـەیت. ئایـا ئامـادەی ئـەوە
ـەیت؟
ـوشیروان: ئەوە گریمانەیەکە لە وەختی خۆیدا باسی دەکەین.
ـلاَن:کـاك نەوشیروان تۆ جگـە لـەوەی وەك سیاسیش وەك نووسـەرێك و وەك
ـشنبیرێکیش تـا ڕادەیـەك جـیَ دەسـتت لـە بـواری ڕۆشنبیری و نووسینیشدا
ـچاوە. خـەڵك چاوەڕوانی دەکرد کە کۆمپانیـای وشـە دادەمـەزرێت بەڕاستی
ـەڕوانی شـتی گـەورەی دەکـرد، بـەلاَم ئێـستا هەسـت دەکـەیت کۆمپانیـای
ـش ئەوە نەبوو کە کاك نەوشیروان بەڕێوەی دەبات. چونکە تەسـەور دەکرا
نەوشیروان دوای ئەو شارەزاییەی لە بواری سیاسەت و نووسین دا هەیـەتی

رەنگە شتێك بكات كە زۆر جیاواز بێت لەو دۆخەی كە رۆژنامەگەری كوردی هەیەتی، نالێم هیچ جیاوازی نییە، تا رادەیەك هەیە بەو ئاراستەیەی كە ئێوە خۆتان دەتانەوێ. بەلاّم ئەوەش نییە كە خەلّك پێی وابوو كۆمپانیای وشە شتێكی نەوعی دەبێت، بەتایبەت ئەگەر دروستكردنی هەوالّی لێ دەركەی، كە من ئەمەیانم پێ باشە، ئەوانی تری تۆزێك لە رۆژنامە ئەهلییەكانی تر باشترە، پرسیار ئەوەیە ئێستا خۆت لەبەڕێوەبردنی ئەو كۆمپانیایە بەو وەزعەی ئێستای ڕازیت؟

نەوشیروان : بەو توانا كەمەوە كە هەمانە بەلّێ ڕازیم.

گولاّن: بەلاّم، رەنگە ئەوە پاساو نەبێت.

نەوشیروان :نا ئەوە پاساو نییە، ئێمە داماننابوو ناوەند (مركز )ێك دروست بكەین بۆ لێكۆڵینەوەی ئابووری، سیاسی، عەسكەری و بواری جیاجیا بە شارەزاییەوە. كە وەختێك حیسابمان كرد بۆ سێ مانگ پارەو پوولێكی زۆری تێدەچێت. داماننابوو بۆ نموونە بلّێین تەلەڤزیۆنەكەمان زووتر بخەینە ئیش، خۆت دەزانیت بودجەی تەلەڤزیۆن چەندی ئەوێت، ڕۆژنامەی ڕۆژانە بودجەی چەندی ئەوێت، كە وەختێك تۆ ڕاپرسیەك ئەكەیت خۆت ئەزانیت بودجەی چەندی ئەوێت. ئێمە تا ئێستا بێجگە لەو پارەیەی كە ئەوەلّجار لە مام جەلال مان وەرگرتووە هیچ پارەیەكمان لە هیچ لایەن و جیهەتێكەوە وەرنەگرتووە، بەو ئیمكانیەتەی كە ئێستا ئێمە هەمانە ئەوەندەمان پێ ئەكرێت. ئومێدم وایە لە پاشەڕۆژدا بتوانین زیاتر بكەین. دوای ئەوەش، خەلّك هەمیشە چاوەڕوانیەكانی زۆرە، واتا چاوەڕوانییەكانی زۆرترە لەوەی كە تۆ بتوانیت پێشكەشی بكەیت. خەلّك پێی وابووە كە ئەگەر حكومەتی كوردی هەبێت خەلّك هەمووی لە بەهەشتدا ئەژیت.

گولاّن:كاك نەوشیروان ئەگەر تووشی قەیرانێكی دارایی هاتی، ئەوەش واریدە، لەگەلّ یەكێتیش وەزعت بەو شێوەیە بێت كە ئەوان هاوكاریت نەكەن. هەست ناكەی تووشی قەیرانێك دەبیت و رەنگە بە زەحمەت بتوانیت لێی دەرچیت؟

نەوشیروان : لەوانەیە

گولآن: واتا بەرچاوڕوونیەکت بۆ کۆمپانیای وشە لەبەر چاو نییە؟

نەوشیروان : بەڵێ لەبەر چاومە، رەنگە ماوەیەکی تر پرۆژەیەك بە پەرلەمان بدەین بۆ جۆری یارمەتیدانی میدیای ئەهلی میدیای کەرتی تایبەتی.

گولآن:ئەگەر پەرلەمان پەسندی نەکرد، چونکە رەنگە ئەوەش زەحمەت بێت؟ لەبەرئەوەی رەنگە تا رادەیەك فەوزایەك لە نێو بواری راگەیاندن بەتایبەت ئەوەی پێی دەڵێن میدیای ئەهلی هەبێت و، رەنگە حکومەت و پەرلەمانیش تا رادەیەك دڵیان پێی خۆش نەبێت.

نەوشیروان :وایە، بەلآم ئەوە ئەرکی حکومەتە، وەك چۆن لە سلێمانی ئەو هەموو دەزگای ڕاگەیاندنە هەیە بە پارەی گشتی ئیش دەکەن، لە هەولێریش ئەو هەموو دەزگای ڕاگەیاندنە هەیە بە پارەی گشتی ئیش دەکەن، مافێکی سروشتی دەزگا ئەهلیەکانیشە کە شەریك بن. یان هی ئەوان بپڕن، یا ئەوانیش بژیێنن. گولآن:بەلآم ئەگەر نەیانکرد تۆ چی دەکەیت؟ هەر زۆر زۆر ناچار دەبیت جار جار شتێك بنووسیت، لەوە زیاتر چیت پێدەکرێت؟ نەوشیروان:با لە ئێستاوە بڕیار نەدەین، با چاوەڕێ بکەین باشترە.

گولآن :کاك نەوشیروان زۆر خۆی لە دیمانە دەپارێزێت، ئایا بەڕاستی گوشاری لەسەرە یان ترسی ئەوەی هەیە بە شێوەیەك لە شێوەکان خەڵکێك تووڕە بکات یان خۆی بە مەرجەعیەتێك دەزانێ بۆ نموونە وەك سیستانی، موقتەدا، . . . هتد حەقیقەتی خۆیان نیشان نادەن و بڕیاریش هەموو لە ژوورەکەی ئەوەوە دەڕوات؟

نەوشیروان :نەخێر، رەنگە هۆی سەرەکی ئەوەی کە خۆم لە دیمانە دەپارێزم بەڕاستی وەك خۆت دەزانی ڕۆژنامەنووس عادەتەن فزولێن ڕاتدەکێشن بۆ قسە کردن، حەز ناکەم ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو قسانەی کە ئەیکەم، خۆت ئەزانی من بە سەراحەت و راشکاوی قسە ئەکەم و خۆم لا نادەم، واتا نامەوێ قسەکانم لە توێکڵێکدا بپێچمەوە. جاری وا هەبووە کە من قسەیەکم کردووە حزبێك،

نەوشیروان: تۆ بیستووتە کەسێك لەناو یەکێتی بووبێت و من پێم وتبێت لەناو یەکێتی وەرە دەرەوە و ئیستیقالە بکە؟
گولان: نەمبیستووە بەلام کە تۆ دابڕای خەلکێك بە تۆ موتەئەسیرە، خەلکێکی زۆریش.
نەوشیروان :ئینجا ئەوە دەکەوێتە سەر خۆیان، من کەسم هان نەداوە واز لە یەکێتی بێنێت. بە پێچەوانەوە هەر کەسێك لە منی پرسیبێ وتوومە لە شوێنی خۆتدا بمێنەرەوە و ئیشی باش بکە. ئێمە بەدیلێکی ترمان نییە تا ئێستا پێی بلێم لەوە واز بێنە و وەرە خەریکی ئەمە بە.
گولان:کاك نەشیروان وابزانم لەو دواییە مام جەلال بڕیارێکی دا کە تەوافوقێك دروست بێت لەنێوان ئەوانەی کە لە کۆنفرانسدا بۆهەلبژاردنەکان دەرنەچوون، ئەوانیش بێن بۆ کۆنگرە. ئایا ئەو کێشەیە بەوە چارەسەر دەبێت؟ئەگەر ئەوانەی کە دەریشنەچوون بە دەنگدان کە حەقی خۆیان بوو دەنگ بهێنن بەهەر هۆکارێك بووبێت دەنگیان نەهێنا، ئەگەر ئەوانە بێنە کۆنگرە دلی کاك نەوشیروان چاك دەکاتەوە؟
نەوشیروان: ئێمە موشکیلەکەمان ئەشخاس نییە، واتا ئەوە نییە چەند کەسێك لابرێت و چەند کەسێك بچێتە شوێنی. ئێمە موشکیلەکەمان ئەوەیە گۆڕین چۆن لە شێوەی بەڕێوەبردنی ئیشەکاندا ئەکرێت، گۆڕین چۆن لە پەیڕەوی ناوخۆدا ئەکرێت، گۆڕین چۆن لە بەرنامەی حزبەکەدا ئەکرێت ئەگینا ئەگەر هەموو سەرکردایەتی بگۆڕدرێت ئەگەر بە هەمان ئەو سیستەمەی ئێستا ئیش بکەن هەمان بابەت و گرفتە. سیستەمی ئیشی یەکێتی سیستەمێکی سەرۆکایەتییە، ئەندامانی مەکتەبی سیاسی لەبەردەمی شەخسی سکرتێری گشتیدا بەرپرسن، واتا لەبەردەمی یەکتریدا بەرپرس نین، مەبەستم ئەوەیە دانانیشن لە کۆبوونەوەکاندا پرس و ڕا بە یەکتری بکەن. مەسەلەی تەوافوقیش تۆ بێیت پێنج کەس لەبەر خاتری من و پێنج کەس لەبەر خاتری سەرکردایەتی

و لەبەر خاتری مەکتەبی سیاسی بهێنی بۆ کۆنگرە، پێم وایە ئەوە چارەسەری گرفت و کێشەکان ناکات. چونکە موشکیلەکانی یەکێتی لەوە قووڵترن.

گولاڵ:ئەوە تەوافوقێکە وەك ئەوەی لە بەغدا دەکرێت. ئەوەش رەنگە چارەسەرێکی کاتی بێت بۆ ئەوەی هەردوو لا بتوانن بە یەکەوە هەڵبکەن.

نەوشیروان :وەك ئێستا عەرزم کردی گرفتی ئەشخاس نییە، گرفت ئەوەیە دەلاقەیەکی گەورە لە نێوان یەکێتی و خەڵکدا دروست بووە. دەلاقە دروستبووە لەنێوان قاعیدەی یەکێتی و سەرکردایەتیەکەی.

گولاڵ:ئەگەر تۆ ببیتە جێگری سکرتێری گشتی کە پێشتریش جێگر بووی، ئەو هەموو کادیر و تەنانەت هەندێك لە ئەوانەیش کە لە مەکتەبی سیاسین و پەیرەوی تۆ دەکەن، ئایا بەم هێزەوە ناتوانیت ئەو دەلاقەیە بچووك بکەیتەوە و ئەو فەزا گەورەیەی لە نێوان خەڵك و یەکێتی نیشتمانی هەیە بە لای کەمی سەدا پەنجای کەم بکەیەوە؟

نەوشیروان :بۆم نەکرا بۆیە هاتمە دەرەوە، نەمتوانی.

گولاڵ:باشە ئەی ئەگەر بڕیاریان دا بۆ نموونە بۆ ئەوەی لەبەر یەکێتی نیشتمانی کوردستان تووشی وەزعێکی خراپ نەبێت سەرلەنوێ کۆنفرانسەکان دەست پێبکەنەوە، واتە ئەوەی کە کرا قبوڵ نەبێت دووبارە وەك پێشتر سەرپەرشتیاری هەڵبژاردنەکانیش هەر خۆت بیکەیت. ئایا ئامادەی ئەوە بکەیت؟

نەوشیروان: ئەوە گریمانەیەکە لە وەختی خۆیدا باسی دەکەین.

گولاڵ:کاك نەوشیروان تۆ جگە لەوەی وەك سیاسیش وەك نووسەرێك و وەك رۆشنبیرێکیش تا رادەیەك جێ دەستت لە بواری رۆشنبیری و نووسینیشدا بەرچاوە. خەڵك چاوەڕوانی دەکرد کە کۆمپانیای وشە دادەمەزرێت بەڕاستی چاوەڕوانی شتی گەورەی دەکرد، بەڵام ئێستا هەست دەکەیت کۆمپانیای وشەش ئەوە نەبوو کە کاك نەوشیروان بەڕێوەی دەبات. چونکە تەسەور دەکرا کاك نەوشیروان دوای ئەو شارەزاییەی لە بواری سیاسەت و نووسین دا هەیەتی

رەنگە شتێك بكات كە زۆر جیاواز بێت لەو دۆخەی كە رۆژنامەگەری كوردی هەیەتی، ناڵێم هیچ جیاوازی نییە، تا رادەیەك هەیە بەو ئاراستەیەی كە ئێوە خۆتان دەتانەوێ. بەڵام ئەوەش نییە كە خەڵك پێی وابوو كۆمپانیای وشە شتێكی نەوعی دەبێت، بەتایبەت ئەگەر دروستكردنی هەواڵی لێ دەركەی، كە من ئەمەیانم پێ باشە، ئەوانی تری تۆزێك لە رۆژنامە ئەهلییەكانی تر باشترە، پرسیار ئەوەیە ئێستا خۆت لەبەڕێوەبردنی ئەو كۆمپانیایە بەو وەزعەی ئێستای ڕازیت؟

نەوشیروان : بەو توانا كەمەوە كە هەمانە بەڵێ ڕازیم.

گولان: بەڵام، رەنگە ئەوە پاساو نەبێت.

نەوشیروان :نا ئەوە پاساو نییە، ئێمە دامانئابوو ناوەند (مركز )ێك دروست بكەین بۆ لێكۆڵینەوەی ئابووری، سیاسی، عەسكەری و بواری جیاجیا بە شارەزاییەوە. كە وەختێك حیسابمان كرد بۆ سێ مانگ پارەو پوولێكی زۆری تێدەچێت. دامانئابوو بۆ نموونە بڵێین تەلەڤزیۆنەكەمان زووتر بخەینە ئیش، خۆت دەزانیت بودجەی تەلەڤزیۆن چەندی ئەوێت، ڕۆژنامەی ڕۆژانە بودجەی چەندی ئەوێت، كە وەختێك تۆ ڕاپرسیەك ئەكەیت خۆت ئەزانیت بودجەی چەندی ئەوێت. ئێمە تا ئێستا بێجگە لەو پارەیەی كە ئەوەڵجار لە مام جەلال مان وەرگرتووە هیچ پارەیەكمان لە هیچ لایەن و جیهەتێكەوە وەرنەگرتووە، بەو ئیمكانیەتەی كە ئێستا ئێمە هەمانە ئەوەندەمان پێ ئەكرێت. ئومێدم وایە لە پاشەڕۆژدا بتوانین زیاتر بكەین. دوای ئەوەش، خەڵك هەمیشە چاوەڕوانیەكانی زۆرە، واتا چاوەڕوانییەكانی زۆرترە لەوەی كە تۆ بتوانیت پێشكەشی بكەیت. خەڵك پێی وابووە كە ئەگەر حكومەتی كوردی هەبێت خەڵك هەمووی لە بەهەشتدا ئەژیت.

گولان:كاك نەوشیروان ئەگەر تووشی قەیرانێكی دارایی هاتی، ئەوەش واریدە، لەگەڵ یەكێتیش وەزعت بەو شێوەیە بێت كە ئەوان هاوكاریت نەكەن. هەست ناكەی تووشی قەیرانێك دەبیت و رەنگە بە زەحمەت بتوانیت لێی دەرچیت؟

نەوشیروان : لەوانەیە

گولآن: واتا بەرچاوڕوونیەکت بۆ کۆمپانیای وشە لەبەر چاو نییە؟

نەوشیروان : بەڵێ لەبەر چاومە، ڕەنگە ماوەیەکی تر پرۆژەیەك بە پەرلەمان بدەین بۆ جۆری یارمەتیدانی میدیای ئەهلی میدیای کەرتی تایبەتی.

گولآن:ئەگەر پەرلەمان پەسندی نەکرد، چونکە ڕەنگە ئەوەش زەحمەت بێت؟ لەبەرئەوەی ڕەنگە تا رادەیەك فەوزایەك لە نێو بواری راگەیاندن بەتایبەت ئەوەی پێی دەڵێن میدیای ئەهلی هەبێت و، ڕەنگە حکومەت و پەرلەمانیش تا ڕادەیەك دڵیان پێی خۆش نەبێت.

نەوشیروان :وایە، بەلآم ئەوە ئەرکی حکومەتە، وەك چۆن لە سلێمانی ئەو هەموو دەزگای ڕاگەیاندنە هەیە بە پارەی گشتی ئیش دەکەن، لە هەولێریش ئەو هەموو دەزگای ڕاگەیاندنە هەیە بە پارەی گشتی ئیش دەکەن، مافێکی سروشتی دەزگا ئەهلیەکانیشە کە شەریك بن. یان هی ئەوان ببڕن، یا ئەوانیش بژیێنن. گولآن:بەلآم ئەگەر نەیانکرد تۆ چی دەکەیت؟ هەر زۆر زۆر ناچار دەبیت جار جار شتێك بنووسیت، لەوە زیاتر چیت پێدەکرێت؟ نەوشیروان:با لە ئێستاوە بڕیار نەدەین، با چاوەڕێ بکەین باشترە.

گولآن :کاك نەوشیروان زۆر خۆی لە دیمانە دەپارێزێت، ئایا بەڕاستی گوشاری لەسەرە یان ترسی ئەوەی هەیە بە شێوەیەك لە شێوەکان خەڵکێك تووڕە بکات یان خۆی بە مەرجەعیەتێك دەزانێ بۆ نموونە وەك سیستانی، موقتەدا، . . . هتد حەقیقەتی خۆیان نیشان نادەن و بڕیاریش هەموو لە ژوورەکەی ئەوەوە دەڕوات؟

نەوشیروان :نەخێر، ڕەنگە هۆی سەرەکی ئەوەی کە خۆم لە دیمانە دەپارێزم بەڕاستی وەك خۆت دەزانی ڕۆژنامەنووس عادەتەن فزولێن ڕاتدەکێشن بۆ قسە کردن، حەز ناکەم ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو قسانەی کە ئەیکەم، خۆت ئەزانی من بە سەراحەت و راشکاوی قسە ئەکەم و خۆم لا نادەم، واتا نامەوێ قسەکانم لە توێکڵێکدا بپێچمەوە. جاری وا هەبووە کە من قسەیەکم کردووە حزبێك،

سەرکردەیەك، گرووپێك یا لایەنێك بە شێوەیەکی تر سەیریان کردووە و بە خراپ لێکیان داوەتەوە. هۆکارەکە ئەوەیە ئەگینا نە خۆم بە مەرجەع ئەزانم و نە ئەو شتانە. هەرچیشی وتوومە من بە وتار نووسیومە.

گولاّن: خۆ خەلّکی تریش هەیە ڕۆژانە دیمانە دەکات و بە خراپیش لێك دەدرێتەوە و گوێشی پێنادات.

نەوشیروان: من گوێی پیَ ئەدەم، بەلامەوە گرنگە کە بە خۆڕایی هیچ لایەك زویر نەکەم.

گولاّن: کاك نەوشیروان دوای ئەوەی ئەو وەزعە گەرم بوو عومەر شێخ مووس گوتی من بۆ ئەوە هاتوومەتەوە بۆ ئەوەی وەزعەکە هێور بکەمەوە. کاك کۆسرەتیش رەنگە ڕۆلّێك ببینێت. ئایا پێت وایە بە ناوبژیوان ئەو مەسەلەیە چارەسەر دەکرێت؟ واتا کێشەی ئێوە کێشەی ئەوەیە خەلّك ببێتە ناوبژیوان و ئێوە تۆزێك سارد بکەنەوە و ئەولاش سارد بکەنەوە بۆ ماوەیەکی کاتی؟ یان کێشەی ئێوە کێشەیەکی سیاسیە و دەبێت گۆڕانکاری سیاسی لە ئیدارە و لە سیستەمەکە بکرێت؟

نەوشیروان: وایە، گۆڕانی سیاسیش بەشێکە لە گفتوگۆ، واتا گۆڕانی سیاسی بە گفتوگۆ ئەکرێت. ناوبژیوانی و قسەکانی ئەوانیش بەشێکە لەو گفتوگۆیانە و شتێکی باشە کە بکرێت. باشترین ڕێگاش ڕێگای گفتوگۆیە و من خۆم بڕوام بە دانوستان هەیە.

گولاّن:واتا گەشبینی بەوەی کە ئەگەر ئەوان هاتنە ناو ئەو کێشەوە وەزعەکە تۆزێك باشتر بکەن؟

نەوشیروان :پێم وانییە بگەنە ئەنجامێکی گەورە، بەلاّم هەر لە هیچ باشترە. هەمیشە کردن باشترە لە نەکردن.

گولاّن:ڕاستە بالّی ریفۆرم دەنگێکی جیاوازە لەناو یەکێتی چ بۆ حکومەت چ لەناو حزبەکانی تریش. بەلاّم هەست ناکەیت ئێوە تا ئێستا پرۆژەیەکی جددیتان نییە بۆ بەڕێوەبردنی حوکم، بۆ سیاسەتی حوکم، بۆ ڕۆشنبیری

حوکم، . . هتد، ڕاسته له وتارەکانت شتێك دەڵێیت، بەڵام وتارەکانت لەسەر بابەتێکە، بۆ نموونە ئەوەی ڕابردوو لەسەر ئەوە بوو کە مامەلەمان لەگەڵ تورکمانەکانی کەرکوك چۆن بێت. ئەوانە پرۆژە نین بەو مانایەی پرۆژە بن بۆ هەموو کاروبارەکانی جکومەت. هەست ناکەیت کەموکورتیتان هەیە بەوەی تەرحەکانتان هێشتا بە پێی پێویست پێنەگەیشتووە؟

نەوشیروان :من قسەکەر نیم بە ناوی ریفۆرمەوە. ریفۆرمیش بە مانای باڵ وەك زەمانی کۆن نییە سەرکردایەتیەکی هەبێت و دانیشێت و کۆبوونەوە بکات و بەرنامە دابنێت، ریفۆرم تا ئێستا ئیتیجاهێکی سیاسیە، تەوەجوهە، تا ئێستا تەیارێکە. یەعنی ئەوە نییە تۆ بڵێیت کۆمەڵێك خەڵکن پێکەوە گروپێکیان درووست کردووە و ئەو گروپە لەڕووی فکریەوە لەسەر هەموو شتێك مولتەزیمن و دانیشتوون بەرنامەیەك دائەنێن وەك بەدیل. لەبەرئەوە من قسەکەر نیم بەناوی ئەوانەوە ئەو شتانەی کە بلاوی دەکەمەوە زیاتر هی خۆمن.

گولاَن:بە رای تۆ یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەو وەزعەوە بۆ کوێ دەڕوات؟ واتا بەرەو بەهێزبوون یان لێکهەڵوەشانەوە کە هەندێ جار لەناو سەرکردایەتی یەکێتیش قسەی وا دەکرێت کە ئەگەر یەکێتی بەم وەزعە هەر بەردەوام بێت رەنگە دەیانەوێت واتە ئێوە دەتانەوێت یەکێتی بچووك بێتەوە و ببێتە حزبێکی ژمارە پێنج یان ژمارە چوار.

نەوشیروان:من خۆم باوەڕم بەوە نییە کە یەکێتی هەڵدەوەشێتەوە یان لەناو دەچێت. رەنگە لاواز ببێتەوە بەلاَم نە هەڵدەوەشێتەوە نە لەناودەچێت.

گولاَن:دوای ئەو هەموو مشت و مرەی کە کرا و دوای ئەو هەمووە رەخنە و رەخنەکاریەی کە کاك نەوشیروان بەسەریدا هات و ئیتر چەند جارێك مام جەلالی بینیوە لە سەردانەکانی ئێرە (سلێمانی)، ئێستا پەیوەندیت لەگەڵ مام جەلال چۆنە؟ بەڕاستی درزێکی زۆر بچووکیش بێت لێی نەکەوتووە دوای ئەوەی کە تۆ ڕای جیاوازت زەق کردۆتەوە؟ یان هەر ئەو مام جەلال و کاك نەوشیروانەن کە جاران پێکەوە لە شاخ بوون و یەك دڵ و یەك گیان بوون؟

نەوشیروان:لەسەر ئاستی شەخسی پەیوەندیم لەگەڵ هەموویان باشە، بەڵام لەسەر ئاستی سیاسی ئێمە ناکۆکین.
گوڵان:ئەو ئاستە سیاسیە کە بۆچوونەکانی خۆتی تێدا دەخەیتە روو بۆچوونی مام جەلال لێت نزیك نابێتەوە؟
نەوشیروان: خۆم وا هەستم نەکردووە.
گوڵان:بەپێی ئەو دیمانەیەی ئێستا لەگەڵ جەنابتم کرد هەست ناکەم تۆ وەکو ئەردۆگان کە لە حزبی رەفاه هاتە دەرەوە و حزبی داد وگەشەپێدانی دروست کرد و لە هەڵبژاردنەکانیشا سەرکەوت، یان وەکو شارۆن کە لە حزبی لیکوٚد هاتە دەرەوەو حزبی کادیمای دروست کرد و ئەویش لە هەڵبژاردنەکانا سەرکەوت، نموونەی تریش زۆرن، پرسیار ئەوەیە من لەم دیمانەیەدا هەستم نەکرد تۆ چاوەڕوانی ئەوە بکەیت بەیانی چ یەکێتی بگریتە دەست خۆت بە شێوەیەکی بەرفراوانتر لە ئێستا، یان حزبێکی نوێ دروست بکەیت کە بنکەیەکی جەماوەری لە ئێستای یەکێتی زیاتری هەبێت. وا هەست دەکەم تەنها هەندێك بۆچوون هەیە دەیخەیتە ڕوو کەلە بۆچوونەکانی یەکێتی جیاوازە و ئیتر لەوە زیاتر شتێکی تر نییە. وایە؟؟
نەوشیروان :وایە، ئەو زەمینە دیموکراسیەی کە لە تورکیا هەیە بۆ دروستکردنی حزب، کوا لە کوردستان هەیە. . .
گوڵان:ئەو زەمینە سیاسیە هەبوایە ئێستا هەنگاوی ترت دەنا؟
نەوشیروان :ئەوە رەنگەیە، لەبەرئەوە ئینسان ناتونێت لەسەر رەنگە شت ئیمزا بکات.
گوڵان:دوا پرسیار، جیاوازیەکانی کاك نەوشیروان ئایا بەشێکە لە سیاسەتی گشتی یەکێتی یان ئێستا کاك نەوشیروان لە یەکێتی نیشتمانی کوردستان دابڕاوە؟ جاران زۆر سرووشتی بوو کە ڕای جیاوازیشت هەبوو هەر سەرکردەی یەکێتی نیشتمانیش بووی. ئایا ئێستا لە یەکێتی دابڕاوی چونکە ئەو ڕەئی جیاوازیە قوبوڵ ناکرێت، یان هەر لەناو یەکێتی؟
نەوشیروان :مەبەستت لەناو یەکێتی چییە؟من ڕۆژانە بە دەیان کادیری یەکێتی دەبینم، سەرکردەی یەکێتی ئەبینم، ئەندامی مەکتەبی سیاسی ئەبینم، خەڵك

ئەبینم. بۆ دابڕان من بە هیچ جۆرێك دانەبڕاوم، بەلآم ئێستا من بەشێك نیم لە سیاسەتی یەكێتی.

گولآن:باشە تۆ ئەو گلەییانە دەكەی لە چۆنێتی مامەلەكردن لەگەڵ بەغدا، پێت وایە ئەگەر تۆ سەرۆكی وەفدی كوردی و نوێنەری كورد بوایت لەو گفتوگۆیانەی كە لەگەڵ بەغدا دەكرێن گۆڕانكاریەك دروست دەبوو؟واتا وەزعی كورد باشتر دەبوو یان ئەگەر جەنابیشت بوایت هەر ئەوە دەبوو كە ئێستا هەیە؟

نەوشیروان:ئەو زەمانەی كە هێشتا ئەنجوومەنی حوكم مابوو وتارێكم نووسی باسی ئەوەم كرد زەمانی گولبارانكردنی ئەمریكیەكان تێپەڕیوە و دۆستی هەمیشەیی و دوژمنی هەیشەیی نییە، هاوپەیمانێتی لە حالەتی گۆڕاندایە و پێویستە ئێمە دانیشین و گفتوگۆیەكی جددی لەگەڵ ئەمریكیەكان بكەین لەسەر پرسە نەتەوەییەكانی خۆمان. ئەوە لە زەمانێكدا بووە كە هێشتا لە ئەنجوومەنی حوكم بووین، ئەوە پێش ئەو زەمانە وابوو كە هێشتا ئەنجوومەنی حوكم مابوو سەبارەت بە رۆلی من، بڕیار وابوو بەلآم كە بە قسەیان نەكردم خۆ ناچم شەڕ بكەم.

گولآن: جارێك نووسیبووت كەركوكمان نەدۆڕاندووە.

نەوشیروان :ئێستاش باوەڕم وایە نەماندۆڕاندووە.

گولآن: بەلآم كەركوكیش نایەتەوە سەر هەرێمی كوردستان.

نەوشیروان : بۆ نایەتەوە؟

گولآن: لەبەرئەوەی نە كورد ئەو توانایەی هەیە و ئێمەش لە ناو چەند ولآتێكداین كە خنكێنراوین هەر ئەوەندەیە هەناسە دەدەین. ئەو ولآتانەش تەحەكوم بەسەر هەموو حوكمڕانیەكانی عێراق دەكەن.

نەوشیروان :من بۆچوونم وا نییە، ئەگەر كورد بیەوێت نەخشەیەكی هەمەلایەنەی هەبێت، پشوو درێژبێت من باوەڕم وایە دەتوانین كەركوك و ناوچە دابڕاوەكانی تر بهێنینەوە سەر هەرێمی كوردستان. مەرجیش نییە ئەم سالّ.

# کەرکوکمان نەدۆڕاندووە

***"کورد نەیتوانی نموونەیەکی باش بدات بە نەتەوەی تورکمان و نەتەوەی عەرەب لە کەرکوکدا"***

**دیمانە: رادیۆ نەوا**

**سەبارەت بە دوا گۆڕانە سیاسییەکانی پەیوەندی کورد و بەغدا و یاسای پەسەندکراوی هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی پارێزگانی عێراق و سەرجەم ئەو ململانێیانە دوای پرۆسەی ئازادی عێراق سەرکردایەتی کوردی لە بەغدا پێیدا تێپەڕبووە و ئەو مافە دەستوریانەی کورد کە لە دەستوری عێراقدا چەسپیوە و ئەو رێکەوتنانەی کە سەرکردایەتی کورد لەگەڵ سەرکردەی لایەنە سیاسییەکانی عێراق هەیەتی و چەند مەسەلەیەکی تری پەیوەست بە کوردەوە، رادیۆی نەوا دیمانەیەکی لەگەڵ نەوشیروان مستەفادا سازکرد، کە ئەمە دەقەکەیەتی. . .**

*** هەرکاتێك باسی کەرکوك بکەین لەدوای پرۆسەی ئازادیی عێراقەوە، ناتوانین هەردو مادەی ١٤٠و ٥٨ فەرامۆش بکەین، جێبەجێنەکردنی مادەی ١٤٠ وەکو ئیستیحقاقی هەڵبژاردن لای تۆ چ سورەتێك دروستدەکات؟**

**نەوشیروان مستەفا: لە راستیدا یەکێك لە هۆیەکانی ئەوەی کە هاوپەیمانی کوردستانی موافەقەتی نەکرد لەسەر ئەوەی کە دکتۆر جەعفەری درێژە بە ئیشەکانی بدا وەکو سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران لە عێراقدا، ئەو تەقصیرە بو کە درایە پاڵی سەبارەت بە جێبەجێنەکردنی مادەی ١٤٠ی دەستوری عێراقی، هاوپەیمانی کوردستانی بەو مەرجە لەگەڵ نوری مالیکیو لیستی ئیئتلاف**

یەکگرتوو ڕێککەوتن کە جەدوەلێکی زەمەنی دابنرێت بۆ جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ی دەستوری عێراقیو جەدوەلە زەمەنییەکە وایان دانا تا کۆتایی ساڵی ٢٠٠٧ جێبەجێ بکرێت.

نوری مالیکی کە هەڵبژێردرا بە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران، هاوپەیمانی کوردستانی بەو مەرجە موافەقەتی کرد ببێتە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران لەو ماوەیەدا ئەو مادەیە جێبەجێ بکات، وەکو گەرەنتییەکیش بۆ جێبەجێکردنی ئەومادەیە ڕێککەوتنێك ئیمزاکرا لەبەینی لیستی هاوپەیمانی کوردستانیو لیستی ئیئتلاف یەکگرتووی شیعە، بە گوێرەی ئەو ڕێککەوتنە هەرکاتێك وەزیرە کوردەکان بکشێنەوە لە وەزارەتەکەی، ئەوساکە حکومەتەکەی نوری مالیکی بە هەڵوەشاوە حساب بکرێت. نوری مالیکی یاخود لیستی ئیئتلاف یەکگرتوو، کە زۆرایەتییان هەیە ئەبوو بڕۆنەوە بۆ بەردەمی پەرلەمان سەرلەنوێ دەستبکەن بە گفتوگۆ لەگەڵ هەمو کوتلە پەرلەمانییەکانی ترو لەگەڵ گروپەکانی تردا، بۆئەوەی وەزارەتێکی تازە پێکبهێنن. ئەم مەرجەی کە لیستی هاوپەیمانی کوردستانی دایناب‌وو بۆ بەشداریکردن لە وەزارەتەکەی نوری مالیکی نە کوتلەی سەدریو نە تەوافوقو نە حیزبی فەزیلە ئەم ڕێککەوتنەیان نەبو لەگەڵ نوری مالیکی، تەنیا لیستی هاوپەیمانی کوردستانی هەیبو.

من بەداخەوە ئەڵێم کە کوتلەی کوردی لە وەزارەتەکەی نوری مالیکی نەیتوانی بەچاکی ئیستیفادە لەم چەکە قانونییو سیاسیە بکات، کە ڕێککەوتنێکی بەینی ئەو دوو کوتلەیە بوو، ئەمەیان بکردایە بەهۆیەك بۆ پەلەکردن لە جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ لەکاتی خۆیدا بۆئەوەی ئیلتیزامی هەبوایە بەرامبەر بەوەی کاتی خۆی لەسەری ڕێککەوتبون.

* بەو ئیعتیبارەی کە حیزبی دەعوەی ئیسلامی عێراقی بەشێکە لە لیستی ئیئتلاف یەکگرتوو، ئەوانیش لە ڕێککەوتنەکەدا هەبوون، ئایا مولزەم بوون پێوەی؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ هەموویان، چونکە ئەو ڕێککەوتنە لە نێوان هاوپەیمانی کوردستانی بە هەموو لایەنەکانیەوەو ئیئتلاف یەکگرتوو بە هەموو لایەنەکانیەوە بوو.

*کاك نەوشیروان، کاتێك تێبینی دەکەین کە نە عەلاوی، نە جەعفەری، نەمالیکی، کە سێ کەسایەتی جیاوازن‌و سەر بە سێ ئینتیمای تا رادەیەك جیاوازن لەسەر ئاستی عێراق، لە سەردەمی دەسەڵاتی هەر سێکیاندا ئەم مادەیە جێبەجێنەکراوە، ئەمە پەیوەندی بە شەخسێکەوە نیە بەڵکو بارودۆخی عێراق ئەو زەمینەیەی جێبەجێکردنی ئەو مادەیەی نەبوە؟

نەوشیروان مستەفا: رەنگە کۆمەڵێك هۆکاری هەبن یەك هۆکار نەبێت، رەنگە کەگلەیی لە وەزیرەکانی عەرەب یان لە سەرۆکی وەزیران بکەین‌و بڵێین عێراق کێشەی زۆرەو نەمان پەرژاوەتە سەر ئەو، ئەولەویاتی جیاوازە، بەلاّم لە راستیدا میللەتان بە هیچ جۆرێك دەست لە ئەرزی خۆیان هەڵناگرن، تەنانەت وڵاتێکی وەکو ئیسرایل کە گۆلانی داگیرکردوەو هەندێ زەوی داگیرکردوە دوای ساڵی ١٩٦٧و دوای ١٩٧٣ ئامادەنیە بە خۆشی دەستی لێبەربدات، ئەوا لەکاتێکدا ئەرزی خۆی نیەو وازی لێناهێنێت. ئەمانیش وەکو پارچەیەك لەعێراق بڕواناکەم ئەگەر زەختی کوردیان لەسەر نەبێت هیچ کەسێك لەوانەی کە عەرەبن ئامادەنین بەئاسانی دەست لە هیچ پارچەیەکی کەرکوك یان خانەقین یان سنجار یان هیچ جێگایەکی تر هەڵبگرن، بەلاّم دەبێت کورد خۆی سوربێت لەسەر ئەوەی کە چۆنی وەردەگرێتەوە. رێگەوشوێن دابنێت، نەخشە دابنێت، خەڵکی بۆ تەرخان بکات، پلانێك دابنێت بۆئەوەی کە ئەو ناوچانە چۆن وەردەگرێتەوەو دەیهێنێتەوە سەر هەرێمی کوردستان. میللەتانی دنیا بۆ نمونە قەتەرو عەرەبستانی سعودیە کە هەردوکیان عەرەبن لەسەر ناوچەیەکی بچوك کەجێی مەخفەرێکی پۆلیسی تیایە ناکۆکن، بەینی ئیمارات‌و سعودیە ناکۆکیی تیایە لەسەر سنور، بەینی هەمو میللەتی عەرەب‌و ئێران ناخۆشە لەسەر سێ دورگەی چۆڵ کە کەسی تیاناژی، ناکۆکی بەینی مەغریب‌و ئیسپانیا لەسەر

دورگەیەکە دە قاچاخچی بەکاری دەهێنێت. جاری واهەیە ئەو ناکۆکیانە بۆ نمونە لە یۆگسلاڤیای پێشوودا دو نەتەوە شەڕیان کرد لەسەر جادەیەك ئەو دەیوت ئەو جادەیە هی منەو ئەوی تریان دەیوت هی منە، مەبەستم ئەوەیە وا بە ئاسانی عەرەب لە عێراقدا دەست لە کەرکوكو شوێنەکانی تر هەڵناگرن. لەبەرئەوە کوردیش دەبێت دەستی لێهەڵنەگرێت، بەڵام ئەوەی دەبێت سوربێت لەسەری کوردە، بۆئەوەی سود لە زەماناتی دەستوری، لە زەماناتی قانونی بکات، لە رێککەوتنەکانی نێوان خۆیو گروپەکانی تر بکات بۆئەوەی فشارێکی قانونیو سیاسی دروستبکات، بۆئەوەی وەرەقەکانی خۆی هەمو بەکاربێنێت بۆئەوەی ناوچەکان وەربگرێتەوە.

* هەندێکجار ئەو تەئویلانە موقنعین، قسە لەسەر بارودۆخی خۆی دەکرێت، بە درێژایی ئەم چەند ساڵەی رابردو لە تەنگژەیەکی گەورەی ئەمنیدا بوە، قسە لە دەستوەردانی ئیقلیمی دەکرێت لەسەر مەسەلەی کەرکوك، فیعلەن دەستوەردانی ئیقلیمی زۆر هەیە، بەڕای جەنابت ئەو پاساوانەی حکومەتە یەك لەدوایەکەکانی عێراق چەندیان لە شوێنی خۆیدایە؟

نەوشیروان مستەفا: بۆ من موقنیع نیە، ئەگینا ئەو ئیدارەیەی حکومەتی عێراقی لە ماوەی پێنج ساڵی رابردو، دەیانتوانی هەندێ ناوچە بخەنەوە سەر هەرێمی کوردستان، بۆ خۆشیان واباشتر بو بۆ نمونە، هەرێمی کوردستان هەرێمێکی جێگیرە لە روی ئەمنیەوە، لە روی ئابوریەوە، لە روی سیاسیەوە، هەر بۆ قازانجی دانیشتوانی کەرکوكو خانەقینو سنجار واباشبو کە ئەوانە لەسەر هەرێمی کوردستان بونایە، وەکو چۆن سلێمانیو هەولێرو دهۆك لە بارێکدا دەژین کە جۆرێك لە گەشانەوەی ئابوری تیایە، سەقامگیریی تیایە، تیرۆرو دەسەڵاتی تیرۆریستەکانی تیانیە، دەکرا ئەوساکە حکومەتی هەرێمی کوردستان بتوانێ دەستەبەری ئەمنو ئاسایشی ئەو ناوچانەیش بکات، ئەوە لەکۆڵ حکومەتی عێراقیش دەبوەوە کە ئەوان مەجبور بن دایمەن لەشکرکێشی

بکەن‌و هێز بنێرن‌و داوا لە ئەمەریکا بکەن تەدەخول بکات‌و ئەو جۆرە شتانە بکات.

* سەبارەت بە واقیعی ئێستای کەرکوك، ئەگەر لە روی ئیداریەوە سەیری بکەین سەر بە حکومەتی مەرکەزیی فیدراڵی بەغدایە، خەڵکی زۆری کورد لەم شارەدا دەژین، لە واقعدا خۆی شارێکی کوردنشینە، ئەو جیاوازیە گەورەیە چیە ئەگەر کەرکوك لەسەر هەرێمی کوردستان بێت یان سەر بە مەرکەز بێت؟

نەوشیروان مستەفا: یەکەمینیان ئەوەیە ئەو زوڵمە گەورەیەی لە کورد کراوە بە درێژایی چەندەها ساڵی رابردو، کورد لەوێ دەربەدەرکراوە، راونراون، زەویەکانیان داگیرکراوە، خانویان داگیرکراوە، بێبەشکراون لە ئیشوکار لەوناوچانە، کورد وەکو هاوڵاتییەکی عێراقی مافەکانی بۆ دەگەڕێتەوە، بێجگە لەوە بە راستی دەمەوێت سەرنجی خوێنەران رابکێشم بۆ ئەوەی کە بایەخی کەرکوك‌و ناوچەکانی بە تەنیا لە نەوتدا نیە، ئەگەر کەسێك نەخشەی عێراق بێنێتە بەرچاوی خۆی، ئەگەر هەرێمی کوردستان کەرکوکی لەسەر نەبێت، سلێمانی‌و هەولێر بە تایبەتی لە نێوان سنوری کەرکوك‌و سنوری ئێران وەکو سەندویجی لێبەسەردێت، یانی ئەگەر کەسێك لە هەولێرەوە ویستی هاتوچۆ بکات، بۆ بەغدا بۆ تکریت، بۆ باشوری عێراق یاخود کەسێك لە سلێمانیەوە ویستی بڕوات بۆ بەغدا بۆ تکریت بۆ باقوبە بۆ شارەکانی تری عێراق لەکوێوە هاتوچۆ دەکات یانی ئەوساکە ئەگەر بڵێین بەدەست ئیدارەیەکەوە بێت کە ئیدارەکەی رۆژێك لە رۆژان ناکۆکی هەبێت لەگەڵ هەرێمدا وەکو چۆن ئێمە زۆرجار توشی ناکۆکی دەبین لەگەڵ ئێراندا سنورمان لێدادەخەن، یان لەگەڵ تورکیا سنورمان لێدادەخەن، جاروبار لەگەڵ موسڵدا سنوردادەخەن، ئەگەر ئەوانیش سنورمان لێدابخەن خەڵکی ئەم ناوچەیە لەکوێوە هاتوچۆ بکات، مەبەستم ئەوەیە بایەخی ناوچەی کەرکوك بە تەنیا لەبەرئەوە نیە، کەرکوك شوێنێکە قوڵاییەکی ستراتیژی‌و قوڵاییەکی جوگرافیە بۆ هەمو کوردستانی

عێراق، کەرکوك کوردستانی عێراق دەبەستێتەوە بە هەمو عێراقەوە، لەبەرئەوە بایەخێکی زۆر گەورەی هەیە بۆ میللەتەکەی ئێمە.

* کاك نەوشیروان لە نەخشەی سیاسی ئێستای عێراقدا کێن ئەوانەی غەیری کورد، لەگەڵ جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠دایە، لەگەڵ خوێندنەوەی ئیرادەی خەڵکی کەرکوکدایە؟

نەوشیروان مستەفا: قسەیەکی زۆر بەناوبانگی چەرچل هەیە دەڵێت: نەدۆستی دایمی هەیە، نە دوژمنی دایمی هەیە بەڵکو بەرژەوەندی دایمی هەیە، ئەگەر ئێمە چاوێك بخشێنین بەو جۆری پەیوەندیەی جولانەوەی کوردو جولانەوە سیاسییەکانی تری عێراق لەماوەی بیست ساڵو بیستو پێنج ساڵی رابردودا جاروبار جێگۆڕکێ کراوە، لە کۆنگرەی لەندەنو لەگەڵێك شوێنی تردا کاتی خۆی کەباسی کەرکوك کراوە زۆر لەو هێزە عەرەبییانەی کەئێستا لەعێراقدا دەسەڵاتدارنو لەحکومەتی عێراقدا بەشدارن قبوڵیان بوە بەوەی کەرکوك وەك بەشێك لەکوردستان بگەڕێتەوە سەر هەرێمی کوردستانو مەسەلەی تەعریبی تیانەمێنێو کورد بەمافی خۆی بگات، بەڵام ئێستا ئەوانە دەسەڵاتدارن وەکو باسیشم کرد، هیچ میللەتێك لە دنیادا ئامادە نیە بە ئارەزوی خۆی دەست لە بستێك ئەرز هەڵبگرێت کە دەستی بەسەرداگرتوە، ئەوانەیش عەینەن بابەت، جاران کە موعارەزە بون ئەیانسەلماند بۆ کورد کە بەڵێ کەرکوك شارێکی کوردستانیە یان کوردیە یا شارێکی عێراقیە، بەڵام تابیعێکی کوردی هەیەو ئێستا بەشێك لەوانەیش پەشیمان بونەتەوە ئەگەر بە ئاشکراش پەشیمان نەبوبنەوە لە راگەیاندنەکانی خۆیانەوە لەکاتی دەنگدانو موناقەشەی ناو ئەنجومەنی نوێنەران تا ئەندازەیەکی زۆر پەشیمانییان پێوەدیارە. کورد میللەتێکی دڵسافو تا رادەیەك ساویلکەیە ئەگینا ئەو کاتەی کە هێزە سیاسیەکانی عەرەب لە عێراقدا زەعیف بون دەبوایە کورد ئەو زەمانە مەرجەکانی خۆی بەسەریاندا بسەپاندایە، چونکە رۆژ بە رۆژ لەدوای روخانی

سەدامەوە هەندێك لەو هێزانە بەهێزتر بون لەچاو جاران، کە وەختێکیش بەهێزتر بو کەمتر داواکانی تۆ قبولْ دەکاتو بەدەم داواکانی تۆوە دێت.

* دەوترێت لەکاتی ئازادکردنی عێراقدا ئەمەریکیەکان هەندێك رێنمایو مەرجیان هەبوە، رێگرییان لە دەسەلاتی کوردی کردوە لەوکاتەدا ئەو هەلۆێستەی کە توانیویەتی لەخانەقیندا هەیبێت لە کەرکوك بیبێت؟

نەوشیروان مستەفا: ئەمەریکاییەکان چیان کردوە، چەند کوردیان لەوێ کوشتوەو چەندجار کردەوەی سەربازییان کردووە، تاوەکو ئێمە ئەمەریکاییەکان تۆمەتبار بکەین؟

* رەنگە سەرکردایەتی سیاسی کوردیان ئاگادار کردبێتەوە لەوەی لە سنورێکی دیاریکراودا بوەستنو مەیەنە ئەم شارەوە، گرەنتیەك بۆ هەرێمەکەی خۆتان؟

نەوشیروان مستەفا: ئەگەر نەیانکردایە چیان لێدەکردن؟ بەپێچەوانەوە لە سالانی یەکەمی دوای روخانی سەدام حسێندا کورد کۆلەکەیەکی سەرەکی بو لە پرۆسەی سیاسی لە عێراقدا، ئەمەریکا پێویستی بە کورد بو، چونکە لە عێراقدا جارێك سوننە بەشی هەرەزۆریان دژی ئەمەریکا بون، شیعە بەشێکی زۆریان بەهۆی ئێرانو بەهۆی ئەو رابردووەوە کە هەیان بو لەگەلْ ئەمەریکا لە راپەرینی رابردودا ئەمەندە لەگەلْ ئەمەریکا کۆك نەبون، تەنیا هێزی کەرکوك بو لەگەلْ ئەمەریکاییەکاندا کورد بو، قابیلە شەڕ ئەبو لەنێوان ئەمەریکاو کوردا، رەنگە هەندێك ناکۆکی سیاسی ئەبو، لەملاوە فشار دروست دەبو، هەندێك شتی لەو بابەتانە دەبوو، بەلام بڕواناکەم ئەگەر ئێمە سور بوینایە لەسەر هەندێك هەلۆێست پێموایە دەمانتوانی بیچەسپێنین.

* سەبارەت بە واقیعی ئێستای کەرکوك، قۆناغی ئاساییکردنەوە قۆناغی یەکەمی جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ بو، بەڕای جەنابت مەبەست لێی چەسپاندنی هەندێ مافو گەڕانەوەی ئاوارەکان بێت، ئەمرۆ عەرەب هاواری لێهەستێت بەرامبەری؟

نەوشیروان مستەفا: دەبێت لێرەدا دان بە راستیەکدا بنێم ئەویش ئەوەیە کە لەدوای روخانی سەدام کورد نەیتوانی نمونەیەکی باش بدات بە نەتەوەی تورکمانو نەتەوەی عەرەب لە کەرکوکدا، نمونەیەك لە حوکمڕانی باش، نمونەیەك لە رەفتاری باش لە کەرکوك لەگەڵ نەتەوە بچوکەکانی کەرکوکدا، چونکە لەدوای روخانی سەدامەوە رەنگە کورد هێزێکی گەورە بوبێت بەتایبەتی لە کەرکوکدا، حکومەتی هەرێم پشتیوانی بوە هەم قولاییەکی ستراتیژییان هەبوە لەوکاتەی کە بۆشاییەکی سیاسیو حکومەتی گەورە لە عێراقدا دروست بو بو، بۆشاییەکی ئەمنی دروست بو بو، کوردی کەرکوك پشتیوانێکو قولاییەکی ستراتیژییان هەبو کە بریتی بو لە حکومەتی هەرێمی کوردستان، ئەو ئیدارەیەی کە لە کەرکوکدا دروستبو، لە راستیدا ئێمە نە لە روی ئابوریەوە نە لە روی کۆمەلایەتیەوە، نە لە روی سیاسیەوە، نە لە روی قانونیەوە، نە لە روی ئیداریەوە نمونەیەکی ئەوەندە باشمان لە کەرکوکدا جێگیر نەکرد کە ببێتە مایەی راکێشانی سەرنجی تورکمانو عەرەبو مەسیحیەکان، هەر بۆ نمونە باسی بکەین لە شوێنێکی وەکو کەرکوکدا هەر لە سەرەتاوە لەدوای هەلبژاردن، سەرۆکی ئەنجومەنی پارێزگا کوردە، پارێزگار کوردە، سەرۆکی شارەوانی کوردە، قایمقامی قەزا کوردە، بێجگە لەوەی ژمارەیەك زۆر لە سەرۆکی دەزگا پۆلیسیو ئەمنیەکانو دەزگا ئیداریەکانی تر هەموی کوردەو لەوانە بەشی تورکمانیان نەدا، من خۆم جارێکیان لەگەڵ کابرایەکی تورکمان گفتوگۆمان بو لەسەر ئەوە وتی: ئێوە هێشتا کەرکوك نەکەوتوەتە ژێر دەسەلاتی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە، بە من هیچ رەوانابینی هیچ پۆستێك لە پۆستە گرنگەکانی حکومەتم بدەیتێ، بە منی رەوانابینی لە تەندەرو قۆنتەراتو لە ژیانی ئابوریدا بمکەیت بە شەریك، بە من رەوانابینی لە دامودەزگای ئاسایشو پۆلیسو ئەوانی تر بمکەیت بە شەریك، لە هەمو دامودەزگایەکی تر، ئێستا دەسەلاتتان لێرەنییە ئەگەر هاتمە سەر هەرێمی کوردستان ئەوسا چ گەرەنتیەك، چ زەمانێك هەیە بۆئەوەی تۆ حقوقی من بپارێزیت، پێموایە ئێمە

بەداخەوە لەوەدا سەرکەوتو نەبوین، کە نمونەیەکی باشی حوکمڕانی لە کەرکوك دابمەزرێنین.

* دەوترێت دەسەڵاتی سیاسی کورد بە راستی لە هەرێمی کوردستاندا نەیتوانیوە ئەزمونێکی زۆر باشی حوکمڕانی پێشکەش بکات بە حوکمی ئەوەی لە ڕوی ئیداریو یاساییەوە، کەرکوك سەر بەم حکومەتە نیە تا بتوانێت بە رێساو رێنماییەکانی حوکمڕانیەکی باش پێکبهێنێت، ئەو بەرپرسیارێتیە لەسەر حکومەتی هەرێم نیە؟

نەوشیروان مستەفا: حکومەتی هەرێم بەرپرسیارێتیەکی گەورەی لەسەرشانە، حکومەتی هەرێم دەیتوانی یەك پەروەردە دروست بکات، یەك ئاسایش دروست بکات، یەك دامودەزگا دروست بکات لە کەرکوك، بەڵام لە کەرکوك حکومەتەکەی هەولێر بۆ خۆی دامودەزگایەکی دروستکردوەو حکومەتەکەی سلێمانیش دامودەزگایەکی دروستکردوە، تەنانەت دو پەروەردە هەیە بۆ خوێندن، دو دەزگای ئاسایش هەیە، هەندێك لەو فەرمانگانە دوانەیە کە لە راستیدا ئەمە نمونەیەکی باش نییە بۆ غەیری کورد، رەنگە کورد ئەوەی قبوڵ بێت بەلایەوە شتێکی ئاسایی بێت، بەلام بەلای کەسێکی ترەوە دەڵێت کوردەکان لەنێوان خۆیاندا رێکنەکەوتون لەسەر ئەوەی یەك دەزگای ئاسایش دروست بکەن، یەك پەروەردە دروست بکەن، یەك دادگا دروست بکەن، یەك فەرمانگە دروست بکەن، رێکناکەون لەناو خۆیاندا لەسەرئەوەی کە کێ پارێزگار بێت، کێ سەرۆکی ئەنجومەنی پارێزگا بێت، ئەمە نمونەیەکی باش نیە. لە کەرکوك کێبڕکێی حیزبی تا ئەندازەیەکی زۆر ئینتیباعێکی خراپی داوە بە نەتەوەکانی تر، دەبوایە لە کەرکوك هەمو حیزبەکان پێش ئەوەی کە حیزبایەتی بکەن، جۆرێك لە مەسەلەی کوردایەتیو وەلائی نیشتمانیو جۆرێك لە بە هاوڵاتیبونی پێشکەوتوانەیان پیشانبدایە نەك ئەو جۆرە وەلائە تەسکە حیزبیانەی کە بوە بەهۆی کێبڕکێ لەنێوانیاندا.

* پێتوایە لەبەر رۆشنایی دابەشبونی‌و عیرقی‌و سیاسیی لە عێراقدا کورد هەرچیەك بکات، هەرچی ئیدارەیەکی نمونەیی لە کەرکوك پێشکەش بکات بتوانێت ئینتیمای تورکمان‌و عەرەب رابکێشێت بەلای خۆیدا، قەت بوە لە مێژودا عەرەبەکان یان تورکمانەکان متمانە بە شۆڕشی کورد بکەن؟

نەوشیروان مستەفا: پێموایە مومکینە، مومکین بو، لێرەش بەدواوە مومکینە، ئەگەر کورد، سەرکردایەتی کورد بتوانێت نەخشەیەکی هەمەلایەنە دابنێت لەپێش هەمو لایەنێکدا بۆ رازیکردنی کوردەکانی کەرکوك، بۆ رازیکردنی تورکمانەکان، بۆ رازیکردنی عەرەبەکان ئەگەر نەشتوانێت هەمویان رازی بکات ئەوە هەر بە شیعرو قسەی خۆش نابێت بڵێیت شاری برایەتی، بەڵکو دەبێت تۆ زەماناتی قانونی‌و دەستوری بدەیت بە تورکمان‌و بە عەرەب‌و مەسیحیەکان، دەبێت خزمەتگوزارییان پێشکەش بکەن، دەبێت نمونەیەکی باشیان پێشکەش بکەن، مفاوەزات لەگەڵ هێزە راستەقینەکانی عەرەب‌و تورکمان بکرێت، لەگەڵ ئەوانەی تا رادەیەك نوێنەرانی ویستی نەتەوەیی ئەو نەتەوانە دەکەن، وەختێك بو ئێمە خۆمان کە مامەڵەمان دەکرد لەگەڵ حکومەتی مەرکەزیدا ناڕەحەت دەبوین، دەبێت ئەو ئەزمونەی کە حکومەتی عێراق لەگەڵ کورددا بەکاری هێناوە بە هیچ جۆرێك لەگەڵ تورکمان‌و عەرەبەکان‌و مەسیحیەکانی کەرکوکدا دوبارەی نەکەینەوە.

پێموایە ئەگەر نەخشەیەك دابنێین، ئەو نەخشەیە لایەنێکی ئابوری بێت، لایەنێکی سیاسی بێت، لایەنێکی یاسایی بێت، لایەنی جیاجیای هەبێت، لەسەر بنەمای هاوڵاتیبونی خەڵکی کەرکوك بێت، تۆ بیهێنە بەرچاوی خۆت تورکمان لە سەرتاسەری عێراقدا ژمارەیان ملیۆنێك یان کەمتر لە ملیۆنێك بن، ئایا بۆ تورکمان ئەگەر وەکو بەرژەوەندی نەتەوەیی بچکۆلە لێکیبداتەوە، قازانجی ئەو لەگەڵ چوار ملیۆن کورددایە یان لەگەڵ ٢٥ ملیۆن عەرەبدایە، بێگومان ئەگەر لەگەڵ چوار ملیۆن کورددا بێت، دەبێت بە هێزێکی گەورە دەتوانێت لە هەمو دامودەزگاکانی هەرێمی کوردستان بەشی هەبێت، دەتوانێت

لـه مەجلیـسی تەشـریعی، لـه وەزارەت، لـه دەزگـای قـەزایی، لـه پـۆلیس لـه پاسەوانی سنور، له ئاسایش، لە ئابوری، لە هەمو بوارەکان دەتوانێت بەشی هـەبێت، بـەڵام کاتێـك کـەمتر لـه یـەك ملیـۆن کـەس دەچێتە سـەر ٢٥ ملیـۆن لـه نەتەوەیەکی جیاواز ئەگەری ئەوە هەیە هەر گوم ببێت لەو قەرەباڵغییە.

* ئێمە کێشەی راستەقینەمان له کەرکوك لەگەڵ تورکمانە یان لەگەڵ عەرەبە؟

نەوشیروان مستەفا: بەبیروبۆچونی من لـه کەرکوکدا کێشەی راستەقینەی ئێمـه نه لەگەڵ عەرەب بوە، نه لەگەڵ تورکمان بوە، بەڵکو لەگەڵ ئەو رژێمانـه بوە کـه حوکمیـان کـردوە، ئێـستاش ئێمـە ئەگـەر لێکیبدەینـەوە لـه راسـتیدا کێـشەی نەتەوەییمان نه لەگەڵ تورکمان هەیە، نه لەگەڵ عەرەب هەیە، بەڵام ئەگەر بێیتە سەر هەڵسەنگاندنی ستراتیژی، رەنگە تورکمـان زۆر ئاسـانتر مامەڵەی لەگەڵدا بکـەیت، چونکه تورکمـان بـه ژمـارە کـەمترن لـه عـەرەب، لـه روی جوگرافیـشەوە چەند سەد کیلۆمەتر دورن له تورکیاوە، بەڵام عـەرەب لـه عێراقدا بێجگە لـەوەی بـه ژمـارە زۆر زۆرن، قوڵاییـان هەیـه لـه عێـراق نزیکـەی ٢٠ ملیـۆن عـەرەب لـه پـشتیانەوە هەیـه لـەدوای ئەوانیـشەوە، بـەرەوژوری ٣٠٠ ملیـۆن لـه جیهـانی عەرەبیـەوە بـه ناوچـەکەی ئەوانـەوە بەسـتراوە. لـه بنەڕەتـدا لـەنێوان تورکمـان‌و تورکیا سنوری هاوبەش نیە، لەبەرئەوە ئاسانە لەگەڵ تورکمانەکاندا جۆرێك لـه لەیەکگەیـشتن بدۆزرێتـەوە کـه مـافی ئـەوان پارێزراوبێـت، هەنـدێ زەمانـاتی دەستوری‌و قانونی‌و سیاسیان بدرێتێ. پێموایە ئەگەر گفتوگۆیان لەگەڵ بکرێت دەتوانرێـت سـەرئەنجام تورکمانـەکانی کـەرکوك قایـل بکرێـت بـەوەی لەگـەڵ هـەرێمی کوردسـتان‌و لەگـەڵ کـورددا بژین. بـەڵام ئەگـەر نـەمانتوانی عەرەبـەکان قایـل بکـەین ناوچـەکانی ئـەوان دیـاریکراوە، کێـشەی تورکمانـەکان ئەوەیـە لـه ناوچەی پچڕ پچڕو پەراگەندە دەژین، بە پێچەوانەی عەرەبەوە کـه هـەمو چڕیی دانیشتوانیان هەیەو لە ناوچەی حەویجەو ریاز دەژین کە دەکرێت پارێزگایەکی تری لێدروست بکرێت، یان بخرێتە سەر تکریت یان بخرێتە سەر موسڵ. ئەگەر خۆیـان پێیـانخۆش بێـت بخرێنـه سـەر موسڵ، بـه ئاسـانی ئـەو کـارە دەکرێـت،

بخرێتـه سـەر تكـريتيش دەتـوانن بەئاسـانی بـبن بـه بەشـێك لـەپارێزگای سەلاحەدین. بشیانەوێت ببن بە پارێزگایەكی سەربەخۆ دەتوانن، بەڵام توركمان لـەلای تەلەعفـەرەوە بەپـەرش‌و بـڵاوی دەژیـن تـا دەگاتـە لای مەنـدەلی، راسـتە هەندێك قەرەباڵغی‌و چڕی دانیشتوانیان هەیە لـە كـەركوك‌و هەنـدێك جێگـای تـر، بـەڵام لـە زۆر جێگـە تێكـەڵاون لەگـەڵ عـەرەب‌و كـورددا. عـەرەب ئـەو حاڵەتـەيان نییـە، عـەرەب بەشـی زۆری ئـەو ناوچانـەی كـە تیایـدا دەژیـن، خۆیـان زۆرینـەی گەورە پێكدەهێنن.

* بۆچونێك هەیە كە پێی وایە دەنگدانی بەشێك لە ئەندامانی پەرلـەمانی عێـراق لەسـەر یاسـای هەڵبـژاردنی پارێزگاكـان بەتایبـەتی مـادەی ٢٤ سـەحوەیەكی عەرەبیـە بەرامبـەر بـەو پێشێلكاریانەی لـە كەركوكـدا دەكـرێن، ئەمـە ئەگـەر بـە دیـوێكی تـردا لێكـی بدەینـەوە هاوارێكە بەتایبـەتی هـاواری عەرەبـە سوننەكان بەرامبـەر واقیعـی ئێـستای كـەركوك بـەو دیـودا لێكـی بدەینـەوە لـە پێـنج سـاڵی رابردوودا، كورد لە كەركوك واقیعێكی دروستكردوە هاواریان لێ هەڵبستێنێت، ئەمـەش ئـەوە دەگەیـەنێت ئەگـەر سـەركردایەتی كـورد وەكـو تـۆ دەڵێیـت نـەیتوانیبێت هەڵـسوكەوتی بـاش بكـات، بـەڵام توانیویـەتی واقیعێكـی نـوێ بهێنێتـە كایـەوە، ژمارەیـەكی زۆری كـوردی گەڕاندوەتـەوە، كـە ئێـستا عـەرەب هاواری لێهەستاوە؟

نەوشیروان مستەفا: من نازانم تا چەند واقیعێكە وایە، بەڵام هێشتا ژمارەیـەكی زۆری كـوردی كـەركوك هەیـە لـە هـەولێرو سلێمانی‌و لـە سەرتاسـەری دنیـا كـە نەگەڕاونەتەوە بۆ كەركوك، دەتوانم بڵێم سەدان هـەزار لە سلێمانی دەژیـن بـوون بە بەشێك لە كۆمەڵگای سلێمانی، یان لـە هـەولێر دەژین‌و بوون بە بەشێك لـە كۆمـەڵگای هـەولێری. دەیـان هـەزار كـەركوكی تائێـستا لـە ئـەوروپا دەژیـن، نەنفوسـیان بردوەتـەوە بـۆ كـەركوك‌و نـە گەڕاویشنەتەوە یـانی ئـەو ژمارەیـەی گەڕاوەتـەوە لەچـاو ژمارەی راستەقینەی كوردی كەركوكدا تەواونیەو كـەمترە، پێشموایە پەیوەندی بەو ناڕەزاییی‌و دەنگدانەوە نیە كە لە پەرلەمان كراوە.

* لە دەنگدان بە مادەی ٢٤ی یاسای هەڵبژاردنەکاندا ئەتوانین بڵێین ئایا ئەوە حەقیقەتی ئیرادەی عەرەبە یان حەقیقەتی واقعی تەوافوقاتی سیاسیە لە عێراقدا؟

نەوشیروان مستەفا: ئەتوانین بڵێین هچیان نەبوو، ئەوە گەمەیەکی دیموکراتیانە بو، ئێمە لە وڵاتێکدا ئەژین ئەبێت پێمانخۆش بێت لەناو پەرلەماندا گەمەی دیموکراتی هەبێت. ئەوەی رویدا ئەوە مانای ئەوە نیە کە ئێمە دۆستە عەرەبەکانمان دۆڕاندوە، ئەوەش بە دەلیلی ئەوەی کە نوێنەری کورد لە ئەنجومەنی سەرۆکایەتیدا کە مام جەلالە، رەفزی یاساکەی کرد، عادل عەبدول مەهدی کە نوێنەری مەجلیسی ئەعلای ئیسلامیەو نوێنەری بەشێکی زۆری عەرەبی شیعەیە، یاساکەی رەفز کردۆتەوە. سەید عەبدولعەزیز حەکیمیش گلەیی لە پەرلەمانتارەکانی خۆی کردوە کە لەناو هۆڵەکەدا ماونەتەوەو ئەویش هەر رەفزی کردووە. ئەوەش نیشانەی ئەوەیە ئێمە دۆستەکانی خۆمان نەدۆڕاندوە، چونکە هەردو باڵەکەی مەجلیسی ئەعلاو هەندێك لە بێلایەنەکانی عەرەب لەگەڵ ئەوەدا بون چاو بە مادەکەدا بخشێنرێتەوە.

عێراقی دوای سەدام حوسەین لەسەر دو بنەمای سەرەکی دامەزراوەتەوە، یەکێکیان سیستەمی (موحاصەصە)یە کە لە زۆر لاوە هێرشی دەکەنە سەر. بنەمای دوەمیش سیستەمی تەوافوقیە کە لە ئەنجامی موحاصەصەکە، تەوافوقە سیاسیەکەش هاتۆتە پێشەوە.

نیزامی موحاصەصە، ئەوەی پێی دەوترێت (کۆتا سیستەم) ئەوە بوە بە سەبەبی ئەوەی کە سێ دەسەڵاتە باڵاکەی عێراق (سەرۆکایەتی کۆمارو پەرلەمانو وەزیران)، یەکێکیان کورد بێتو یەکێکیان شیعە بێتو ئەوی دیکەشیان سونی بێت. هەر یەکێك لەو سەرۆکانە دو جێگری هەیە لە نەتەوەو مەزەهەبی جیاواز.

لەدوای روخانی سەدام حوسەینەوە، هەمو پرۆسەی سیاسی لە عێراقدا لەسەر بنەمای سازان(تەوافوق) بەڕێوەچوە. دەستور لەسەر ئەساسی تەوافوق

نوسراوەتەوە، پەرلەمان لەسەر هەمان ئەساس دامەزراوە، تەوافوق لە بەینی سێ پێکهاتە سەرەکیەکەی میللەتی عێراقدا. ئەگەر یەکێك لەو پێکهاتە سەرەکییانە لەو پرۆسەیەدا بەشداری نەکات، پرۆسەکە شەل ئەبێت‌و لەنگ ئەبێت‌و ناتوانێت بەڕێوەبچێت. سوننە بەشداری نەکات، پرۆسەکە بە باشی ناڕواتە پێشەوە، کوردو شیعەش بەشداری نەکەن، عەینی بابەتە. کاتێك شتێك دەخرێتە دەنگدانەوە لە پەرلەمان‌و ڕەفز دەکرێت، فرسەتێکی ترە بۆئەوەی جارێکی دیکە سەرانی فراکسیۆنەکان‌و لیستە سەرەکییەکان مەتبەخێك پێکبهێنن‌و لەو مەتبەخە، بیروبۆچونە سیاسیەکانیان باش بکوڵێنن و بە ئامادەکراوی بچێتەوە بەردەمی پەرلەمان. ئەوە گەمەیەکی دیموکراتییە ڕویداوەو بەهیچ جۆرێك بڕوا ناکەم موئامەرە بێت، چونکە ئێمە زەمانەتی دەستوریمان هەیە لەناو دەستوری عێراقدا.

هەر یاسایەك لە پەرلەمان دەردەچێت، بەپێی ئەو دەستورە، دەچێتەوە بەردەمی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی کۆمار کە لە ٣ کەس پێکهاتوەو هەریەکێك لەوانە ماڤی ئەوەی هەیە ئەو یاسایە ڕەفز بکاتەوەو جارێکی دیکە بینێرێتەوە بۆ پەرلەمان بۆئەوەی موناقەشە بکرێتەوە. دوای موناقەشە، کە ناردیانەوە بۆ سەرۆکایەتی کۆمار، تا ٣ جار، سەرۆکایەتی کۆمار ماڤ هەیە ئەو یاسایە ڕەفز بکاتەوە. ئەوەش فرسەتێکی باش بە لایەنە سیاسیەکان دەدات کە لەبەینی خۆیان موناقەشە بکەن تا ئەگەن بە تەوافوقێکی سیاسی کە هەمویان پێی ڕازیبن.

* هەندێك لە چاودێران پێیان وایە نیزامی موحاصەصەو تەوافوق بۆ دواڕۆژی دیموکراسی لە عێراقدا باش نیە، ڕای ئێوە چیە؟

نەوشیروان مستەفا: مومکینە بۆ ٢٠ ساڵی دیکە ئەوە باش نەبێت. ئەو دیموکراتیەتەی ئێستە لە عێراقدا هەیە، دیموکراتیەتی زۆرینەو کەمینە نیە، بەڵکو دیموکراتیەتی تەوافوقییە. هێشتا متمانەیەکی ئەوتۆ لەبەینی پێکهاتە سەرەکیەکانی عێراقدا دروست نەبوە، نە کورد متمانەی بە عەرەب هەیەو نە عەرەب متمانەی تەواوی بە کورد هەیە. ئەگەر دیموکراتیەتی زۆرینەو کەمینە

بکرێتە بنەمای ژیانی دیموکراسی لە عێراقدا، ئەوکات عێراق نامێنێتو هەڵدەوەشێتەوە، چونکە لەبواری نەتەوەییدا کورد کەمینەیەو عەرەب زۆرینەیە. لەبواری مەزهەبیدا، سوننە کەمینەیەو شیعە زۆرینەیە بەتایبەت ئەگەر کورد لەگەڵ سوننەی عەرەب نەبێت. هێشتا ئەو قۆناغە نەهاتۆتە پێشەوە کە بایی ئەوە متمانە لە بەینی ئەو ٣ لایەنە سەرەکیەدا دروست ببێت لەسەر بنچینەی هاوڵاتی بونو بەرنامەی سیاسی دەنگ بدرێت. لەبەرئەوە لە قۆناغی داهاتوشدا ئەوەی لە ئاسۆی نزیکدا ئەبینرێتو یەکێتی عێراق ئەپارێزێت، ئەوەیە کە لەسەر ئەساسی موحاصەصەو تەوافوق ئیش بکرێت نەك زۆرینەو کەمینە.

* هەندێك لە عەرەبەکان باسی ئەوە دەکەن کە بۆچی کورد بۆ هەمو شتەکان باسی تەوافوق ئەکات، بەڵام کە دێتە سەر مەسەلەی کەرکوك، داوای دەسەڵاتی زۆرینە دەکات؟

نەوشیروان مستەفا: کەرکوك تەنها شار نیە کە پێکهاتە سەرەکیەکانی جیاواز بێت. ئەگەر (دابەشکردنی پۆستو کورسیەکانی ئەو شارە لە بەینی عەرەبو تورکمانو کوردو ئاشوری:رۆژنامە) بۆ کەرکوك رەوا بێت، ئەوا ئەبێت لە موسڵو دیالەو بەغدادیش هەمان شت بکرێت، چونکە ئەوانیش تێکەڵن لە نەتەوەو ئاینە جیاوازەکان. نابێت ئیزدواجیەتی پێوەر لەو مەسەلەدا بەکاربهێنرێت، جگە لەوەش کەرکوك زوڵمێکی گەورەی لێکراوە، چونکە تەعریب کراوە، پارچە پارچە کراوە. پارچەیەکی خراوەتە سەر سلێمانیو پارچەیەکی دیکەی خراوەتە سەر هەولێرو هەندێکیشی خراوەتە سەر سەلاحەدین. سەرەڕای ئەوەش خەڵکی ئەسلی ئەو شارە دەرکراوەو عەرەبی هاوردەیان هێناوەتە شوێنی. ئەوە لە بەسرەو عەمارەو باقی شوێنەکانی دیکە روینەداوە. ئەوە لە موسڵو دیالەش رویداوە لەو ناوچانەی کوردنشین بونو ئەوان بەر تەهجیرو تەرحیلو تەعریب کەوتون.

کەرکوك مادەیەکی تایبەتی بۆ تەرخان کراوە کە ١٤٠ەو بەپێی ئەو مادە، دەبێت ئەوانەی دەرکراون، بگەڕێنەوە سەر موڵكو شوێنی نیشتەجێبونی

خۆیانو ئەوەی هێنراوەتە ئەو شارە، ئەبێت بگەڕێنرێنەوەو بارودۆخی شارەکە ئاسایی بکرێتەوە.

* بەشێوەیەکی گشتی عەرەبە سونیەکانی پەرلەمان دەنگیان بەو مادە داوە، (مادەی ٢٤ی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکان)، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا کورد یاداشتی لێکگەشتنی لەگەڵ سونەدا ئیمزا کردوە کە ئەمڕۆ دیارترین حیزبیان، حیزبی ئیسلامی عێراقیە، بەڕای ئێوە چۆن لە سایەی ئەو ئیتفاقە سیاسیەدا ئەو شتانە رویداوە؟

نەوشیروان مستەفا: من ئەبێت دان بەوەدا بنێم لە دوای روخانی سەدامو بیدایەتی مەجلیسی حوکمداو دوای ئەوەش لە قۆناغە جیاوازەکانی دیکەدا، حیزبی ئیسلامی عێراقی، وەك حیزبێکی سوننی عەرەبی، لە کۆمەڵێك مەسەلەدا لەگەڵ کورد یەکیان نەگرتۆتەوە. هەر لە بیدایەتەوە ئەوان دژی نیزامی موحاصەصە بون. ئەوان لەگەڵ حکومەتی مەرکەزی بونو دژی فیدراڵیەت بون. ئەوان لایەنگیری ئەوە بون جەیشی عێراقی دروست بکرێتەوەو نەوتو سامانە سروشتیەکان لەدەستی بەغدادا بێت. ئەوان لە کۆمەڵێك مەسەلەی سەرەکیو گرنگدا بۆچونیان لە کوردو شیعە جیاواز بوە. بۆیە ناکرێت بوترێت ئەوەی رویداوە گۆڕانکاری گەورەیە لە بیرکردنەوەی سیاسیاندا.

* ئایا ئەو بۆچونەی سوننیەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە تەشکیلی کەمینە ئەکەن یان عەقایدی سیاسیان وایە؟

نەوشیروان مستەفا: ئەگەڕێتەوە بۆ لایەنی عەقیدەییان نەك تەشکیلی کەمینە.

* دوای ئەوەی یاساکە بۆ جاری سێیەم دەگەڕێنرێتەوە پەرلەمان، بەلاّم ئەگەر سێ لەسەر پێنجی ئەندامانی پەرلەمان دەنگی پێدا، ئەوکات لە دەسەلاّتی ئەنجومەنی سەرۆکایەتیشدا نامێنێت رەفزی بکاتەوە. پێدەچێت ئەو حاڵەتە روبدات؟

نەوشیروان مستەفا: من بڕوام وا نیە لە پەرلەماندا سێ لەسەر پێنجی دەنگەکان بەدەست بهێنرێت، لە حاڵەتێکدا ئەگەر بەدەستیشی هێنا، لە عێراقدا دادگای فیدراڵی هەیەو ئەتوانین لەوێ شکات بکەین. پاشان کورد چەکێکی دیکەی بەدەستەوەیە، ئەویش کشانەوەیە لە حکومەتو روخاندنی حکومەتەکەی مالیکی. ئەساسەن کورد دەتوانێ هەر لە پرۆسەی سیاسی بە کاملی بێتە دەرەوە. کە ئەوکات هەمو پرۆسەی سیاسی لە عێراقدا توشی شەلەل ئەبێتو باوەڕناکەم ئەمەریکایەکان لەم قۆناغەدا زەخت لە کورد بکەن، چونکە خۆیان لەبەردەم هەڵبژاردندان. ئەگەر هەمو ئەوانەشمان جێبەجێ نەکرد، ئەتوانین ئەو لیژنەی کە داوای تەعدیلی دەستوری دەکات، ئێمەش هەموو ئەو شتانەی کە لەکاتی نوسینەوەی دەستوردا تەنازولمان لێکردوە لەبەرامبەر هەندێك دەستکەوتی دیکەدا، ئێستە داوای بکەینەوە. واتە تەعدیلی دەستور بەو شێوەیە بە قازانجی ئێمەیە. ئێمە ئەتوانین هەر گۆڕانێك تێکبدەین کە لە دەستوردا دەکرێتو دژی مافەکانی ئێمەیە. جگە لەوەش بۆ تەعدیلی دەستور، پێویستە دو لەسەر سێی ئەندامانی پەرلەمان موافەقەتی لەسەر بکەنو پاشان بخرێتە دەنگدانەوەو ئەگەر لەوێش، ۳ پارێزگا دژی بون، ئەوا ئەو گۆڕانە فەشەل دێنێت.

* نادەستوری بونی مادەی ٢٤ لە چیدایە؟

نەوشیروان مستەفا: من پسپۆڕی کاروباری دەستوری نیم. بەڵام ئەوان دەنگدانی نهێنیان هێناوەتە پێشەوە کە عادەتەن لەسەر قانون، بەنهێنی دەنگ نادرێت. ئەوان نوێنەری میللەتێکن چۆن ئەکرێت بەنهێنی قانونێك پەسەند بکەن. لەدوای ڕوخانی سەدامەوە ئێمە بە ڕونی بە سەرکردایەتی هەموو هێزە سیاسیەکانی عەرەبی عێراقمان وتوە کە مەبدەئی زۆرینەو کەمینە لە مەسەلە ئەساسیەکانی میللەتی عێراقدا قبوڵ ناکەین، بەڵکو مەبدەئی تەوافوق قبوڵ ئەکەین.

* بۆچونێك هەیە كە پێی وایە ناوەڕۆكی مادەی ٢٤ی یاسای هەڵبژاردنەكەیە پێچەوانەی مادەی ١٤٠ە، ئەوەیان هێناوەتە پێشەوە وەك بەشێك لە لوعبەیەكی سیاسی بۆئەوەی كورد ناچار بكەن تەنازولی زیاتر بكات لە ١٤٠، رای ئێوە چیە؟

نەوشیروان مستەفا: ئەوە لایەنێكی مەسەلەكەیە، چونكە زۆرینەی ئەندامانی ئەنجومەنی موحافەزەی كەركوك كوردن‌و ئەگەر بڕیارەكەی پەرلەمانی مەركەزیان قبوڵ نەكردو ئەنجومەنەكە خۆی وەك هەیئەتێكی تەشریعی بڕیاریدا بێتە سەر هەرێمی كوردستان، ئەوەش دیوێكی تری مەوزوعەكەیە.

* بەڵام بەپێی دەستور لە دەسەڵاتی ئەواندا هەیە ئەو بڕیارە بدەن؟

نەوشیروان مستەفا: بەڵێ ئەو سەلاحیاتەیان هەیە. بەپێی دەستوری عێراقی (ویستیان ئەو مادە لابەن، بەڵام هێلرایەوە)، سێ یەكی ئەندامانی ئەنجومەنی پارێزگا یان دە یەكی دانیشتوانی پارێزگایەك ئەتوانن هەریزەیەك بنوسن‌و بڵێن ئەمانەوێت ببینە هەرێمێكی سەربەخۆ یان بچینە سەر هەرێمێكی دیكە. پاشان راپرسی بۆ ئەو مەسەلە ئەكرێت‌و ئەگەر زۆرینە (٥٠+١) دەنگی بەو مەشروعە دا، ئەوە پەسەند دەكرێت. ئێمەش ئەوەمان بەدەستەوەیەو ئەتوانن بڵێن ئەگەڕێینەوە سەر هەرێمی كوردستان.

* بۆچی تا ئێستە ئەنجومەنی موحافەزە بەو ئاراستەیە حەرەكەیەكی نەكردووە؟

نەوشیروان مستەفا: زۆر شت هەیە كە كورد ئەیتوانی بیكاتو هەڵی خۆشی بووە، بەڵام نەیكردووە، ئەویش لەبەر ئەو تەوافوقە سیاسیەی باسم كرد.

* ئەو واقیعەی لە پەرلەمانی عێراق هەیەو پەسەندكردنی مادەی ٢٤ چەندە پەیوەندی بە موعادەلە نێودەوڵەتیەكانەوە هەیە، وەك سیاسەتەكانی ئەمریكاو بەریتانیاو راپۆرتەكەی بەیكەر هاملتۆن‌و هاتنی دیمستۆرا؟

نەوشیروان مستەفا: پەیوەندی بە هەموویانەوە هەیە، لەم زەمانەدا هیچ شتێك نیە دابڕابێت لە باقی روداوەكانی دیكە. لە راپۆرتەكەی بەیكەر هاملتۆندا زۆر

زۆ باسی دواخستنی هەڵبژاردنی کەرکوکو گۆڕانکاری کراوەو ئەمەریکاییەکانیش بەلایانەوە مەتڵەبە کە مەوزوعی کەرکوك بە جۆرێك حەل بکرێت دڵی عەرەبو وڵاتە عەرەبییەکانو تورکیاش رازی بکرێت. چونکە جارجاریش تورکیا بەهۆی تورکمانەوە خۆی هەڵدەقورتێنێتە مەسەلەکە.
کورد لە ئێستادا ئەتوانێت پێداگری لەسەر هەندێك شت بکات، چونکە ئەمەریکا لەبەردەم هەڵبژاردنی سەرۆکایەتیدایەو سەرۆك بوش ئەیەوێت پێش جێهێشتنی کۆشکی سپی، کۆمەڵێك دەستکەوتی هەبێت لە عێراق، وەك پەسەندکردنی یاسای نەوتو غازو هەڵبژاردنی موحافەزەو رێکەوتنی ستراتیجی. بەڵام ئێمە دەبێت بەهیچ شێوەیەك پەیوەندیمان بەوەوە نەبێت حیزبەکانی ئەمەریکا لەچیدا قازانج ئەکەن یان زەرەر، ئێمە ئەبێت چاومان لە مافو بەرژەوەندییەکانی خۆمانەوە بێتو پێداگری لەسەر ئەوانە بکەین.
* رازیکردنی هەموو ئەو لایەنانە لە مەسەلەی کەرکوکدا بۆ ئەمەریکا زەحمەت نیە؟
نەوشیروان مستەفا: بەڵێ زەحمەتە، بەڵام رەنگە کورد بتوانێت ببێت بە عاملی موشتەرەك لەبەینی عەرەبو تورکمان لەسەر مەسەلەی کەرکوك.
* هاوڵاتیانی کوردستان بەگشتی توشی جۆرێك لە نائومێدی بون لە مەسەلە گرنگەکاندا، رای ئێوە چییە؟
نەوشیروان مستەفا: من ناهەقی خەڵکی ناگرم، وەختێك ئیدارەی کوردی پاش ١٦ ساڵ نەیتوانیبێت ئاوی خواردنەوە بۆ هاوڵاتیان دابین بکات، بە تەئکید لە ئاستی ئەوەشدا نیە موشکیلەیەکی ئاڵۆزی وەك کەرکوك چارەسەر بکات، بەڵام نابێت ئێمە نائومێد بینو بەدڵنیاییەوە ئێمە قەزیەکەمان نەدۆڕاندوە ئەگەر لەسەری بەردەوام بین، ئەیبەینەوە.
* بەڕای ئێوە هاوڵاتیان چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەم واقعەدا بکەن، لەکاتێکدا هەندێك رایان وایە پەنا ببرێتە بەر چەك بۆ یەکلاییکردنەوەی کێشەی کەرکوك؟

نەوشـیروان مـستەفا: خـەڵکی ئـەتوانێت زۆر شـت بکـات، ئـەویش لەڕێگـەی دەربڕینی بیروبۆچونی خۆیان ئەنجامدانی خۆپیشاندانو مانگرتن، بەڵام بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ توندوتیژیدا نیم، چونکە ئێمـە زەمانەتی دەستوریمان هەیـەو ئـەتوانین چـەکی سیاسـیو ئـابوری بـەکاربێنینو زۆر لـە تـۆپو تـەیارەش کاریگەرترن لەم رۆژگارەدا. ئەگەر قیادەی کوردی لەو لایەنانەوە کەموکورتیان هەبو، هەقی خۆیەتی خەڵکی ناچاریان بك

# لە هاوخەباتیەوە بۆ تەخوین

نەوشیروان مستەفا

لە رۆژانی ٢٩-٣١/١٠/٢٠٠٩ دا یەکێتیی نیشتمانی لە هۆڵی تەلاری هونەری شاری سلێمانی بە ئامادەبونی ١٦٠٠ کەس چوارەمین پلینۆمی بەست. هەندێ کەس، چاوەڕێی ئەوە بون لەم پلینۆمەدا پلانی چاککردنەوەی پەیوەندی حیزبەکەیان لە گەڵ خەڵك دابنێن، بەڵام دەرکەوت پلینۆمەکە بۆ مەبەستێکی تر رێك خرا بو.

پێشتر قسەکانی "فەخامەتی سەرۆکی کۆماری عیراق و بەڕێز سکرتێری گشتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان" تاڵەبانی، کە لە پلینۆم دا دژی من و هاوڕێکانم لە بزوتنەوەی گۆڕان دا کردبوی، بەشێوەی جیاواز بە من گەیشتبو. هەندێك لەو قسانە لە رۆژنامەکاندا بڵاوبونەوە و بەر گوێی زۆر کەس کەوت. بەڵام تا ئەوکاتەی قسەکان بەشێوەیەکی فەرمی بڵاونەکرانەوە، منیش وەك شتێکی نەبو حسابم بۆ کردن و بە توڕەبون و هەڵچونێکی کاتیم لە قەڵەم دان کە پێویست نەکات وەڵام بدرێنەوە. بەڵام ئێستا کە کۆی ئەو قسانە لە هەمو دەزگاکانی راگەیاندنی یەکێتیدا بڵاوکرانەوە ناچارم و بە پێویستی ئەزانم وەڵامی زۆری ئەو تۆمەتانە بدەمەوە کە تاڵەبانی بۆ خودی خۆم و هاوڕێکانم لە بزوتنەوەی گۆڕان ریزی کردوە.

لێرەدا بە راشکاوی ئەڵێم: پێم ناخۆشە ئاستی پەیوەندی من لەگەڵ تاڵەبانیدا گەیشتۆتە ئەم ئاستەی وتوێژ کە هەر هەموی تۆمەتبارکردن و "تەخوین" ە.

پێم ناخۆشە پاش ٤٠ساڵ لە تەمەنی هاوڕێیەتی و هاوخەباتی، تەنها

لەبەرئەوەی چیتر لە ژێر چەتری یەك رێكخراودا پێكەوە كار ناكەین، بە "زمانی تەخوین" قسە لەگەڵ یەك بكەین.

من نە تاڵەبانی و نە هیچ سەركردە و نە هیچ سیاسیەكی كوردم بە خائین و دژی كوردستان و بە "كلكگرێدان لەگەڵ جاش و بەعسیەكاندا" تاوانبار نەكردوە وەك ئێستا تاڵەبانی من و هاورێكانمی پێ تاوانبار ئەكات. ئەوەی ئێمە هەمانە ئەوەیە سیاسەتی تاڵەبانیمان بۆ بەرێوەبەرایەتی حیزب و بۆ بەرێوەبردنی ولات پێ راست نەبوە و پێ دروست نیە. بروامان وایە ئەم سیاسەتە نابێتە هۆی بەدیهێنانی ئەو دروشمە سەرەكیانەی هەزاران رۆڵەی كورد خۆیان لەپێناویدا كردە قوربانی كە ئەویش: "دروستبونی ولاتێكی دیموكرات و دادپەروەر و ئازاد كە كەرامەتی هەمو هاولاتیانی تیا پارێزراو بێت. "

ئێمە سیاسەتی تاڵەبانیمان پێ راست نیە و چەوتە. بەلام نە بە خائین و نە بە دوژمنی خۆمان و نە بە بەكرێگیراو و نە بە دەستی دەرەكی ئەزانین. كەچی ئەو تەنها لەبەرئەوەی چەند كورسیەكی پەرلەمانی بە ئێمە دۆراندوە، پێ لە ٤٠ ساڵ هاوخەباتی و هاوسەنگەری ئەنێت و وەك دوژمن و ناحەزی كوردستان وەسفمان ئەكات. چونكە ئەو قسانەی تاڵەبانی لە پلینۆم دا لەسەر بزوتنەوەی گۆران و خودی خۆم كردویەتی سنورەكانی رەخنەی سیاسی بەزاندوە و سەرئەكێشێ بۆ تۆمەتباركردنێكی سەرتاسەری كە ئەگەر تەنها یەكێكیشیان راست بێ، هەڵسوراوانی بزوتنەوەكە و لایەنگرانی پەلكێشی دادگا ئەكات و رەنگە روبەروی حوكمی لە سێدارەدانیشیان بكاتەوە. لەبەرئەوەش كە تاڵەبانی كەسێكی ئاسایی نیە و ناكرێت قسەكانی بێ وەلامدانەوە بڕۆن، ناچارم لێرەدا وەلامی هێڵە گشتیەكانی ئەو تۆمەتانە بدەمەوە كە لە راپۆرتەكەی پلینۆم دا بۆ خۆم و هاورێكانمی هۆنیوەتەوە.

ئەگەرچی تاڵەبانی لە راپۆرتەکەی دا روداوەکانی زیاتر لە ٣٠ ساڵی بە تێکەڵوپێکەڵی گێڕاوەتەوە کە وەڵامدانەوەی لێدوانی زۆر زیاتری هەڵئەگرت، بەڵام بۆ ئەوەی لەمە درێژتر نەبێ هەڵم گرت بۆ کاتی خۆی.

#

ئەشی کوژێ و بۆیشی ئەگری

تاڵەبانی لەراپۆرتەکەی دا ئەڵێ:

"لەناو خۆشماندا، بێ ئاگاداری سکرتێری گشتی و نیوەی (م. س)و ناوەندی کۆمەڵەش، بڕیاری کوشتنی خەڵکی لەشارو لەلادێ دەردەکرد. ئەمەش بوو بەهۆیەکی گەورەی ناکۆکی ئێمەمانان لەگەل هێڵی نەوشیروان لەساڵی (١٩٨١)ەوەلەناو کۆمەڵەدا. تا کار گەیشتە ئەو رادەیەی هەڕەشەمان کرد بەبەجێهێشتنی ولات ئەگەر کوشتار لەشارو لەلادێ رانەوەستێت، هەرچەندە، سەرەتا ئەنجامدانی ئەو تاوانانەو گەلێ بڕیاری ترمان لێ دەشاردرایەوە، بەلام سەرەنجام، دوای ماوەیەکی کەم، لەرێگەی بەرپرسانی گەورەی ناو شارەوە، راستیەکانمان هەموو زانی و چیکەفڕوفێل دادی نەدەدا. ئەم راستیانەش وای لێکردین بتوانین دوا سنوور بۆ پاکتاوی جەستەیی ناڕەوا دابنێین! ئەمە یەکەمین ناکۆکی و دووبەرەکی ناڕاستەوخۆی گرنگی نێومان بوو، لەگەڵ پەیڕەوانی توندوتیژی. "

#

لە سەرەتاوە ئەڵێم: من وەکو هەندێ کەس نامەوێ پاکانەی درۆ بکەم!

لەساڵی ١٩٧٥ ەوە کە، لەگەڵ تاڵەبانی و ئەندامانی تری دەستەی دامەزرێنەری یەکێتیی نیشتمانی، دەستمان کرد بەدانانی رێوشوێنی خەباتی سیاسی - چەکدار و، لەئەنجامی ئەوەش دا هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشی کورد، من وەکو یەکێ لە بەرپرسە باڵاکانی ئەو جوڵانەوەیە، لەساڵی ١٩٧٥ ەوە تا ساڵی ١٩٩١ کە بە راپەڕین کۆتایی هاتوە، بەئەندازەی مەسئولیەتی خۆم لەجوڵانەوەکەدا، ئۆباڵی ئەدەبی و ئەخلاقی و سیاسی هەمو روداوەکانی شۆڕشەکە و، هەمو

ئەوانەی کە لە ئەنجامی ئەم شۆڕشەدا کوژراون یا زەرەرمەند بون، لە هەر لایەك بوبن، لە ریزەکانی یەکێتی دا بوبن، یان لە ریزەکانی لایەنەکانی تری شۆڕشی کوردا بوبن، یان هاولاتی ئاسایی بوبن، یان لە ریزەکانی حکومەتی عیراق دا بوبن، هەڵئەگرم و، لەبەردەم کەسوکاری ئەوانەدا و، لەبەردەم دادگای مێژوی نەتەوەکەم دا و، لەبەردەم دادگای خوای گەورەدا ئامادەی وەلامدانەوەم.

ئەبو هەر کەسێ ئەو قسەیەی بکردایە تاڵەبانی قسەی وای نەکردایە!

ئەگەر تاڵەبانی من و چەند کەسێکی کە تاوانبار بکات بە کوشتنی چەند کەسێ لە شار و لە لادێکانی کوردستان دا، ئەی کێ بەرپرسە لە کوشتنی سەدان هەزار کورد کە بە درێژایی سالانی ١٩٦١ – ١٩٧٥ و ١٩٧٥ – ١٩٩١ و ١٩٩١– ٢٠٠١ کوژراون؟

#

***کارەساتی هەڵەبجە: کێ بەرپرسە من یا سەدام؟***

***تاڵەبانی لە راپۆرتەکەی دا ئەڵێ:***

"لەناو ئەو کێشمەکێشە سیاسی و فکرییەدا، سەرەڕای ئەوەی تاقیکردنەوەی زۆرمان لەگەل سەدامییەکاندا هەبوو، بە تایبەتی سیاسەتی سەدام لە جەنگی عێراق– ئێراندا، سروشتی فاشیانەی رژێم ئاشکرا دەرکەوتبوو، دەریش کەوتبوو کە ئەم فاشیستانە لە هیچ تاوانێك نەدەسلەمینەوە، مفاوەزاتەکەشمان لەگەل رژێم سالێك بوو بەهۆی شۆڤێنیەتی بەعسی سەدامی و تەکنەلۆژیای جەنگی و فشارە ئیقلیمیەکە، شکستی خواردبوو، ئەو هەموو راستیانەمان دەزانی، بۆیە دەبوو ژیرانەتر هەڵبسوڕێین و کەمترین پاساو بدەینە دەست فاشیەکان، کەچی لەو کاتەدا، نەك نەمانتوانی جیاوازیەکان و هەڵەکان سەبارەت بە سکرتێری کۆمەڵە کەمبکرێنەوە، بەڵکو ناوبراو ناکۆکیەکانی لە مەیدانی سیاسەتو فکرەوە، گەیاندە ئاستێکی ترسناك، ئەویش بواری عەسکەرییە، بڕیاری هەرەمەترسیداریش لەو کاتەدا، ئەوە بوو بەبێ رەزامەندی سکرتێری گشتی، کە فەرماندەی گشتی هێزی (پ. م)ش بوو، بەڵکو بەبێ

ڕەزامەنـدی زۆربـەی مەکتـەبی سیاسـی و سـەرکردایەتی یـەکێتیش، فـەرمانی عەسکەری دابوو بە فەرماندەو هـەڤالانی دەڤەری هەڵەبجە، کە وەکو بەشێك لـە هاوکێشە عەسکەرییەکانی جەنگی عێراق – ئێران هەوڵی رزگارکردنی هەڵەبجە بـدەن. گوایـە بـۆ کەمکردنـەوەی گوشـار بـوو بـۆ سـەر سـەرکردایەتی کـە رژێـم پـەلاماری دەدا. ئـەم بڕیـارەش بـەو شـێوەیە، بـەبێ لێکدانـەوەی هەلومـەرجی جەنگەکەو سروشتی فاشیانەی سەدامیەکان لە دوو ساڵی کۆتایی جەنگەکەدا، پاسـاوی دایـە دەسـت سـەدام کـە سروشـتە فاشـیەکەی بـەرۆژی رونـاك، بـەبێ دوودڵیی لە شاری هەڵەبجەدا جێبەجێ بکات. کە ئەگەر هاتباو ئەم نەخشەیە لە مەکتـەبی سیاسـی و لەگـەڵ سـکرتێرو فەرمانـدەی گـشتی (پ. م)دا، باسـکراباو تـاوتوێ بکرایـە، بێگومـان رێگـە نـەدەدرا رێگـەی وا بگیرێتـە بـەر. بـەڵکو هـەول دەدرا نەخشەو تاکتیکی عەسکەری گونجاوتر لەو هەلومەرجەدا بگیرێتە بەر. بە تایبـەتی حکومـەت پێـشتر هەڕەشـەی بـۆ ناردبوین کـە هـەر پـەلامارێك لەگـەل پاسداران بۆ سەر هەر شوێنێك، بە بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی جوابی دەبێت، تەنانەت گەر شاری سلێمانیش بێت. سەرەڕای هەموو ئەم راستیانەش، ئۆبـاڵی تـاوانی کیمیابـارانی هەڵەبجـەو سەرانسەری کوردسـتان، لـە ئەسـتۆی بەعـسی سەدامدایە.

کـە کارەسـاتەکە روویـداو حـوکمی دیکتـاتۆری هەڵەبجـەی دایـە بـەر چـەکی کیمیاوی، ناڕەزایی لەسـەر سەپاندنی بڕیارەکە، کە بەبێ ڕەزامەنـدی مەکتەبی سیاسی دەرکرابوو، لەلایەن چەندین هەڤالـەوە بەرزبۆوە. بەلام تـازە کـار لـە کـار ترازابوو. "

#

لەمێژە وتویانە سەرکەوتن هەزار باوکی هەیە بەلاّم شکان هەتیوە.

تالـەبانی لەمێـژ بـو گەیـشتبوە ئـەو بـاوەڕەی رژێمـی بـەعس لـە عێـراق ئـەوەنـدە بـەهێز بـوە کـە موعـارەزەی عیراقـی، بـە کـورد و بەئەویـشەوە، لـە توانایـدا نیـە بیرۆخـێنێ. بـاوەڕی وابـو روخـانی رژێمـی سـەدام بـە "عـامیلی خـاریجی" و بـە

"هێزی دەرەکی" ئەکرێت. هەر بۆیە بایەخێکی تایبەتی ئەدا بە سوریاو لیبیا بە هیوای سازدانی ئینقیلابی عەسکەری. کە لەوان بێ ئومێد بو پەنای بردە بەر کۆماری ئیسلامی ئێران کە ئەو کاتە لەگەڵ جەیشی عێراق، لە جەنگێکی خوێناویەوە گلا بو، بەشکو بە هاوکاری جەنگی و سیاسی ئیران، عێراق بروخێ.

لە چوارچێوەی ئەم ستراتیجیەدا هێشتا مفاوەزاتی یەکیتی بە تەواوی لەگەڵ عێراق کۆتایی نەها تبو، لە هەوڵی دامەزراندنی پێوەندی دا بو لەگەڵ ئێران.

دوای چەندین هاتوچوی نوێنەرانی هەردولا و، دوای چەندین هەڵکشان و داکشان لە دانوستانەکانی نوێنەرانی هەردولادا زەمینەی پێکهاتن ساز بو. تاڵەبانی لەگەڵ شاندێکی یەکێتی کە پێك هات بو لە فەرەیدون عەبدولقادر، دکتۆر کەمال خۆشناو، محەمەد تۆفیق رەحیم، شێردڵ حەوێزی. . . چوە تاران.

لەمانگی ١٠ ی ١٩٨٦ دا لەتاران، بە نوێنەرایەتی یەکێتی لە لایەن تاڵەبانی و بە نوێنەرایەتی ئێران لە لایەن محەمەد باقیر زولقەدر (فەرماندەی ئەوسای قەرارگای رەمەزان) رێککەوتنێکی جەنگی و سیاسی و لۆجستی بۆ هاوکاری و هاوئاهەنگی هێزەکانی هەردولا دژی جەیشی عێراق لە هەمو بوارەکان دا ئیمزا کرا.

بە پێی ئەم رێکەوتنە ئەبو هێزەکانی یەکێتی لە هەمو بوارێکی جەنگی دا، هاوکاری و هاوئاهەنگی لەگەڵ هێزەکانی ئێران بکا و، تا روخانی سەدام درێژە بە شەڕ بدا و بێ ئاگادرای ئێران و رەزامەندی ئەو هیچ مفاوەزەو ئاشتیەك لەگەڵ عیراق نەکا.

دوای ئەم رێککەوتنە زنجیرەیەك عەمەلیاتی عەسکەری هاوبەشی پێشمەرگەی یەکێتی و لایەنەکانی تر لەگەڵ سپای پاسداران بە ئاشکرا لە ژێر ناوەکانی "فەتح" و "نەصر" و "فەجر". . . دەستی پێ کردو بەدوی ئەویش دا دەیان عەمەلیاتی تر ئەنجام درا، کەیەکێکیان "داستانی رزگاری" بو لە ناوچەی

چوارتا نزیك بارەگاكانی سەركردایەتی یەكێتی، كە لە ژێر سەرپەرشتی راستەوخۆی خودی تاڵەبانی دا بو، بە هاوكاری و هاوئاهەنگی راستەوخۆ لە گەڵ محەمەد باقیر زولقەدر، دواتر سەرۆكی ستادی سپای پاسداران، و عەلی شەمەخانی، دواتر فەرماندەی نیروی دەریایی ئینجا وەزیری دیفاع.
هەر هاوكاریو هاوئاهەنگیەك لە نێوان من یان هەر سەركردە یان فەرماندە یا پێشمەرگەیەكی یەكێتی لەگەڵ هێزەكانی ئیران كرابێ، بە پێی ئەم رێكەوتنە بوە، كە ئاغای تاڵەبانی ئیمزای كرد بو. پاكانە بە بیانوی بێئاگاییەوە لەم عەمەلیاتە، لە لێپرسراوێتی سیاسی و قانونی ئەو كەم ناكاتەوە، هیشتا سەدان كەس لە ئاگادارەكانی ئەو پەیوەندی و هاوكارییانە شایەتی زیندون و، پاكانەش بۆ سەدام و رژێمی بەعس، بە بیانوی ئەوەی هەڕەشەی پێشەكییان لێ كردوە، هیچ لە لێپرسراوێتی سەدام و هاوڕێكانی كەم ناكاتەوە، ئەوە دادگای تاوانەكان لە بەغداد خەریكی لێپرسینەوەیە.
پێش هەڵەبجە لە چەندین مەیدانی جەنگیدا لە پارێزگاكانی سلێمانی، كەركوك، هەولێر، دیالە. . . كاری هاوبەش لەگەڵ ئێران كرابو، ئازادكردنی هەڵەبجە كە بە وێرانكردنی هەڵەبجە و قڕكردنی خەڵكەكەی تەواو بو بەشێك بو لە نەخشەیەكی جەنگیی فراوان بۆ ئازادكردنی ناوچەكانی هەڵەبجە، قەڵادزە، رانیە، دوكانو چوارتا. . . كاتێك كە ئازادكردنی هەڵەبجە لە ئەنجامی كیمیابارن دا بو بە كارەسات، واز لە جێبەجێكردنی تەواوی نەخشەكە هێنرا.
پێش هەڵەبجە حكومەتی بەعس كەم جێگەی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە هەبو كیمیابارانی نەكردبێ، چەندین ناوچەی لە خۆشناوەتی، بیتوێن، پشدەر، بەری مەرگە، دۆڵی جافەتی، بەری قەرەداغ، بادینان، دەشتی كۆیە، دەشتی كەركوك. . . كیمیاباران كردبو. حكومەتی بەعس تەنیا بە تەسلیمبون و كۆتاییهێنان بە شۆڕش دەستی لە كیمیاباران هەڵئەگرت، بە تایبەتی لە سایەی بێدەنگی ئەمەریكاو زلهێزەكانی دنیادا.

لەو هەڕەشەیەی تاڵەبانی باسی لەکات ئەگەر بەو گەیشتبێت، بە من نەگەیشتوە، چونکە ئەو زەمانە بەعس هیچ ڕێگە پەیوەندیەکی لەگەڵ من نەبو تا ئەو هەواڵەم پێ بگەیەنێ، ئاغای تاڵەبانیش شتی وای بە ئێمە نەوتبو. .
لۆباڵی گوێنەدان بەم هەڕەشەیە، ئەگەر ڕاست بێ، لە ئەستۆی ئەودایە.
پێویست ناکات لە سەر کارەساتی هەڵەبجە درێژەی پێ بدەم، چونکە خوالێخۆشبو شەوکەتی حاجی موشیر کتێبێکی لە ژێر سەرناوی "کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە - بەهاری ١٩٨٨" لە سەر نوسیوە و ساڵی ١٩٩٨ لەسەر ئەرکی تاڵەبانی لە سلێمانی چاپی کردوە.
هەرکەس ئەو کتێبە بخوێنێتەوە ئەزانی کە:
فەرماندەی عەسکەری عەمەلیاتەکە شەوکەتی حاجی مشیر بوە و،
لێپرسراوی سیاسی عەمەلیاتەکە دکتۆر فوئاد مەعسوم و فەرەیدون عەبدولقادر بون و،
لێپرسراوی لۆجستی عەمەلیاتەکە سالح محەمەد ئەمین بوە.
یەکێ لەو بەڵگانەی لەم کتێبەدا بڵاو کراوەتەوە وێنەی نامەیەکی فوئاد مەعسومە بۆ شەوکەت کە تیا نوسیوە: "هومێدی سەرکەوتنت بۆ دەکەم لە کارە پیرۆزەکە" دا کە ناڕاستیی هەمو قسەکانی تاڵەبانی ئەسەلمێنێ.
لەو زەمانە مەکتەبی سیاسی پێکهاتبو لە ٥ ئەندام: سکرتێری گشتی، دو نوێنەری شۆڕشگێران - کە فوئاد مەعسوم و نازم عومەر بون و، دو نوێنەری کۆمەڵە - کە یەکێکیان منو ئەویتریان فەرەیدون بو.
عەمەلیاتی وا گەورە کە سەدان فەرماندە و بەرپرسو چەندین لایەنی سیاسی کوردستانیو عێراقی (پارتی، سوشیالیست، بزوتنەوەی ئیسلامی، فەیلەقی بەدر) ی تێدا بەشدار بێت، بارەگای چەندین لایەنی سیاسی ئێرانی (لەوانە دیموکراتو کۆمەڵە) بکەوێتە بەر مەترسی، ئەئەکرا بێ ئاگاداریو ڕەزامەندی سەرکردایەتی یەکێتیو بە تایبەتی شەخسی تاڵەبانی ئەنجام بدرێت. خۆ

بێئاگـاکردنی ئاغـای تاڵـەبانی لـەو مەسـەلەیە چەواشـەکاریەکی ئاشـکرایە لەبەردەم تەوژمی روداوەکاندا خۆی ناگرێت.
لەو سەردەمەدا کە ئێمە بە دڵی شکاو و دەرونـی بریندارەوە باسـی ئـەوەمان ئەکرد چۆن هـەوڵی "ئـازادکردنی هەڵەبجە" بـو بە "کارەسـاتێکی ئینسانی"، ئاغـای تاڵـەبانی بـێ هـیچ سـڵەمینەوەیەك ئـەیوت: "کیمیابـارانی هەڵەبجـە مەسـەلەی کـوردی بـردە نـاو مەیـدانی ناودەوڵەتیـەوە. . . ئـاخ بـۆ دووسـێ هەڵەبجەی تر".
#
***بوشی باوك: رزگاری بۆ کوەیت و فیدرالی بۆ کوردستان!***
***تاڵەبانی لە راپۆرتەکەی دا ئەڵێ:***
"ئەمریکیـەکان بـە سـکرتێری گـشتی ی. ن. ك یـان راگەیانـد، کـە ئەگـەر بێـت و هاوکـاری هێـزی هاوپـەیمانان بـۆ رزگـارکردنی کوێـت بکـەن، ئـەوا هـەم یارمەتییەکی باشی چەك و ماددی دەدەن بەکوردو هەم پاشان فیدرالیەتیشی لە عیراقدا بۆ دەسەلمێنن و دەسەپێنن. سکرتێری گشتیش، داوای لـە نەوشیروان کـرد، کـە لەگـەل هـەڤالانی سـەرکردایەتی و پـارتیش دراسـەی بکـەن و وەلامـی بدەنەوە. ئەویش وا وەلامی سکرتێری گشتی دایەوە: کە ئەوە پەسەند نییە، چونکە سەدام هەر بە خۆشی لە کوێت دەکشێتەوەو شەڕەکەش تووشی ئێمە دەبێت. بەم هەڵوێستە هەڵەیە هەڵێکی مێژوویی لە کیس کورد دا، ئەگینا دوای رزگـاری کوێـت، بەتایبـەتی کەزۆربـەی زۆری کوردسـتانمان رزگـارکردبوو، فیدراڵمان بۆ دەچەسپا. "
#
تاڵـەبانی لـەپێش دەست پێکردنـی عەمـەلیاتی ئەنفالـەوە بـە ٣ مـانگ سـەفەری دەرەوەی کردبو، لە کاتی راوەستانی شەڕی عێراق‌و ئێراندا ئەو چەند مانگ بو خـۆی لـەدەرەوە ئەگنخانـد، هەمیـشە بیـانوی ناڕاسـتی دائەتاشـی بـۆ مانـەوەی هەرچی درێژتری لەدەرەوەی کوردستان.

تاڵەبانی لە کاتی هێرشی جەیشی عیراق دا بۆ سەر کوەیت لە دەرەوەی کوردستان بو. لەدوای داگیرکردنی کوەیت سەفەری ئەمەریکای کرد. بە بروسکە رەئی منیشی پرسی، کە لەوێ داوای چی بکا. من سەفەرەکەیم پێ باش بو. پێشنیارم بۆ کرد هەرچیەکی پێ ئەکرێت بۆ دژایەتی رژێمی بەعس و بۆ روخاندنی بیکات، بەڵام لە بەر ئەوەی زۆری میللەتەکەمان لە ئۆردوگاکان دا وەکو دیلی جەنگ کۆکراونەتەوە و چەندین هاوڕێمان لە زیندانەکانی بەعس دان، خۆی لە "تەسریحاتی رۆژنامەوانیی ئیستیفزازی" بپارێزێ. هەرچیش بە ئێمە ئەکرێت بیکەین. لەو کاتەدا ئێمە، لە قاسمەڕەش، بەوپەڕی جدیەتەوە، خەریکی خۆ ئامادەکردن بوین بۆ راپەڕین. وردەکاری نەخشەی کارەکانی خۆمان بۆ سازدانی پێشمەرگە و راپەڕاندنی خەڵك لە شارەکان، بە نوسین و بەدرێژی، بە دەستی، بە دانای ئەحمەد مەجیدا، کە ئەوسا نوێنەری یەکێتی بو لە کرماشان، بۆ ناردبو بۆ دیمەشق، ئەویش سوریەکانی لێ ئاگادار کرد بو.

ئیدارەی سەرۆکی ئەمەریکی بوشی باوك، لەو هەلومەرجەدا، ئامادە نەبو نە تاڵەبانی و نە هیچ کەسێکی تری موعارەزەی عیراقی ببینێ، چونکە ئامانجی ئەمەریکا لەو شەڕەدا تەنیا دەرکردنی جەیشی عێراقی بو لە کوەیتو رزگارکردنی کوەیت بو لە داگیرکردنی عێراق. روخانی رژێمی بەعسو لابردنی سەدام لەبەرنامەی ئەمەریکادا نەبو، چونکە ئەمە هاوسەنگی هێزەکانی نێوان ئێران- عێراق و ئێران- خلیجی تێك ئەدا.

وتارەکانی بوشی باوك و وتەبێژەکانی کۆشکی سپی و پێنتاگۆن و وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا لە رۆژانی کۆڕەودا، کە رای گشتی جیهانی وروژا بو داوای دەستێوەردانی جیهانی‌یان ئەکرد، ئەم راستیە دەرئەخەن. ئەوان بە ئاشکرا ئامانجی خۆیان رونکردەوە. هەرکەس بیەوێ لەراستی ئەمە بکوڵێتەوە ئەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ ئارشیفی قسەکانی ئەوکاتەی سەرۆك بوش کە وتی: "من ئامادە نیم یەك سەربازی ئەمەریکی بنێرم بۆ ناو زەلکاوی عێراق".

تاڵەبانی لەسەفەرەکەی ئەمەریکادا ئەگەرچی هەوڵی زۆری دابو کاربەدەستانی ئەمەریکی ببینێ، تەنانەت بۆ خۆنزیککردنەوە لە کاربەدەستانی ئەمەریکی، بەرتیلێکی سیاسی خۆڕایی دابونێ. تەسریحێکی ئاگرینی دا کە لە "واشنتۆن پۆست" دا بلاوکرابوەوە وتبوی: "ئەگەر سەرۆك بوش رازی بێ ١٠ هەزارکەس لە پیاوەکانم ئەنێرم بۆ کوەیت شان بە شانی سپای ئەمەریکی شەڕی جەیشی عێراق بکەن. . . "

تاڵەبانی بە هۆی چەند رۆژنامەنوسێکی ناسراوەوە وەك جوناسان راندال کارمەندێکی بچوکی وەزارەتی دەرەوەی لەچاپخانەیەك دا بینی بو، ئەویش بە ئاشکرا و، بێ هێچ پێچوپەنایەك، پێی وتبو: "ئەمەریکا لەو کاتەدا ئامادە نیە لەگەڵ موعارزەی عێراق پەیوەندی دروست بکا".

مەسەلەی ئەم بەڵێنەی کە بەو دراوە حیکایەتێکە خۆی دروستی کردوە، بەمە گەرەکێتی سۆزی هاولاتیانی کوردستان بۆ سودی خۆی و سەلماندنی گرنگیی سەفەرە بێهودەکانی بە کار بهێنێ، وا لە خەڵك بگەیەنێت کە دەوڵەتی ئەمەریکاش – وەك ئیدارەی سیاسی سەردەمی سەرۆکایەتیەکی خۆی . بێ سەروبەرەو ئەویش بێ رەزامەندی دەزگا پێوەندیدارەکانی کۆنگرێس و سێنات و ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی و وەزارەتەکانی بەرگری‌و دەرەوە، ئەتوانێ بەڵینی درۆ بەم و ئەو بدات.

نە ئەو سەردەمە، سەرۆك بوشی باوك و، نە دوای ئەویش سەرۆك کلینتۆن و، نەدوای ئەوانیش سەرۆك بوشی کوڕ و، نە ئێستاش سەرۆك ئۆباما، هیچکامیان بەڵینی لەو بابەتەیان بە تاڵەبانی و بە هیچ کوردیکی تر نەداوە.

سەرۆك بوشی باوك و کاربەدەستە بالاکانی سەردەمی ئەو هەمویان زیندون. ئەگەر بشمرن ئارشیفی بەڵگەکانیان لەدەزگا پەیوەندیدارەکان دا ئەمێنێ. لێکۆڵەرەوەیەکی سیاسی تەنانەت رۆژنامەوانێکی وریا ئەتوانێ بچێتە بنجوبناوانی ئەم قسەیەی تاڵەبانی و دەرئەکەوێ کە شوبهاندنی ئیدارەی ئەمەریکی لە بەخشینی بەڵێن‌و پارەو چەك و پشتیوانی، کە لە ئەمەریکا، بە

پرۆسەیەکی قانونی درێژدا تێ ئەپەڕێ و، شوبهاندنی بە ئیدارەی کوردی کە بە ئارەزوی خۆی ئەتوانێ ئەو شتانە بێ پرۆسەی قانونی و پەرلەمانی تێپەڕێنێ، درۆیەکی چەند زلە بۆ چەواشەکردنی رای گشتی کوردی.

خۆ ئەگەر بەڕاستی بەڵێنی وەهای پێ درا بو ئەبو ئاگاداری سەرکردایەتی "بەرەی کوردستان" ی بکردایە و، بە پێشنیارێکی فەرمی رەوانەی سەرکردیاتی بەرەی کوردستانی بکرایە، بۆ ئەوەی تاوتوێی بکات و بڕیاری لێ بدات. چونکە سەرکردایەتی بەرە پێکهاتبون لە سەر ئەوەی هیچ لایەك بە تەنیا بڕیاری کاری چارەنوسساز نەدا، بە تایبەتی لەو سەردەمەدا مەسعود بارزانی بەرپرسی یەکەمی کاروباری بەرە بو لە کوردستان و تاڵەبانی بەرپرسی کاروباری هەندەران بو. من بەشبەحاڵی خۆم لەم راپۆرتەدا ئەو حیکایەتەم خوێندۆتەوە. بۆ خۆشبەختی سەرانی بەرەی کوردستانی هەمویان زیندون ئەتوانن راستی و ناڕاستی ئەم حیکایەتە ساخ بکەنەوە.

#

***پاشهاتەکانی ئەنفال: گلان و هەڵسانەوە***

***تاڵەبانی لە راپۆرتەکەی دا ئەڵێ:***

"ناکۆکیەکی تری سەرەکی لەنێوانماندا، لەسەروبەری راوەستانی شەڕی ئێران– عیراق بوو، لەوساتەدا سکرتێری کۆمەڵە باوەڕی بەشۆڕش نەمابوو، لەدوای شەڕی سەرکردایەتی ورەی بەردابوو، بەپەلەپروزە ناوچەکەی بەجێهێشت بەسەر هەڤالانی سەرکردایەتیدا بێ ئەوەی پرس و راوێژیان پێ بکات. بەتایبەتی لەدوای ئەنفالەکان. کە سەدان خێزان و هەزاران کەس لەگەل یەکێتی لەپاشەکشەدا کەوتبوون و پێویستیان بەهاوکاریو رێنوێنی هەبوو، بەلام سکرتێری کۆمەڵە بەئارەزووی خۆی بڕیاری دەداو سەرەنجام سەربەخۆ کەوتە بلاوەپێکردنی شۆڕشو دەستی کرد بەناردنە دەرەوەی کادیرەکانی نزیك لەخۆی و هاندانی پێشمەرگەش بۆ چونە ماڵی خۆیان یان بۆ ئێران.

بەکەڵکوەرگرتن لەدەسەلاتی جێگری سکرتێری گشتی لەغیابی سکرتێری گشتیدا، خەریك بوو شۆڕشەکە بلاوە پێ بکات. ئەگەر بەرهەڵستی هەڤالان کاك کۆسرەتو هەڤال جەبار فەرمان و چەند هەڤاڵێکی شۆڕشگێڕیان نەبا، بەرەسمی بڕیاری بلاوەپێکردنی شۆڕشی دەدا. سەرەنجامی ئەم سیاسەتەو ئەم باوەڕەی کەوتە هەڵگرتنی دروشمی گفتوگۆ لەگەل سەدام و پروپاگەندە بۆ نەمانی توانای درێژەدان بە شۆڕش. بۆ رازیکردنی سکرتێری گشتیش، کە لەسوریە بوو، هەڤال عومەر عەبدوڵلا یان ناردە لای. بەلام سکرتێری گشتی ئەو سیاسەتەی پەسەند نەکردو بەقسە بەناوبانگەکەی وەلامی دانەوە، کە خەبات درێژە پێدەدەین تا سەدام هەر دەڕوخێنین.

لێرەوە ناکۆکی نێوان سکرتێری گشتی و جێگرەکەی زۆر توندو قول بوو. هەر بەوە خاوکرایەوە کە پاشان (م. س) بڕیاری دا شۆڕش بەشێوەی شەڕی پارتیزانی درێژەی هەبێت و خەبات شان بەشانی موعارەزەی عیراقیش دژی دیکتاتۆریەت درێژەی هەبێت، خۆشمان دەست بکەین بە دروستکردنی دەستەی چەکدار لەشارەکان و ئۆردوگاکان بۆ رۆژی خۆی. چونکە ئێمە پێمان وابوو، کە سەدام کەتنێك لەگەل کوێت، هەر دەکات، ئەمریکاو ئەوروپاش هەر لێی دەدەن. لەسەر ئەوەش لەگەل نەوشیروان ناکۆك بووین، چونکە ئەو پێی وابوو کە لەسەدام نادرێت، تەنانەت دوای پەلاماردانی کوێتیش پێی وابو سەدام دەکشێتەوە، بۆیە داوای گفتوگۆی لەگەل سەدام دەکرد. ئەوەبوو، بێ پرسی هەڤالانیش، بەتایبەتی سکرتێری گشتی، کەوتە نامەناردن بۆ سەدام و هەولدانی لاواز بۆ رێکەوتنێکی لاواز بەهیوای ئەوەی سیاسەتی خۆی بباتەسەر. کەچی نەك سەدام ئامادەنەبوو چارەسەرێکی لاوازیش بۆ کێشەکە بسەلمێنێ، بەلکو شەخسی خۆی ئامادە نەبوو وەلامی یەك نامەی جێگری سکرتێری یەکێتیی بداتەوە، تەنیا داوای زارەکی ئەوەبوو کە (یاخیبووەکان بگەڕێنەوە ریزی نیشتمانی) ئەمەش هەر بیروبۆچونەکانی هێڵی روخاندنی

سەدامی سەلماندەوە، کە رژێم شۆڤێنی و فاشییەو مافی دیموکراتی هەرگیز نادات. "

#

هەرکەس باسی ئەنفال و پاشهاتەکانی ئەنفالی بکردایە، ئەبو تاڵەبانی خۆی لە قەرەی ئەو باسە نەدایە. چونکە ئەو ئەیزانی گەورەترین هێرشی ئەو جەیشە زەبەلاحەی سەدام بۆ شەڕی ئێرانی دروست کردبو، بەرێوەیە بۆ سەر کوردستان. کەچی بۆ ئەوەی خۆی لەو ئاگرە سورە دور رابگرێت، سەفەرێکی بۆ ئێران رێکخستو لەوێوە فڕی بۆ دەرەوە و تا سەرکەوتنی کورد لە راپەڕیندا و تا ئازادکردنی هەمو کوردستانی عێراق نەگەڕایەوە بۆ کوردستان. لە گەڕانەوەشی دا کە توشی شکانو کۆڕەو بوین، لەباتی بەرگریکردن و کەڵك وەرگرتن لەو هەلەی کۆڕەو لە ئاستی ناودەوڵەتی دا بۆ کوردی رەخساند، بە هەڵەداوان چوە بەغدا و بە جۆرێکی شەرمهێنەری ئەوتۆ ئەملاوئەولای سەدامی ماچ کرد، بوە هەواڵی یەکەمی دەزگاکانی راگەیاندن لە سەرانسەری دنیادا.

تاڵەبانی و هەندێ لە هاوبیرەکانی پێیان وا بو: لە دوای ئەنفال ئیتر ئیشمان بە پێشمەرگە نەماوە، بۆیە ئەو دیسان سوریای کردەوە بە بارەگای سەرەکی خۆی و، بۆئەوەی باری سوك بێ و ئیلتزاماتی مادی کەم بێ، ئەیویست جگە لە ئەنـدامانی سـەرکردایەتیو ژمارەیـەکی کـەمی کـادری سیاسـی و ئیعلامـی و پێشمەرگەیی، ئەوەی تری "رەشایی لەشکر" بە هەر جۆرێ بێ لە کۆڵی بێتەوە.

لە سوریا بایەخی زۆری بەکاری راگەیاندنو چاوپێکەوتنی رۆژنامەیی ئەدا، بۆیە کە بەرەی کوردستانی دامەزرا ئەو خۆی ئەوەی هەڵبژارد کە بەرپرسی چالاکیەکانی بەرەی کوردستانی بێ لە هەندەران. بەڵام کە سەدام گەوجێتیە گەورەکەی کرد و کوەیتی داگیر کرد، ئینجا کەوتەوە جۆش و خرۆش بۆ سازدانو کۆکردنەوەی پێشمەرگە.

ئەگەرچی هەمیشە باوەڕم بەوە هەبوە کە شان بە شانی کاری چەکدار و ململانێی توندوتیژ ئەشێ گفتوگۆی ژیرانە و دانوسەندنی سیاسی رێگەیەکی تر بێ بۆ بە لادا خستنی کێشەی سیاسی و دواخستنی ململانێی خوێناوی، بەلاّم بە درێژایی ژیانم، نە ئەو کاتەو نە پێش ئەوکاتەو نە دوای ئەو کاتە، هەرگیز نامەم بۆ سەدام حسێن و بۆ هیچ کام لە کاربەدەستانی بەعس نەنوسیوە. لە کاتێکدا رەنگە ئاغای تاڵەبانی دەیان نامەی بە خەتی خۆی و بە ئیمزای خۆی بو سەدام حسێنو بەرزانی برایو سەبعاوی برای و بۆ عیزەت دوری و کاربەدەستانی تری بەعس نوسی بێ و، دوای روخانی بەعس و بە تالاّن چونی بەڵگەکانی عێراق، وێنەی هەندێکیان کەوتۆتە دەس دەزگا و دەوڵەتی جیاواز و، رۆژێ دێ روناکی ببینن.

لەدوای ئەنفال زیاتر لە بیست مانگ من لە سەر سنور لە قاسمەڕەش، نۆکان و شێنێ، بوم. ئەمتوانی منیش وەکو ئاغای تاڵەبانی بچم لە یەکێ لە پایتەختە خۆشەکانی ولاّتانی ئەوروپا پاڵی لێ بدەمەوە لەوێوە قسەی زلی بێ گومرگ بکەم و قارەمانێتی بە هاوڕێکانم بفرۆشمەوە، بەلاّم من ئەوەم نەکرد، لە گەڵ هاوڕێکانم و لە گەڵ هاوسەنگەرەکانم و لە گەڵ هاولاّتیە لێقەوماوەکانم دا مامەوە. تەنیا شتیش کە ئەوەی پێ ئەکردم خۆشەویستی نەتەوە و نیشتمانەکەم بو، ئەگینا هەمو شارەزایەك ئەزانێ ئەو زەمانە لەو زەمینەدا هیچ خۆشیەکی دنیایی یا هیچ دەسکەوتێکی مادی نەبو کەسێ بە دیاریەوە دابنیشێ، بەلاّم لەوێ بە هاوکاریو بە یارمەتی هاوڕێکانم "لە غیابی سکرتێری گشتی" دا، وەك خۆی نوسیوێتی، "پایەکانی ستراتیجی قۆناغی نوێی کار" مان لەسەر ٤ بناغە دانا:

١. کاری رێکخراوەیی – سیاسی
٢. کاروباری راگەیاندن
٣. کاری پێشمەرگەیی
٤. کاری دیپلۆماسی

"لـه غيـابى سـكرتيرى گـشتى دا" لـەو ماوەيـەدا "بـەرەى كوردسـتانى" مـان پێكهێنا و، بۆ يەكەمجار لە مێژوى شۆڕشەكانى كوردا بناغەى دۆستايەتيەكى بـەهێزمان لەگـەڵ پـارتى ديمـۆكراتى كوردسـتان و لايەنـە كوردسـتانيەكان دامەزراند، كە دواتر لە راپەڕين و كۆڕەو و مفاوەزات و دامەزراندنى يەكەمين تەجروبەى حوكمڕانى كوردا رەنگى دايەوە.

"لە غيابى سكرتێرى گشتى دا" لايەنى كەمى ژيانى پێشمەرگەمان، بێ ئـەوەى ئەو بتوانێ هيچ سەرچاوەيەكى داراييمان بۆ پەيدا بكا، دابين كرد. نەمانهێشت جياوازى چينايەتى لـە ژيـانى كـادرو تێكۆشـەرو پێـشمەرگەكانى يـەكێتى دا دروست ببێ.

"لە غيابى سكرتێرى گشتى دا" نەمانهێشت دەزگاى راگەياندن لە كار بكەوێت، راديـوى دەنگـى گـەلى كوردستان بوە سەرچاوەى گەيانـدنى راستىو هـەواڵو سـازدانو رێكخـستنى كۆمـەلانى خـەلك و شـەرارەى عـەرەبى و ريبـازى نـوێى كوردى مانگانە بلاو ئەكرانەوە.

"لە غيابى سكرتيرى گشتى دا" هێزە چەكدارەكانمان رێكخستەوە:

١٢ بەتاليۆنى نيمچە نيزامى لە سەر سنورەكان

٥٢٠ پارتيزان لەسەرانسەرى كوردستان

١٢٠ كادرى سرك لەناو شارو ئۆردوگاكان دا

٧٠٠٠ كەس لە ريزى شانە چەكدارەكانى شالاو و بروسك دا

چەند هەزار كەس هێزى پشتگيرى لەناو ئاوارەكانى ئيران دا

لەهەر چوار مەيدانەكەدا بە سەركەوتويى ئەركەكانى "ستراتيجى قۆناغى نوێى كار" مان بەجێ هێنا، لە رۆژانى جەنگى دوهەمى كەنداودا، "شكستى ئـەنفال" مان گۆڕى بە "سەركەوتنى راپەڕين".

ئێمە "لە غيابى سكرتێرى گشتى دا" ئەمانەمان كردوە، ئەو چى كردوە؟

#

كورد – عەرەب: برايەتيەكى لاسەنگ يا پەيوەنديەكى هاوتا؟

تاڵەبانی بۆ هاندانی هێزە عەرەبییەکان لە بزوتنەوەی گۆڕان و خودی خۆم وای پیشان ئەدات من دژی عەرەبم و گاڵتەم بە برایەتی کورد و عەرەب دێت. ماوەیەکیشە سیاسەتێکی دوفاقی دزێویان دژی بزوتنەوەی گۆڕان گرتۆتە بەر. لای هێزە عەرەبییە عێراقیەکان وەك بزوتنەوەیەکی توندڕەوی کوردی وێنامان ئەکەن کە بڕوای بە پێکەوە ژیان نیەو کار بۆ سەربەخۆیی ئەکات، و لای خەڵکی کوردیش وەك هێزێك کە دژی کوردستان و ئازادی کوردستانە و کار بۆ پارچە پارچە بونی ئەکەن. هەندێکجار وەك ناحەزی ئەمەریکا و هەندیکجار وەك ناحەزی ئێران. . هەندێکجار وەك ناحەزی پارتی و لایەنگری شەڕی ناوخۆ، و لای هەندێکیش وەك بزوتنەوەیەکی فاشی دژ بە هەمو شتێکی غەیرە کوردی. لە کویێ چیان پیێ کرا بێت دژی ئێمە کردویانە و لەکوێش هەستیان کردبێت تۆمەتێك هەیە وا لە لایەنێك ئەکات دژمان بوەستێتەوە وتویانە. ئەم قسانەش کە ئێستا لە پلینۆمدا دژی خۆم و بزوتنەوەی گۆڕان ئەیکات، هەر لەپێناو ئەم ئامانجەدایە.

سەبارەت بە مەسەلەی برایەتی کورد و عەرەبیش ئەبێ بڵێین هیچ کەس بەقەد ئێمە بڕوای بە هاوکاریو دۆستایەتی و پێکەوەکارکردنی نەتەوە و ئەتنیە جیاوازەکان نیە. بگرە یەکێك لە رەخنە سەرەکیەکانی بزوتنەوەی گۆڕان و خودی خۆم لە سیاسەتی حیزبە کوردیەکان ئەوە بوە کە نەیتوانیوە بەشێویەکی دیموکراتیانە و دور لە دەمارگیری حیزبایەتی و خیلأیەتی مامەڵە لەگەڵ فرە نەتەوەیی کوردستان و عێراقدا بکات.

بەلأم هاوکاریو دۆستایەتی و مامەڵەی یەکسان شتێکەو خۆ بەبچوك زانی شتێکی تر. ئەوەی ئێمە ئەوساو ئێستاش دژایەتیمان کردوە هەستی خۆ بە بچوکزانی و خۆ بچوککردنەوەیە لەبەرامبەر ئەوانی تردا. زۆرێك لە سیاسیەکانی کورد لەبەر ئەوەی کورد خاوەن دەوڵەتی خۆی نەبوەو تەنها بزوتنەوەیەکی چەکداری هەبوە کە لە روی هێزو ژمارە و قەبارەوە لە ناحەز و نەیارەکانی لاوازتر بوە، بە گرێی هەستی خۆ بەبچوکزانی و خۆ سوککردنەوە

مامەڵەیان لەگەڵ سەرکردە سیاسیەکانی ئەو گەلانەدا کردوە کە بەهێز و قەبارەگەورەتر بون. ئەمە تا ئێستاش بەردەوامە هەرکەس چاودێری هەڵسوکەوتی سەرانی کورد بکا لەگەڵ کار بەدەستانی عەرەب چ لە عێراقو چ لە جیهانی عەرەبدا، لەگەڵ کاربەدەستانی ئێرانیو تورکیدا، لەگەڵ کاربەدەستانی ئەمەریکیو ئینگلیزیدا بە ئاشکرا ئەم دیاردەیە ئەبینرێت و ئەم فەرهەنگە ئەخوێنیتەوە.

لە قۆناغێکی سیاسی کوردستانیشدا بۆ ئەوەی رەوایەتی بەم هەستی خۆ بە بچوکزانینە بدرێت، دروشمی درۆزنانەی برایەتیان هێناوەتە پێشێ. برایەتیەك کە برایەتی نەبوە، بەڵکو کۆیلەیەتی و خۆ بە بچوکزانی و بەسوك تەماشاکردن بوە. سیاسیەکانی کورد لەجیاتی ئەوەی وەك نوێنەری میلەتێك و بە هێز و ورە وەرگرتن لەو نوێنەرایەتیەوە، بە هەستێکی هاوشان و چونیەکەوە بچنە وتوێژ لەگەڵ سەرکردە سیاسیەکانی گەلانی تردا، بە هەستی خۆ بە بچوکزانیەوە مامەڵەیان کردوە و زۆرجار بەمەش گەلەکەی خۆیان شەرمەزار کردوە.

سەرۆك و سەرکردەکانی گەلانی دنیا، هێز و توانای خۆیان لە گەلەکانیانەوە وەرئەگرن، نەك لەهێزی سەربازی و قەبارەی سیاسی بچوکی دەسەڵاتیانەوە وەك هەندێك لە سەرکردەکانی کورد ئەیکەن.

گەلان هیچیان خۆیان لەوانی تر بە کەمترو بچوکتر نازانن. هیچ گەلێك ئەگەر بە ژمارەش کەم بێت خۆی لە گەلێکی تر ئەگەر تەنانەت بە ژمارە زۆریش بێ بە بچوکتر نازانێ.

بەڵام زۆرێك لە سیاسیەکانی کورد کە قەت قەبارەی سەربازی هێزەکانیان لەئاست قەبارەی سەربازی دراوسێکانیاندا نەبوە، بە رۆحێکی خۆ بە بچوك زانی و برا بچوکیەوە تەماشای گەلەکانی تریان کردوە.

بڕوای پتەوی ئێمەش ئەوساو ئێستاش ئەوەیە کورد برابچوکی هیچ گەلێك نیەو هیچ شتێکی لە هیچ نەتەوەیەکی تر کەمتر نیە. هەر جۆرە برایەتی و هاوکاریەکیش باسی برا گەورەیی و بچوکی تیا کرا، برایەتی نیەو کۆیلەیەتی و

سـوكايەتی پێكردنـە. لـەنێوان گـەلانی دنیـادا گـەوەر و بـچوكی نیـە، بـەڵكو یەكسانی و هاوشانی و رێزگرتنی بەرامبەر و بەرژەوەندی هاوبەش هەیە. مرۆڤ ئاژەڵ نیە و بە لۆژیكی دارستان ناژی كە تیای دا ئەوەی گەورە و بەهێز بێت، مـاف زیـاتر و گـەورەتری هـەبێت. گـەلان هـەمو ئـەبێت لەپێگەیـەكی یەكسان‌و چونیەك و رێزی هاوبەشەوە، مامەڵە لەگەڵ یەك بكەن، نەك بە پێی گەورەی و بچوكی.

ئـەوەی ئێمـە ئەوسـا و ئێـستاش دژایـەتی ئەكـەین ئەوەیـە سیاسـی و سـەركردەكانی كـورد بـە گرێـی خـۆ بەبـچووكزانیەوە مامەڵـە نەكـەن‌و رێـز و حورمەت و كەرامەتی ئەو نەتەوەیە بگرن كە نوێنەرایەتی ئەكەن. نەتەوەكەیان لەبەر خۆ خۆشەویستكردن لای بێگانە بچوك نەكەنەوە و بە برا بچوكی لە قەڵەم نەدەن. . خەڵكی ئێمە بەوە پەرەوەردە نەكەن برابچوكی هیچ گەلێكی تر بێت و هـیچ كەس لـە خـۆی بـە گـەورەتر نـەزانێت. ئەوسا و ئێستاش بڕوامـان وابـوە ئەبێت گەلەكەی خۆمان فێری هاوكاری و پێكەوە ژیانی ئاشتیانە و یەكسانی بكەین، نەك كۆیلەیەتی و خۆ بە بچوك زانی.

بێگومان برا گەورەیەتی و برا بچوكی وەكو بەشێك لە نەریتی كۆمەڵایـەتی نـاو خێزان‌و بنەماڵە و تیرە و هۆز و خێڵ شتێكی ئاساییەو ئەبێ پەیڕەوەی بكرێت، بەڵام براگەورەو برا بچوك لە پەیوەندی سیاسی ناو دەوڵەتان و ناو گەلان‌و نـاو نەتەوەكانی جیهانـدا نیە، بەڵكو پەیوەندی یەكسان لەسـەر بنچینەی قازانجی هاوبەش و رێزگرتنی یەكتری هەیە.

جگـە لـەو فەرهەنگـە چـەوتەی ماوەیـەكی درێـژە هەنـدێك لەسـەرانی كـورد و سیاسـیەكانی، لاوەكـانی كوردیـان پـێ رائـەهێنا: كـە "كـورد لـە عێـراق دا بـرا بچوكی عەرەبە"و "عەرەب لە عێراق دا برا گەورەی كوردە".

لەسـاڵی ١٩٧٥ ەوە خـۆم و زۆرێـك لـە هاورێكـانم ویـستومانە ئەم فەرهەنگـە لـە بناغەوە هەڵتەكێنین‌و بیگۆڕین بەوەی تاكی كورد بەتایبەتی ئەندامانی كۆمەڵـە و یەكێتی پەروەردە بكەین بەوەی كوردیش وەكو هەمو نەتەوەكانی جیهان ماف

چارەنوسی هەیە، مافی دەوڵەتی هەیە، برا بچوکی هیچ نەتەوەیەکی تر نیە، پەیوەندی کورد لەگەڵ گەلانی دراوسێ دا لەسەر بنچینەی هاوتایی‌و یەکسانی‌و قازانجی هاوبەش دابمەزرێنین‌و، گرێی خۆبەکەمزانی‌و خۆ بە بچوکزانی بگۆڕی بەخۆ نازین و کورد لە ئاستی هیچ بێگانەیەک دا خۆی بە کەمتر و بچوکتر نەزانێت.

ئەگەر کەسانێک هەبن ئەمە بە نوقسانی بۆ من لە قەڵەم بدەن، من بە شانازی ئەزانم بۆ خۆم.

#

***کێ فیدرالیزمی پارێزگاکانی داهێنا؟***

تاڵەبانی لەقسەکانیدا بزوتنەوەی گۆڕان‌و هەڵسوڕاوەکانی بە دژی فیدڕالیزم و هەرێمی کوردستان تاوانبار ئەکات و ئێمە بە لایەنگری فیدراڵی پاریزگاکان ناو ئەهێنێ، گۆیا ئێمە دژی هاتنەوەی کەرکوکین بۆ سەر هەرێمی کوردستان. پێ ئەچێت تاڵەبانی وەک چۆن زاکیرەی خۆی لاواز بوە لە گێرانەوەی روداوەکان دا، وابزانێت هەمو خەڵکی کوردستانیش زاکیرەیان لاوازە و ئەوەیان لە بیر چۆتەوە. خەڵکی کوردستان هەمو لە بیریانە:

یەکەم، ئەوەی یەکەم کەس کە بە شێوەیەکی فەرمی پرسی فیدراڵی پارێزگاکانی سەلماند و بەم سەلماندنەش هەمو کوردی لەبەردەم هێزە عێراقیەکان‌و ئەمەریکادا ئیحراج کرد خودی تاڵەبانی بو.

لەو رێکەوتنەدا کە تاڵەبانی بەناوی سەرۆکی مەجلیسی حوکم و بریمەر بەناوی حاکمی مەدەنی عیراقەوە ئیمزایان کردوەخاڵێکی سەرەکی رێکەوتنەکەیان ئەوە بو کە عیراق ببێتە ١٨ پارێزگای فیدرالی، ئەمەشی بۆ هەمو عێراق قەبوڵ کردبو، لەوانە هەرێمی کوردستان. دوای ئەوەی سیاسیەکانی عەرەب‌و لە کوردستانیش هەندێک لایەن لێیان کرد بەهەرا، ئینجا لێی بێدەنگ بو.

دوەم، ئەوەی کێشەی بۆ مادەی ١٤٠ دروستکرد و بو بە هۆی هێنانە ئارای پرۆژەیەکی قانونی جیاواز لە مادەی ١٤٠ لە کاتی دانانی قانونی هەڵبژاردنی پارێزگاکان دا، خودی تاڵەبانی بو.

تاڵەبانی لە سەردانەکەی دا بۆ کەرکوك و لە کۆبونەوەی دا لەگەڵ ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك داوای لێ کردن "دەسەلاّت و بەڕێوبەرایەتی کەرکوك بە ڕێژەی ٪٣٢ لە نێوان تورکمانو عەرەبو کوردا دابەش بکرێت و کەرکوك ببیتە هەرێمێکی فیدراڵی جیاواز لە هەرێمی کوردستان. " ئەم قسەیەی لە کۆبونەوەکانی لەگەڵ تورکمانو عەرەب دوپات کردۆتەوە.

ئەم کەتنە بوە هۆی هاندانی عەرەب و تورکمان بۆ ئەوەی ئەو پرۆژەیە ببەنە پەرلەمانی عێراق و بیکەن بە یاساو لە دەنگدانی رۆژی ٢٢ تەموزدا بیسەپێنن و کێشەیەکی سیاسی و یاسایی دژواری ئەوتۆی خوڵقاند کە بە بایکۆتی ئەندامانی کوردی پەرلەمانی عێراق ولە ئەنجامی ئەم بایکۆتەدا و لە ژێر فشاری رای گشتی دا دەستەی سەرۆکایەتی ناچار بە ڤیتۆ کرا، بەلاّم وەکو کێشەیەکی هەڵواسراو مایەوە دوا خرا بۆ کاتێکی دیارینەکراو.

سێیەم، لە کاتی خۆی دا کە ئێمە بەم کەتنەمان زانی بۆ هەڕەشە و ناچارکردنی بە پاشگەزبونەوە لەو بیرە، بە تاڵەبانیمان وت: "ئەگەر ئەو باوەڕی وایە عەرەبو تورکمانو کورد لە پارێزگای کەرکوك ببن بە هەرێمێکی جیاواز، ئەوا باشتر وایە سلیمانیو هەولێر و دهۆکیش هەریەکەیان ببێ بە هەرێمێکی فیدرالی، ئەوسا هەر ٤ هەرێمی فیدراڵی پێکەوە ئەتوانن دەزگایەکی هاوبەشی کوردستانی پێك بهێنن. ئەوسا کەرکوکیش نابێتە حاڵەتێکی جیاواز لە پارێزگاکانی تری کوردستان. "

لە گۆڕانێکی وەهادا تاڵەبانی خۆی هیچ دەسەلاّتێکی نەئەما، نە لە کوردستان و نە لە پارێزگای سلیمانی، بۆیە لە بەردەم دەزگاکانی راگەیاندنی کوردی دا پەشیمان بوەوە، وتی: "من سوێندم خواردوە پارێزگاری دەستور بکەم، مادەی ١٤٠ یش مادەیەکی دەستوریە".

تاڵەبانی هەتا ئێستاش لە سەر کەرکوك بە دو جۆر ئەدوێ:
لەکۆبونەوە تایبەتیەکانی دا لەگەڵ تورکمانی کەرکوك و لەگەڵ کاربەدەستانی حکومەتی تورك پشتگیری لەوە ئەکات کەرکوك ببێتە هەرێمێکی فیدراڵی،
لە کۆبونە گشتیەکانی کوردستانیش دا باسی مادەی ١٤٠ و گەڕانەوەی کەرکوك ئەکا بۆ سەر هەرێمی کوردستان،
لە ناو تورکمان و کورد و عەرەب دا هەن کە فیدراڵیەتی کەرکوك بە چارەسەرێکی گونجاو ئەزانن بۆ کێشە هەڵواسراوەکانی کەرکوك، خۆ ئەگەر تاڵەبانی لەم بڕوایەدایە پێویست بەوە ناکات نیازی راستەقینەی خۆی بشارێتەوەو بەو دو جۆرە جیاوازە بدوێت،
ئێمە بیروبۆچونی خۆمان لەسەر چارەسەرکردنی کێشەی کەرکوك و ناوچە دابڕاوەکان بە گشتی و لە سەر جۆری چارەسەرکردنی لە چوارچێوەی هەرێمی کوردستان دا، بە ئاشکرا لە دەیان وتار و گفتوگۆی رۆژنامەوانی و رادیۆیی و تەلەفزیۆنی دا بلاو کردۆتەوە. لەم بارەیەوە هەر قسەیەك بکەن لەچێتە خانەی موزایەدەی سیاسی بێ بایەخەوە، رەنگە هەبن لە دۆڕاندنی هەندێ ناوچەی کوردستان دا قازانجی سیاسی بکەن، بەڵام ئێمە هیچ دەسکەوتێکی سیاسی یا مادی لە دۆڕاندنی مەترێکی سەرزەمینی کوردستان دا بە دەس ناهێنین،
چوارەم، ئێمە پێمان وایە سیستەمی بەڕێوەبردنی هەرێم لە گەڵ پێویستیەکانیپێشکەوتنی گەلی کوردستاندا ناسازە:
حیزب و حکومەت تێکەڵاوە،
حیزب دەس وەر ئەداتە دەسەلاتەکانی تەنفیزی، تەشریعی، قەزائی،
حیزب دەس وەر ئەداتە زانکۆ، پەیمانگا، رێکخراوەکانی کۆمەڵگای شارستانی،
حیزب دەس وەر ئەداتە بازاڕ و بازرگانی،
ئاسایش و پۆلیس و پێشمەرگە بێلایەن نین،
بودجە رون نیە و، بە جۆرێکی ناعادلانە سەرف ئەکرێ،

گەندەڵی بە هەمو شێوەکانی کارگێڕی، دارایی، سیاسی، لە داوودەزگاکان دا ڕەنگی داوەتەوە.

ئەمانە بیروبۆچونەکانی ئێمەن، نەمان شاردۆتەوە. بە ئاشکرا لە وتار و پەیام و گفتوگۆی ڕۆژنامەوانی دا دوبارەمان کردۆتەوە و، ئالتەرنەتیڤمان پێشنیار کردوە.

پێنجەم، لە شێوەی بەڕێوەبردنی هاوچەرخ دا لە دنیای ئەم سەردەمەدا نەناوەندێتی کارگێڕی بۆتە بنەمایەکی باوی کاری حکومەت و فەرمانگەکانی، کەچی ئەوە بە دژایەتی فیدرالیزم دائەنێ، لە کاتێك دا ئەمە بەشێکە لە چاکسازی کارگێڕی هەرێمی فیدرالی کوردستان. ئێمە پێمان وایە پێویستە چاکسازی لە سیستەمی بەڕێوەبردنی هەرێمی کوردستان دا بکرێ. پێویستە:

دەسەڵاتی جێبەجێکردن کە خۆی ئەنوێنێت لە سەرۆکایەتی هەرێمو ئەنجومەنی وەزیرانو هێزە چەکدارەکانی پێشمەرگە و ئاسایشو پۆلیس، پێویستە یەکگرتو بن لە دەسەڵاتی هەرێم دا.

دەسەڵاتی تەشریعی کە بریتیە لە پەرلەمانی کوردستان پێویستە یەکگرتو بێو قانون بۆ هەمو هەرێم دابنێ.

دەسەڵاتی قەزائی کە بریتیە لە ئەنجومەنی قەزاو دەزگاکانی سیستەمی قەزائی پێویستە یەك دەسەڵاتی قەزائی لە هەمو هەرێم دا حوکمڕان بێ و بە قانونەکانی پەرلەمان کار بکا.

بەڵام ئەبێ دەسەڵات لەنێوان دەسەڵاتی کارگێڕیی هەرێمو دەسەڵاتی پارێزگادا دابەش بکرێ، کە ئەویان خۆی لە ئەنجومەنی وەزیران و ئەمیان خۆی لە ئەنجومەنی پارێزگاکان دا ئەنوێنێ، واتە پەیڕەوی بنەماکانی نەناوەندێتی بکرێت.

ئەوانەی دژی "نەناوەندێتی" و ئەم پێشنیارانە ڕائەوەستن ئەوانەن کە قازانجیان هەیە لە مانەوەی بودجەی هەرێم و جۆری سەرفکردنی و، دامەزراندنی کارمەندانی پلە و پایە جیاوازەکانی پەیژەی بەڕێوەبەرایەتی، لە

تاریکی دا و، ئەوانەن بە جۆرێ لە جۆرەکان سودمەندن لە شێوە جیاوازەکانی گەندەڵی.
ئێمە بیروبۆچونەکانی خۆمان لە سەر ئەو بابەتە گرنگانە نەشاردۆتەوە، هەم بە نوسین و هەم لە گفتوگۆی تەلەفزیۆنی دا بە ئاشکرا و بێ پێچوپەنا رونمان کردۆتەوە. ئەمە نەك بە تاوان نازانین، بەڵکو بەشێکە لە پرۆژەی چاکسازی کارگێڕیی هەرێمی کوردستان.
#
دەستور: خەبات بۆ سەرۆکایەتی یان بۆ ماڤی کورد؟
تاڵەبانی لە چەند جێگەیەکی راپۆرتەکەی دا شانازی ئەکا بەو دەستکەوتانەوە کە لە دەستوری عێراق دا نوسراون، کەسێ ئاگای لە پرۆسەی نوسینی نەبێ وائەزانێ ئەمە قارەمانی بەدەستەێنانی دەسکەوتە دەستوریەکان.
لێرەدا پێویستە بۆ مێژو لەم بارەیەوە شایەتیی خۆم تۆمار بکەم. هەر کەسیش ویستی وردەکاری زیاتری ئەم پرۆسەیە بزانێ، ئەتوانێ بپرسێ. بۆ خۆشبەختی مەسعود بەرزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان، ئازاد بەرواری و د رۆژ شاوەیس، ماون کە بەشداری راستەقینەی پرۆسەکە بون. ئەمە جگە لە دەیان کەسی تر کە بەو بۆنەیەوە لەبەغدا رۆژانە لە کۆبونەوەکان دا بەشدار ئەبون.
من ئەندامی پەرلەمانی عێراق نەبوم، لەبەرئەوە ئەندامی لیژنەی داڕشتنی دەستوریش نەبوم، کاتێك کە خەریك بو داڕشتنی دەستوری عێراق بگاتە دوایین قۆناغی، چەند رەشنوسێك بڵاوکرایەوە کە مافەکانی کوردی بە رونی تیا دیاری نەکرابو. مەسعود بەرزانی بۆ بەشداری لە دواداڕشتنی دا چو بۆ بەغدا، لەگەڵ خۆی نوێنەرانی لایەنە سیاسیەکانی کوردستان و نوێنەرانی پەرلەمانی کوردستانی برد، داوای لە منیش کرد لە گەڵی بچم بۆ بەغدا.
لە ژێر گوشاری ئەمەریکی دا بۆ ئەوەی پرۆسەی نوسینی دەستور بە رێکوپێکی بڕوا و لەکاتی دیاریکراودا تەواو ببێ و رابگەیەنرێ، "مەتبەخێکی

سیاسی" لە نوێنەرانی هێزە سیاسییە سەرەکییەکانی عێراق و کوردستان پێکهێنرا بۆ تاوتوێکردنو ئامادەکردنی مادەکانی دەستور. لەو مەتبەخەدا تاڵەبانی و من نوێنەرایەتی یەکێتی مان کرد.
ئەو رەشنوسەی کە بۆ دەستور نوسرابو دەسەڵاتی سەرکۆماری سنوردار کردبو، پایەی سەرکۆماری کرد بوە کارێکی تەشریفاتی. تاڵەبانی خۆی ئامادەکردبو ببێتە سەرکۆمار، ئەو دەسەڵاتانەی بۆ سەرکۆمار، واتە بۆ خۆی بە کەم ئەزانی. ئەیویست دەسەڵاتەکانی فراوان بکات. لایەنە عەرەبییەکان کە شارەزاتر بون لە کورد، ئەیانویست سیستەمی سیاسی عێراق پەرلەمانی بێ و بۆ ئەوەی تەجروبەی سەردەمی سەدام دوبارە نەبێتەوە، سەرۆکی کۆمار پایەیەکی "تەشریفاتی و ئیحتیفالی" هەبێ. دەسەڵاتێکی ئەوتۆی نەبێ بتوانێ سیستەمی سیاسی- پەرلەمانی بخاتە مەترسیەوە.
تاڵەبانی بەمە رازی نەبو، لە کۆبونەوە سەرەتاییەکانی رۆژی یەکەم دا لەسەر دەسەڵاتەکانی سەرکۆمار دوانێکی توندوتیژی دا. لەبەرئەوەی کەس نەبو بە هاودەنگی بە توڕەییەوە کۆبونەوەکەی بەجێهێشتو ئیتر هیچ بەشداریەکی جدی و کاریگەری لە گفتوگۆکانی نوسینی دەستوردا نەکرد، دو جار نەبێ کە هەردوك جارەکەش بە زەرەر بۆ کورد تەواو بو:
یەکێکیان، زوربەی لایەنە عەرەبییەکان رازی کرابون بەوەی کە لە دەستوری نوێی عێراق دا ئاماژە بۆ ئەوە نەکرێت "عێراق بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب" کە ساڵەهای ساڵ هۆی ناکۆکی کورد و حکومەتی ناوەندی عێراق بوە. ئەم مادەیە لە دەستوری چەند دەوڵەتێکی عەرەبی دا هەیەو لە دەستوری چەند دەوڵەتێکی تردا نیە.
تاڵەبانی بۆ رازیکردنی عەرەب پێشنیارێکی هێناو، وتی: "ئەمە هی عەمرۆ موسای ئەمینی عامی جامیعەی عەرەبیەو منیش پێم باشە بیخەینە دەستورەوە". پێشنیارەکەی بریتی بو لەوەی ئەم رستەیە: "وهو عچو مۆسس وفعال ڤ جامعە الدول العربیە وملتزم بمیپاقها" بخرێتە مادەی ٣ ی

دەستورەوە. پێشنیارەکەی بە خۆشیەوە وەرگیرا و خرایە دەستورەوە، بەوەش ئاوەرۆکی مادەی ٣ کە دانی ئابو بەوەدا: "عیراق وڵاتێکی فرەنەتەوە و فرەئاین و فرەمەزەب" ە لاواز بو.

دوهەمیان، دوای ئەوەی نوسینی دەستور تەواو بو، ئیتر ئەبو بڵاوبکرێتەوەو بخرێتە بەردەم دەنگدەرانی عێراق بۆ قەبوڵکردن یان رەفزکردن، زالمای خەلیل زاد، سەفیری ئەمەریکا، لەسەر داوای هەندێ لایەنی عەرەبی سونی ویستی مادەیەکی تازە تێهەڵکێشی دەستورەکە بکرێ، لە ئەنجومەنی نوێنەرانی داهاتودا بێ ئەوەی ٨ ساڵ چاوەڕوان بکەن، مادەکانی دەستور قابیلی دەستکاری بێو زۆری ئەو مادانەش کە ئەیانویست دەستکاری بکرێن، ئەو مادانە بون کە بە قازانجی کوردو شیعە بون.

لایەنی شیعە بەهیچ جۆرێ ئامادە نەبون ئەم مادەیە قەبوڵ بکەن، بەڵام لەسەر داوای خەلیلزاد، تاڵەبانی لایەنی کوردی "ئیحراج" کرد قەبوڵی بکەن، هەر ئەوان لایەنی شیعەشیان بەم گۆڕینە رازی کرد، بە تایبەتی سەید عەبدولعەزیز حەکیم کە سەرۆکی ئیئتیلافی شیعە بو. پاش دوجار سەردان و پێداگریەکی زۆر ئینجا ئەویش لەسەر داوای کورد قەبولی کردو بو بە مادەی ١٤٢.

لە کاتێك دا نوێنەرایەتی کورد خۆی دەوری سەرەکی هەبوە لە دانانی مادەی ١٤٢ دا بۆ تەعدیلکردنی دەستور، کەچی ئێستا خۆی بە هەرەشەی دائەنێ لە دەستکەوتە دەستوریەکانی.

عەرەب ئەڵێت "شر البلیة ما یضحک"!

#

***جاران و ئیستا***

***تاڵەبانی لە راپۆرتەکەی دا ئەڵێ:***

"پێویستە ئەم راستیە بۆ خەڵك روون کەینەوە کە بۆچی: لە سەرۆك جاشە بابەلباب خائینەکانەوە، تا سەر مەلا کرێکار، تا سەر جاشە هارەکانی خۆماڵی،

تا سەر کۆنە جاسوس و کۆنە بەعسی، هەروەها باڵی تۆرانی جەبهەی تورکمانی، بەگەرمی دەنگیان بۆ دان؟ ئایا لەدژی پارتی و ی. ن. ك و حکومەتی هەرێم و کوردایەتی نەبوو؟"

جاران یەکێ لە هونەرەکانی تاڵەبانی دوان و نوسین بو.

پێ ئەچێ لە ژێر کاریگەری تورەیی دۆڕاندنی هەڵبژاردن دا ئەم هونەرەشی لاواز بوبێ. نوسینەکانی و وتارەکانی پڕن لە قسەی ناکۆك و رستەی ناهاوسەنگ، ئەوەی لە شوێنێك دا ئەیلێ لە شوێنێکی تردا پێچەوانەکەی ئەڵێ، لە یەك کات دا شتێك و پێچەوانەکەشی دوبارە ئەکاتەوە. لیستی ئەو تۆمەتانەی بۆ من و بزوتنەوەی گۆڕانی ریز کردوە پڕە لەم جۆرە شتانە.

لە لایەك پێم ئەڵێ سلێمانچێتی ئەکا، کەچی لە شوێنێکی تردا ئەڵێ ٣ هەزار ملیۆن دۆلاری کۆریەکانی لە کیس سلێمانی داوە چونکە لە هەولێر خەرجیان کردوە!

لە لایەك پێم ئەڵێ دژی برایەتی کورد و گەلانە، کەچی لە شوێنێکی تردا ئەڵێ هاوکار و دۆستی کۆنە بەعسی و جاش و تۆرانیە!

لە لایەك پێم ئەڵێ پیاوێکی توندوتیژە کەس قبوڵ ناکا کەچی لە شوێنێکی تردا ئەڵێ هاوڕێی مەلا کرێکارە، بە واتەیەکی تر دۆستی ئیسلامیە توندڕەوەکانە!

لیستی تۆمەتە هەڵبەستراوەکانی هەموو سنورەکانی مەنتیقی تێپەڕاندوە، لە "تەخوین" ی ئیمەوە سەر ئەکێشێ بۆ "تەخوین" ی سەدان هەزار هاوڵاتی ئەم نیشتمانە.

لە هەڵبژاردنی ٢٠٠٩/٧/٢٥ دا زیاتر لە ٤٤٥ هەزار کەس لە هاوڵاتیانی کوردستان دەنگیان بە لیستی گۆڕان داوە. . . تۆ بڵێی ئەو هەمو خەڵکە جاشی بابلباب و کۆنە بەعسی و خائین بوبن؟ بۆچی ئەو کاتەی ئەم خەڵکە پاکە دەنگی بۆ یەکێتی ئەدا تێکۆشەر و دڵسۆز و هاوڵاتی پاك بون و ئیستاش کە

دەنگیان پێ نەداون کۆنە بەعسی و جاشی بابلبابن؟ تۆ بلێی هەمو ئەو خەڵکە دژی حکومەتی هەرێم و کوردایەتی بن؟
لە لایەکی ترەوە هەمو کەس ئەزانێ کەرکوك بەشداری لە هەڵبژاردنی پارلەمانی کوردستان دا نەکرد، ئیتر ئەم باڵە تۆرانیەی "جەبهەی تورکمانی" لە کوێوە هاتن و چۆن دەنگیان بە ئێمە دا؟ لەمەش بترازێ هەرکەسێ باسی تۆرانی و جەبهەی تورکمانی بکات، هەق نیە تاڵەبانی بیکات، چونکە ئەو بو ئیکلیلی گوڵی بردە سەر گۆڕی ئەتاتورك و هەر لەوێش رایگەیاند دەوڵەتی کوردی خەونی شاعیرانەیە، نەك من و هەڵسوڕاوانی گۆڕان.
ئایا هیچ لۆجیکێ لەم قسانەدا هەیە؟ ئەگەر ئەمانە هەر هەموی هەوڵێکی رێکخراو نەبێ بۆ پەڵپ گرتن و بیانو هێنانەوە دژی بزوتنەوەی گۆڕان چ مەبەستێکی ترە لە دوایە؟
#

***کاکڵەی راپۆرتەکەی تاڵەبانی و مەبەستی پلینۆم***

***تاڵەبانی لە راپۆرتەکەی دا ئەڵێ:***

"سیاسەتی راستەقینەی گۆڕانی گردەکە
گۆڕانی گردەکە، کە دەکاتە گۆڕانی نەوشیروان، لەدەستپێکیەوە دژی ی. ن. ك کاردەکات.
بەلام سیاسەتی شاردراوە، یان نیمچە شاردراوەیان دژی کوردایەتی، دژی فیدرالە، دژی یەکێتی خاکی کوردستانە، دژی گەڕاندنەوەی کەرکوکە بۆ باوەشی هەرێم، دژی (هـ. پ. ك)و یەکێتیی خەڵکی کوردستانە. چۆن؟
١- دژایەتیکردنی (ی. ن. ك) بۆ هەموو خەڵك و خۆمان ئاشکراو روونە، بۆیە پێویستی بەباسکردن نییە.

٢- دژی فیدرالی کوردستانن: گەر بۆیان بکرێ سلێمانی لە هەرێم جیادەکەنەوەو هەرێم پارچە پارچە دەکەن، هەر پارێزگایەك بۆ خۆی لامەرکەزیەتێکی هەبێت.

٣- دژایەتی کوردایەتین: بەنەهێشتنی لەو کیانە سیاسیەی کوردستان دژی هەرێمو فیدرالیەتی کوردستانن.

٤- دژی هاتنەوەی کەرکوکن بۆ سەر کوردستان: هەردەم بەگوتەیەك جارێکیان دەڵێ وا چەمچەمال و کفری و کەلار هاتۆتە سەر سلێمانی و زۆربەی نەوت و غاز لەوێیە: ئیتر ئێمە بۆ لەسەر کەرکوك هەرا بکەین؟ جارێکی تریان دەڵێ: با کەرکوك پارێزگایەکی سەربەخۆ بێت! لەهەردوو جاردا کەرکوك نەگەڕێتەوە سەر هەرێم!

٥- لای هەندێ دەوڵەت و هەندێ لایەنی سیاسی عیراقی دەڵێ (هـ. پ. ك) زیادەیەو پێویستمان پێی نەماوە.

٦- هەندێ جاریان نەوشیروان بەئاشکرا دەڵێ بادینی کورد نین، کەرکوکی کەس نازانێ چین؟ هەولێریش (قسەی قێزەون دەکات)، بۆیە هەر سلێمانیمان بەسە:

جا هەڤاڵینە: ئێمە پێویستە کە لەسەر گۆڕانی نەوشیروان دەنووسین، ئەم راستیانە بۆ خەڵك روون کەینەوە. نەك شتی شەخسیەکانیان. پێویستە خەتەری ئەو سیاسەت چەوتەیان ریسوا بکەین.

هەروەك پێویستە ئەم راستیەش بۆ خەڵك روون کەینەوە، کە ئەو گۆڕانە پێویستە بە نەوشیروان ناکرێت، بەڵکو بە ی. ن. ك و پارتی و حکومەتی هەرێمی کوردستان دەکرێت، کە ئەوان دژایەتیان دەکەن. "

#

ئەمە کاکلەی راپۆرتەکەی تاڵەبانی و مەبەستی سەرەکی پلینۆمەکەیەتی!

تاوانبارکردنی بزوتنەوەی گۆڕان بەو هەموو دوژمنایەتیە لە گەڵ کوردایەتی، فیدرالیزم، پێشمەرگە، کەرکوك. . . . جگە لە چەواشەکاری شتێکی تر نیە.

مەبەستی تاڵەبانی لە پلینۆمەکەی نمایشی سیاسی، عەسکەری، نەفسی‌یە. . .
بۆ سازدانی هەمو هێز و توانای خۆی و یەکیتی و داوودەزگا حکومەتیەکان، دژی بزوتنەوەی گۆڕان. لە بەر ئەوەی خۆی سەرکۆماری عێراقە و لە هەمان کات دا سکرتێری گشتی یەکێتیی نیشتمانی و فەرماندەی گشتی پێشمەرگەکانی و بەرپرسی یەکەمی دەزگاکانی زانیاری و هەواڵگری و ئاسایشە، حیزبەکەشی هاوبەشی حکومەتی ناوەندیی بەغداد و حکومەتی هەرێمی کوردستانە، ئەبێ راپۆرتەکەی بە هەڕەشەیەکی جدی وەربگیرێ.
مرۆڤ ئەبێ بپرسێت:
ئایا ئەو لێشاوی تیرۆر و تۆقاندن و هەڕەشانەی لەدوای پلینۆمەوە بۆ سەر لایەنگران و هەڵسوڕاوانی گۆڕان دەستی پێ کردوە، پەیوەندی بەم قسە و تۆمەتانەوە نیە کە تاڵەبانی بۆ بزوتنەوەی گۆڕانی هەڵئەبەستێت؟
ئایا ئەو تۆمەتانەی تاڵەبانی بۆ بزوتنەوەی گۆڕانی ریز ئەکات، هەڵکردنی چرای سەوز نیە بۆ ئەو دەستدرێژییانەی لە دوای پلینۆمەوە کراوەتە سەر لایەنگر و هەڵسوڕاوانی گۆڕان؟
ناساندنی بزوتنەوەی گۆڕان و هەڵسوڕاوەکانی لە لایەن تاڵەبانیەوە، بە خەتەر بۆ سەر کوردایەتی، هەرێمی کوردستان، فیدرالیزم، دیمۆکراسی، پێشمەرگە، کەرکوك و دانانی بە دوژمنی یەکێتی و کورد و کوردستان خۆشکردنی زەمینەیە بۆ پاکتاوی جەستەیی بزوتنەوەکە و هەڵسوڕاوەکانی.
بۆیە لەدوای ئەم راپۆرتەوە کە بەشێوەیەکی فەرمی لەلایەن راگەیاندنی یەکێتیەوە بلاو کراوەتەوە، ئۆبالی هەمو روداوێکی ناخۆش و قەوماوێکی نەویستراو ئەکەوێتە ئەستۆی تاڵەبانی و یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان و ئەوان بەرپرسیاری سەرەکی هەمو پاشهاتەکانی ئەبن.